ئۆرهان پاموك

نووسەری کتێبی من ناوم سوورە
خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە بواری ئەدەب




# ئەستەنبوڵ

## یادەوەرییەکان و شارەکە

"بە شێوەیەکی دڵخۆشکەر، کاریگەر، سەرسوڕهێنەر...
پاموك لە چاوی یادگارییەکانیەوە،
چیرۆکی شارەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە."
(ئەلبێرتۆ مانگویل)

وەرگێڕانی | بەڕێز کەریم

**له بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە: ( ٧٦٠ )**

## ناسنامەی کتێب

- ✓ ناوی کتێب: ئەستەنبوڵ
- ✓ نوسینی: ئۆرهان پاموك
- ✓ بابەت: بیرەوەری
- ✓ وەرگێڕانی: بەڕێز کەریم
- ✓ دیزاین: فواد کەوڵۆسی
- ✓ بەرگ: ئیبراهیم ساڵح
- ✓ چاپخانە: چاپەمەنی گەنج.
- ✓ ساڵی چاپ: ٢٠١٨
- ✓ نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم.
- ✓ تیراژ: ١٠٠٠

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (١٤٨٣)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە**

ناونیشان:

سلێمانی، نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکییە ڕووتە.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

## پێڕست

# ستایشکردنی (ئەسستەنبوڵ)ی ئۆرهان پاموک له لاپەڕە جیهانییەکانەوە:

(ئەستەنبوڵ) وەك باشترین کتێبی ساڵ له سانفرانسیسکۆز

زە ئۆبسێرڤەر (لەندەن)

"دڵڕفێن... یاداشتنامەیەك له ناخی شارێکەوە."

زە سەن

"شرۆڤەیەکی بنەڕەتی لەلایەن ئۆرهان پاموك بۆ ئاشقانی ڕۆمانەکانی."

زە ئیندیپێندێنت (لەندەن)

"سەرکەشییەکی سەرنجراکێشی ئەدەبی... فراوان له توێژینەوە و وردەکاریدا."

سان فرانسیسکۆ کرۆنیکل

"زۆر نایابە... نیگاری شارێکی ئاڵۆز و بێهاوتا."

تاوون & کەنتری

" (ئەستەنبول)، جوانترین و دڵگیرترین کتێبی ئۆرهان پاموکە کە تا ئێستا نووسرابێت لەبارەی شارەکەوە."

زە سان دیگۆ یونیەن تریبیون

"بە چەشنی ئالەکساندرییەی لاورێنس دووریل، یان دوبلینی جەیمس جۆیس، ئۆرهان پاموك لەبارەی (ئەستەنبول) دەدوێ."

سان جۆس مێرکوری نیوز

"ئەستەنبوڵ پرە لە ڕێڕەو بۆ گەیاندنی خوێنەر بە ئەندێشەکانی پاموك."

زە نیویۆرك تایمز بووك ڕڤیو

"سەرنجڕاکێش... تەنانەت ئەوانەشمان کە هەرگیز قاچمان نەخستووەتە ئەستەنبوڵ، بە خوێندنەوەی کتێبە نایابەکەی پاموك، بیروڕای خۆمان دەگۆڕین."

فایناننشیاڵ تایمز

پێشکەشە بە باوکم، گوندێز پاموک (١٩٢٥–٢٠٠٢)

"جوانیی دیمەنێك، لە ماتەمییەکەیدا شاردراوەتەوە."

ئەحمەد ڕاسیم

# ١

## ئۆرهانێکی تر

هەر لە قۆناغێکی زۆر منداڵیمەوە، وا گومانم دەبرد کە جیهانەکەی من، لەوە زیاترە کە دەیبینم: لە هەر گەڕەکێك یان خانوویەکی تری هاوشێوەی ئەوەی ئێمە، ئۆرهانێکی تر دەژی، کە ئەوەندە لە من دەچێت، تەنانەت دەشێت برای جمکم بێت. بەباشی لەبیرم نییە، ئەم بیرۆکەیەم چۆن یان لەکوێوە بۆ هات. ڕەنگە لە تۆڕێك قسەوقسەلۆك، هەڵەتێگەیشتن، وەهم و ترسەوە سەرچاوەی گرتبێت. بەڵام لە یەکێك لە بیرەوەرییە کۆنەکانمدا، بەڕوونی دیارە کە چۆن ئەم هەستەم دەربارەی تارماییەکەی دیکەی خۆم بۆ هاتووە.



کاتێك کە تەمەنم پێنج ساڵان بوو، بۆ ماوەیەکی کورت نێردرام، تا لە ماڵێکی تر بژیم. پاش چەندین جیابوونەوەی توند، دایك و باوکم بەدیدەنی ڕۆشتن بۆ پاریس و من و براکەمیان لە ئەستەنبوڵ هێشتەوە. براکەم دەبوو لای دڵی خێزانەکە داپیرەم بوو، لە ئەپارتمانی پاموك لە نیشانتاشی دەژیا، بمێنێتەوە، منیش نێردرام بۆ لای پورم لە

جیهانگیر. لەسەر دیواری ئەو خانووەی کە بەوپەڕی بەخشندەییەوە مامەڵەم لەگەڵ دەکرا، وێنەی منداڵێکی بچووک هەڵواسرابوو. هەموو خولەکێك، پوورم یان هاوسەرەکەی، ئاماژەیان بۆ وێنەکە دەکرد و دەیانوت: "سەیر بکە! ئەوە تۆیت!"

ڕاستیان دەگوت: کوڕە خوێنشیرین و چاومامزەکەی ناو چوارچێوە بچووکە سپییەکە کەمێك دەچوویەوە سەر من، تەنانەت هەمان کڵاوی لە سەردا بوو کە جاروبار لە سەرم دەکرد. سەربارى ئەوەی دەمزانی کوڕی ناو وێنەکە، کە وەك وێنەی (منداڵێکی جوانکیلە) لە ئەورووپاوە هێنابوویەوە، من نیم، بەڵام تا ئێستاش لە خۆم دەپرسم، ئەوە ئۆرهانەکەی ترە کە لە ماڵێکی تر دەژی؟



منیش لە خانوویەکی تر دەژیام، بەڵام بە جۆرێك بوو، وەك ئەوەی بۆ بینینی برا جمکەکەم هێنرابێتم بۆ ئەو ماڵە. هەرچەندە هیچ خۆشییەکم لە ناسینی ئەو نەدەبینی، چونکە تاکە ئارەزووم لەو کاتەدا، گەڕانەوەم بوو بۆ ماڵەکەی خۆم. کاتێك پوورم و هاوسەرەکەی، گەمەیان پێ دەکردم و دەیانوت ئەو منداڵە هەر تۆی، سەرم لێ دەشێواو و هەستم دەکرد بیرۆکەکانی ناو مێشکم لەبارەی خۆم و ئەو کوڕەی کە لە من دەچێت، لێکچوونی وێنەکەی خۆم و ئەو وێنەیەی لە من دەچوو، ماڵەکەی خۆم و ماڵەکەی تر، ئاڵۆزتر دەبوون و دەمودەست، حەزم دەکرد بگەڕێمەوە ماڵی خۆمان و خێزانەکەم لەدەورم بن.

هەر زوو ئەو ئاواتەم هاتە دی. بەڵام تارمایی ئۆرهانەکەی تر، لە خانوویەکی تری ئەستەنبوڵ هەرگیز وازی لێ نەهێنام. بە درێژایی منداڵیم و هەرزەکاریم، تارماییەکە دەستی بەسەر خەیاڵەکانمدا گرتبوو. لە ئێوارانی زستاندا بە گەڕەکەکانی شاردا پیاسەم دەکرد، لە ڕێی ئەو ڕووناکییە پرتەقاڵییە زەردباوانە، چاوم دەبرییە خانووی کەسانی دیکە و خەیاڵم دەچووە سەر ئەو خێزانە بەختەوەر و ئاشتیخوازانەی، ژیانێکی ئاسوودەیان تێدا دەگوزەراند. دواتر، کاتێك بیرم دەکردەوە کە ڕەنگە ئۆرهانەکەی تر لە یەکێك لەو ماڵانەدا بژی، لە ترسا لەرز دەیگرتم. هەرچەندە گەورەتر دەبووم، تارماییەکە زیاتر دەبووە خەونی سامناك و داڵغەی شەو و ڕۆژم. لە هەندێك لەخەونەکانمدا، لەگەڵ هەبوونی قاوقیژێکی تۆقێنەر، سڵاوم لەو ئۆرهانەی تر دەکرد. لە هەندێکی تریان، بە بێدەنگییەکی سامناك، چاومان بڕیبووە چاوی یەکدی. لەپاش ئەوەی لە خەو ڕادەچڵەکیم، دەمویست بەتوندی باوەش بە سەرین و ماڵ و گەڕەك و شوێنەکەم لەم جیهانەدا بکەم. هەر کاتێك دڵتەنگ بوومایە، بە خەیاڵ دەچوومە ماڵەکەی تر و ژیانەکەی تر، ئەو شوێنەی ئۆرهانەکەی تر تێیدا دەژیا. سەرباری هەموو شتێك، کەمێك خۆمم قایل دەکرد کە من هەر ئەوم و بەو خەیاڵەی کە ئەو زۆر شادومانە، خۆشیم دەبینی. بۆ ماوەیەك، ئەم هەستی خۆشبینینە پاڵی پێوە دەنام کە ئیتر پێویست نییە برۆم لە خانووەکانی تری بەشەکەی تری شارە خەیاڵییەکەم بەدوای ئەودا بگەڕێم.

لێرە بەدواوە، دەچینە ناو قووڵایی باسەکەوە: من هەرگیز ئەستەنبوڵ و خانوو و شەقام و گەڕەکەکانی منداڵیم جێ نەهێشتووە. هەرچەندە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لە گەڕەکی جیاواز ژیاوم، بەڵام لەدوای تەمەنی پەنجا ساڵییەوە، دیسان خۆمم لەپشتەوەی ئەپارتمانەکانی پاموك، ئەو شوێنەی یەکەم وێنەم تێیدا گیراوە و دایکم لەباوەشی گرتووم و دونیام پیشان دەدا، بینییەوە. بەردەوامبوونم بەم جۆرە، ڕەنگە بە هۆی هاوڕێ ئەندێشەییەکەم، (ئۆرهانەکەی تر)، یان ئەو ئارامییەی لە پەیوەندیی نێوانمان بەدەستم دەکەوت، بووبێت. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێستا لە ڕۆژگارێکدا دەژین، کۆچکردن و گەشتکردن زۆر باوە، هەندێك جار بۆم ئەستەم دەبێت بۆتانی ڕوون بکەمەوە کە بۆچی هەتا ئێستا هەموو ژیانم نەك لە هەمان شار، بەڵکو لە هەمان باڵەخانەدا بەسەر

بردووه. دەنگە خەمناکەکەی دایکم بیر دێتەوە، کە دەیگوت: "بۆچی کەمێك ناچیتە دەرەوە؟ بۆچی گۆڕینی شوێن تاقی ناکەیتەوە، یان گەشت بکەی ؟"

نووسەرانی وەکو کۆنراد، نابۆکۆڤ و نای پاول بە گەشتکردن بە ناو کلتوور و شارستانی و وڵاتە جیاوازەکاندا ناسراون و خەیاڵەکانیان بەو جۆرە پەرە پێ داون. خەیاڵەکانی منیش هەر چۆنێك بن، لە هەمان شار و کۆڵان و ماڵ و بینینی هەمان دیمەن هاتوونەتە بوون. چارەنووسی ئەستەنبوڵ چارەنووسی منیشە. من بەستراومەتەوە بەم شارەوە، چونکە ئەم شارە منی کرد بەوەی کە هەم.

گۆستاڤ فلاوبێر، کە ١٠٢ ساڵ بەر لە لەدایکبوونی من، سەردانی ئەم شارەی کردووە، هەمەچەشنیی ژیانی شەقامەکانی ئێرە، سەرسامی کردووە: لە یەکێك لە نامەکانیدا، پێشبینیی کردووە، ڕەنگە لە سەدەیەکدا ئەم شارە ببێتە پایتەختی جیهان. پێچەوانەی پێشبینییەکەی هاتووەتە دی. لەدوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەکان، جیهان خەریك بووە بەتەواوەتی، بوونی ئەستەبوڵ لەبیر بکات. ئەو شارەی چاوم تیایدا هەڵهێنا، لەچاو دوو هەزار ساڵی پێشووتری مێژوویی، هەژارتر و فەرامۆشکراوتر بووە و هەمیشە خەمی وێرانکاری و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی بەخۆیەوەی بینیوە. وەك هەر تاکێکی ئەم شارە، بە ململانێکردن لەگەڵ ئەم خەمە، ژیانم تێیدا گوزەراندووە.

هیچ نەبێت، تێڕامان لە خۆمان بۆ یەك جاریش لە ژیاندا، پاڵمان پێوە دەنێت، بڕوانینە ئەو بارودۆخەی چاومان تێیدا هەڵهێنا. بۆچی لە بەروار و گۆشەیەکی تایبەتی جیهان و لەدایك بووین؟ ئەو خێزان و شار و وڵاتەی یاریی چارەنووسمانی دیاری کردووە و چاوەڕێی خۆشەویستیمان لێ دەکەن، بەڵام ئایا ئێمە شایەنی باشترینین؟ هەندێك جار وەك بێبەختێك بیر لە خۆم دەکەمەوە کە لە شارێکی هەژاری داپۆشراو بە خۆڵەمێشی ئیمپراتۆرە ڕووخاوەکان لەدایك بووم. بەڵام دەنگێك لە ناخمدا هەمیشە ئاگادارم دەکاتەوە، کە ئەمەش بەڕاستی بەشێکە لە بەختێکی باش. ئەگەر بابەتی سامان بێت، من خۆم بە کەسێکی دەوڵەمەند لەقەڵەم دەدەم، کە لە خێزانێکی خانەدان و لە ڕۆژگارێکدا هاتوومەتە دونیاوە، کە شارەکە لەوپەڕی قەیران و داکشاندا بووە (هەرچەندە هەندێك بەپێچەوانەوە بیریان لێ کردووەتەوە). زۆر لەسەر گازندەکردن

ڕانەهاتووم، ڕازیم بەو شارەی لێی لەدایك بووم، هەر بەو جۆرەش لە لەشولاری خۆم (بۆ نموونە: ئەگەر بمەوێت لەوە زیاتر قۆزتر و لەشولارم جوانتر بێت)، ڕەگەزی خۆم (هەرچەندە بەساویلکەیی پرسیار لە خۆم دەکەم و دەڵێم لەوانەیە بۆ من باشتر بووایە، ئەگەر وەك ئافرەت لەدایك بوومایە) قایلم. ئەمە چارەنووسی منە و بە باسکردنی هیچ شتێك ناگۆڕێت، ئەم کتێبەش گرنگی بە چارەنووس دەدات.

لە نیوەشەوی ٧ی حوزەیرانی ١٩٥٢، لە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی بچووك، لە مۆدا چاوم بە دونیا هەڵهێناوە. بۆیان گێڕاومەتەوە کە ئەو شەوە هەموو داڵانەکانی نەخۆشخانەکە و تەنانەت هەموو جیهان ئارام بووە. تەنها ئەوەندە نەبێت لە دوو ڕۆژی پێشووتر، بڵێسەی ئاگر و خۆڵەمێش لەناکاو لە گڕکانەکانی سترامبۆلینی هەڵقوڵاون گوتراوە ڕەنگە ئەوەش نیشانەی ڕوودانی شتێك بێت لەسەر هەسارەکەمان. لاپەڕەی ڕۆژنامەکان پڕ کراون لە هەواڵ: کۆمەڵە بەسەرهاتێك دەربارەی ئەو دەستە سەربازە تورکانەی چووبوونە بەرەی جەنگ لە کۆریا، ئەو قسەوقسەڵۆکانەی ئەمەریکییەکان، بڵاویان دەکردنەوە و ترسی ئەوەیان لای خەڵك دروست دەکرد، کە کۆریای باکوور سەرقاڵی ئامادەکاریی بەکارهێنانی چەکی قورسە. چەند کاتژمێرێك پێش لەدایکبوونم، دایکم بەچاوچنۆکییەوە، هەوڵی زانینی ئەو بەسەرهاتە ناوخۆییانەی داوە: دوو ڕۆژ لەوەوپێش، پاسەوانان و دانیشتووانە (قارەمانەکانی) سەنتەری قوتابیانی کۆنیا، پیاوێکیان بە دەمامکێکی ترسێنەرەوە بینیوە کە ویستوویەتی لە پەنجەرەی گەرماوەکەوە بچێتە ناو ماڵێکەوە لە لەنگە، ئەمانیش بەناو کۆڵانەکاندا بەرەو مەیدانی داروتەختە فرۆشتن ڕاویان ناوە، لەپاش ململانێیەکی زۆر لەگەڵ پۆلیس، تاوانبارە بێبەزەییەکە هەر لەوێ خۆی کووشتوە. یەکێك لە فرۆشیارەکانی کەلوپەلی وشکە، تەرمی تاوانبارەکەی وەك یەکێك لەو دەستەی چەتانە ناسیوەتەوە کە بە هەمان شێوە، چەند ساڵێك پێشتر بە چەکەوە هێرشیان کردووەتە سەر فرۆشگاکەی و دزییان لێ کردووە.

چەند ساڵ دواتر، دایکم بەتەنیا لە ژوورەکەیدا، بە دەنگێکی پەشیمانی و بێزارییەوە کۆتاییەکانی ئەم درامایەی بۆ دەگێڕامەوە. لەپاش ئەوەی منداڵبوونەکەی کەمێك دوا کەوتووە، باوکم بەدیار دایکمەوە ئۆقرەیی لێ بڕاوە و لە نەخۆشخانە چووەتە

دەرەوە بۆ لای هاوڕێکانی. لەو دەمەدا، تاکە کەس لەلای لە ژووری منداڵبوون، پوورم بووە، کە لە نیوەشەودا بەسەر دیواری باخچەی نەخۆشخانەکەوە، خۆی گەیاندووەتە لای دایکم. یەکەم جار کە دایکم چاوی بە من کەوتووە، زۆر لاوازتر و وردیلانەتر بووم لەچاو براکەی ترم.

هەست دەکەم پێویست نەکات هیچی تر بۆ ئەوەی بۆم گێڕدراوەتەوە، زیاد بکەم. لە زمانی تورکیدا، ئێمە ئەو جۆرە دەربڕینە تایبەتییەکەمان هەیە، کە بە هۆیەوە دەتوانین جیاوازی لەنێوان ئەوەی بیستوومانە و ئەوەی بە چاوی خۆمان بینیومانە، بکەین. کاتێك کە خەونێك یان چیرۆکێکی ئەفسانەیی، یاخود ڕووداوێکی ڕابردوو بەیەکەوە دەگێڕینەوە و هیچ گەواهیدەدەرێکمان نییە بۆ گوتنەکەمان، ئێمە ئەم شێوازە دەربڕینە بەکار دێنین. ئەمەش جیاوازییەکی زۆر باشە بۆ وەبیرهێنانەوەی ئەزموونی ژیانی پێشوومان، لانکەی منداڵی، یەکەم هەنگاومان هەموو ئەمانە لەلایەن خێزانەکەمانەوە تۆمار کراوە و هەموو ئەو چیرۆکانەی تر لە دەمی خەڵکی ترەوە بیستوومانن. بینینی خۆمان بەو جۆرە لە خەونەکانماندا، هەستێکی شیرینمان پێ دەبەخشێت، بەڵام ئەوەش بە بەهایەکی گران دەکرێت. ئەوەی کە خەڵکی لەبارەی ئێمەوە تۆماریان کردووە، زیاتر لەوەی کە خۆمان بەبیرمان دێتەوە، لەناو مێشکماندا دەچەسپێت. هەر بەو چەشنەی کە ڕابوردووی ژیانی خۆمان لە دەمی خەڵکی ترەوە بیستووە، دەبێت ڕێگە بە کەسانی تر بدەین، کار لە تێگەیشتنمان لەبارەی ئەو شارەی کە لێی دەژین بکەن.

لەو کاتەوەی چیرۆکی ژیانی خۆم و شارەکەم لە دەمی خەڵکە ترەوە بیستووە، پێی ڕازی بووم و تێکۆشاوم، خۆم فریو بدەم بە وتنی "ڕۆژێك لە ڕۆژان خولیای نیگارکێشانم هەبووە. لە ئەستەنبوڵ لەدایك بووم و منداڵێکی زرنگ بووم. کاتێك تەمەنم بیست و دوو ساڵ بووە، نازانم لەبەر چی دەستم کردووە بە نووسینی ڕۆمان؟" ئارەزووم بووە بە جۆرێك ژیانی خۆم بهۆنمەوە، وەك ئەوەی ژیانی کەسێکی تر بووبێت و بیکەم بە چیرۆك، یان هەر وەك ئەوەی خەونێك بووبێت و تێیدا دەنگم دەرنەیەت و هەموو ویستەکانم چووبێتنە ژێر ڕکێفێکی جادووییەوە. ئەو شتانەی ژیان بۆ مرۆڤ ئامادەیان دەکات، وەك ڕووداوی ئەم چیرۆکە، ناتوانن من قایل بکەن، چونکە بۆ

کەسانی وەکو من، ئەگەر بیانەوێت لە ژیانی دووەمیان بژین، تەنها حەز دەکەن کتێبێك بگرنە دەستیان کە خۆیان نوسیووییانە و ژیانی خۆیانە، ئەوەش دەکەوێتە سەر خوێنەر، ئایا ئەو کتێبە بە ڕاستی و دروستی دەخوێنێتەوە یان نا!

٢

# وێنەکانی ناو مۆزەخانە تاریکەکەی خانووەکە

لەگەڵ دایکم و باوکم و براکەم و داپیرەم و مامەکانم و پوورەکانم، هەموومان پێکەوە لە باڵەخانەیەکی پێنج نهۆمی و لە نهۆمی جیاوازدا دەژیاین. هەتاوەکو ساڵێك پێش لەدایکبوونم، هەموو خێزانەکە پێکەوە، هەر وەك خێزانە گەورەکانی عوسمانی، لە کۆشکێکی بەردیندا پێکەوە ژیاون. لە ساڵی ١٩٥١، ئەو کۆشکەیان بەکرێ داوەتە قوتابخانەیەکی سەرەتایی تایبەت و لەسەر ڕووبەرێکی بەتاڵ و لەسەر شێوازێکی مۆدێرن، بینایەکیان دروست کردووە و بەشانازییەوە لە بەشی پێشەوەی نووسیویانە (ئەپارتمانەکانی پاموك). ئێمە لە نهۆمی چوارەم دەژیاین. بەڵام من هەر ئەوەندەی گەورە بووم و لە باوەشی دایکم هاتمە خوارەوە، ئەمسەر و ئەوسەری هەموو باڵەخانەکەم دەکرد. لەبیرمە لە هەر نهۆمێك، پیانۆیەك دانرابوو. مامە زوگورتەکەم، لەپاش ئەوەی وازی لە کاری ڕۆژنامەنووسی هێنا و هاوسەرگیریی کردەوە، هاوسەرە نوێیەکەی بە پیانۆکەوە لە نهۆمی یەکەمی باڵەخانەکە، کە نیوەی تەمەنی بە سەیرکردنی دەرەوە لە پەنجەرەکەی ئەوێ بەسەر برد، نیشتەجێ بوو. نە ئەم پیانۆیە و نە پیانۆکانی تریش، هەرگیز کەس نەیژەنیبوون. ڕەنگە ئەمەش هۆکارێکی تری هەستکردنم بە دڵتەنگی بوو‌بێت لەو ماڵەدا.

بەڵام لێرە، تەنها پیانۆی نەژەنراوی لێ نەبوو، بەڵکو لە هەر نهۆمێك، دۆڵابی داخراوی شووشەیی تێدا بوو کە بە قاپی فەخفوری و کوپی چای و تاقمی زیوی و شەکردان و قوتووی بڕنووتی و قاپی پلێت و پەرداخی کریستاڵ و تەپڵەکی بخورد

سووتاندن ڕازێنرابوونەوە، کە هەرگیز هیچ دەستێکیان بەر نەکەوتبوو. هەندێك جار لەنێوان هەموو ئەم کەلوپەلانەدا، شوێنی شاراوەم دەدۆزییەوە بۆ حەشاردانی ئۆتۆمبێلە بچووکەکانم. لە ژوورەکاندا مێزی تێدا بوو کە بە پۆشەرێکی ڕازاوە بە مرواری و ئەستێرەی دەریا داپۆشرابوو، کە ئەوانیش تەنها بۆ جوانی دانرابوون. چەند ڕەفەیەکیش هەبوون کە هیچ پۆشەرێك بەسەریانەوە نەبوو، لەپشت ئەوانیشەوە شاشەی ژاپۆنی و نەخشی نۆقۆ هەبوو کە لەپشتیانەوە هیچ شتێك شاراوە نەبوو. لەناو کتێبخانەکەشدا، کە تۆزێکی زۆر نیشتبوو بەسەر هەموو کتێبەکانیەوە کتێبێکی پزیشکیی مامە پزیشکەکەم هەبوو، کە لە بیست ساڵییەوە کۆچی کردبوو بۆ ئەمەریکا، هەر لەو کاتەوەی کۆچی کردبوو، کەس دەستی بەری نەکەوتبوو. لەو دەمەدا وەك منداڵێك، پێم وا بوو ئەو ژوورە ڕەنگ مردووانە، بۆ ژیان نەڕازێنراونەتەوە. (هەموو خولەکێك، مێزێکی قاوە یان سندووقێکی نەخێشنراو لە ژووری دانیشتنی نهۆمێکەوە دەبرا بۆ ژووری دانیشتنی نهۆمێکی تر).



داپیرەم ئەگەر بیزانیایە لەسەر قەنەفە دەزوو زیوییەکانی بەباشی دانەنیشتووین، ئاگاداری دەکردینەوە و دەیگوت: "ب جوانی دابنیشن!" ژووری دانیشتنەکان، شوێنی حەسانەوە و وچاندان نەبوون، جگە لەوەی وەك مۆزەخانەیەکی بچووك ڕازێنرابوونەوە، بۆ ئەوەی پیشانی میوانە مۆرك ڕۆژئاواییەکان بدرێن. (لە ڕەمەزاندا ئەو کەسەی بەڕۆژوو نەدەبوو و لەناو ئەو دۆڵابە شووشەیی و پیانۆ مردووانەدا دانیشتبوو، ڕەنگە ئازاری ویژدانی لەو کەسە کەمتر بووبێت، کە قاچ لەسەر قاچ لە ژوورێکی پڕ لە سەرین و

قەنەفەدا دانیشتبێت) هەرچەندە هەمووان ئەم شێوازەی وەك ئازادبوون لە یاساکانی ئیسلام دەناساند، بەلاّم بەتەواوی دلّنیا نەبوو، شتێکی تر جگە لە ڕۆژئاوایبوون بەکەلّکیان دێت. مالّەکەی ئێمە، تاقە خانووی خێزانێکی دەولّەمەند نەبوو لە ئەستەنبولّ کە ژووری دانیشتن وەك مۆزەخانەیەك بێت. پەنجا سالّی تر دەبینین کە چۆن ئەم کاریگەرییە تاریکەی خۆرئاواییەکان (بەلاّم هەندێك جاریش شاعیرانە)، لە ژووری دانیشتنی هەموو مالّێکی تورکیا ڕەنگی داوەتەوە. لەپاش سالّی ١٩٧٠ تەلەڤزیۆنەکان، ژووری دانیشتنەکانیان لە مۆزەخانەیەکی بچووکەوە گۆڕی بۆ سینەمایەکی بچووك. ڕۆژێك خەلّکی دەزانن ئەو ساتانە کە پێکەوە بەدیار تەلەڤزیۆنەکانەوە دادەنیشتن و سەیری هەوالّەکانی ئێوارانیان دەکرد، چەندە چێژبەخش بوون. سەرباری ئەوەش، هەتا ئێستا هەندێك لە خێزانەکان، تا ئێستاش تەلەڤزیۆنەکانیان لە هۆلّی ناوەند دادەنێن و دەرگای ژووری میوانەکانیان داخستووە، تەنها لە کاتی پشوو یان بۆ میوانی تایبەت دەیکەنەوە.

هەر وەکو کۆشکی عوسمانییەکان، دەرگاکانی بالّەخانە مۆدێرنەکەمان بەزۆری کراوەبوون و هاتوچۆ لەنێوانیان هەبوون. ئەو دەمانەی براکەم لە قوتابخانە بوو، دایکم ڕێگەی پێ دەدام بەتەنیا بچمە نهۆمەکانی ترەوە، یان پێکەوە بەیانیان سەردانی داپیرەمان کە هێشتا لەسەر نوێنەکەی ڕاکشابوو، دەکرد. پەردەکانی ژووری دانیشتنەکەی داپیرەم هەمیشە دادرابوونەوە، هەرچەندە گۆڕانێکی ئەوتۆ ڕووی نەدەدا، چونکە بالّەخانەکەی تەنیشتمان ئەوەندە نزیك بوو، ژوورەکەی تاریك کردبوو. لەسەر مافوورە قورس و گەورەکانی ژوورەکەی گەمەم دەکرد. هەموو ئۆتۆمبێلەکانم دانەبەدانە ڕیز دەکردن. دواتر لە گەمەکەمدا، مافوورەکان دەبوونە دەریا و کورسی و مێزەکانیش دوورگە بن، بەخێرایی لە یەکێکیانەوە بۆ یەکێکی تریان دەجوولاّم، بەبێ ئەوەی دەستم بەر ئاو بکەوێت (هەروەك کالڤینۆس بارن کە هەموو ژیانی لەم چلّ بۆ ئەو چلّی درەختەکان بەڕێ کرد، بەبێ ئەوەی دەستی بەر زەوی بکەوێت). کاتێك تەواو لە یاریی فڕۆکەوانی و ئەسپسواریی سەر قەنەفەکان (ڕەنگە ئەم گەمەیان لە ئەسپ و عارەبانەکانی هەیبەلەدییەوە فێر بووبێتم) وەڕەس و ماندوو دەبووم، یارییەکی هەرزەکارانەم دەکرد: ئەو شوێنەی لێی دانیشتووم کە ڕەنگە ژووری خەوتن، ژووری

دانیشتن، پۆل، سەربازگە، ژووری نەخۆشخانە یان دەزگایەك بوویێت، دەگۆڕی بۆ هەر شوێنێك کە بە خەیاڵمدا دەهات. دوای ئەوەی لەو داڵغانەش بێزار دەبووم، سەرنجم دەخستە سەر هەموو ئەو وێنانەی لەسەر هەموو مێز و کورسی و دیواری ژوورەکەدا دەردەکەوتن.

دڵنیام، تەنانەت پیانۆکانیش بۆ ئەوەی وێنەکان زیاتر بخەنە بەرچاوان، دانرابوون. هیچ وێنەیەك لە ژووری دانیشتنەکەی داپیرەم نەبوو، چوارچێوەی بە قەبارەی گەورە و بچووکەوە نەبێت. لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر، ئەو دوو وێنە گەورەیە بوون کە لەسەر ئاگردانە کارپێنەکراوەکە هەڵواسرابوون. یەکێك لەو وێنانە، داپیرەم بوو و ئەوی تریشیان باپیرەم بوو کە لە ١٩٣٤ کۆچی دوایی کردبوو. هەر کەسێك بچێتە ئەو ژوورەوە، بە شێوازی هەڵواسینی وێنەکان لەسەر دیوارەکە و ڕوانینی لووتبەرزانەی داپیرەم و باپیرەم (هەر وەکو پادشا و شاژنی ئەورووپا لە کاتی واژووکردنی دەسەڵاتەکەیان)، بۆی ڕوون دەبێتەوە کە چیرۆکەکە لە مانەوە دەست پێ دەکات.

هەردووکیان خەڵکی شارۆچکەیەك بوون لەنزیك مانیسا، پێی گوتراوە گۆردێس. لەبەر زەردیی پێستیان و قژی سپییان، خێزانەکەیان بە پاموك (لۆکە) ناسراوە. دایکی باوکم، لە شێرکاسیان بووە (کچی شێرکاسییەکان لە حەریمی عوسمانییەکان ناویان بەجوانی و باڵابەرزی دەرکرتبوو). داپیرەی باوکم لە کاتی جەنگی نێوان ڕووسیا و عوسمانی لە (١٨٧٧-١٨٧٨) کۆچی کردووە بۆ ئەنادۆڵ یەکەم جار لە ئیزمیر ماوەتەوە و دواتر چووە بۆ ئەستەنبوڵ کە هەر لەوێ باپیرەم ئەندازیاری شارستانیی تەواو کردووە. کاتێك کە کۆماری نوێی تورکیا دەستی کردووە بە خستنەگەڕی ڕێگای شەمەندەفەر، باپیرەم کارگەیەکی گەورەی بنیات ناوە کە گوریسی بۆ وشککردنەوەی توتن دروست کردووە. کارگەکەی لەسەر ڕۆخی ڕووباری گۆکسو بووە کە دەڕژایە بۆسفۆرەوە. باپیرەم لە ساڵی ١٩٣٤ لە تەمەنی پەنجا و دوو ساڵیدا، کۆچی دوایی کردووە و سامانێکی زۆری لەپاش خۆی بۆ باوکم و مامم جێ هێشتووە، کە هەرگیز بە هیچ ڕێگایەك کۆتایی پێ نەدەهات، سەرەڕای هەموو شکستە داراییەکانیان.

بڕۆین بەرەو ژووری کتێبخانەکە. لەوێ کۆمەڵێك وێنەی نەوەکانی خێزانەکە هەبوو کە هەریەکەیان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لەسەر دیوارەکە جێگیر کرابوو. ڕەنگی وێنەکان، پیشانی دەدا کە هەموو وێنەکان لەلایەن یەك وێنەگرەوە گیراون. لە لایەکی

تری دیوارەکەوە، وێنەیەکی مامە قەڵەو و چالاکەکەم، مامە ئۆزهان هەبوو کە بەبێ تەواوکردنی خزمەتی سەربازی، بۆ خوێندنی پزیشکی ڕۆشتبوو بۆ ئەمەریکا، لەبەر ئەوە هەرگیز نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ تورکیا. بەو جۆرە، داپیرەم ئەو تەمەنەی مابووی، بەماتەمینییەوە بەدیار وێنەکانەوە دەیبردە سەر. وێنەیەکی تری مامە عەینەك لە چاوەکەم، مامە ئایدن هەبوو، کە ئەویش وەك باوکم ئەندازیاری شارستانیی تەواو کردبوو و زۆربەی تەمەنی بە سەرقاڵبوون بە پرۆژەکانیەوە بەسەر دەبرد. لە دیواری چوارەم، وێنەی خوشکی باوکم هەبوو کە ماوەیەك بۆ خوێندنی دەرسی پیانۆ چوبوو بۆ پاریس. هاوسەری ئەم پوورەشم، یاریدەدەر بوو لە کۆلێژی یاسا، کە لە باڵەخانەیەکی نایاب دەژیان کە دوای چەند ساڵێك گواستمەوە بۆ ئەوێ و هەر لەوێش ئێستا ئەم کتێبە دەنووسم.

ژووری کتێبخانە جێ بهێڵین و بگەڕێینەوە بۆ ژووری مۆزەخانەکە. کەمێك لای گڵۆپە کریستاڵییەکانەوە بوەستین، کە تەنها بۆ تاریکییەکە زیاد کرابوون، جەنجاڵییەکی زۆری وێنە ڕەشوسپییە دەستلێنەدراوەکان دەبینین کە پێیان دەگوترێ ژیان تەوژمێکی خێرایە. لە وێنەکاندا، نەوەکان دەبینین کە لە نیشانەکردنی هاوسەرگیرییەکان و ساتە خۆشەکانی تری ژیانیان وەستاون. لەتەنیشت ئەو وێنە ڕەنگاوڕەنگانەی کە مامم لە ئەمەریکاوە ناردبوونی، چەند وێنەیەکی خێزانێکی گەورە هەبوو کە لە پارکە جیاوازەکانی شارەکە و گۆڕەپانی تاقسیم و کەنارەکانی بۆسفۆر، پێکەوە پشووەکەیان بەسەر دەبرد و چێژیان لە ساتەکانی خوانەکەیان وەردەگرت. لەتەنیشت وێنەکەی من و براکەم و دایکم و باوکم کە لە ئاهەنگی هاوسەرگیرییەك گرتبوومان، دوو وێنەی تر هەبوون: یەکێکیان باپیرەم بوو کە لەتەنیشت ئۆتۆمبێلەکەیەوە لە باخچەی خانووە کۆنەکەمان ڕاوەستابوو و ئەوی تریشیان وێنەی مامم بوو کە ئەویش لەتەنیشت ئۆتۆمبێلە نوێیەکەی، لە دەروازەی دەرەوەی باڵەخانەکانی پاموك ڕاوەستابوو. هەموو وێنەکان بەجێگیری لە شوێنی خۆیان لە مۆزەخانەکە دانرابوون، بە هۆی چەند ڕووداوێکی نەخوازراوەوە نەبووایە، لە شوێنی خۆیان نەدەجووڵان و دەستکاری نەدەکران. بۆ نموونە: ڕۆژێکیان داپیرەم وێنەی یەکەم هاوسەری مامەکەی ئەمەریکامی لا برد و وێنەی هاوسەری دووەمی لە جێگەی دانا. هەرچەندە سەدان جار سەیری ئەو وێنانەم کردبوو، بەڵام هەرگیز بەهەڕەمەکی لە ژوورەکە نەدەچوومە دەرەوە، هەتا جارێکی تر سەیری وێنەکانم نەکردایە.



خوێندنەوەی زۆرم بۆ ئەم وێنە گیراوانە وای لێ کردم، هەڵسەنگاندن بکەم بۆ گرنگیی مانەوەی ساتە تایبەتەکان لەسەر نەوەی داهاتوو، لە هەمان کاتدا بۆم دەرکەوت کە ئەم دیمەنە لە چوارچێوە نراوانە، چەند کاریگەرییان هەیە لەسەر ژیانی داهاتوومان. بە سەیرکردنی وێنەیەکیان کە مامم لەتەنیشت براکەم وەستاوە و هاوکێشەیەکی بیرکاریی بۆ شی دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا سەیری وێنەیەکی تریانم دەکرد کە سی و دوو ساڵ لەوەوبەر گیرابوو، بینینی وێنەیەکی باوکم کە لە وێنەکەدا سەیری ڕۆژنامە دەکات و هەڵ دەدات کەمێك زەردەخەنە بکات، بۆ ئەوەی فریای نوکتە و قسەی خۆشی ناو ژووره قەرەباڵغەکە بکەوێت. هەروەها لەگەڵ سەیری وێنەیەکی تری باوکم دەکرد کە لە تەمەنی پێنج ساڵی –تەمەنی ئەو کاتەی من کە سەیری وێنەکانم دەکرد– قژێکی درێژی هەبوو وەك قژی کچ، دەمزانی کە داپیرەم بۆ ئەوەی هەموو ئەو بیرەوەرییانە زیندوو بکاتەوە و پیشانی ئێمەیان بدات، بەو جۆرە لە چوارچێوەی ناون. کاتێك داپیرەم بە تۆنێکی تەواو ئاسایی هەستەکانی دەشاردەوە، باسی باپیرەمی بۆ دەکردم کە بەگەنجی مردووە. کاتێك ئاماژەی دەدا بە چوارچێوەکانی سەر دیوار و مێزەکان، وا دیار بوو داپیرەم _وەك من_ لەسەر دوو ئاڕاستە وەستابوو، دەیویست بەردەوام بێت لەم ژیانە، بەڵام بەهیوای بەدەستهێنانی ساتی خۆش و چێژبەخش. ئەگەر تۆ ساتێکی تایبەت لە ژیانت وەربگریت و لە چوارچێوەی بگری، ئایا ئەو کاتە بەرەنگاری مەرگ و لەناوچوون یاخود ڕێڕەوی ژیانت دەبیتەوە؟ یان خۆت بەدەستەوە دەدەی؟ هەر کات بیرم بەو شتانەوە ئاڵۆز دەبوو، تەواو وەڕەس و پەست دەبووم.

هەموو جار کە دەڕۆشتم بۆ بەزمورەزمی خوانی نیوەڕۆ و ئێوارانی جەژنی سەری ساڵی تازە کە هەموو خێزانەکە ماوەیەکی زۆر پێکەوە لەسەر سفرەی خوانەکە کەیفیان دەکرد و دواتریش یاریی لۆتۆ دەهاتە کایەوە، سوێندم دەخوارد ئەوە کۆتا جارم بێت بچم بۆ ئەو ئاهەنگانە، بەڵام نەمدەتوانی نەریتەکان بشکێنم. کە بچووك بووم، حەزم لەو جۆرە ئاهەنگی خوانە خێزانییانە هەبوو. کاتێك بەدەوری مێزە قەرەباڵغەکاندا دەسووڕامەوە و سەیری گاڵتەوگەپی خەڵکەکە، پێکەنینی مامم (کە مەی مەستی کردبوو)، زەردەخەنەی داپیرەم ( لەژێر کاریگەریی پەرداخی بچووکی بیرەدا) دەکرد، هیچ شتێکی تر بە خەیاڵمدا نەدەهات، جگە لە بینینی ئەو ڕاستییەی کە ژیانی دەرەوەی ئەو چوارچێوانە چەندە خۆشە. هەستم دەکرد بە بوونی خێزانێکی وەها گەورە و دڵخۆش و ئەو خەیاڵەی ئێمە بۆ کەیفکردن هاتووینەتە ئەم ژیانەوە، ئاسوودەییان پێ دەبەخشیم. بێئاگا بووم لەوەی کە لەپاڵ ئەم خوان و پێکەنین و کەیفکردنەی پشووەکانی خزمەکانمان، چەندین شەڕ و دەمەقاڵێی لەسەر پارەوپول بوونیان هەیە. دایکم، هەمیشە بەنهێنی لە ماڵی خۆمان لەبارەی دڵڕەقییەکانی پوورم و مامم و داپیرەم، گازندەی لەلای من و براکەم دەکرد. هۆکاری زۆربەی مشتومڕەکانیش لەسەر ئەوە بوو، کێ خاوەنی گوریسەکانی کارگە بێت و چۆن دابەشیان بکەن لەنێوانی خۆیان. یان لەسەر نهۆمەکانی باڵەخانەکە بوو کە کێ لە کام نهۆم نیشتەجێ بێت. تاکە شتی دڵنیاکەرەوە ئەوە بوو کە هەرگیز خێزانەکە لەسەر بڕیارێك پێك نەدەهاتن. هەموو ئەم ناکۆکییانە، لەسەر مێزی نانخواردنی پشووەکان لەبیر دەچوونەوە. بەڵام هەر لە تەمەنێکی کەمی منداڵیمەوە، هەستم کرد کە لەپشت هەر شادی و خۆشییەك، هێندەی شاخێك نائاسوودەیی و دەریایەك سەرزەنشتکردنی یەکتر هەبوو.

هەر لقێکی خێزانە گەورەکەمان، خزمەتکاری تایبەت بە خۆی هەبوو. خزمەتکارەکانیش دەبووایە لە کاتی شەڕکردندا، لایەنگریی ئەو خێزانە بگرن کە کاریان بۆ دەکرد. ئەسما خاتوون خزمەتکاری دایکم بوو و ناوەناوە سەردانی ئقبالی دەکرد، کە خزمەتکاری ئامۆژنم بوو. دواتر لەسەر مێزی نانخواردنی بەیانیان، دایکم پرسیاری لێ دەکرد و دەیگوت: "گوێت لە قسەکانی ئایدنەکان گرت، چییان دەگوت؟"

باوكم خۆی هەڵدەقورتاند بۆ ئەوەی بزانێت باسەكە چییە، بەڵام كاتێك بە باسەكەی دەزانی، دەیوت: "بۆ خاتری خوا، ئیتر وا زیێنە، كەم نیگەرانی ئەم شتانە بە." ئینجا سەری دەخستەوە سەر ڕۆژنامەكەی دەستی.

هەروەك بەمنداڵی پەیم بە هۆكاری دەمەقاڵێكان بردبوو كە بوونە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەو خێزانەم كە پێشتر هەموویان لە كۆشكێكی عوسمانی پێكەوە دەژیان، بە هەمان شێوەش، هەستم بە موفلیسبوون و نەگەڕانەوەی باوكم بۆ ماڵەوە كردبوو. هەر كات دایكم، من و براكەمی دەبرد بۆ لای داپیرەكەی ترم، لە خانووە تارمایی ڕەنگەكە لە شیشیلی، ئەوكات زیاتر گوێبیستی هەواڵە ناخۆشەكان دەبووم. كاتێك من و براكەم خەریك دەبووین بە گەمەكردنەوە، دایكم لای داپیرەم سكاڵای لە باوكم دەكرد و داپیرەشم لەسەرخۆ ئامۆژگاری دەكرد. هەردەم ترسی ئەوەم هەبوو، دایكم لەم خانووە تۆزاوییە سێ ژوورییەدا بمێنێتەوە. داپیرەم، كە بەتەنیا لەوێ دەژیا، جارجار سەرنجی ڕادەكێشاین بۆ هەندێك لە كەموكوڕییەكانی ماڵەكەی.

بەڵام من زۆر گلەییم لە باوكم نەبوو، كە هەمیشە ڕووخسار و بیركردنەوەكانی، دڵخۆشییەكی منداڵانەی پێوە دیار بوو. بەدەم فیكەلێدانەوە، لە ماڵەوە لە ئاوێنە سەیری خۆی دەكرد و ناوەناوەش لەتێك لیمۆی وەك ڕۆن بۆ بریسكەداركردنی قژی، دەدا لە سەری. حەزی لە نوكتە و قسەی خۆش و خوێندنەوەی هۆنراوە و بەرنامەڕێژی بۆ گەشتی دوور بوو. هەرگیز باوكم، سەرزەنشتكردن و قەدەغەكردن و سزادانی نەبوو. كاتێك كە دەیبردینە دەرەوە، بە هەموو شارەكەدا دەیگەڕاندین و هاوڕێی نوێی پێ دەناساندین. لەمیانەی گەشتەكانم لەگەڵ باوكم، پەیم بەوە دەبرد كە ئەم جیهانە تەنها شوێنی كەیف و سەفایە.



هەر کاتێك بەتەواوەتی تووڕە و پەست بووایە، هەموو کاردانەوەیەکی ئەوە بوو، ڕووی وەردەگێڕا و بێدەنگ دەبوو. ئەوە دایکم بوو لە ماڵەوە یاسای دادەنا، برۆکانی گرژ دەکرد و لەسەر ڕووە تاریکەکەی تری ژیان ڕایدەهێناین. من تا ئێستاش زۆر پشتم بە خۆشەویستی و گرنگیپێدانەکەی ئەو بەستووە، چونکە ئەو لە باوکم زیاتر کاتی هەبوو لەگەڵمان بەسەری بەرێت. باوکم هەمیشە بەدوای هەلێکدا دەگەڕا تا لە باڵەخانەکە هەڵبێت و بڕواتە دەرەوە. قورسترین دەرسی من لە ژیاندا، پێشبڕکێکردن بوو لەگەڵ براکەم، بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی و گرنگیپێدانی دایکم.

هەموو ململانێی و ڕکابەرییانە لەگەڵ براکەم بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستیی دایکم، لەوانەیە بە هۆی ئەوەوە بوبێت کە باوکم دەسەڵاتێکی کەمتری هەبوو لە ماڵەوە. هەرچەندە هیچکاممان سەبارەت بە دەروونناسی، هیچ شتێکمان نەدەزانی، بەڵام شەڕەکانمان وەك جۆرە یارییەك لێکردبوو، لە یارییەکەدا ئۆرهان و شەوکەت بەتوندی ڕووبەڕووی یەك نەدەبوونەوە، بەڵکو خۆمان دەکرد بە کەسانی تر، بۆ نموونە" خۆمان دەکرد بەو قارەمانانە یان ئەو یاریزانەی کە خۆشمان دەویستن. ڕۆڵی پاڵەوانەکانی خۆمان دەگێڕا، بەم جۆرە بەردەوام دەبووین. بەڵام کاتێك یارییەکەمان یاخود شەڕەکەمان بە بریندارکردن، فرمێسك ڕشتن، تووڕەیی و ئیرەی کۆتایی پێ دەهات، لەبیرمان دەچوو کە ئێمە دوو برای ڕاستەقینەی یەك بین.

هەر کات دڵتەنگ یان بێزار بوومایە، ئەو شوێنەم بەبێدەنگی جێ دەهێشت و دەڕۆشتمە نهۆمی خوارەوە بۆ لای کوڕە مامەکەم و گەمەم لەگەڵدا دەکرد، یان دەڕۆشتم بۆ نهۆمی سەرەوە بۆ لای داپیرەم. هەرچەندە هەموو نهۆمەکان زۆر لە یەك دەچوون، کورسی، مێزی نانخواردن، قاپی شەکر و تەپڵەکی جگەرە، هەموویان لە یەك دوکان کڕدرابوون، بەڵام هەر نهۆمێك بۆخۆی وەك وڵاتێکی جیاواز و جیهانێکی جیا بوو لەوانی تر. کاتێك لە ژووری دانیشتنە خەمگینەکەی داپیرەم بووم، بەتایبەت کاتێك لەژێر سێبەری مێزی قاوە، دۆڵابی شووشەیی، گوڵدان و وێنە لە چوارچێوە نراوەکاندا بووم، وا خەیاڵم دەکرد لە شوێنێکی تر بم.

 

سەرلەئێواران، کاتێك هەموومان وەك خێزانێك کۆ دەبووینەوە، زۆر جار من خۆم خەریکی گەمە دەکرد و وام دەهێنایە پێشچاوی خۆم، کە نهۆمەکەی داپیرەم، پردی پەڕینەوەی کەشتییەکی گەورەیە. ئەو کەشتییانەی بەناو بۆسفۆردا تێدەپەڕین و دەنگی هۆڕینە خەمگینەکانیان ئاوێتەی بیرکردنەوەکانم دەبوون و دەبوونە سەرچاوەی ئەو جۆرە خەیاڵانە. لە خەیاڵەکەمدا، بەناو گەردەلوولدا دەڕۆشتین، کاتێك دەستەی دەریاوانەکانم و سەرنشینەکانم ڕووبەڕووی هێرشی شەپۆلەکان دەبوونەوە، ڕۆڵی کاپتنێکی سەربەرزم وەردەگرد، چونکە دەمزانی چارەنووسی کەشتییەکە و خێزانەکەم لە دەستی مندایە.

هەروەك چۆن سەرکەشییە هەزەلییەکانی براکەم دەبوونە سەرچاوەی خەیاڵەکانم، بە هەمان شێوە بیرکردنەوەکانم دەربارەی خودا کاریگەرییان هەبوو لەسەرم. وا بیرم دەکردەوە، لەبەر ئەوەی ئێمە دەوڵەمەندین، خودا نەیبەستووینەتەوە بە چارەنووسی شارەکەوە. بەڵام بە هۆی ئەوەی باوکم و مامم تووشی کۆسپك هاتن، بە هۆی موفلیسبوونە یەك لەدوای یەکەکانیان، هەروەها لەناوچوونی سامانەکەمان و جیابوونەوەی خێزانەکەم لە یەکتری و زیادبوونی شەڕەکانی نێوانیان، هەموو جارێك سەردانەکەم بۆ لای داپیرەم دەبوویە ناخۆشی و هەنگاوێك زیاتر لە ڕاستییەکان نزیکتر دەبوومەوە. لەو ڕۆژگارەدا، بە هۆی ڕووخانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی، هەورێکی تاریك ئاسمانی ئەستەنبوڵی گرتبوو، لە کۆتاییدا کاریگەریی لەسەر خێزانەکەی منیش هەبوو.

# ٣

# مــــن

ئەو کاتەی من پێم نایە چوار ساڵی تەمەنمەوە، براکەم لە شەش ساڵیدا چوویە قوتابخانە. لە دوو ساڵی دواتر، پەیوەندیی تیژڕۆی نێوانمان هێدی هێدی بەرەو کەمبوونەوە دەچوو و ئیدی لە بەربەرەکانییەکانی نێوانمان و لەدەست ستەمەکانی براکەم، چونکە ئەو لە من بەهێزتر بوو، ڕزگارم دەبوو. چێژم لە خۆشیی تەنیاییەکەم دەبینی و بە درێژای ڕۆژەکە بەتەنها خۆم خاوەنی ئەپارتمانەکانی پاموك و سۆز و بایەخی دابەشنەکراوی دایکم بووم.

ئەو کاتانەی براکەم لە قوتابخانە بوو، سەرکەشییە هەزەلییەکانی ئەوم دووبارە دەکردنەوە و دەکۆشام ئەو شتانە بخوێنمەوە کە پێشتر بۆی خوێندبوومەوە. ڕۆژێکیان، لە پاشنیوەڕۆیەکی فێنك و خۆش، لەناو جێگاکەم ڕاکشابووم هەتا سەرخەوێك بشکێنم، بەڵام کە زانیم خەوم نایە، ڕووم کردە سەرکەشییەکانی تۆم میکس. دواتر هەستم کرد ئەو شتەی دایکم پێی دەگوت، (بیبییەکەم) ڕەق دەبێت، هەروەها تەماشای وێنەی هیندییەسوورێکی نیمچەڕووتم دەکرد کە چەند پەتێکی پێچاندبوو بەدەوری ناوقەدیدا، هەروەها پارچەیەکی ڕێکی سپی وەك ئاڵا، لە بەشی پێشەوەی ڕانی شۆڕ بووبوویەوە بۆ خوارەوە.



دوانیوەڕۆیەکی تر کاتێك بە بیجامەوە لەژێر سەرچەفەکە ڕاکشابووم و لەگەڵ بووکەڵە ورچەکەم قسەم دەکرد، لەناکاو هەستم بە هەمان ڕەقبوون کرد. سەیر ئەوە بوو ئەم ڕووداوە نامۆ و جادووییە، لە هەمانکات دا چێژبەخش، ڕێك لەدوای ئەوە ڕووی دا کە بە ورچەکەم دەگوت، "هەر ئێستا دەتخۆم!" بەڵام دەشمزانی دەبێت بەناچاری ئەم هەستە، بشارمەوە. دروستبوونی ئەم هەستە بە هۆی هۆگری بوونمەوە بۆ ورچەکە نەبوو: دەمتوانی تەنها بە دووبارەکردنەوەی هەمان ئەم هەڕەشانە، ئەم هەستە دووبارە بکەمەوە. کاتێك دایکم چیرۆکی بۆ دەگێرامەوە، پێی دەگوتم: "هەر ئێستا دەتخۆم."، هەر ئەو وشانە بوون زۆرترین کاریگەرییان هەبوو لەسەرم و وا لێیان تێدەگەشتم تەنها بە مانای خواردن نایەن، بەڵکو بە واتای لەناوبردنی یەکجاری دێن. هەروەك دواتر بۆم دەرکەوت، دێوەکانی ناو ئەدەبی کلاسیکی فارسی _ئەو دڕندە ترسناکانەی ناو چیرۆکەکان کە پەیوەندییان بە شەیتان و جنەوە هەبوو و لەلایەن نیگارکێشەکانەوە وێنەیان کێشرابوو_ بووبوون بە دێوی ناو ئەو چیرۆکانەی کە لە تورکیا دەوترانەوە. وێنەی دێوێکم بە بەرگی داستانێکی کۆنی کورتکراوەی تورکییەوە بینیبوو، بە ناوی (دەد کۆرکۆت). دێوەکە هەروەك هیندییەسوورەکە جلێکی نیمچەڕووتی لەبەردا بوو، لەبەرچاوی من بە جۆرێك دەردەکەوت، وەك ئەوەی فەرمانڕەوایی هەموو جیهان بکات.

هەر لەو ساڵانەدا بوو، مامم پرۆجێکتەرێکی لێدانی فیلمی کڕی و لە پشووەکاندا، لە دوکانێکی فۆتۆگرافی ناوخۆیی فیلمەکانی وەکو چارلی چاپلین و واڵت دیزنەیی و لۆرێل و هاردی بەکرێ دەهێنا، دواتر بەجۆشەوە وێنەکانی داپیرەم و باپیرەمی لەسەر دیوارە سپییەکەی سەر ئاگردانەکە لا دەبرد و سکرینی فیلمەکانی لە شوێنەکەیان

جێگیر دەکرد. لەناو یەکێك لە کۆکراوەی فیلمەکانی، کە من زۆر ئارەزووم لێی بوو، فیلمێکی دیزنەی هەبوو کە تەنها دوو جار پیشانی دابووین. لە فیلمەکەدا، دێوێکی کەلەپووت و زەبەلاح کە ئەوەندەی باڵەخانەکەی ئێمە گەورە بوو، میکی ماوسی بەرەو قووڵایی بیرێك ڕاو دەنا، دواتر بیرەکەی لە زەوییەوە دەرهێنا و وەك ئەوەی پەرداخێك ئاو بێت بە دەستییەوە، بیرەکەی هەڵلووشی و میکی کەوتە ناو دەمیەوە، لەو کاتەدا هەتا توانیم، قیژاندم. نیگارێکی تری دێوێك هەبوو کە لەلایەن (گۆیا) لە کتێبی (زوحەل کوڕەکەی خۆی دەخوات) کێشرابوو. ئەو ڕۆژە دیمەنی نیگارەکە کە زەبەلاحەکە فوو دەکات بە پیاوێکی بچووکدا و دواتر هەڵیدەداتە ناو دەمیەوە، بەتەواوەتی تۆقاندمی.

جاران کاتێك باوکم بۆ نانی نیوەڕۆ و وچانێکی کورت دەگەڕایەوە، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە سەر کارەکەی، لە باوەشی دەگرتم و ماچێکی دەکردم. ڕۆژێکیان کاتێك بە شێوەیەکی ئاسایی هەڕەشەم لە ورچەکەم دەکرد و لە هەمان کاتدا سۆزێکی سەیرم بۆ دەردەبڕی، دەرگای ژوورەکەم کرایەوە، باوکم خۆی کرد بە ژووردا. کاتێك بینیی تەنها دەرپێ کورتەکانی ژێرەوەم پۆشیوە، دەرگاکەی بە کەمێك هێواشتر لە چاوکردنەوەی داخست و (دەتوانم بڵێم) بە کەمێك ڕێزەوە بوو. زۆر پەرێشان بووم و ترسام شتێکی خراپم کردبێت. لەبەر ئەوە لەوە بەدواوە بیرۆکەی چێژوەرگرتن، بووە بیرۆکەیەکی ناخۆش و ژەهراوی بۆ من.

درککردنیشم بەو شتانە، ڕێك لەدوای یەکێك لە شەڕە دوانەهاتووەکانی دایکم و باوکم و تۆرانی دایکم و هاتنی ئەو دایەنە بوو کە باوکم بۆ چاودێری و سەرشۆردنی من و براکەم هێنابوویەوە. ئەم دایەنە بە دەنگێکی بێبەزەییانە سەرزەنشتی دەکردم و پێی دەگوتم: "تۆ وەك سەگی!"

نەمدەتوانی دەست بگرم بەسەر کاردانەوەکانی جەستەمدا. هەتا لە تەمەنی شەش بۆ حەوتساڵی، لە قوتابخانەیەکی کوڕان پەیم بەو ڕاستییە برد کە ئەو هەستانە بێهاوتا نین و لە کەسانی تردا بوونیان هەیە.

ساڵانێك دەمویست ئەو بەهرە قێزەون و ئاڵۆزە کە پێم وا بوو بەتەنها لە مندا بوونیان هەیە، لە جیهانەکەی ترم کە مەڵبەندێکی ئازادی خراپە و غەریزەکانی ناخم بوو، حەشار بدەم. هەر کات بێزاری باڵی بکێشایە بەسەرمدا، دەچوومە ئەو جیهانەی

دیکەمەوە و دەبوومە کەسێکی تر و لە شوێنێکی تر. زۆر بەسانایی دەمتوانی لە هەموو کەس و لە جیهانی ڕاستەقینەم هەڵبێم. لە ژووری دانیشتنەکەی داپیرەم، گەشتی خەیاڵیم بۆ ناو فیلمەکەی جولێس ڤێرن، (بیست هەزار لیج لەبن دەریادا) .کە پێشتر لە سینەما پالآسی تەپوتۆزاوی سەیری ئەم فیلمەم کردبوو و بێدەنگییەکانی ناو فیلمەکە تۆقاندبوومی و ژوورەکە دەبوویە ئەو ژێر دەریایە. لە داڵغەکەمدا و لە کاتی بینینی دیمەنە ترسناك و ڕێڕەوە ڕەش و سپییەکانی ژێر دەریاکە، نەمدەتوانی هیچ شتێك بکەم، تەنها ئەوەندە ئەبێت هەندێك لە شتەکانی ناو ماڵی خۆمانم دەناسییەوە. ئەوکات زۆر منداڵ بووم، هەتا ژێرنووسەکان بخوێنمەوە، بەڵام خەیاڵەکانم هەموو بۆشاییەکانی پڕ دەکردەوە. (تەنانەت دواتریش کاتێك بەتەواوەتی فێری خوێندنەوە بووم، کێشە ئەوە نەبوو کە چەندە لە نووسینەکە تێگەشتووم، بەڵام ئەوەی گرنگ بوو، گونجاندنی واتای نووسینەکە بوو لەگەڵ خەیاڵەکانم).

هەموو جار کاتێك بەئاشکرا لەناو داڵغەیەکدا نقوم دەبووم، داپیرەم ڕاهاتبوو پێم بڵێت: "بەم جۆرە لەقەلەق بە قاچەکانت مەکە، تووشی سەرسووڕانم دەکەی."

وازم لە جووڵانی قاچەکانم دەهێنا، بەڵام لە خەیاڵەکەم، فڕۆکەیەك هێشتا بەناو دووکەڵی جگەرەی جێلینسیگ، کە لە دەمی داپیرەمەوە بەرز دەبوویە، دەهات و دەچوو. دواتر دەچوومە ناو دارستانێکی پڕ لە دار و کەروێشك و مار و شێر، کە بەپێی شێوەی ئەندازەیی فەرشەکە، جێگەکانیانم ڕێك دەخستن. لاسایی یەکێك لەو سەرکەشییانەم دەکردەوە کە لەناو پەرتووکە کارتۆنییەکان دیتبووم. دەبوومە قارەمانێکی ئەسپسوار، ئاگرم هەڵدەگیرساند و خەڵکم دەکوشت. بە گوێیەکم، هۆشیاری دەنگی دەرەوە دەبووم. پێش ئەوەی بگەڕێمەوە لای هیندییەسوورە نیمچەڕووتەکەی ناو خەیاڵەکەم، ئاگام لێ بوو دەرگای خوارەوەی باڵەخانەکە بەتوندی کرایەوە و ئیسماعیلی پاسەوانمان بەرەو سەرەوە دەهات. لە خەیاڵەکەمدا چێژم لە سووتانی ماڵەکان، بڵاوبوونەوەی پرشەی ئاگرەکە و هەڵهاتنم لە خانووەکە لە ڕێگەی ئەو تونێلەی بە دەستی خۆم دروستم کردبوو، دەبینی. بەهێواشی مێشەکانی نێوان شووشەی پەنجەرەکە و تووڵی ئەو پەردانەی کە لە تەختەیەکی کونکراوەوە شۆڕ بووبوونەوە خوارەوە و بە بۆنی دووکەڵی جگەرە بۆگەنیان کردبوو، دەگرتن و دەکوشتن، چونکە

مێشەکان ئەو چەتانە بوون کە دەبوو باجی تاوانەکەیان بدەن. هەتا تەمەنی چل و پێنج ساڵییش، ئەو کاتانەی لەناو پێخەفەکەم ئەمدیو و ئەودیوم دەکرد، داڵغەی کوشتنی خەڵك چێژبەخش بوو بەلامەوە. حەزم دەکرد پۆزش بهێنمەوە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەبوونە قوربانیی ناو خەیاڵەکانم، وەکو کەسە نزیکەکانم -بەتایبەت براکەم- کەسە سیاسییەکان و ئەستێرەکانی ئەدەب و کارەکتەرە خەیاڵییەکانی ناو داڵغەکەم. یەکێکی تر لەو تاوانانەی ئارەزووم لە کردنی بوو، پیشاندانی هەستی بەزەییم بوو بۆ ئەو پشیلەیە کە لە کاتی تووڕەییدا زۆر بەتوندی ئازارم دەدا. بیست و پێنج ساڵ دواتر، دوانیوەڕۆیەکیان کە لە خزمەتی سەربازی بووم، تەماشای هاوپیشەکانی خۆم دەکرد کە لە کانتینێکی سەربازی نانخواردن دانیشتبوون، سەرقاڵی قسەکردن و جگەرەکێشان بوون. نزیکەی ٧٥٠ سەربازی هاوشێوەی خۆم لەوێ بوو، لە خەیاڵەکەمدا هەموویان سەریان لە لاشەیان جیا بووبوویەوە. کاتێك بەناو دووکەڵی جگەرەدا تەماشای لاشە هەڵئاوساوەکەیانم دەکرد، کە لەناو تەمێکی شینی ناو کانتینە ئەشکەوتئاساکەدا کەتبوون، یەکێك لە هاوڕێ سەربازەکانم بانگی کردم و گوتی: "کوڕم، بەسە لەقەلەق بە قاچت مەکە. زۆر هیلاکم، ئیتر بوەستە."

تەنها کەسێك کە دیار بوو ئاگاداری جیهانە نهێنییەکەم بێت، باوکم بوو.



لە کاتێدا بیرم لە ورچە بریندارەکەم دەکردەوە، کە لە کاتی تووڕەییدا چاوەکانیم دەرهێنابوو و ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر لاواز دەبوو بە هۆی دەرهێنانی لۆکەکەی ناویەوە. یاخود بیرم لەو یاریزانە بچووکەی تۆپی پێ دەکردەوە کە ئەوەندەی پەنجەیەك دەبوو، کاتێك دەستت بەر سەری دەکەوت، یەکسەر لار دەبوویەوەوە و دەکەوت. سێیەم یاریزانی تۆپی پێم بوو، یەکەم و دووەم دانەیانم شکاندبوو و ئێستاش ئەمەیانم دەشکاند. یاخود کاتێك لەناو خەیاڵە ترسێنەرەکان ون دەبووم، لەو کاتانەی کە دەمبینی خزمەتکارەکەمان سەرقاڵی قسەکردنە لەگەڵ خودا، لەناکاو گوێم لە دەنگی باوکم دەبوو و دەیگوت: "ئەگەر پێم بڵێی چی لەناو ئەو مێشکە بچووکەتدا هەیە، پێنج قورووشت دەدەمێ."

لەبەر ئەوەی هەرگیز خۆم یەکلایی نەکردەوە کە ڕاستییەکەی بە هەندێك دەستکارییەوە پێ بڵێم یان درۆی بۆ بکەم، بێدەنگ دەبووم. لەپاش ماوەیەکی کورت، باوکم پێدەکەنی و دەیگوت: "تازە درەنگە، باشتر بوو قسەم بۆ بکەی."

تۆ بڵێی باوکیشم وەك من لە جیهانەکەی دیکەی، کاتی بەسەر بردبێت؟ لەپاش چەند ساڵ، بۆم دەرکەوت کە ئەو کاتبەسەربردنە سەیرە، پێی دەڵێن دالغەی ڕۆژانە. لەبەر ئەوە هەر کاتێك پرسیارەکانی باوکم تووشی ترسیان بکردمایە، وەك هەمیشە بەپەرۆشی خۆم لە بیرکردنەوە بێزارەکان دەدزییەوە و خۆم لا دەدا لە پرسیارەکانی و دواتر لە بیرم دەمخستنە دەرەوە.

بەشاراوەیی هێشتنەوەی جیهانە نهێنییەکەم، دەمتوانی بەئاسانی و بێ خەم لە ماڵەوە بێم و بڕۆم. کاتێك لەبەرامبەر داپیرەم دادەنیشتم و تیشکی ڕووناکی بەناو پەردەکاندا دەهاتە ژوورەوە، هەروەك ڕووناکیی پشکنەری ئەو کەشتییانەی بە شەودا بۆ بۆسفۆردا تێدەپەڕین، ئەگەر بمتوانیایە ڕێك سەیری ڕووناکییەکە بکەم، ئەوا وام دادەنا کە کەشتیگەلە کەشتییە سوورە ئاسمانییەکان دەبینم. دواتر، وەك ئەوەی کەسێکی تر بووبێت ژوورەکەی جێ هێشتبێت، یاخود ڕووناکییەکانی لەدوای خۆی کوژاندبێتەوە، لە هەر شوێنێك ئارەزووم لێ بووایە، خەیاڵەکانم کۆتایی پێ دەهێنا و

دەگەڕامەوە جیهانی ڕاستەقینە. (هەر وەکو سەردەمی منداڵیم، هەمیشە کەسانی تر بەبیریان هێناومەتەوە، بگەڕێمەوە دونیای ڕاستەقینە).

سەرباری ئەوەی هەمیشە خەونم بە گۆڕینەوەی شوێنەوە دەبینی لەگەڵ ئۆرهانەکەی تر لە ماڵێك دا، بیرم لە ژیانێك کردووەتەوە دوور لە ژووری مۆزەخانە، ڕێڕەو و فەرشەکان، ویستبێتم دوور بم لە هاوڕێیەتیکردنی ئەو کەسانەی کە حەزیان لە بیرکاری و لێکدانەوەی وشەکان بوو، یان وا هەستم دەکرد دەورە دراوم بەم خانووە شپرز و تاریکە (هەرچەندە خێزانەکەم دواتر نکوولّییان لیّ دەکرد)، کە هەموو بیرۆکەیەکی ڕۆحی و خۆشەویستی و هونەری و ئەدەبی و تەنانەت ئەفسانەی ڕەت دەکردەوە، ئەگەر لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر کۆچم کردبێت بۆ جیهانەکەی ترم، هێشتا کەسێکی شادومان بووم. دوور لە هەموو ئەو شتانە، بەتایبەت لەنێوان تەمەنی نێوان چوار بۆ شەش ساڵی، وەك منداڵێکی ڕووخۆش و ژیر، هەستم بە خۆشەویستیی هەموو ئەوانە دەکرد کە نزیك بوون لێمەوە. هەمیشە ماچ دەکرام و لەم باوەش بۆ ئەوی تر ڕەوانە دەکرام و هەردەم ڕێنمایی دەکرام. کاتێك لە دوکانی میوە فرۆشەکە سێوم دەکڕی، دایکم دەیگوت: "نەیخۆی، هەتا نەیشۆیتەوە." یان ئەو مێوژانەی لای پیاوی قاوەخانەکە دەمهێنان، دەیگو: "لەدوای نانی نیوەڕۆ بیانخۆ."یاخود شیرینییەکانی پوورم کاتێك لەسەر شەقام دەیبینیم و پێی دەدام، دەیگوت: "بڵێ سوپاس."

هۆکاری گلەیی و گازندەکانم، بە هۆی بێتوانایی خۆم بوو کە نەمدەتوانی دەرەوەی دیوارەکان ببینم. کاتێك لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، ئەگەر هیچ شتێکم لە شەقامەکەی تەنیشت یان لە شەقامەکەی خوارەوە نەبینیایە، تەنیا بەشێکی کەمی ئاسمان نەبێت، کاتێك بە هۆی بچووکیمەوە نەمدەتوانی بگەمە تەختەی گۆشتجنینی گۆشتفرۆشەکەی فرۆشگای شەقامەکەی بەرامبەرمان (هەندێك جار تەنها بۆ ئەوەی بۆنەکەیم بیر بکەوێتەوە، چەند ساتێك دەچمەوە ئەو شەقامە)، کە چەقۆکەی هەڵدەگرت (هەر چەقۆیەکی، هێندەی لاقێکی من دەبوو) بۆ ئەوەی گۆشتەکەی لەسەر لەت لەت بکات، کاتێك نەمدەتوانی ناو کەوانتەر و بەفرگر و سەر مێزەکان ببینم، کاتێك ڕووداوێکی هاتوچۆ لەسەر شەقامەکە ڕووی دەدا، کوڕانی هەرزەکار بەرچاویان دەگرتم و ڕووداوەکەم بەباشی نەدەبینی، تەواو بێزار و پەست دەبووم. ئەو کاتانەی باوکم بۆ

سەیری یاریی دووگۆلّی دەیبردم، هەر کاتێك تیمەکەی ئێمە دەکەوتە مەترسییەوە، هاندەرەکانی تر هەلّدەستانە سەر پێ و بەرچاویان دەگرتم و نەمدەتوانی گۆلّەکە ببینم. بەلاّم لە ڕاستیدا، من هەرگیز چاوم لە تۆپەکە نەبوو، بەلّکو چاوم لەسەر ئەو پەنیر و نانە چەور و چوکلێتانە بوو کە باوکم بۆ من و براکەمی کڕیبوو. لە هەمووی ناخۆشتر، کاتی چوونە دەرەوە بوو لە یاریگاکە کە لەنێوان قاچی پیاوەکاندا بەند دەبووم و هەروەك لەناو دارستانێکی تاریك و بێ هەوا بم، لەنێوان ئەو شەڕواڵە چرچ و پێلاّوە قوڕاوییانەدا دەمامەوە. جیا لە خانمە جوانەکانی تری وەك دایکم، ناتوانم بلّێم شەیدای هەرزەکارەکانی ئەستەنبولّ بووبێتم، چونکە زۆر ناشیرین و توکن و گرژ و مۆن و قەبە بوون. ڕەنگە ئەوانیش وەك من، ڕۆژێك دنیا نهێنییەکەی دیکەیان ناسیبێت، بەلاّم لەوە دەچوو هێزی خۆشبەختبوونیان لەدەست دابێت و لەبیریان چووبێت چۆن خەیالّ بکەن، لەوانەیە ئەوەش بە هۆی دەرهاتنی ئەو مووە بێزارکەرانەی سەر جومگە و مل و لووت و گوێیانەوە بووبێت. لە هەمان کاتدا، خۆشم لە پێکەنینەکەیان _لەوەش زیاتر_ هەلّسوکەوتیان، ماچەکانیان بە هۆی ریش و سمێلّیانەوە، پێستیان سووردەکردمەوە، بۆنە بۆنناخۆشەکانیان و هەناسەی دووکەلاّوییان، دەهات. ئەو هەموو گازندانە، پەلکێشی دەرەوەی مالّ و کۆلاّنەکانی ئەستەنبولّی کردم.

٤

# وێرانبوونی کۆشکی پادشاکان:

# گەشتێك بەناو ماتەمینیی کۆلانەکاندا

ئەپارتمانەکانی پاموك لەسەر ڕووبەرێکی گەورە، کە ڕۆژێك باخچەی کۆشکی پادشایەك بووە، لە نیشانتاشی بنیات نراون. ناوی نیشانتاشی، بە واتای (بەردی نیشانە) دێت، کە لە سەردەمی چاکسازیی سوڵتانە لاساییکەرەوەکانی خۆرئاوای سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەمەوە (سوڵتان سەلیمی سێیەم و سوڵتان مەحموودی دووەم) هاتووە. بەردی نیشانەکەیان لەسەر گردێکی چۆڵ بۆ مەشقی تەقاندن و تیرهاوێژی داناوە و خاڵێکیان لەسەری نەخشاندووە کە تیرەکە لەسەری نیشتۆتەوە، یان دەفرێکی گڵیان لەسەر نیشانەکە داناوە و بە پێکانی گوللەکە وردوخاش بووە. هەندێك جاریش بۆ ڕوونکردنەوە، یەك دوو هێڵیان لەنزیکی نیشانەکەوە داناوە.

کاتێك سوڵتانی عوسمانییەکان، لە ترسی نەخۆشیی سیل و گۆڕینی مەیلیان بۆ لای جوانیی دیمەنە ڕۆژئاواییەکان، بارگە و بنکەیان لە تۆپکاپی پالآسەوە بەرەو دوڵماباخچە و یەڵدز گواستووەتەوە، وەزیر و شازادەکانیان لەسەر بەرزاییەکانی نیشانتاشی دەستیان بە بنیاتنانی کۆشکی تەختە کردووە. ڕۆژانێك کۆشکی شازادەی جێنشین (یوسف عیزەدین پادشا) و وەزیر (خەلیل پادشا)، قوتابخانەم بوون. لە کاتێکدا وانەم تێیاندا دەخوێند و تەنانەت لە باخچەکەیان یاریی دووگۆڵیم دەکرد، بڕیاری سوتان و ڕووخانیان درابوو. لەسەر پاشماوەی کۆشکی وێرانبووی (فایەق بەگ)ی وەزیری شارەوانی لە شەقامەکەی بەرامبەر ماڵمان، بینایەك دروست کرا. لە

ڕاستیدا لە گەڕەکەکەی ئێمە، تەنها ئەو کۆشکە بەردینانەی وەزیرەکان مابوونەوە کە لەپاش ڕووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی و گواستنەوەی پایتەخت بۆ ئەنقەرە، کەوتبوونە ژێر ڕکێفی شارەوانیی شارەکەوە. لەبیرمە، جاران بۆ نۆرەی کوتانی دژەنەخۆشیی ئاولە، بۆ یەکێك لەو کۆشکە دێرینانە دەچووم کە دواتر بوویە بارەگای ئەنجوومەنی گشتی. ئەوانی دیکەش، وەکو ئەو کۆشکانەی کە ڕۆژێك کارگێڕانی عوسمانی، دڵی باڵوێزە بیانییەکانیان پێ خۆش کردوون و کۆشکی کچانی سوڵتان عەبدولحەمیدی سەدەی نۆزدەیەم، جگە لە هەیکەلێکی تاریك بە هۆی ئەو درەختە خۆڕسکانەی لەوێ سەوز بووبوون و پەنجەرە و پلیکانەی ڕووخاو، هیچی دیکەیان لێ نەمابوویەوە. وەبیرهێنانەوەی ئەم کۆشکانە لە ئێستادا، هەمان هەستی خەمباریی منداڵیم لا دروست دەکەنەوە. لە کۆتاییەکانی پەنجاکان، زۆربەی ئەم کۆشکانە سووتێنران، یاخود ڕووخێنران و بینای مۆدێرن جێگەیان گرتنەوە.

لە پەنجەرەی دواوەی باڵەخانەکەی ئێمە، لەسەر شەقامی تەشویقیە، لەپشت دار مازووەکان و درەختە سەوزەکانەوە، پاشماوەی کۆشکی حەیرەدین پادشای تونسی، کە خەڵکی قەفقاسیا بووە و بۆ ماوەیەکی کەم لە کاتی جەنگی نێوان (عوسمانی–ڕووسی)، وەزیری گشتی بوو، دیار بوو. هەر بەگەنجی لە ساڵی ۱۸۳۰، دە ساڵ لەپێش ئەوەی فلاوبێر بنووسێت: "دەمەوێت بڕۆم ئەستەنبوڵ و کۆیلەیەك بکڕم."، هێنراوە بۆ ئەستەنبوڵ وەك کۆیلەك فرۆشراوە. پێش ئەوەی ببرێت بۆ فەرەنسا، وەك کۆیلە لە ماڵی دادوەری تونس ماوەتەوە و هەر لەوێش بەتەواوەتی فێری زمانی عەرەبی بووە. دواتر بۆ ئەوەی بچێتە ناو سوپاوە، گەڕاوەتەوە تونس و لەوێ بەزوویی پلەکەی بەرز کراوەتەوە. وەکو دەستەی فەرمانڕەوایی، فەرمانگەی دادوەر، دەستەی دیبلۆماسی و وەزیری دارایی خزمەتی کردووە، لەدوای تەمەنی شەست ساڵی خانەنشین کراوە بۆ پاریس. دواتر عەبدلحەمید (کە لەسەر پێشنیاری شێخ زەفیری تونسی نوێنەرایەتی کردووە)، بانگهێشتی کردووە بۆ ئەستەنبوڵ. پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی کورت ڕاوێژکاری دارایی بووە، دواتر پلەی وەزیری گەورەی پێ بەخشراوە. بەم جۆرە پادشا، لەو زنجیرەیەی کە ویستوویانە تورکیا لە دەریای قەیرانی ئابووری دەربهێنن، بووە بە یەکەم پسپۆڕی بیانی دارایی و ئاوەدانکردنەوەی شارەکە لەسەر ڕیفۆرمی ڕۆژئاوایی، کە

خەونی زۆربەی شارە هەژارنشینەنەکان و هەرێمەکانی تریش بووە. خەڵکیش وەکو چاوەڕێی کاری باشیان لەم پادشایە کردووە، ئەوەش ڕەنگە بە هۆی ئەوە بووبێت کە ئەم پادشایە خۆرئاوایبوونی پێوە دیار بووبێت زیاتر لە عوسمانییەك یاخود تورکێك. بە هۆی هەمان هۆکار -کە تورك نەبووە- هەستی بە شەرمەزاری کردووە. بوختانیان بۆ پادشا دروست کردووە کە گوایا ئەم پادشایە سیخوڕی بۆ عەرەب کردووە، کاتێك بە سواری ئەسپ و عەرەبانەکەی لەدوای چاوپێکەوتنەکانی لە کۆشك گەڕاوەتەوە بۆ ماڵ، هەروەها فەرمانیشی کردووە بە سکرتێرەکەی لە فەرەنسا هەروەك ئەم بکات. شۆڕشگێڕە توندڕەوەکان ئەم قسەوقسەڵۆکانەیان بڵاو کردەوە کە گوایا پادشا زمانی تورکی بەباشی نازانێت و ئامانجی نهێنیی بەزۆر سەپاندنی زمانی عەرەبییە. هەرچەندە دەزانرا ئەم قسانە زۆربەیان بێبنەمان، بەڵام لە کۆتاییدا عەبدولحەمید گومانی لێ کرد و پادشای وەك وەزیر لە پلەکەی دوور خستەوە. لەبەر ئەوەی پادشا لای ڕەوا نەبووە وەك وەزیرێکی لەکارلابراو خۆی لە فەرەنسا حەشار بدات، تێکۆشاوە کۆتا ڕۆژەکانی لە ئەستەنبوڵ بەسەر بەرێت. هاوینانی لە ڤێلاکەی بۆسفۆر لە کروچەشم و زستانانی لە کۆشکێکی وەك زیندان بەسەر بردووە، کە ئەپارتمانەکەی ئێمە لە باخچەکەی بنیات نراوە. ئەو کاتانەی ڕاپۆرتی بۆ عەبدولحەمید نەدەنووسی لە فەرەنسا، پادشا کاتەکانی خۆی بە نووسینەوەی یادگارییەکانی بەسەر بردووە، ئەم کتێبی یادەوەرییە (کە لەپاش هەشتا ساڵ لە نووسینی، وەرگێڕدرایە سەر زمانی تورکی)، دەریدەخات کە نووسەر خۆی بە کارێکی ئاقڵانە و گرنگ خەریك کردووە. کتێبەکەی پێشکەشی کوڕەکانی کردووە کە یەکێکیان بە تاوانی تێوەگلان لە کوشتنی وەزیری گشتی (مەحمود شەوکەت پادشا) لەسێدارە دراوە. هەر لەو سەروبەرەشدا، عەبدولحەمید کۆشکەکەی پادشای بۆ (سوڵتانە شادییە)ی کچی کڕیوە.

خێزانەکەم، واقوڕماو سەیری سوتاندنی کۆشکی پادشاکانیان دەکرد. وەك ئەوە بوو سەیری چیرۆکی شازادە سەرشێتەکان، ئۆفیونکێشانی حەرەمسەرا، منداڵانی بەندکراو لە ژێرخانەکانی کۆشك، زۆرداریی کچانی سوڵتان، پادشا بکوژ و زۆردارەکان و پووکانەوەی هەموو ئیمپراتۆریەتەکە بکەن. ئەو ڕۆژگارە لە نیشانتاش دەمانبینی کە چۆن حکومەتی کۆماری، دەسەڵاتی پادشا و شازادە و پلە بەرزەکانی تری، عوسمانیی

تەفروتونا دەکرد و ئەو کۆشکانەی لەدوایانەوە بەجێ دەمان، دەبوونە شوێنێکی بێکەڵك و نامۆ.




هەتاکو ئێستاش، ماتەمینیی ئەو کلتوورە مردووە لە دەوروپشتمانە. هەروەك ئەوەی ئەڤیندارێکی دۆڕاو، جلوبەرگ و سامان و وێنەکانی خۆشەویستە دۆڕاوەکەی فڕێ بدات، مەیلی خۆرئاواییبوون و مۆدێرنبوون وەك هیوایەکی نەخوازراو بوو بۆ لەبیرچوونەوەی یادگارییە تاڵەکانی ئیمپراتۆرە ڕووخاوەکە. بەڵام ئەو خواستەش بۆ سڕینەوەی ڕابردوو، کاریگەریی لەسەر کلتوورمان هەبوو، بووە هۆی کەمکردنەوەی گەشەسەندنی خێزانە گەورەکانی وەکو خێزانی ئێمە و لە لایەکی دیکەوە دڵخۆشبوون بە سەرهەڵدانی کۆماری، بۆ ئەوەی ماڵەکانیان نوێ بکەنەوە و وەك مۆزەخانەیەکیان لێبکەن. کاتێك گوێم دەگرت بۆ موزیکی (ئەلاتورکا) کە داپیرەم لەگەڵی، تەپەتەپی بە نەعلەکانی دەکرد، ئەو هەستی وەڕەسییەی منداڵیم کە دواتر بوویە خەمباری و شێواوییەکی بڵاو، زیاتر دەردەکەوت. بە چاندنی خەیاڵەکانم، لەو دۆخە بێزارکەرە هەڵدەهاتم.

چوونەدەرەوە لەگەڵ دایکم، هەڵهاتنێکی ترم بوو لەو بێزارییە. ئەو کاتە زۆر باو نەبوو منداڵ بەرنە دەرەوە بۆ پارك و باخچەکان، لەبەر ئەوە هەرکاتێك لەگەڵ دایکم بچوومایەتە دەرەوە، ئەوە ڕووداوێکی گرنگ بوو بۆ من. "سبەینێ لەگەڵ دایکم دەڕۆمە دەرەوە."، بەم قسەیە لای کوڕەکەی پوورم کە سێ ساڵ لە من منداڵتر بوو، خۆم هەڵدەکێشا. لەپاش ئەوەی لە پلیکانە پێچاوپێچەکانەوە دەهاتینەوە خوارەوە بۆ

ژێرزەمینەکە، لەبەردەم ئەو پەنجەرەیەی ڕووی لە دەرگاکەی دەرەوە بوو، کەمێك دەوەستاین کە لەوێوەوە پاسەوانەکە هاتن و ڕۆشتنی هەموو کەسێکی دەبینی. ئەگەر پاسەوانەکە لەوێ نەبووایە، لە شووشەی پەنجەرەکەوە سەیری جلەکانم دەکرد و دایکیشم دڵنیای دەکردمەوە قۆپچەی کراسەکەم هەموویان داخراون. هەر کات دەهاتینە دەرەوە، لە خۆشییان هاوارم دەکرد: "شەقام!"

خۆر، هەوای پاك، ڕووناکی... ماڵی ئێمە زۆر تاریك بوو، بە جۆرێك کاتێك هاوینان پەردەکانمان لا دەدان، ڕووناکییەکە چاومانی ئازار دەدا. دەستی دایکم دەگرت و سەیری دوکانەکانم دەکرد: لە پەنجەرەی تەماویی دوکانی گوڵفرۆشێکەوە سەیری ئەو گوڵانەم دەکرد کە وەك گورگی سور وا بوون، سەیری دوکانی ئەو پێڵاوفرۆشەم دەکرد کە بە وایەرێکی بچووك پێڵاوە بنبەرزەکانی هەڵواسیبوون، ئەو جلشۆرگەیەی کە پەنجەرەکانی وەك ئەوانەی دوکانی گوڵفرۆشەکە تەماوی بوون، باوکم هەموو جار جلەکانی دەنارد بۆ ئەوێ هەتا بیانشۆن و ئوتوویان بکەن. بەڵام لە پەنجەرەکانی دوکانی کتێب فرۆشەکەوە _هەمان دەفتەری قوتابخانەم بینی کە من و براکەم بەکارمان دەهێنا_ وانەیەك فێر بووم: بەتەنها ئێمە خاوەنی ئەو سامان و نەریتانە نین، بەڵکو لەدەرەوەی ماڵی ئێمە، خەڵکانێك هەن هەر وەکو ئێمە دەژین. قوتابخانەی سەرەتایی من و براکەم، ڕێك بەرامبەر مزگەوتی تەشویقیە بوو کە لەوێ خەڵك پرسەیان دادەنا. هەموو قسەیەکی دڵخۆشکەری براکەم لەماڵەوە، لەبارەی مامۆستاکەم بوو. وشەی مامۆستاکەم، خەیاڵی ئەوەی بۆ دروست دەکردم، هەروەك چۆن هەموو منداڵێك دایەنی خۆی هەیە، ئاوەهاش هەموو قوتابییەك مامۆستای تایبەت بە خۆی هەیە. بەڵام کاتێك ساڵێك دوای براکەم چوومە قوتابخانە و خۆم لە پۆلێکی سی و دوو کەسیدا بینییەوە لەگەڵ یەك مامۆستا، نائومێد بووم و بۆم دەرکەوت، جیهانی دەرەوە ناخۆشترە لە هەر ڕۆژێك لە دایکم جیا ببمەوە، یاخود لە ئاسوودەییەکانی ماڵەوە دوور بکەومەوە. کاتێك دایکم سەردانی یەکێك لە لقەکانی بانکە ناوخۆییەکانی دەکرد، من ڕەتم دەکردەوە شەش هەنگاو لەگەڵی برۆم بۆ ژووری ژمێریاریی پارە، چونکە ئەو شەش هەنگاوە بە تەختە گیرابوو و درزیش لەنێوان تەختەکان هەبوو، وام دەزانی دەکەومە خوارەوەو بۆ هەمیشە ون دەبم. کاتێك دایکم بانگی دەکردم: "بۆچی نایەیتە ژوورەوە؟"، وا خۆم

پیشان دەدا کە لەگەڵ منی نەبێت. کاتێك دایکم دیار نەدەما، دەستم دەکرد بە خەیاڵکردن و دیمەنەکانم دەگۆڕی، وام دادەنا کە لە پالاّسێکی تر بم... هەر کات دەچووین بەلای عوسمانبەگ، یاخود حەربییە لەنزیك وێستگەی مۆبایل کە لە سووچێکەوە بوو، ئەوا ئەسپێکی باڵدار کە بەسەر پۆستەری لایەکی ئەپارتمانەکانێکەوە بوو، دەهاتە ناو خەیاڵەکانمەوە. لەسەر ڕێگاکەمان، دوکانی پیرەژنێکی ڕۆمانی هەبوو، کە گۆرەویی پینە دەکرد و قایش و قۆپچە و (هێلکەی گوندی) دەفرۆشت کە دانە بە دانە، وەکو زێڕ لەناو سندووقێکی نەخشێنراو دەریدەهێنان. لەناو دوکانەکەیدا، ئەکوارییۆمێکی بچووکی ماسی هەبوو کە ماسیی سووری تێدا بوو. کاتێك دەستم دەهێنا بە شووشەکەیدا، بە جۆرێك دەمە بچووك و ترسناکەکەیان دەکردەوە، وەك بیانەوێت قەپ لە پەنجەم بگرن، بەلاّم مەلەکردنە گەوجانەکەیان، هەرگیز سەرنجی ڕانەدەکێشام. دوکانی یەعقوب و فازیل هەبوو، کە پەڕاوگە و توتن و گۆڤاریان دەفرۆشت، کە ئەوەندە بچووك و قەرەباڵغ بوو، هەر جارێك من و دایکم سەردانمان بکردایە، دەبوو کەمێك بوەستین هەتا نۆرەمان دەهات بچینە ژوورەوە. دوکانێکی تری قاوە فرۆشتن هەبوو، پێیان دەگوت (دوکانی عەرەب)، هەر وەك چۆن عەرەبەکان لە ئەمەریکای لاتین بە تورك ناسراون، بە هەمان شێوە بەشێکی کەم لە ڕەشپێستەکان لە تورکیا بە عەرەب ناسراون)، لە دوکانەکەدا ئامێرێکی گەورەی ئامادەکردنی قاوە هەبوو، هەر کات دادەگیرسا، دەنگە هەورەتریشقە ئاساکەی کە وەك دەنگی جلشۆرەکەی ماڵەوە بوو، دەستبەجێ لە ترساندا دوکانەکەم جێ دەهێشت و عەرەبەکە پێکەنینێکی میهرەبانانەی دەکرد. ئەم دوکانانە مۆدێرن نەبوون، یەك لەدوای یەك داخران، بۆ ئەوەی جێگا بۆ ئەوانی تر بکەنەوە کە مۆدێرن بوو. بە جۆریك لەدوای یەك ڕیز بووبوون، هەر وەکو ئەو یارییەی من و براکەم دەمانکرد، دەمانگوت: (دوکانەکەی تەنیشتی قوتابخانەی شەوانەی کچان) یان بەم جۆرە ڕیزمان دەکردن (دوکانی شیرینیی ژنە ڕۆمانییەکە، دوکانی گوڵفرۆشەکە، دوکانی جانتا، دوکانی کاتژمێر، چاپەمەنی، گەلەریی کتێبەکان و دەرمانخانەکە).



پێش ئەوەی بچینە ناو دوکانە شێوە ئەشکەوتییەکە، کە لەوێ پیاوێکی پەنجا ساڵە بە ناوی عەلادین، جگەرە و گەمەی منداڵان و ڕۆژنامە و پەڕاوگەی دەفرۆشت، داوام لە دایکم دەکرد فیقەنەیەك و کەمێك هەڵمات و دەفتەری ڕەنگاوڕەنگم بۆ بکڕێت، دایکیشم دیارییەکی بۆ دەکڕیم و دەیخستە جانتاکەی دەستیەوە، ئیتر ئۆقرەم لێ دەبڕا و دەمویست زوو بگەڕێینەوە ماڵەوە.

دایکم دەیگوت: "با بڕۆین، بەناو پارکەکەدا کەمێك پیاسە بکەین."، بەڵام من قاچەکانم ئەوەندە ئازاریان هەبوو، نەمدەتوانی هەنگاو بنێم. چەند ساڵ دواتر کاتێك لەگەڵ کچەکەم، کە لە هەمان تەمەنی ئەو کاتەی من بوو، دەڕۆشتین بۆ پیاسەکردن، ئەویش هەمان گازندەی دەکرد کە چیتر ناتوانێت لەسەر پێکانی بڕوات. کاتێك دەمانبردە نەخۆشخانە، پزیشك ئازارەکەی بە هیلاکبوونێکی ئاسایی دەستنیشان دەکرد. کاتێك تەواو ماندوو دەبووم، ڕەنگی ئەو شەقام و پەنجەرانەی کە کەمێك لەمەوبەر سەرنجم دابوون، دەگۆڕدرا بۆ ڕەنگی ڕەش و سپی.

"دایکە، لەباوەشم بگرە!"

دایکم وەڵامی دەدامەوە و دەیوت: "باکەمێك پیاسە بکەین بەناو ماچکا، دواتر سواری پاسی ترۆلی دەبین و دەگەڕێینەوە."

لە ساڵی (١٩١٤)وە، ترۆلییەکان بە شەقامەکەی ئێمەدا دەهاتن و دەچوون، ماچکا و نیشانتاشییان دەبەستەوە بە مەیدانی تاقسیم و تونێل و پردی گالەتاوە و هەموو کۆڵانە هەژار و دێرینەکانی تر کە وا دەردەکەوتن سەر بە شارێکی تر بن. ئەو کاتانەی سەرلەئێوارە دەچوومە جێی خەوەکەمەوە، ئاوازی خەمگینی ئەم ترۆلییانە لایلایەیان بۆ دەکردم هەتا خەو دەیبردمەوە. زەوییە تەختە و شووشە نیلی و شینەکەی سەر دەرگای نێوان شوفێر و سەرنشینەکانم خۆش دەویست. تەنانەت ئەو سولفەشم خۆش دەویست کە شوفێرەکە ڕێگای دەدا لەو کاتەی دەگەشتینە کۆتایی هێڵەکە و چاوەڕێی دابەزینمان دەکرد، یاریی پێ بکەم. هەتا دەگەشتینە ماڵەوە، شەقامەکان و ئەپارتمانەکان و تەنانەت درەختەکانیش بە ڕەنگی ڕەش و سپی داپۆشرابوون.



## ٥

# ڕەش و سپی

لە ڕۆژە تاریک و هەورارییەکاندا، خووم پێوە گرتبوو، لە ژووری مۆزەخانە سپی هەڵگەڕاوەکەی ماڵەوە بمێنمەوە و نەچمە دەرەوە. شەقامەکان و گەڕەك و کۆڵانە هەژارەکان، هێندەی دیمەنە ڕەشوسپییەکانی ناو فیلمی چەتەکان، ترسێنەر دەردەکەوتن. سەرنجڕاکێشیی دونیای سێبەراوی، وای کردبوو هەمیشە زستانی ئەستەنبوڵم زیاتر لە هاوین لا خۆشتر بێت. حەزم لەو ئێوارانە بوو کە پاییز بەرەو زستان دەچوو و درەختە بێ گەڵاکان بە شنەبایەك دەلەرزین و خەڵکی بە چاکەت و قاپووتە ڕەشەکانیانەوە بەپاکردن بەناو شەقامە تاریکەکاندا بەرەو ماڵەوە دەگەڕانەوە. حەزم لە سەیرکردنی دیمەنی خەمگینی دیواری باڵەخانە کۆنەکان و ڕووپۆشی تاریکی کۆشکە تەختە داڕووخا و بێ بۆیە و پشتگوێخراوەکان بوو. ئەم دیمەنە سێبەراوییانەم بەتەنها لە ئەستەنبوڵ بینیوە. کاتێك ئێوارانی زستان، تەماشای دیمەنی ڕەشوسپیی ئاپۆڕەی جەماوەرم دەکرد کە بەلێشاو بەناو کۆڵانەکاندا ڕێیان دەکرد، هەستێکی قووڵم بۆ دروست دەبوو، وەك ئەوەی شەو ژیانمان و شەقامەکان و هەموو ئەوانەی کە هەمانە بە تاریکی داپۆشیتبێت، وەك ئەوەی لە ماڵ و لە ژوور و جێگای خەوەکەمان، بەبێ ترس گەڕابێتینەوە بۆ خەونی دەوڵەمەندیی لەدەستچوو و ژیانی ئەفسانەیی ڕابردوومان. کاتێك سەیری ئەو زەردەپەڕەم دەکرد کە وەك هۆنراوەیەك لەناو ڕووناکیی زەردی گڵۆپەکانی سەر شەقامەکان درێژ بووبوویەوە بۆ ئەوەی ئەو گەڕەکە دێرینانە داپۆشێت، هەستم بە ئارامی دەکرد، چونکە پێم وا بوو هیچ نەبێت لە شەودا، بەبێ

ترس دەژین و هەژارییە شەرمەزارییەکەی شارەکەمان لە چاوی ڕۆژئاواییەکان دادەپۆشین.



ئەو وێنەیەی لەلایەن ئارا گولەرەوە گیراوە، زۆر بەجوانی وێنەی گەڕەکەکانی دواوەی کاتی منداڵیمی دەرخستووە. لە وێنەکەدا، بینا کۆنکریتکراوەکان لەتەنیشت خانووی بە تەختە دروستکراوەکانەوەن، ڕووناکیی کزی چرای سەر ڕێگاکان و تاریکیی گزنگی بەیان _ئەو شتەی بە تێڕوانینی من وەسفی شارەکە دەکات_ دەکەونە بەرچاو. (هەرچەندە لەگەڵ ڕۆژگاری ئەمڕۆی جیاوازییەکەی ئەوتۆی نییە، چونکە بە هەمان شێوە باڵەخانەکان بەتەواوەتی زاڵبوون بەسەر خانووە تەختییەکاندا.) لە وێنەکەدا، تەنها چەوی سەر شەقام و شۆستەکان، بەربەستی ئاسنینی پەنجەرەکان و خانووە تەختە چۆڵ و کاولبووەکان سەرنجی ڕانەکێشام، بەڵکو ئەو دوو کەسە سەرنجیان ڕاکێشام کە لە دەمەوئێوارەدا، کاتێك هەموو شارەکە بە شەو داپۆشراوە، لەسەر ڕێگاکەیانن بۆ ماڵەوە و سێبەرەکەیان بەدوایانەوە ڕاکێشراوە.



له سالآنی نێوان( ١٩٥٠ بۆ ١٩٦٠)، وەك هەر كەسێكی تری شارەكەم، حەزم له سەیركردنی دەستەی ئامادەكردنی فیلمەكان بوو كە بە هەموو شارەكەدا دەگەڕان. لۆگۆی كۆمپانیای فیلمەكان لەسەر لاتەنیشتی مینی پاسە بچووكەكەیان هەڵواسرابوون، دوو موەلیدەی گەورەی ڕووناكی دادەگیرسان، بێژەرێك كە دەبووایە بە دەنگێكی بەرزتر لە نەڕەی موەلیدەكان هاواری بكردایە، لەو ساتانەی كە ئافرەتە ئەكتەرە مكیاج تۆخەكان و پاڵەوانە ڕۆمانسییەكان دەقێكیان لەبیر دەچوو، كرێكارەكان خۆیان دەخشاند بە منداڵ و بینەرە نامۆكانی سەر كورسییەكان، بۆ ئەوەی سەیری دیمەنەكان بكەن. چل ساڵ دواتر، فیلمەكانی سەردەمی پیشەسازی بوونیان نەما (ئەمەش زیاتر بە هۆی لاوازیی دەرهێنەر و ئەكتەر و بەرهەمهێنەرەكان و شكستهێنانیان بووە لە ڕكابەریكردنی فیلمەكانی هۆلیوود). هەر كات ئەم فیلمە ڕەشوسپییانە لە تەلەفزیۆن پیشان دەدرێن و كۆڵان و باخچە كۆنەكان، دیمەنەكانی بۆسفۆر، كۆشكە ڕووخاوەكان و بیناكان بە ڕەنگی ڕەش و سپی پیشان دەدرێن، هەندێك جار بیرم دەچێت كە سەیری فیلم دەكەم، وا هەست دەكەم سەیری ڕابردوومان دەكەم.



لە تەمەنی شازدە بۆ حەڤدەساڵی، ئەو کاتەی خۆم بە وێنەکێشێکی سەرکەوتوو دادەنا، هیوایەتم ڕەنگکردنی دانەبەدانەی چەوی کۆڵانەکان بوو. پێش ئەوەی شارەوانی بێبەزەییانە دەست بکات بە داپۆشینی ئەو بەردانە بە قیرتاوکردنیان، شوفێری تەکسی و پاسەکان هەمیشە گازندەی ئەوەیان هەبوو، ئەو بەردانە زیان بە تایەی ئۆتۆمبێلەکانیان دەگەیەنن، لە لایەکی ترەوە گلەیی ئەوەشیان دەکرد کە کاری تەواوکردنی زێراب و ڕیگاوبان و کارەبا و چاکردنەوەکانی تر، هەر دواییان نایەت. کاتێك قیرتاوکردنەکە دەستی پێ کرد، ڕێگاوبانی کۆڵانەکان هەڵدەکەنران و چەوەکەی سەریان بەپەلە لا دەبرا _هەرچەندە ئەم کارە بۆ هەمیشە درێژەی خایاند، بەتایبەت لەدوای ئەوەی ڕیگای ژێرزەمینیی بێزەنتەیان دۆزییەوە_ حەزم لە سەیرکردنی ئەو کرێکارانە بوو کە بەردەکانیان دانەبەدانە بە جادوویەکی پسپۆڕیی هاوسەنگ دەگواستەوە.

کۆشکە بە تەختە دروستکراوەکانی سەردەمی منداڵیم و خانووە بچووك و تەختەکانی دواوەوەی شارەکە، لە بارێکی موگناتیسیی داڕوخاندا بوون. هەژاری و پشتگوێخستن، دەستی گرتبوو بەسەر ئەم خانووانەدا کە هەرگیز ڕەنگ نەکرابوون. تەختەکانیان بە هۆی تێپەڕبوونی زەمەن و چڵکنی و شێدارییەوە تاریك بووبوون و ڕەنگێکی تایبەتیان هەبوو. وەك منداڵێك، پێم وا بوو ئەو ڕەنگە ڕەشەی خانووی کۆڵانە هەژارەکان، هەر خۆی لە بنەڕەتەوە بەو جۆرەیە. هەندێك لە خانووەکان، ڕەنگێکی

قاوەییان هەبوو، بە هۆی ئەوە بووە ئەم گەڕەکە هەژارنشینانە، هەرگیز نەیانزانیوە ڕەنگیان بکەن. بەڵام گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانی سەدەی هەژدەیەم و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، بە جۆرێك وەك کۆشکێکی درەوشاوە و ڕەنگکراو کە لەوپەڕی جوانی و هێزدا بێت، وەسفی کۆشکی کۆلانە دەوڵەمەندەکانیان کردووە. وەك منداڵێك، هەندێك جار وا خەیاڵم دەکرد هەموو ئەو خانووانە ڕەنگ بکەم، بەڵام تەنانەت لابردنی داپۆشەری ڕەشوسپیی شارەکە ترسێنەر بوو. لە هاویندا، کاتێك خانووە تەختە کۆنەکان وشك دەبوونەوە و دەگۆڕان بۆ ڕەش و چڵکن دەبوون، وەك سندووقێکی تەقەمەنیی لێ دەهات و چاوەڕێ دەکرا لە هەر خولەکێکدا ئاگر بگرن. بە درێژایی سەرمای زستانیش، بە هۆی بەفر و بارانەوە تەختە خراپبووەکانی هەمان ئەم خانووانە، کەڕوویان هەڵدەهێنا. هەمان شت لە تەکیە کۆن و بە تەختە دروستکراوەکانی دەروێشەکان ڕووی دەدا. زۆربەی ئەو تەکییانە، لەلایەن حکومەتی کۆمارییەوە قەدەغە کران کە بکرێنە شوێنی پەرستش و زۆربەیان دەستیان لێ هەڵگیرا، یان تەنها جێگەی منداڵی سەرگەردان و تارمایی و ڕاوکەرەکانن. کاتێك سەیری دیوارە نیوە ڕووخاوەکان و درەختە شێدار و پەنجەرە شکاوەکانیان دەکەم، هەست بە هەمان ترس و نیگەرانی دەکەم و موچوڕکە بە لەشمدا دێت.

بۆ تێگەیشتن لە ڕۆحە ڕەشوسپییەکەی شارەکە، هەمیشە سەیری هێڵی ئەو نیگارانە دەکەم کە زۆر بە سەلیقەوە لەلایەن گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانی وەکو لی کۆبیوسەر کێشراون، یاخود هەر کتێبێکێکی تر کە لەبارەی ئەستەنبوڵەوە نووسراوە و نیگارەکانی ڕەشوسپین. (هەموو ڕۆژانی بێکاریی منداڵیم، لە چاوەڕوانیکردنی کاریکاتێری سەرکەشییەکانی (تان تان)م کە لەلایەن هورجییەوە نوسرابوو، بەسەر دەبرد. یەکەم فیلمی (تان تان) کە لێرە بەرهەم هێنرا، پشتی بەستبوو بە پەرتووکێکی ڕەشوسپیی منداڵان بە ناوی (تان-تان) لە ئەستەنبوڵ. دروستکەری کارتۆنە ناوخۆییەکە، دیمەنەکانی خۆی لەگەڵ سەرکەشییەکانی تری (تان تان) لە فیلمەکانی تر تێکەڵ کردبوو). لە هەمان کاتدا، زۆر ئارەزووم لە خوێندنەوەی ڕۆژنامە کۆنەکانە. هەر کات دەگەمە لاپەڕەی کوشتن و تاوان و خۆکوشتن و دزی، هەست بە هەمان ترسی منداڵیم دەکەم.



ئەمە ڕەشوسپییەکەی ئەپباشی، گالەتا، فاتیح، زیرەك، چەند گوندێکی نزیك بۆسفۆر و کۆڵانە هەژارەکانی ئۆسکودارە، تەنانەت لە ئێستاش قسەکەم دەسەلمێنێت. لە بەیانیانی تەمومژاویدا، لە شەوانی باران و ڕەشەبادا، لەسەر گومەزی مزگەوتەکان کە نەوڕەسەکان هێلانەیان لەسەر دروست کردووە، لەناو دووکەڵی بۆریی ڕۆپاکان، هەورەکان، زبڵدانە ژەنگاوییەکاندا، پارك و باخچەکان کە لە ڕۆژانی زستاندا چۆڵن و کەسیان تێدا نییە، لەناو ئاپۆڕەی ئەو خەڵکەی لە ئێوارانی زستاندا بەناو قوڕ و بەفردا بەلێشاو بەرەو ماڵەوە دەگەڕێنەوە، هەمان ڕەنگی ڕەش و سپی دەبینی. چەندین خۆشیی خەمگین لە ڕەش و سپی ئەستەنبوڵدا هەیە: کانیاوە شکاوەکان کە چەندین سەدەیە پشتگوێ خراون، کۆڵانە هەژارەکان و مزگەوتە لەبیرکراوەکانیان، جەنجاڵیی لەپڕی منداڵانی قوتابخانەکان کە کراسی سپیی یەخە ڕەش و دووکەڵاوییان پۆشیوە، بارهەڵگرە کۆن و هیلاك و قوڕاوییەکان، فرۆشگای خواردەمەنییەکان کە بە هۆی تۆز و کۆنییانەوە تاریك بوبوون، دوکانە بچووك و پەڕپوت و وێرانەکانی گەڕەکەکان کە خاوەنەکانیان پیاوانێکی خەمبار و بێکار بوون، دیوارە داڕووخاوەکانی شار، وەکو زۆربەی ڕێگا چەوڕێژە تەواونەکراوەکان، دەرگای چوونەژوورەوەی سینەماکان کە لەپاش ماوەیەك دەکرانەوە بۆ ئەوەی نموونەیی دەرکەون، دوکانی شیرنەمەنییەکان، ئەو فرۆشیارە دەستگێڕانەی کە لەسەر شۆستەکان ڕۆژنامەیان دەفرۆشت، ئەو خەڵکە مەستانەی کە لە نیوەی شەودا وێڵ و سەرگەردان دەسووڕانەوە، گڵۆپە زەردەکانی سەر

شەقامەکان، ئەو کەشتییانەی بە بۆسفۆردا دەهاتن و دەچوون و ئەو دووکەڵەی لە دووکەڵکێشەکانەوە دەهاتە دەرەوە، هەموو شارەکە بە بەفر داپۆشرابوو.



بیرهێنانەوەی ڕۆژانی منداڵیم، بەبێ یادکردنەوەی داپۆشەری بەفری شارەکە شیاو نییە. لە کاتێکدا منداڵانی دیکە، چاوەڕێی پشووی هاوینیان دەکرد، من چاوەڕێی بارینی بەفرم دەکرد. ئەوەش نەك لەبەر ئەوەی کە دەچوومە دەرەوە و گەمەم پێ دەکرد، بەڵکو بەفر نەك تەنها بە داپۆشینی قوڕ و خاشاك و وێرانکاری و پشتگوێخراوەکان، بەڵکو بە دروستکردنی دیمەنێکی نامۆ و کەشێکی نایابی کارەساتێکی چاوەڕوانکراو لە هەر کووچە و کۆڵانێکدا، شارەکەی نوێ دەکردەوە. ساڵانە سێ تا پێنج ڕۆژ بەسەریەکەوە بەفر دەبارێی و هەفتەیەك یان زیاتر لە سەر زەوییش دەمایەوە. لە ئەستەنبوڵ هەموو جار کە بەفر دەباری، وەك ئەوە بوو کە یەکەم جاربێت: کۆڵانەکانی دواوە و ڕێگا سەرەکییەکان دادەخران، خەڵکێکی زۆریش وەك ئەوەی چاوەڕوانی ڕوودانی جەنگێك یان کارەساتێکی نەتەوەیی بن، لە نۆرەی نانەواخانەکاندا دەوەستان. سەرباری هەموو ئەو شتانە، ئەو هێزەی بەفر کە کاری دەکردە سەر مرۆگەلی ئێرە، هەتا هەموو وەك یەك ڕەفتار بکەن و وەك یەك گیرخواردوو بن و دابڕێن لە جیهانی دەرەوە، زۆرتر سەرنجڕاکێش بوو بەلامەوە. لە ڕۆژانی بەفردا، ئەستەنبوڵ دەبوویە شارێکی دابڕاو لەوانی دیکە، بەڵام بە تێڕامان، بە هەمان چارەنووسی هاوبەش لە ڕابردووی ئەفسانەییمان نزیك دەبووینەوە.

جارێکیان بە هۆی هەوایەکی زۆر ساردی ترسناکەوە، دەریای ڕەش بە درێژایی دانوب بۆ بۆسفۆر بەستی. ئەم ڕووداوە بۆ شارەکانی سەر دەریای ناوەڕاست، سەرسوڕهێنەر بوو. ساڵانی دواتریش، خەڵك بەجۆشەوە ڕووداوەکەیان دەگێڕایەوە.



بۆ بینینی ڕەشوسپیی شارەکە، دەبێت سەیری مێژووە تەڵخەکەی و ڕووخساری ئەو شتە بکەین کە کۆن بووە و فڕێ دراوە و ئیتر هیچ بایەخێکی بۆ جیهان نییە. تەنانەت پاشماوەی گەورەترین تەلاری عوسمانییەکان، لەناوچوونی ئیمپراتۆرەکە و خۆبەدەستەوەدان بۆ تێڕوانینی نزمی ئەورووپییەکان و هەژارییەکی بۆماوە پیشان دەدەن، کە دەبێت وەك کارەساتێکی چارەسەرنەکراو مامەڵەی لەگەڵ بکرێت. بۆ ئەوەی شارێك لە ڕەش و سپیدا، ئەو تەمەی شارەکەی داپۆشیوە و هەناسەی خەمباریی دانیشتووانەکەی ببینی کە هەمووان وەك چارەنووسێکی هاوبەش باوەشیان بۆ کردووەتەوە، دەبێت لە شارێکی خۆشی ئەورووپاوە هەڵبێیت و سەرێك لە شەقامە جەنجاڵەکانی ئێرە بدەیت. زستانان هەموو پیاوانی سەر پردی گالەتا، یەك جۆر جلوبەرگی زەرد هەڵگەڕاو و بۆر و سێبەراوییان پۆشیوە. ئەستەنبوڵییەکانی سەردەمی

من، جیاواز لە باوباپیرانی دەوڵەمەند و سەربەرزیان، پۆشینی جلوبەرگی ڕەنگ سوور و سەوز و پرتەقاڵیی شیاو نەبوو بەلایانەوە، بەلای ڕێبوارە بیانییەکانەوە بە جۆرێك دەردەکەوتن، وەك ئەوەی ئەم کارەیان بەئەنقەست بووبێت، بۆ ئەوەی ڕەوشتێکی جوان پیشان بدەن. بەڵام بەو جۆرە نییە، چونکە ئەوان لەناو تاریکیی سادەیی و بێفیزیدان. بەو جۆرە، لە شارێکی ڕەش و سپیدا بەرگ دەپۆشن و ماتەمینیی خۆیان بۆ شارێك دەردەبڕن، کە پەنجا یان سەدان ساڵە وێران کراوە.










زۆربەی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانی سەدەی نۆزدەیەمی شارەکە، هەر لە لامارتین و نێرڤالْ هەتا مارك تواین، لە نووسینەکانیان ئاماژەیان بەو سەگە بێ خاوەنانە داوە کە لە کووچە و کۆڵانآندا سووڕاونەتەوە و درامایەکی ڕەشوسپیی تری شارەکە بوون. ئەم سەگانە هەموویان یەك بیچم بوون، تەنانەت توکەکانیان یەك ڕەنگی نەناسراوبوون _ڕەنگێك بوو لەنێوان ڕەساسی و خۆڵەمێشی. سالآنێك دەوڵەت و سیستمی قوتابخانەکان یەك دوای یەك، کەمپینی لابردنی سەگی کۆڵانەکانیان دادەمەزراند، بەلآم

هەتا ئێستاش بەئازادی دەسوورێنەوە. ئەم بوونەوەرە شێت و سەرگەردانانە، ئەوەندە ترسێنەر و جۆرێکی یەکگرتوویی دەردەکەوتن، وەك ئەوەی بەرەنگاری دەوڵەت ببنەوە، هیچ سۆزم بۆیان نەدەجولا.





لەبەر ئەوەی ڕابردوو و شکۆداریی شارەکەمان لەبری ئەوەی لەلایەن کەسێکی ناوخۆوە بناسین، لە ڕێی نیگارە جێماوەکانی وێنەکێشەکانی ڕۆژئاواوە ناسیوە، ئەوەش هۆکارێکی دیکە بووە شارەکەمان بە ڕەشوسپی ببینین. هیچ نیگارێکی عوسمانییەکان

بوونی نییە، کە بەتەواوەتی چێژی سەیرکردنمان تێر بکات. ئەوەش نا، ئەمڕۆ دەقێك یان کارێکی ئەوتۆ نییە کە ڕێبەریمان بکات، چۆن چێژ وەربگرین لە هونەری عوسمانی و هونەری کلاسیکیی فارسی، کە زۆرگاریگەریی هەبووە لەسەر هونەری عوسمانی. هونەرمەندانی عوسمانی، ئەزموونیان لە هونەری فارسییەوە وەرگرتووە. هەر وەکو شاعیرەکانی دیڤان، شارەکەیان وەکو شوێنێکی ڕاستەقینە وەسف نەکردووە، بەڵکو وەك وشەیەك، یان (وەك نەخشەکێش ناسوھ) وەك نەخشەیەك، یاخود وەك کاروانێك وەسفیان کردووە، کە بەبەردەمیاندا تێدەپەڕێت. تەنانەت لە کتێبی باسی بۆنەکانیاندا، سەرنجیان لەسەر کۆیلەکانی سوڵتان و گەورەیی سامانەکەیان و بابەتەکانی تر بووە، شارەکە شوێنێك نەبوو بۆ ژیانی خەڵك، بەڵکو وەك گەلەرییەك بووە لە سەرنجی بۆچوونە جیاوازەکانەوە بینراوە.

کاتێك گۆڤارێك یاخود کتێبێکی قوتابخانە پێویستی بە تابلۆیەکی کۆنی ئەستەنبوڵ دەبێت، پشت بەو نیگارە ڕەشوسپییانە دەبەستن کە لەلایەن ڕێبوار و هونەرمەندە ڕۆژئاواییەکانەوە کێشراون. زۆر جار سەیری نیگارەکانی ئیمپڕاتۆریەتی ئەستەنبوڵ دەکەم، کە لەلایەن ئەنتۆن مێڵین کێشراون، کە دواتر زیاتر باسی دەکەم، بۆم دەردەکەوێت ئەو کەسانەی کە بە چارەنووسی خۆیان ڕازی بوون، پێیان باش بووە ڕابردووی خۆیان لە وێنەیەکی بێڕەنگ ببینن، چونکە کاتێك سەیری وێنەیەکی بێڕەنگ دەکەن، خەمی قبوڵکراوی خۆیان دەبینن.

لە ڕۆژانی منداڵیم، ژمارەیەکی کەم بینا هەبوون. کاتێك شەو دادەهات، بەرگی تاریکی هەموو خانوو و درەخت و سینەمایی هاوینی و باڵکۆن و پەنجەرەی کراوە و بینای چەماوە و کۆڵانی پێچاوپێچ و گردەکانی دادەپۆشی. ئەو نیگارەی تۆماس ئەلوم کە لە کتێبەکەیدا لە ساڵی ١٨٣٩ کێشاویەتی، زۆر لام جوانە. لە نیگارەکەدا، شەو ڕۆڵێکی دوو واتایی هەیە: تاریکی وەك سەرچاوەی خراپە، دەستی گرتووە بەسەر ئەو شتەی خەڵکی بە (کلتووری مانگەشەو)ی ئەستەنبوڵ ناوی دەهێنن. مانگەشەو، شارەکە لە تاریکیی تەواو ڕزگار دەکات. لە لایەکی دیکەوە، ڕووناکی کزی نیوەمانگ، یاخود ئەو مانگەی لەپشت هەورەکانەوە خۆی حەشار داوە، وەك بکوژێك وایە کە ڕووناکییەکان دەکوژێنێتەوە، بۆ ئەوەی کەس نەیبینێت لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەی.



بەتەنها گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان، زمانی شەویان بەکار نەهێناوە بۆ باسکردنی ڕووداوە نادیار و یەك لەدوای یەکەکانی. یان ئەگەر ئەو گەشتیارانە هیچ شتێکیان دەربارەی فێڵ و تەڵەکەکانی ناو کۆشکەکان نەزانیبێت، لەبەر ئەوە بووە ئەستەنبوڵییەکان هەمیشە حەزیان کردووە بە چرپەچرپ و نهێنی باسی ڕووداوەکانی ناو کۆشك و کوشتنی کچانی حەرەمسەرا و ئەو کچانەی تر بکەن کە جەستەیان لەودیوی دیواری کۆشکەکان و لەژێر تاریکی بۆگەنی کردووە و دواتر فڕێ دراونەتە ناو کەنداوی زێڕین، هەتا ئاوی دەریاکە دووریان بخاتەوە.

ڕووداوە ئەفسانەییەکەی سالاکاکی بکوژ (کە لە ساڵی ١٩٥٨ پێش ئەوەی من بچمە قوتابخانە، ڕووی دابوو. چیرۆکەکەم زۆر بەباشی لەبەر کردبوو کە ترسی لای خێزانەکەم _لە ڕاستیدا لای هەموو خێزانەکانی تری شارەکە_ دروست کردبوو)، فەنتازیایەکی تری ڕەشوسپی بوو دەربارەی خەونێکی ترسناك و بەلەمی سەوڵەکان و ئاوی بۆسفۆر. بۆیان گێڕامەوە (کە یەکەم جار لە دەمی خێزانەکەمەوە چیرۆکەکەم بیست)، ڤیلیان گەنجێکی هەژاری ماسیگر بووە، بەڵام لەو سەردەمەدا دانیشتووانی شارەکە بوختانیان بۆ کردووە، کە گوایا دایك و منداڵێکی ڕفاندووە و دواتر دەستدرێژی کردۆتە سەر ئافرەتەکە و منداڵەکەشی فڕێ داوەتە ناو ئاوەکەی بۆسفۆر. ڕۆژنامەکان بە ناوی (دێوە سالاکاك) باسی ڕووداوەکەیان کردووە. دایکم هەمیشە ترسی ئەوەی لە دڵدا بوو کە

ڕەنگە ماسیگرێکی تری هاوشێوەی ئەو، خۆی حەشار دابێت و تۆڕەکەی لەنزیک ماڵە هاوینییەکەمان لە حیبەلەدیە دانابێت. لەبەر ئەوە، هەر کات لەو خانووە بووینایە، دایکم نەیدەهێشت من و براکەم بۆ یاریکردن بڕۆینەوە دەرەوە و تەنانەت بۆ ناو باخچەکەشمان ڕێگریی لێ دەکردین. لە خەیاڵە ترسناکەکانمدا، گوێم لە قاوقیژی دایکەکان دەبوو، کاتێك تارماییە سێبەراوییەکەی ماسیگرەکە بە سەتڵەکەی دەیکێشا بە سەریاندا و سەیری دەکرد کە چۆن منداڵانی دەخستە ناو ئاوەکەوە، ئەوانیش هەوڵیان دەدا بە پەنجەکانیان دەست بگرن بە بەلەمەکەوە. تەنانەت ئەمڕۆش کاتێك لە لاپەڕەکانی ئەستەنبوڵ دەربارەی تاوانی کوشتنەکان دەخوێنمەوە (تەنها بۆ خۆشیی خۆم ئەو جۆرە بابەتانە دەخوێنمەوە)، هەمان ئەم دیمەنە ڕەشوسپییانە دێنە بەرچاوم.

## ٦

# گەڕان بە بۆسفۆردا

لەدوای بیستنی بەسەرهاتەکەی سالاکاك، من و براکەم هەرگیز جارێکی تر بە بەلەم لەگەڵ دایکمان گەشتمان نەکرد. بەڵام زستانی پێش ڕووداوەکە، کاتێك من و براکەم تووشی کۆکەیەکی قورس هاتین، دایکم بۆ ماوەیەك هەموو ڕۆژێك دەیبردین بۆ بۆسفۆر. سەرەتا براکەم نەخۆش کەوت، منیش لەدوای دە ڕۆژ نەخۆش کەوتم. لە ماوەی نەخۆشییەکەم، خۆشییەکی زۆرم لە کۆمەڵێك شت بینی: دایکم زۆر بەسۆزتر لە جاران ڕەفتاری لەگەڵ دەکردم، هەموو ئەو وشە شیرینانەی دەگوتن، کە زۆر ئارەزووم لە بیستنیان بوو و هەموو ئەو کەلوپەلی گەمانەی بۆ دەکریم کە حەزم لێیان بوو. بەڵام شتێك هەبوو، دوورخستنەوەم لە مێزی خوانی خێزانەکە، بیستنی زرنگەزرنگی چەقۆ و چەنگاڵ و قاپەکان و پێکەنینی ئەوانی تر بەبێ ئەوەی نزیك بیت لێیانەوە بزانیت چی دەگوترێت، لە بەرگەگرتنی نەخۆشییەکەم قورستر بوو.

لەپاش ئەوەی لەرزوتاکەمان نەما، ئالبەر" پزیشکی منداڵان (هەموو شتێکی ئەم پیاوە ترسێنەر بوو بەلامانەوە، لە سمێڵیەوە هەتا جانتاکەی دەستی)، ڕێنمایی دایکمی کرد، ڕۆژانە بمانبات بۆ بۆسفۆر هەتا هەوای پاك هەڵمژین. ئەو وشەیەی کە لە زمانی تورکیدا وەك وشەی بۆسفۆر وایە، ئەویش وشەی گەرووە، لەبەر ئەوە لەپاش ئەو زستانە، هەمیشە بۆسفۆرم دەبەستەوە بە هەوای خاوێنەوە. شارۆچکەی تەرەبیەی بۆسفۆر، ڕۆژێك گوندێکی دوورەپەرێزی ڕاوەماسیی ڕۆمەکان بووە و ئیستاش بووەتە سەیرانگایەکی بەناوبانگ و چەندین هۆتێل و چێشتخانەی تێدایە، لەو کاتانەی کە شاعیر جەڤافی سەدان ساڵ لەمەوبەر لەوێ ژیاوە، بە ترابیا ناسراوە.

ئەگەر شارەکە وێرانی و شکست و خەم و هەژاری بەسەردا هاتبێت، بۆسفۆر گۆرانیی بۆ ژیان و شادومانی چڕیوە. ئەستەنبوڵ، هێزی لە بۆسفۆرەوە وەرگرتووە. هەرچەندە ڕۆژانی زوو، زۆر جێگەی بایەخ نەبووە، تەنها دیمەنێکی دڵڕفێن یان ڕێگایەکی ئاوی بووە و لەپاش دوو سەد ساڵ بووەتە جێگایەکی شیاو بۆ کۆشکە هاوینییەکان.





بۆسفۆر بۆ ماوەی چەندین سەدە، ناوەندی ڕاوەماسیی گوندە ڕۆمانییەکان بووە، بەڵام لە سەدەی هەژدەیەمەوە خانەدانە عوسمانییەکان کردوویانە بە مەڵبەندی ماڵە هاوینییەکانیان. زۆرتر لەدەوری گۆکسو، کوچوکسو، بەبەك، کاندیلی، ڕومليحيسار و کانلیکا کلتووری عوسمانییەکان بە ڕووی ئەستەنبوڵدا کرایەوە و جیای کردەوە لە هەموو جیهان. *یالەکان* کە کۆمەڵێك کۆشکی قەراغ ئاوی سەرنجڕاکێش بوون، لە ماوەی

سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم لەلایەن عوسمانییە زەنگینەکانەوە دروست کراون. لە سەدەی بیستەیەم، لەگەڵ لەدایکبوونی دەوڵەتی کۆماریی تورکیا، وەك ناسنامەیەکی دێرین ناسراون. لە کتێبی (یادگارییەکانی بۆسفۆر)، وێنەی ئەو *یالانە* هەن کە لەلایەن میلینەوە وێنەیان کێشراوەتەوە و ڕەنگدانەوەی ***یالەکانی*** سەداد حەکی ئەلدەمن، کە مەزنی و جوانیی کۆشکەکان و دووکەڵکێشی تەسك و پەنجەرە بەرز و دەرپەڕیوەکانیان بوونەتە سێبەری ئەو کلتوورە وێرانەیە.







پاسەکانی نێوان تاقسیم-ئەمیرجان، لەپاش ساڵی (١٩٥٠)ەوە بەناو نیشانتاشیدا تێپەڕ دەبوون. ئەگەر بە پاس بڕۆشتینایە بۆ بۆسفۆر، لەنزیکی ماڵەوە سوار دەبووین، بەڵام ئەگەر لە ڕێگای ترۆلییەوە بڕۆشتینایە، لە بەبەك سەر دەکەوتین. لەپاش پیاسەیەکی دووروودرێژ لەکەنار ئاوەکە، دەڕۆشتین بۆ لای پیاوێکی بەلەمەوان کە هەمیشە لە هەمان کات و هەمان شوێندا چاوەڕێی دەکردین. کاتێك سواری بەلەمە بچووکەکەی دەبووین و بە بەلەمە سەوڵدارەکان، پاپۆڕەکانی سنووری شارەکە، کەشتیی گواستنەوەی سەدەف و مەشخەڵی کەشتییەکان دەوره دەراین و بەرەو تەوژمەکانی بۆسفۆر دەچووین، نزام دەکرد و دەمگوت ئەمە کۆتا جارمە.



لە گەشتێکی بەجۆشی بۆسفۆردا، ناوەندی شارەکە و ئەستەنبوڵێکی گەورە و مێژوویی و مات دەبینی و هەست بە ئازادیی دەریا دەکەیت. هەر ڕێبوارێك بە لای تەوژمەکانیدا کە بای دەریاکە دەیانخاتە جووڵە و هەموو شوێنەوارێکی پیسی، دووکەڵ، ژاوەژاوی ئەو شارە قەرەباڵەی کە دەوری داوە لەناو دەبات، پەی بەو ڕاستییە دەبات کە بۆسفۆر سەرباری هەموو شتێکی دیکە، شوێنێکە بۆ چێژ وەرگرتن لە تەنیایی و

دۆزینەوەی ئازادی. ئەو ڕێگا ئاوییەی کە بەناوەڕاستی شارەکەدا تێدەپەڕێت، نابێت لەگەڵ کەنداوەکانی ئەمستردام و ڤینیسیا، یان ئەو ڕووبارانەی پاریس و ڕۆم لەیەک جیا دەکەنەوە، بەراورد بکرێت: هەمیشە تەوژمی بەهێز، ڕاست و چەپی بۆسفۆر دەکەن و ئاوە قووڵ و تاریکەکەی، بە هۆی شەپۆل و ڕەشەباوە هەمیشە لە جووڵەدایە.

ئەگەر بە بەلەمێك بەناو ئاوەکەدا گەشت بکەیت، ئەوا چاوت دەکەوێت بە باڵەخانەکان و *یالەکان*، ئەو پیرەژنانە بەدەم چای خواردنەوە لە باڵکۆنیەکانیانەوە سەیرت دەکەن، کەپری ئەو قاوەخانانەی بوونەتە هێلانەی باڵندەکان، ئەو منداڵانەی بە دەرپێکورتەوە خۆیان دەخەنە دەریاکەوە، ئەو پیاوانەی لەسەر شۆستەی قەراغ دەریاکە ڕاوەماسی دەکەن، ئەو خەڵکانەی لەناو یەختەکانیان ڕاکشاون، ئەو منداڵانەی لە قوتابخانە گەڕاونەتەوە و لەکەنار ئاوەکە پیاسە دەکەن، ئەو گەشتیارانەی لە پەنجەرەی پاسەکانەوە سەیری دەریاکە دەکەن، ئەو پشیلانەی لەکەنار ئاوەکە خۆیان مەڵاس داوە و چاوەڕێی ماسیگرەکان دەکەن. درەختە بەرزەکان، ڤێللا شاراوەکان، دیواری ئەو باخچانەی کە هەرگیز نەتزانیوە بوونیان هەیە، ئەو کۆڵانە تەسکانەی بەرەو گردەکان درێژ بوونەتەوە، ئەو بینا بەرزانەی وێنەکەیان لەناو ئاوەکەدا ڕەنگ دەداتەوە. هەروەها لەدوورەوە ئەستەنبوڵ دەبینی بە هەموو دیمەنەکانی تریەوە _مزگەوتەکان، کۆڵانە هەژارەکان، پردەکان، منارەکان، تاوەرەکان، باخچەکان و باڵەخانە تێکەڵوپێکەڵەکان. گەڕان بە بۆسفۆردا بە بەلەمی بچووك یان بەلەمی ماتۆڕی، یاخود هەر شتێکی دیکە، ئەوا ماڵ بە ماڵ و کۆڵان بە کۆڵانی شارەکە، یان لەدوورەوە وەك سێبەر، یان سەرابێکی هەمیشە گۆڕاو دەیبینی.





لە گەشتە خێزانییەکانمان بۆ بۆسفۆر، زیاتر ئارەزووم لە بینینی هەموو ئەو شوێنەوارە کلتووریی و بەبەهایانە بوو کە ڕەسەنایەتیی خۆیان لەدەست نەدابوو و لەلای ڕۆژئاواییەکان زۆر گرنگ و سەرنجڕاکێش بوون. بە ڕاوەستانت لەبەردەم قاپییەکی گەورە و ئاسنینی *یالێك*، بە سەیرکردنی دیوارە ئەستوور و بە قەوزە داپۆشراوەکانی *یالێکی* تر، بە سەرنجدانی دەروازە و کارە بە تەختە دروستکراوەکانی *یالی* سێیەم و گرانبەهاتر و تەماشاکردنی ئەو دار ئەرخەوانانەی کە لە گردەکەوە بەرەو ئەم *یالە* هاتوون، بە تێپەڕبوون بە یەکێك لە باخچانەی کە بە هۆی درەختە سەوز و چڕوپڕەکانی چەندین سەدەوە تاریك بوون، تەنانەت منداڵێکیش هەست دەکات کە شارستانیەتێکی تەواو گەورە لێرە ڕاوەستاوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان خەڵکێکی وەکو ئێمە ژیانێکی تەواو جیاواز لەوەی ئێمەیان بەڕێ کردووە و ئێمەیان لەدوای خۆیان جێ هێشتووە کە لەچاو ئەوان هەست بە هەژاری و لاوازی و بێدەسەڵاتیی خۆمان دەکەین.





له نیوەی سەدەی نۆزدەیەمەوە، لە اش شکستە یەك لەدوای یەکەکانی سوپاکە، گۆڕانی شارە دێرینەکە بە هۆی کۆچەرییەکان و وێرانبوونی بیناکانی ئیمپڕاتۆرەکە، پادشا و خانەدانە مۆدێرنە بیۆکراسییەکانی عوسمانی، هێدی هێدی ڕوویان لە کەنارەکانی بۆسفۆر کردووە، لەویٚ کۆشکەکانیان و کلتوورێکی نوێیان بنیات ناوە و خۆیان لە هەموو جیهان جیا کردووەتەوە. زۆربەی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان نەیانتوانیوە بچنە ناو ئەم کۆمەڵگا داخراوەوە، چونکە هیچ ڕێگایەکی قیرتاوکراوی تێدا نەبووە. تەنانەت لەدوای کردنەوەی ڕێگەی کەشتی لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەم، بۆسفۆر بەتەواوەتی نەبۆتە بەشێك لە شارەکە _عوسمانییەکان کاتێك بۆسفۆریان هەڵبژاردووە بۆ کردنەوەی کۆشکەکانیان، هیچ نووسراوێکیان دەربارەی ژیانیان لەدوای خۆیان جێ نەهێشتووە، لەبەر ئەوە دەبێت تەنها پشت بە بیرەوەرییەکانی نەوەکانیان ببەستین.

گەشاوەترینی ناو ئەو بیرەوەرییانە (شارستانیەتی بۆسفۆر)ی عەبدولحەق شناسی حیسار (١٨٨٧-١٩٦٣) بووە، کە پڕ کراوە لە ڕستەی هەستی پڕۆستیانی. ئەم پیاوە بیرەوەرینووسە، زۆربەی تەمەنی لاوێتیی لە پاریس بەسەر بردووە و هاوڕێی شاعیر یەحیا کەمال (١٩٥٨-١٨٨٤) بووە و پێکەوە دەرسی زانستی سیاسییان خوێندووە. لە کتێبی (مانگەشەوی بۆسفۆر و *باڵەکانی* بۆسفۆر)، تێکۆشاوە لە ڕێی کاری زرنگ و وێنە کۆنەکانەوە، کلتوورە ونبووەکەی دروست بکاتەوە.



حیسار لەبارەی نەریتەکانی ڕۆژانەیان و کاتە خۆشەکانی شەوانیان، کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانی لەسەر کەڵەکێك کۆبوونەتەوە، بۆ ئەوەی سەیری گەمەی ڕووناکیی زیوینی مانگەشەو بکەن لەسەر ڕووی ئاوەکە و چێژ لەو مۆسیقا وەربگرن کە بای شەماڵ لە بەلەمێکی دوورەوە هێناویەتی. هەر کات کتێبی (مانگەشەوی بۆسفۆر) دەگرم بە

دەستمەوە، هەست بە داخ دەكەم كە هیچ هەلێك نەبووە هەتا دەمودەست گەواهیدەدەری سۆز و بێدەنگییەكانی ناو كتێبەكە بم و بە بینینی ئەوەی چۆن نۆستالجیای بەتینی نووسەر چاوی كوێر كردووە لە ئاست ئەو خراپی و تاریكییە شاراوانەی كە لە بەهەشتە ونبووەكەیدا هەبوون، هەست بە شادومانی دەكەم. لە مانگەشەوەكاندا، كاتێك لەسەر ئاوێكی ئارام لەسەر بەلەمەكانیان كۆ بوونەتەوە و مۆسیقاژەنەكان بەبێدەنگی دانیشتوون، حیسار بەم جۆرە باسی دیمەنەكەی كردووە: "لە كاتێكدا هیچ هەناسەیەك نەبووە و هەوا كشومات بوو، بەلام ئاوەكە هەر وەكو ئاوریشم جوولاوە."





کاتێك لەگەڵ دایکم بە بەلەم بەناو ئاوەکەدا ڕێمان دەکرد، بەرزاییەکانی دەوری بۆسفۆر بە ڕووناکیی دەرەوە هیچ ڕەنگدانەوەیەکیان لەناو ئاوەکەدا نەبوو. دار ئەرخەوان و ئەسپیندار و باڵە شەکاوەکانی ئەو نەورەسانەی بەتیژی بەلاماندا تێدەپەڕین و دیوارە نیوەڕووخاوەکانی مەیدانی بەلەمەکان بە جۆرێك دەردەکەتن، وەك ئەوەی بە هۆی ئەو ڕووناکییە تەڵخەوە بدرەوشێنەوە کە لەناوەوەی ئاوەکەوە دەهات. تەنانەت لە ڕۆژە زۆر گەرمەکاندا، لەو ڕۆژانەی منداڵە داماوەکان لەتاو گەرما لەکەنار ئاوەکەوە خۆیان دەخەنە ناو دەریاکەوە، خۆر کاریگەرییەکی ئەوتۆی نابێت لەسەر گۆڕینی دیمەنەکان. لە ئێوارانی هاویندا، کاتێك ئاسمانی سوور لەگەڵ چارەنووسی تاریك و نادیاری بۆسفۆردا تێکەڵ دەبێت، ئاوەکە کەف دەکات و کەفەکەشی شێتانە بەشوێن کەشتییەکانەوە ڕادەکێشرێت. بەڵام ڕێك لەتەنیشت کەفەکەوە، ئارامترین و نەرمترین بەشی دەریاکە هەیە، کە ڕەنگەکەی وەکو شەپۆلەکان بەزوویی ناگۆڕێت، هەر وەکو حەوزی گوڵڕەنگی نیگارەکەی مۆنێت وایە.

لە ساڵی ١٩٦٠، کاتێك لە قوتابخانەی ئامادەیی ڕۆبێرت دەمخوێند، کاتێکی زۆرم لە پاسە قەرەباڵغەکانی بەشکتاش–ساریێر بەسەر برد، کە دەیڕوانیە سەر بەرزاییەکانی کەناری ئاوەکەی بەشی ئاسیا. کاتێك لەنێوان کورسییەکانی بەپێوە دەوەستام، سەیری بۆسفۆرم دەکرد کە وەك دەریایەکی نادیار دەبریسکایەوە، دواتر لەگەڵ خۆرئاوابوون، ڕەنگەکەی دەگۆڕا. لە بەیانییە تەمومژاوییەکانی بەهاردا، کە هیچ خشەیەکی گەڵا نییە لە شارەکەدا، لە شەوە کپ و بێدەنگەکانی هاویندا، کاتێك کەسێك بەتەنیا لەکەنار بۆسفۆر پیاسە دەکات، جگە لە دەنگی تەپەی پێیەکانی، هیچ دەنگێکی تر نابیستێت. ئەو ساتەی بەدەوری ئاکینتی بورنو پیاسە دەکات، یان لەپشت ئارناڤوتکۆی، یاخود ئەو کاتەی دەگاتە لای ڕووناکیی پشکنەری نزیك گۆڕستانی ئاشیان، کاتێك گوێبیستی نەڕەی تەوژمەکان دەبێت و سەرنجی کەفی بریقەدار و سپیی ئاوەکە دەدات، ئەوا لەو ساتەدا سەرسام دەبێت و جگە لە خەیاڵکردن، هیچ شتێکی تر بە مێشکیدا نایەت. هەر وەکو من و ع. ش. حیسار، کە جارێکیان هەمان گەشتمان کرد، دەگات بەو ئەنجامەی بۆسفۆر ڕۆحی هەیە.

بۆ بینینی درەختە سەوزەکان، دارستانە تاریکەکانی ناو دۆڵەکان، *یاڵە* خاڵی پشتگوێخراوەکان، کەشتییە شڕ و کۆنەکان و ژەنگاوییەکان، پاپۆڕەکان، جوانیی کەشتییەکانی بۆسفۆر و *یاڵەکان*، بۆ سڕینەوەی ئازارە مێژووییەکان و خۆشیبینین لێیان هەروەك منداڵێك، بۆ زانینی زیاتر دەربارەی ئەم جیهانە و تێگەشتن لێی، ئەوا دەبێت خۆت بەدەستەوە بدەیت بۆ هەموو ئەو گومانانە کە نووسەرێکی پەنجا ساڵە، زۆر لەمێژ نییە وەك خۆشیبەخشێك لێیان تێگەیشتووە. هەر کاتێك ویستبێتم باسی جوانیی بۆسفۆر و کۆڵانە تاریکەکانی ئەستەنبوڵ بکەم، دەنگێگ لە ناخمدا ئاگادارم دەکاتەوە لە باسەکاندا هیچ زیادەڕۆییەك نەکەم. ئەگەر من شارەکەم وەك شارێکی جوان و سیحراوی ببینم، ئەوا دەبێت تێڕوانینم بۆ ژیانیشم بە هەمان شێوە بێت. هەندێك لە نووسەرانی نەوەکانی پێشوو، کاتێك دەربارەی ئەستەنبوڵ نووسیویانە، جۆرە نەریتێکیان هەبووە: زۆر باسی جوانییەکانی شارەکەیان کردووە. بەڵام کاتێك چیرۆکی هەمان ئەو نووسەرانە دەخوێنیتەوە، بۆت دەردەکەوێت کە ئەوان لەو شوێنە نەژیاون کە وەسفیان کردووە، بەڵکو ئاسوودەیی شارە ڕۆژئاواییەکانیان هەڵبژاردووە. لە پێشینەکانەوە فێر بووم، بۆ کۆکردنەوەی هەر پیاهەڵدانێکی ئەستەنبوڵ، دەبێت سەیری پیاهەڵدانەکانی ئەو کەسانە بکەم کە لێرە نەژیاون، چونکە ئەو نووسەرانەی کە باسی وێرانکاری و پەشێویی شارەکەی کردووە، ئاگاداری ئەو تیشکە نییە کە ژیانی ڕووناك کردۆتەوە. بۆ ئەوەی بگەین بە وەسفکردنی جوانییەکانی شارەکە و بۆسفۆر، دەبێت بگەین بە هەموو ئەو جیاوازییانەی کە لەنێوان ژیانی ناخۆش و هەموو سەرکەوتنەکانی ڕابردووی کەسێکدا هەیە.



گەشتەکەمان بە بەلەم لەگەڵ دایکم، هەمیشە لە هەمان ڕێگادا کۆتایی دەهات. پاش ئەوەی یەك دوو جار ڕووبەڕووی تەوژمی ترسناکی ئاوەکە دەبووینەوە، بۆ چەند جارێکی کەمیش، بەلەمەکەمان تووشی ڕاوەشان دەبوو بە هۆی ئەو کەشتییانەی کە بەلاماندا تێپەڕ دەبوو، بەلەمەوانەکە ڕووی دەکردە کەنارەکانی بەشی ئاسیا، کەمێك پێش ڕوملیحیسار کە لەوێ تەوژمەکان بەرەو کەناری ئاوەکە دەچوون. پاش ئەوەی دایکم کەمێك پیاسەی پێ دەکردین، لەگەڵ براکەم بەو تۆپانە گەمەمان دەکرد کە موحەمەدی بەزێنەر لە کاتی گرتنی شارەکە، بەکاری هێنابوون و ئێستاش لە دەورووبەری دیواری قەڵاکە دانراون. کاتێك سەیری ناوەوەی لوولە گەورە و کۆنەکانی ئەو تۆپانەم دەکرد کە کەسانی مەست و سەرگەردان ژیانیان تێدا بەسەر دەبردن و پڕ کرابوون لە میز و شووشەی شکاو و قوتووی قوپاو و فلتەری جگەرە، هیچ شتێکی دیکە بە خەیاڵماندا نایەت جگە لە هەستکردن بەوەی کە ئەم (پاشماوە نایابانە) بە لایەنی کەمەوە سوودیان بۆ ئەو کەسانە هەیە کە ژیانیان تێدا دەگوزەرێنن، ئەوەش ناچێتە مێشکی مرۆڤەوە.

کاتێك دەگەشتینە مەیدانی کەشتییەکانی ڕوملیحیسار، دایکم بە دەستی ئاماژەی بۆ ڕێگەیەکی چەوریژکراو و شۆستەیەك دەکرد، کە ئێستا بە چەندین قاوەخانە پڕ کراوەتەوە. دەیگوت: "لە وێ *یالێکی* تەختە هەیە، کاتێك کچێکی بچووك بووم، باپیرەتان هاوینان دەیهێناین بۆ ئەوێ." ئەم خانووە هاوینەییە، کە بە خەیاڵی من وەك خانوویەکی کۆن و وێران و ترسناك دەهاتە بەرچاوم، هەمیشە لە بیروهۆشمدا بەو چیرۆکانەم دەبەستەوە کە دەربارەی بیستبووم: هەر لەو ماوەیەی کە دایکم لێرە ماوەتەوە، لە ساڵانی سییەکان، خاوەنی ئەم خانووە، کچی پادشا کە لە نهۆمی خوارەوە ژیاوە، لەلایەن دزەکانەوە کوژراوە. کاتێك دایکم دەیبینی ئەو چیرۆکە چەندە ترسی لا دروست دەکردم، سەرنجی بۆ لای ڤێللا لەناوچووەکانی نزیك مەیدانی بەلەمەکان و چیرۆکێکی تر ڕادەکێشام و بە زەردەخەنەیەکەوە کە دڵتەنگی پێوە دیار بوو، بەسەرهاتی ئەو کاتەی بۆ دەگێڕاینەوە کە باپیرەم حەزی لە چێشتی بامیەی داپیرەم نەبووە و هەر کات بێتاقەت بووە، قاپی چێشتەکەی لە پەنجەرەکەوە فڕێ داوەتە ناو ئاوەکەی بۆسفۆرەوە.



له ئیستەنیە، *یالێکی* تر هەبوو کە دەیڕوانیە سەر مەیدانی بەلەمەکان، خزمە دوورەکانم لەوێ ژیاون و ئەو کاتانەش دایکم تۆراوە، لەوێ ماوەتەوە. بەڵام ئەوەندەی لەبیرم بێت، ئەم کۆشکە دواتر وێران بووە. لە ڕۆژانی منداڵیم، ئەم ڤێللایانەی بۆسفۆر لەلای دەوڵەمەندە تازە پێگەشتووەکان و ئەوانەی بەهێواشی دەبوونە بۆرجواز، هیچ دڵڕفێن نەبوون، چونکە کۆشکە کۆنەکان بەرگرییەکی کەمیان بۆ پاراستن لە هەوای باکوور و هەوای ساردی زستان بۆ دروست کرابوو و لەقەراغ ئاوەکە دروست کرابوون و زۆر بەقورسی گەرم دەکران. لەبەر ئەوەی خانەدانەکانی دەوڵەتی کۆماری وەك پادشاکانی عوسمانی زۆر بەهێز نەبوون، یاخود لەبەر ئەوەی زیاتر هەستیان بە خۆرئاواییبوون کردووە، شوێنی بنیاتنانی ئەپارتمانەکانیان لە ناوچەکانی دەوروبەری تاقسیم جێگیر کردووە و هەر لەدوورەوە سەیری بۆسفۆریان کردووە. هەروەها خێزانە کۆنەکانی عوسمانی و نەوەی پادشاکان، سامانەکەیان لەدەست داوە و هەژار بوون، خزمەکانیان وەکو ع. ش. حیسار _لاواز بوون و نەیانتوانیوە هیچ جێگیرێك لە کۆشکەکانیان لە بۆسفۆر دابنێن. لەبەر ئەوە لە سەردەمی منداڵیمەوە هەتا ساڵانی حەفتاکان، ئەو کاتەی شارەکە فراوان بوو، زۆربەی کۆشکەکان و *یالەکان* وەك میرات لەلایەن نەوەکانی پادشاکان و ژنە سەرشێتەکانی حەرەمسەراوە دەستیان بەسەردا گیراوە، دابەش کراون، یاخود هەموو کۆشکەکە یان تەنانەت تاکە ژوورێکی دراوەتە

کرێ. زۆربەیان سەرما و شێداریی تەختەکەیانی ڕەش کردووە و هەندێکی تریشیان بە ئومێدی کردنەوەی بینای نوێ لە جێگەکەیان، سووتێنراون.



لەدوای ساڵی ١٩٥٠، خووم پێوە گرتبوو ڕۆژی یەکشەممان لەگەڵ باوکم یان مامم بە سواری ئۆتۆمبێلە دۆجەکەی مۆدێل ١٩٥٠، گەشتی بەیانیانمان بەدەوری بۆسفۆر بکردایە. پاشماوەی کلتووری عوسمانییەکان لەوێ هەرچەندە ماتەمینیی پێوە دیار بوو، بەڵام ڕێگریی لە گەشتەکەمان نەدەکرد. ئەوکات خێزانەکەم لە تازەدەوڵەمەندەکانی سەردەمی کۆماری بوو، لەبەر ئەوە پاشماوەی کۆتاکانی شارستانیەتە گەورەکەی ع.ش.حیسار، کەمێك ئاسوودەی دەکردین. دڵخۆش دەبووین و تەنانەت شانازیمان بەو شارستانیەتیە گەورەوە دەکرد. هەمیشە بۆ کڕینی بسکیت، دەچووین بۆ کافێی چنارالتی لە ئەمیرجان. بەدەوری کەنار ئاوەکە لە ئەمیرجان یان بەبەك، پیاسەمان دەکرد و سەیری ئەو کەشتییانەمان دەکرد کە بە ئاوەکەدا تێپەڕ دەبوون. زۆر جار لەسەر ڕێگاکە، دایکم ئوتۆمبێلەکەی ڕادەگرت و دوو ماسیی گەورە و گوڵدانی دەکڕی.

هەرچەندە گەورەتر دەبووم، ئەم گەڕان و گەشتانە لەگەڵ خێزانەکەم چێژی جارانیان نەدەما و ئیدی بێزارکەر بوون و فشاریان دەخستە سەرم. دەمەقاڵێی خێزانەکەم، ململانێکانم لەگەڵ براکەم کە هەموویان بە شەڕ کۆتاییان پێ دەهات، نیگەرانییەکانی خێزانێکی نائاسوودە کە بە ئۆتۆمبێل دەسووڕێنەوە بەهیوای هەڵهاتنێکی کەم لە زیندانی ماڵەوە، هەموو ئەمانە مەیلی گەشتی بۆسفۆریان لەلام

ژەهراوی کرد. سەرباری هەموو ئەوانە، لەدوای ڕۆشتنی ئەوان، نەمدەتوانی بەتەنیا لە ماڵەوە بمێنمەوە. لە ساڵانی دواتر، کاتێك ڕۆژی یەکشەممان چاوم دەکەوت بە شەڕ و دەمەقاڵێی خێزانەکانی تر لە ئۆتۆمبێلێکی تر لەسەر ڕێگایان بۆ بۆسفۆر، ئەوەی منی سەرسام دەکرد، ئەو لێکچوونانەی نێوانمان نەبوو، بەڵکو ئەو ڕاستییە بوو کە بۆسفۆر دڵنەواییکەر و ئارامیبەخشی زۆربەی خێزانەکانی ئەستەنبوڵە.



هێدی هێدی ئەو شتانە بوونیان نەما: ئەو *یالانەی* کە دانەبەدانە سووتێنران، ئەو تۆڕی ماسییانەی کە باوکم هەموو جار پیشانی دەدام، ئەو میوەفرۆشانەی کە هەموو ڕۆژێك بە کەڵەکەکانیان لە *یالێکەوە* بۆ *یالێکی* تر دەچوون، ئەو کەنار دەریایانەی کە دایکم بۆ مەلەکردن دەیبردین، چێژی مەلەکردن لە بۆسفۆر، مەیدانی بەلەمەکان کە گوازرانەوە، لە شوێنەکەیان چێشتخانەی خەیاڵی دروست کران، ئەو پیاوە ماسیگرانەی کە پاڵیان بە بەلەمەکانیانەوە دەنا، لە مەیدانی بەلەمەکان بوونیان نەما، ئیتر نەدەکرا بەلەمەکانیان بۆ گەشتێکی کورت بەکرێ بگیرێن. بەڵام بۆ من، یەك شت وەك خۆی مابوویەوە: ئەویش بۆسفۆرە کە لە دڵی هەمووماندا ماوەتەوە. ئێستاش سەرچاوەی تەندروستییەکی باش، چارەسەری نەخۆشییەکانمان و سەرچاوەیەکی نیازپاکی سەیری بۆسفۆر دەکەین، کە بەردەوامی و هێز دەداتە شارەکە و دانیشتووانەکەی.

ژیان هەمیشە خراپ و ناخۆش نییە، پێم وایە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێت. هەرچییەك ڕوو بدات، من هەموو کات دەتوانم بە بۆسفۆردا گوزەر بکەم.

## ٧

# دیمەنە جوانەکانی بۆسفۆڕ، لە نیگارەکانی (مێلین)دا

بە بۆچوونی من، لەناو هەموو ئەو نیگارکێشە ڕۆژئاواییانەی کە وێنەی بۆسفۆڕیان کێشاوە، مێلین لە هەموویان کاریگەرتر و ڕاستتر بووە. کتێبەکەی بەناوی (*گەشتە ڕەنگاو ڕەنگەکەم بۆ قونستەنتینیە و کەنار ئاوەکەی بۆسفۆڕ*) _تەنانەت ناونیشانی کتێبەکەی شیعرئامێزە_ لە ساڵی ١٨١٩ بڵاو کراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٦٩، هاوسەری پوورم، شەوکەت ڕادۆ کە شاعیر بوو و کاری چاپ و بڵاوکردنەوەی دەکرد، چاپێکی نیوەقەبارەی دەقاودەقی کتێبەکەی بڵاو کردەوە و دەیزانی ئەو ڕۆژانە چەندە دڵم بۆ وێنەکێشان لێدەدات، لەبەرگیراوەیەکی کتێبەکەی بەدیاری پێ دام. چەندین کاتژمێرم بە وردبوونەوە لە هەر سووچێکی نیگارەکان و دۆزینەوەی ئەستەنبوڵی شکۆداری عوسمانییەکان لەناویاندا بەسەر برد. ئەم خەیاڵە شیرینانەم لەو وێنانەوە بۆ نەهات کە تێڕامان لێیان، کاری ئەندازیاری تەلارسازی و بیرکاری زانەکانە، بەڵکو بە هۆی ئەو نیگارانەی مێلینەوە بوو کە دواتر ئاماژەیان پێ دەکەم. لەو کاتانەی بەتەواوەتی ئومێد لێ بڕاو بوویبووم بە باوەڕکردن بە ڕابردووی شکۆدارمان، هەروەك هەموو ئەوانەی کە زۆر سەرسامی هونەر و ئەدەبی ڕۆژئاوایی بوون وەك جۆرێك لە دەمارگیری ئەستەنبوڵی، وێنەکانی مێلین سەبووریان پێ دەبەخشیم و ئومێدیان بۆ دەگەڕاندمەوە. بەڵام خۆیشم لەو ڕاستییە لا دەدا کە ئاگاداری ئەوەم کە وێنەکانی مێلین سەرەڕای جوانییەکەیان، زانیارییەکی دڵتەزێن دەبەخشن، چونکە باسی شتێك دەکەن کە چیتر بوونی نییە. تا زیاتر لەم وێنانە ورد بمەوە، زیاتر هەست بە خەم دەکەم.

ئەنتۆین مێلین، لە ساڵی ١٧٦٣ لەدایك بووە و ئەورووپییەکی تەواو بووە، چونکە بنەچەی خێزانەکەی لە ئەڵمانیاوە بۆ فەرەنسا و ئیتالیا بووە. لەپاش ئەوەی لەژێر چاودێریی باوکی خوێندوویەتی و لە کۆشکی شازادە کارل فریدریك لە کارسلرو بووە بە پەیکەرتاش. دواتر بۆ خوێندنی ئەندازیاریی تەلارسازی و بیرکاری و وێنەکێشان، چووە بۆ ستراسبۆرگ. لە نۆزدە ساڵی تەمەنیدا، گەشتی بۆ ئەستەنبوڵ کردووە. ڕەنگە بیرۆکەی سەردانەکەی بە هۆی گەشەسەندنی قوتابخانەی هونەری ڕۆمانتیك بووبێت لە ئەورووپا. هەر خۆشیی پێشبینیی ئەوەی نەکردووە، کە ماوەی هەژدە ساڵ لە شارەکە بمێنێتەوە.



سەرەتا مێلین لە باخە ترێکانی پێرا، ئەو شوێنە بووە بە هۆی کاریگەریی باڵوێزخانەکانی دەوروبەرەوە کە کۆمەڵگایەکی هەمەجۆری دوور لە نەریتی ناوچەگەری تێدا دروست بووە و کە تۆوی بیرۆکەی ئەمڕۆی تێدا چێنراوە، وانەبێژ بووە. کاتێك خەدیجە سوڵتانی خوشکی سوڵتان سەلیمی سێیەم سەردانی باخچەکانی بارۆن دو هوبس، باڵوێزی پێشووی دانیمارك لە ئەستەنبوڵ کردووە، ئاواتی خواستووە کە ئەویش

ببێتە خاوەنی باخچەیەکی ڕازاوەی لەو جۆرە. دواتر مێلین ئاگادار کراوەتەوە، کە باخچەیەکی بۆ دروست بکات.

یەکەم شت کە مێلین کردی، ڕازاندنەوەی باخچەکەی بوو بە گوڵە ئەکاسیا و گوڵە زەمبەق لەسەر شێوازی باخچەی ڕۆژئاوایی. دواتر کۆشکێکی بچووکی ڕازاوەی لەناو پالآسەکەی لە دەفتەرداربورنو (دەکەوێتە سەر کەنار ئاوەکەی بۆسفۆر لە بەشی ئەوروپا، لەنێوان دوو شارۆچکەدا کە ئێستا بە کرومچەشم و ئۆرتاکۆی ناسراون) دروست کرد. ئەم بینایە کە لەسەر شێوازی کلاسیکی نوێ بنیات نرابوو، ئێستا بوونی نەماوە، تەنها لەو وێنەناوە بینیومان کە لەلایەن خودی مێلینەوە کێشران. مێلین لە نیگارەکانیدا تەنها ناسنامەی بۆسفۆری دەرنەخستووە، بەڵکو ستانداردێکی داناوە بۆ ئەو شتەی کە چەند ساڵ دواتر ڕۆماننووس ئەحمەد حەمدی تانپنار (١٩٠١_١٩٦٢) ناوی ناوە (شێوازی دووڕەگ): نەخشەیەکی تەلارسازی نوێی عوسمانییەکان بووە، کە بەسەرکەوتوویی شێوازی خۆرئاواییەکان و شێوازی ڕەسەنی کۆنی عوسمانی تێدا بەکار هاتووە.

مێلین چاودێریی شێوازی دروستکردن و ڕازاندنەوەی کۆشکەکانی هاوینەی سوڵتان سەلیمی سێیەم بووە لە بەشیکتاش، شێوازی کلاسیکی نوێی بەکار هێناوە، کە ئەم شێوازەش زۆر گونجاو بووە لەگەڵ کەشوهەوای بۆسفۆروس. لە هەمان کاتدا، کاری بۆ خەدیجە سوڵتان کردووە، هەروەك ئەو کەسەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێت (دیزاینەری تەلارسازی)، گوڵدانی بۆ کڕیوە، چاودێریی دوورینەوەی مروارییەکانی لەسەر دەستەسڕە چنراوەکانی کردووە، یەکشەممان سەردانی کۆشکی خێزانی باڵوێزەکانی کردووە و



سەرپەرشتی درووستکردنی پەردەکوللەکانی کردووە.

هەموو ئەم زانیارییانە لە ڕێگای ئەو نامانەوە ئاشکرا بوون، کە لەنێوان مێلین و خەدیجە سوڵتان ئاڵوگۆڕ کراون. نامەکانیان ئەزموونێکی کەمی سەردەمی ڕۆشنبیرییان پێوە دیارە: لە سەد و سی ساڵ پێش ئەوەی ئەتاتورک شۆڕشی گۆڕینی ئەلفابێت دەست پێ بکات، لە ساڵی ١٩٢٨، ئەم نامانە بە ئەلفابێتی لاتینی نووسراون. لەو ڕۆژانەدا لە ئەستەنبوڵ هیچ یادنامەیەك یان ڕۆمانێك نەنووسراوە، بەڵام سوپاس بۆ ئەم نامانە کە هەستی وشك و مامەڵەی ڕەقی خەدیجە سوڵتانی بۆ دەرخستووین. بەم جۆرە قسەی کردووە:

مامۆستا مێلین، کەی پەردەکوللەکان دەگەنە دەستم؟ تکایە پێم بڵێ، هەر ئەمرۆ دەگەن؟ بەوانیش بڵێ دەستوبرد بکەن. با بەم نزیکانە یەك ببینین... نیگارێکی سەیرە... کاتی تەواوبوونی وێنەکەی ئەستەنبوڵ تەواو بووە، لەبیرم نەچووەتەوە... حەزم لە کورسییەکان نییە، نامەوێن، کورسییەکی ڕووپۆشکراوم دەوێت... زۆر حەزم لە ئاوریشم نییە، بەڵام هەندێك دەزووی ئاوریشم بەکار بێنە... سەیری نیگاری سەر سندووقە زیوییەکەم کرد، بەڵام هیوادار بووم بەو جۆرەت نەنەخشاندایە، تکایە کار لەسەر وێنە کۆنەکە بکە، تکایە خراپی مەکە... لە مارتیدی (سێ شەم) گەوهەر و پارەوپوولەکانت دەدەمێ.

لە نامەکاندا دیارە کە خەدیجە سوڵتان، تەنها ڕابەرایەتیی ئەلفابێتی لاتینی ناکات، بەڵکو ئەلفابێتی ئیتالییشی بەکار هێناوە. ئەو کاتەی دەستی کردووە بە نامە ناردن بۆ مێلین، هێشتا تەمەنی نەگەیشتووەتە سی ساڵ. هاوسەرەکەی، سەید ئەحمەد پادشا، فەرمانڕەوایی ئەرزەرومی کردووە و زۆر بەدەگمەن لە ئەستەنبوڵ ماوەتەوە. لەپاش پەلاماردان و داگیرکردنی وڵاتی میسر لەلایەن ناپلیۆنەوە، هەستێکی دژە فەرەنسا لەناو کۆشکەکاندا پەرەی سەندووە. هەموو ئەو ڕووداوانە لە دەوروبەرەدا بوون، کە مێلین لەگەڵ کچێکی جیۆنسی هاوسەرگیریی کردووە. لە نامەیەکی خەماویدا بۆ خەدیجە سوڵتان، هەستێکی تووڕەیی و ئاڵۆز دەردەخات:

خاوەنشکۆ لە ڕۆژی شەممە، من" خزمەتکارە سادەکەت، غولامەکەم نارد بۆ وەرگرتنی مووچەی مانگانە بەڵام ئەوان پێیان ڕاگەیاندبوو کە مووچەکەم بڕدراوە. لەدوای بینینی ئەو هەموو چاکانە لە تۆ، باوەڕ ناکەم کە فرمانێکی وات دەرکردبێت. لەوانەیە ئەمە قسەوقسەلۆکی چاوچنۆکەکان بێت! ڕەنگە ئێرەیی بەرن کە خاوەنشکۆ چەندە بەردەستەکەی خۆش دەوێت... ئەوا زستان هات، من دەڕۆم بۆ بیۆگلۆ، بەڵام چۆن بچم؟ هیچ پارەیەکیشم پێ نییە. خاوەن ماڵەکە داوای کرێ دەکات. پێویستمان بە خەڵووز و تەختە و پێویستییەکانی چێشتخانە هەیە. هەروەها کچەکەشم تووشی نەخۆشیی ئاوڵە بووە، دکتۆر داوای (٥٠) قووروش دەکات. ئەو پارەیە لەکوێ بێنم؟ گرنگ نییە چەند جار لێت پاڕامەوە، گرنك نییە چەندە پارەم داوە بە گەشتکردن بە بەلەم یان ڕێگای تر، هەتا ئێستاش کاردانەوەیەکی دڵخۆشکەرم پێ نەگەشتووە... لێت دەپاڕێمەوە، من بێکەس و گیرفان خاڵیم... خاوەنشکۆ، تکا دەکەم دەستبەردارم مەبە.

پاش ئەوەی خەدیجە سوڵتان هیچ کاردانەوەیەکی بۆ ئەو تکایانەی نەبووە، مێلین دەستی بە خۆکۆکردنەوە بۆ ئەورووپا و بیرکرنەوە لە کارێکی نوێ بۆ بەدەستهێنانی پارە، کردووە. وا دیارە پێی باش بووە هەموو نیگارە کێشراوەکانی، ئەوانەی پەیوەندییان بە کۆشکەوە هەبووە، کۆ بکاتەوە و بیانکات بە کتێبێك. توانیویەتی بە هاوکاریی پایر ڕوفین، باڵوێزی فەرەنسا بووە لە ئەستەنبوڵ و ڕۆژهەڵاتناسێکی بەناوبانگ بووە، پەیوەندی ببەستێت بە بڵاوکراوەکانی پاریسەوە. هەرچەندە مێلین لە ساڵی ١٨٠٢ گەڕاوەتەوە بۆ پاریس، حەڤدە ساڵ لەپێش ئەوەی کتێبەکەی بڵاو بکرێتەوە (کاتێك تەمەنی پەنجا و شەش ساڵ بووە)، توانیویەتی لەگەڵ چەند نیگارکێشێکی زۆر باشی ئەو سەردەمە، دەست بکات بە کارکردن. هەر لە سەرەتاوە ڕاسپێردراویەکی بەهێز لە کارەکانیدا هەبووە، ئەویش دڵسۆزی و ڕاستگۆیی بووە بۆ وێنە کۆنەکانی.



کاتێك سەیری چل و هەشت وێنەکەی مێلین لەناو کتێبە مەزنەکەی دەکەین، ئەو شتەی کە یەکەم جار سەرنجمان ڕادەکێشێت، ئەو وردەکارییە زۆرەیە لە وێنەکانیدا کردوویەتی. کاتێك دەڕوانینە دیمەنە جوانەکانی جیهانێکی ونبوو، نەخشەی تەلارسازییەکی جوان و پڕ لە شارەزایی لە دەستکاریکردنی وردەکارییەکانیدا، ئەوا ئارەزوومان بۆ بینینی وێنەیەکی ڕاستەقینە بەتەواوەتی دێتە دی. تەنانەت نیگارەکانی ناو حەرەمسەرا کە زۆربەیان خەیاڵین، وردبوونەوە و سەلیقەی وێنەکێش لە کارەکانیدا دەردەخەن. دیمەنەکان زۆر بە جوانی و شکۆداری پیشان دراون، بە جۆرێك زۆر دوورن لە فانتازیای باوی ئارەزووبازیی ڕۆژئاواییەکان بۆ حەرەمسەرا و تەنانەت هەوڵێك هەیە لە وێنەکانیدا، تەنانەت بینەری ئەستەنبوڵیش قایل دەکات. مێلین، هاوسەنگی لە ئەکادیمیبوونی کارەکانی لەگەڵ وردەکارییە گونجاوەکان بەکار هێناوە. لە یەکێك لە وێنەکانی حەرەمسەرا، دوو ئافرەت دەبینین لەپاڵ دیوارێکی دوور ڕاوەستاون، بەسۆزەوە ڕوویان لە یەك کردووە و پێکەوە قسە دەکەن، بەڵام جیاواز لە نیگارکێشە ڕۆژئاواییەکان، مێلین بە دەرخستنی دوو ئافرەتەکە لەناوەڕاستی وێنەکەدا، دەیسەلمێنێت هیچ زیادەڕەوییەکی لە نەخشاندنیاندا نەکردووە.



مێلین وێنەی دیمەنەکانی ئەستەنبوڵی بە جۆرێك کێشاوە، وەك ئەوەی چەقیان نەبێت. ڕەنگە بە هۆی ئەم هۆکارەوە و کاری زۆری لە وردەکاری پیشاندانی دیمەنەکان، سەرنجی منی ڕاکێشاوە بۆ ئەو ئەستەنبوڵەی کە وێنەی کێشاوە. لە نەخشەیەکدا کە لە کۆتایی کتێبەکەدا دایناوە، شوێنی هەر چل و هەشت تابلۆکەی پیشان دەدات کە دەکەونە کوێوە، هەروەها ئاماژە دەدات بەو گۆشەیەی کە لێوەی دەرکەوتوون. بەم کارەش دەریدەخات، نیگەرانی سەرنجی بینەر بووە، بەڵام هەروەك کاغەزی لوولدراوی چینییەکان، یاخود هەندێ کاری کامێرای سینەمایی، سەرنجی بینەر بەردەوام گۆڕانکاریی بەسەردا دێت.

مێلین، هەرگیز درامای مرۆڤەکانی نەکردۆتە ناوەندی نیگارەکانی. کاتێك لە نیگارەکانی ڕادەمێنم، هەست دەکەم هەروەك ڕۆژانی منداڵی بە کەناری بۆسفۆردا دەگەڕێم: کەنداوێك لەپڕ لەپشت کەنداوێکی ترەوە دەردەکەوێت و لەگەڵ هەر چاو لادانێك لەسەر ڕێگای کەنار دەریاکە، دیمەنێکی تری سەرسامکەر لە گۆشەیەکی ترەوە دەردەکەوێت. کەواتە لەبەر ئەم هۆکارەیە هەر کاتێك سەیری ئەم کتێبە دەکەم، ئەستەنبوڵ وەك شارێکی کۆتایینەهاتوو و بێسنوور دەبینم و هەست بە خۆم دەکەم لەناو یەکێك لەو چیرۆکانەی کە کاتی لاوێتی زۆر پێیان سەرسام بووم.

بۆ سەیرکردنی دیمەنەکانی بۆسفۆر، نابێت بەتەنها بیر لەو بۆسفۆرە بکەینەوە، وەك ئەوەی یەکەم جار من بینیم: دۆڵ و گرد و چەماوەکان، هەروەك خۆیانن. ناوهێنان و بیرکردنەوەیەکی پاکیزەیی لەو ئاوەدانکردنەوە ناشیرینانەی کە چل ساڵ دواتر، کارێکی نەگونجاوە. کاتێك سەیری کتێبەکەی مێلین دەکەم، جۆرێك لە دڵخۆشیم لا دروست دەبێت. کاتێك بیر لەو بەهەشتە ونبووە دەکەمەوە کە لە تابلۆکانیدا بۆم جێ ماوە، تەنانەت هەندێك لە خانوو، دیمەنەکان ئێستاش بوونیان ماوە، لێرەدا خەم و خۆشی تێکەڵ بە یەك دەبن. کاتێك کاتی ئەوە دێت بەهەشتە ونبووەکە جێ بهێڵم و بگەڕێمەوە بۆ ژیانی ئێستام، ئەنجامێکی تر لە ئاڕاستەیەکی ترەوە دروست دەبێت. بەڵێ، بە خۆم دەڵێم کاتێك کەنداوی تەرەبیە جێ دەهێڵێت، دەریاکە ئیتر ئارام نییە و لەناکاو ڕووی ئاوەکە دەست دەکات بە جووڵە و لەرزین بە هۆی ئەو گێژەڵۆکی ڕەشەبایەوە کە لە دەریای ڕەشەوە هەڵدەکات و کەنارەکانی شەپۆلەکان هەمان

بڵقەبڵقی بچووك و توندڕەو دروست دەكەن، كە مێلین لە وێنەكانیدا پیشانی داوە. بەڵێ، بەو جۆرە، درەختەكانی سەر گردەكان بە جۆرێك لە ئێوارانداا نوقمی تاریكی دەبن، كە تەنها كەسانی وەك من، مێلین و ئەو كەسەی بە لایەنی كەمەوە بۆ ماوەی دە ساڵ لێرە ژیابێت، لەم تاریكییە تێدەگات.



دیمەنی درەختە سەوزەكانی ناو نیگارە ئیسلامییەكانی بەهەشت و باخە كۆنە ئیسلامییەكان و ناو تابلۆكانی مێلین، هەمان ڕۆڵی ناو نیگارۆكە ئێرانییەكان دەبینن: درەختەكان زۆر بەهێمنی وەكو بەشە تاریكەكانی تر دەركەوتوون و دیمەنێكی شاعیرانەیان دروست كردووە. كاتێك مێلین وێنەی لاربوونەوە و پێچاوپێچی درەختەكانی بۆسفۆری كێشاوە، وەكو شێوازی نیگاركێشە ڕۆژئاواییەكانی نەكردووە، چونكە ئەوان بە دروستكردنی سەرنجێكی درامایی، یان پێدانی شێوەی جیاواز لەوەی خۆیان، زێدەڕۆییان لە دیمەنی گەڵای دارەكان كردووە. بەڵام مێلین، هەر وەكو وێنەكێشی نیگارۆك، لە كاتی كێشانی وێنەكانی لەدوورەوە سەیری درەختەكانی كردووە و بە هەمان شێوە سەیری خەڵكی كردووە، ئەگەر تەنانەت لەوپەڕی پیشاندانی هەستوسۆزدا بووبێتن. ڕاستە كە مێلین لە وێنەكێشانی جووڵەكانی مرۆڤ زۆر باش نەبووە، هەروەها شوێنی بەلەمەكان و كەشتییەكانی بۆسفۆر زۆر بەزەقی دەركەوتوون (بە جۆرێك دیارن،

وەك ئەوەی ڕاستەوخۆ بەرەو ڕووت بێن). سەرباری ئەو هەموو گرنگی و سەرنجەی داویەتی بە بیناكان و هەیكەلەكانیان، هەندێك جار بە شێوەیەكی مندالآنە دەركەوتوون. بەلآم ئەم كەموكورتییانە لە كارەكانی مێلین، بە هۆی ڕوانینە شاعیرانەكەی بووە بۆ دیمەنەكان، هەر ئەمەش وای لێ كردووە ببێتە ئەو نیگاركێشەی كە بۆ ئەستەنبولییەكانی سەدەی مۆدێرن بدوێت. كاتێك تێبینی ڕووخساری ئافرەتەكانی ناو كۆشكی سولتان و حەرەمسەرا دەكەین، هەموویان وەك ئەوەی دەستەخوشك بن، یەك شێوە و ڕووخساریان هەیە. ئەمەش ڕوانینی ساویلكەیی و پاكیزەیی (مێلین)مان بۆ دەردەخات كە زەردەخەنە دەخاتە سەر لێومان. هەروەها بەو لێكچوونەی لەگەلّ وێنەكێشانی نیگارۆك هەیەتی، بووەتە جێی شانازیمان.



مێلین، بە پیشاندانی تەلار و تۆپۆگرافی و هەموو وردەكارییەكی ڕۆژانە، سەردەمی زێڕینی شارەكەی بە جۆرێك هێنانەوەتە بەرچاومان، كە هیچ كام لە شێوەكارانی ژێر كاریگەریی بیرۆكەی ڕۆژئاوایی، نەیانتوانیوە كارێكی وەها بەئەنجام بگەیەنن. لەسەر نەخشەكەی ئاماژەی بە خالّێك داوە _كە پەنجا هەنگاو دورتر نییە لەو شوێنەی

جیهانگیر که ئێستا ئەم دێرانە لەوێ دەنوسم_ لە پێرا کە وێنەی کیزکولیسی و ئۆسکوداری لێوە کێشاوە، لە پەنجەرەی قاوەخانەیەک لە بەرزاییە لێژەکانی تۆفان سەرنجی تۆپکاپی پالاسی داوە و نیگاری کێشاوە و لەسەر بەرزاییەکانی ئەیوبەوە وێنەی بینا بەرزەکانی ئەستەنبوڵی کێشاوە. بەم جۆرە، وێنەی بەهەشتی بۆسفۆری بۆ کێشاوین، بەو جۆرەی عوسمانییەکان سەیری کردووە، بەهەشتی بۆسفۆری بۆ نەخشاندووین، چونکە عوسمانییەکان وەک زنجیرەی گوندەکانی ڕاوەماسیی ڕۆمەکان، سەیری بۆسفۆریان نەکردووە، بەڵکو وەک شوێنێک کە هەڵبژاردەی خۆیان بووە. ئەندازیارە تەلارسازەکان بەرپرسیارن لە پاڵپێوەنان بەرەو خۆرئاوا و لەناوچوونی پاکیزەیی دیمەنەکان، لەبەر ئەوە مێلین لە وردەکاریی نیگارەکانیدا ئاڵوگۆڕی کلتووریمان پیشان دەدات، بە جۆرێک کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەپێش سوڵتان سەلیمی سێیەمەوە تەواو جیاوازە.



مارگریت یورکنار، جارێکیان تێڕوانینی خۆی لەسەر وێنەیەکی سەدەی هەژدەیەمی ڕۆم و ڤینیسیا نوسیوە کە لەلایەن پیرانزی کێشراوە، منیش (بە هاوێنەیەکی وردبینی بە دەستەوە) ئارەزوو دەکەم بە هەمان شێوە لەسەر دیمەنەکانی ئەستەنبوڵی مێلین تێڕوانینی خۆم بنووسم. ڕەنگە بمەوێت لە نیگارێکی مەیدانی تۆفان و کانیاوی تۆفانەوە کە وێنەکێش بەبەردەوامی سەردانی کردوون، دەست پێ بکەم. لەلای چەپی وێنەکە، فرۆشیارێکی شووتی ڕاوەستاوە کە هەروەك شووتی فرۆشەکانی ئێستا بەجۆشەوە تێراماوە و شووتییەکانی دەفرۆشێت. وردەکارییەکانی مێلین، پیشانمانی داوە کە لە سەردەمی ئەودا، کانیاوەکەی تۆفان لە ئاستی شەقامەکە بەرزتر بووە، بەڵام ئێستا ئاوی کانیاوەکە لە چاڵێکەوە هەڵدەقوڵێت و لەسەر ڕێگاکانی دەوروبەریەوە کە ئەوکات چەوریژ کرابوون، دواتر چین چین بە قیر داپۆشران، دەڕوات. لە نیگارەکانیدا ئەو دایکانە دەبینین، کە لە هەموو باخچە و کۆڵانێك بەتوندی دەستی منداڵەکانیان گرتووە. (پەنجا ساڵ دواتر، تۆفل جوتیەر پێی وا بوو کە مێلین وێنەی ژنانی بەتەنها نەکێشاوە، بەڵکو لەگەڵ منداڵ زیاتر دەرکەوتوون، چونکە ئەو جۆرە دیمەنە لەو ڕۆژانەدا ئاسوودەیی و ڕێزی ئافرەتی پیشان داوە).



لە شارەکەی مێلین، هەر وەکو شارەکەی ئێمە، کۆمەڵێك فرۆشیاری دەستگێڕی لێیە، جلوبەرگ و خۆراك دەفرۆشن و شمەکەکانیشیان لەسەر مێزێکی سێ قاچی داناوە. پیاوێکی لاویش ڕاوەماسی دەکات، لە کەنارە کۆنەکەی ڕاوەماسی لە بەشیکتاش (من بەتەواوەتی ناتوانم وەك مێلین باسی دەریای بەشیکتاش بکەم، کە هەرگیز کپ و ئارام

نییه)، پێنج هەنگاو دوورتر لەتەنیشت ئەو لاوەوە، ئەو دوو پیاوە نامۆیە هەن کە لەسەر بەرگی کتێبەکەم (قەلای سپی) دەرکەوتوون. لەسەر گردەکانی کاندیلی، پیاوێك لەگەڵ ورچە سەماکەرەکەی و غولامەکەی ڕاوەستاوە و تەپڵە دەستییەکەی ڕادەشەکێنێت (لێدەدات)، لە ناوەندی گۆڕەپانی سوڵتان ئەحمەد (بەپێی وێنەکانی مێلین، گۆڕەپانی ئەسپسواری بووە)، کە وا دەردەکەوێت بە هۆی ئاپۆرەی خەڵك هەناسەی تێدا نەبێت، پیاوێك لەتەنیشت گوێدرێژە بارهەڵگرەکەیەوە دەڕوات، لە هەمان وێنەدا پیاوێك کە پشتی کردۆتە قەرەباڵغییەکە، لەسەر هەمان مێزی سێ قاچی کە سمیت فرۆشەکانی ئەمڕۆ بەکاری دەهێنن، سمیت دەفرۆشێت.

گرنگ نییە کە یادگارییەکان چەندە مەزن و دیمەنەکان چەندە سەرنجڕاکێشن، مێلین هەرگیز ڕێگەی نەداوە زاڵ بن بەسەر نیگارەکانیدا. هەرچەندە وەکو پیرانیز حەزی لە پیشاندانی دیمەنەکان بووە، بەلام دیمەنەکانی هەرگیز درامی نەبوون. ئەو شتەی کە وای کردووە خەڵك شەیدای وێنەکانی پیرانزی بێت، ئەو دراما توندڕەوەیە، کە لە وێنەکانیدا هەن لەپاڵ پیشاندانی تەلارە ستوونییەکان و پیشاندانی کەسایەتییەکان وەك نامۆ و سوالکەر و گەوج. دیمەنەکانی مێلین، جووڵەیەکی ئاسۆییان هەیە و هەموو شتێك لەبەرچاو ڕوونە. بە باش بەکارهێنان و پیشاندانی جیۆگرافی و تەلارە دوانەهاتووەکانی ئەستەنبوڵ، بەهەشتێکی خەیاڵیمان پێشکەش دەکات و بانگهێشتمان دەکات کە لە کاتی پشووەکانماندا، بگەڕێین بە ناویدا.

لەپاش ئەوەی نیوەی تەمەنی لێرە بەسەر بردووە، بە تێپەڕبوونی کات، مێلین ئەستەنبوڵی جێ هێشتووە. دروست نییە ئەگەر بڵێین مێلین بۆ فێربوون هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ، بەڵکو دەستپێکی ژیانێکی نوێی لێرە بنیات ناوە و هەروەك دانیشتووییەکی ئەستەنبوڵ سەیری هەموو شتێکی ئەم شارەی کردووە. لە تابلۆکانیدا، وەکو شێوازی زۆربەی نیگارکێش و هەڵکۆڵەرەکان، وەکو ولیام هێنری (جوانییەکانی بۆسفۆر ١٨٣٥)، تۆماس ئەلوم (قونستەنتینیە و دیمەنی حەوت کڵێساکەی ئەنادۆڵ ١٨٣٩)، ئوجین فلاندین (خۆرهەڵاتناسی١٨٥٣)، زۆر بایەخی بە پیشاندانی مۆرکی بیانی یان ڕۆژهەڵاتی نەداوە. مێلین هەرگیز بە پێویستی نەزانیوە دیمەنەکانی بە کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکی (*هەزار و یەك شەوە*) پڕ بکاتەوە، بە قوتابخانەی هونەری ڕۆمانتیکی سەرسام

نەبووە، کە پڕە لە بیرۆکەی خۆرئاوایی و هەوڵی نەداوە لە ڕێی یاریکردن بە ڕووناکی، سێبەر، تەمومژ و هەورەکان، یاخود لە ڕێگای دەرخستنی شێوازی شارەکە و خەڵکەکەی بە جۆرێکی هەژارتر، زیاتر و سەرنجڕاکێشتر، یان بە شێوازی ئەرەبێسك زیاتر لەوەی لە ڕاستیدا دەردەکەون، کەشێکی جیاواز دروست بکات بۆ نیگارەکانی.

مێلین بووەتە چاوی شارەکە، چونکە ئەستەنبوڵییەکانی سەردەمی ئەو نەیانزانیوە وێنەی خۆیان و شارەکەیان بکێشن _لە ڕاستیدا هیچ بە پێویستیان نەزانیوە _ئەو تەکنیکانەی لە کارەکانیدا بەکاری هێناون، لە ڕوژئاواوە لەگەڵ خۆی هێناون، بەم جۆرەش نیگارەکانی کەشێکی ڕۆژئاواییان وەرگرتووە. لەبەر ئەوەی وەك ئەستەنبوڵییەك سەیری شارەکەی کردووە، بەڵام وەك ڕۆژئاواییەکی دڵسۆز وێنەی شارەکەی کێشاوە، ئەستەنبوڵەکەی مێلین تەنها شوێنێك نییە ڕازێنرابێتەوە بە گرد و مزگەوت و شوێنەوارە دێرینەکان، بەو جۆرەی کە ئێمە لێی دەڕوانین، بەڵکو شوێنێکە خاوەنی جوانییەکی مەزن و گرنگە.

٨

# دایکم و باوکم و ونبوونەکان

باوکم زۆر جار دەچوو بۆ شوێنی دوور و بۆ ماوەی چەندین مانگ چاومان پێی نەدەکەوت. سەیر ئەوە بوو زۆر تێبینیی ونبوونەکەیمان نەدەکرد، هەتا ئەو کاتانەی دەڕۆیشت و بۆ ماوەیەکی زۆر نەدەگەڕایەوە. بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، ڕاهاتین بە ونبوونی. ئەوەندە درەنگ درکمان بە نەگەڕانەوەکەی کرد، بە جۆرێك وەك ئەوەی درەنگ بزانی بە کەسێك کە پاسکلێکی دزراو یان ونبوو بەکار دەهێنێت، یاخود هاوپۆلێکت کە دەمێکە نەهاتۆتەوە بۆ قوتابخانە، دواتر بزانیت کە ئیتر ناگەڕێتەوە. هەرگیز هیچ کەس هۆکارەکەی پێ نەدەگوتم کە بۆچی باوکم لە ماڵ نییە، یاخود کەی دەگەڕێتەوە. هەرگیز بواری ئەوە نەبوو زانیاری وەربگریت، چونکە ئێمە لە ماڵێکی گەورە و قەرەباڵغ دەژیاین، کە دەورە درابوو بە داپیرەم، مامەکانم، پوورەکانم، پاسەوان و خزمەتکارەکان، لەبەر ئەوە زۆر بەئاسانی دەمانتوانی بەهێواشی ماوەی



ونبوونەکەی تێپەڕێنین، بەبێ ئەوەی ڕاوەستین لە پرسیارکردن، یان زۆر جار بەسانایی لەبیرمان دەچوو کە لێرە نییە. ناوەناوەش دەچووینە باوەشی گەرمی خزمەتکارەکەمان، (ئەسما خاتوون)، یان دەچووین بۆ لای چێشتلێنەرەکەی داپیرەم کە خوێندنەوەی بۆ هەموو قسەکانمان

دەکرد، یاخود گەشتی یەکشەممانمان لەگەڵ مامە ئایدن بە ئۆتۆمبێلە دۆجەکەی مۆدێل ١٩٥٢ بۆ بۆسفۆر دەکرد و بەو جۆرە دڵتەنگییەکەمان لە بیردەچوویەوە.

هەندێك جار بە هۆی چەلەحانێی بەیانیانی دایکم بە تەلەفۆن لەگەڵ خوشکەکانی و هاوڕێکانی، یان لەگەڵ دایکی، هەستم دەکرد شتێکی خراپ ڕووی داوە. لەو کاتانەدا دایکم لاق لەسەر لاق لەسەر کورسییەکە دادەنیشت و ڕۆبە درێژ و ڕەنگ کرێمییەکەی کە گوڵە مێخەکی سووری پێوە بوو، وەك تاڤگەی ئاو دەخشایە سەر زەوییەکە، جلی خەوەکەی کە هەروەك ڕەنگی پێستی گەشاوە بوو و گەردنی زەریفیم دەبینی، یان کە دەچوومە باوەشیەوە، نزیکتر دەبوومەوە لەو سێگۆشە جوانەی کە لەنێوان پرچی و مل و سنگیدا بوو. هەروەك چەند ساڵ دواتر دایکم، لەپاش دەمەقاڵێیەکی لەگەڵ باوکم لەسەر مێزی نان خواردن، پێی گوتم کە من بەڕاستی لە کەشی ناخۆشی ناو ماڵەکەمان کە بە هۆی کێشەی ناو خێزانەکەمان و مشتومڕی نێوان دایك و باوکمەوە دروست دەبوو، خۆشی دەبینم.

کاتێك لە ژوورەکەی دایکم دەبووم و چاوەڕێم دەکرد هەتا سەرنجم بدات، لەبەردەم مێزی خۆڕازاندنەوەکەی دادەنیشتم. بە جووڵاندنی شووشەی بۆنەکانی، سووراو، بۆیەی پەنجە، ئاوی قۆڵۆنیا، گوڵاو و ڕۆنی بادەمەکەی، خۆم سەرقاڵ دەکرد، چەکمەجەکانیم دەکردەوە و گەمەم بە هەموو جۆرە موکێش، مقەست، بڕبەندی نینۆك، قەڵەمی برۆکانی، فلچە، شانە و هەموو کەلوپەلە جیاوازەکانی تری دەکرد و سەیری وێنەیەکی خۆم و براکەم دەکرد کە دایکم خزاندبوویە ژێر شووشەیەکەوە کە لەسەر مێزەکە دانرابوو. (جارێکیان دایکم کە هەمان ڕۆبی پۆشیبوو، لەسەر کورسییەکی بەرز دایانم، کەوچکێکی نانخواردنی منداڵانەی دایە دەستم و بەدەم سەیرکردنی وێنەکەوە، زەردەخەنەیەکی ڕووکەشیمان بۆ یەکتر کرد) کاتێك سەیری وێنەکەم دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە کە چەندە شەرمەزارییە کە کەس نایبیستێ، چەندە دڵخۆشکەرن هاوارەکانم.

کاتێك تەواو بێزار و تاقەت لێبڕاو دەبووم، هەوڵم دەدا خۆم بە گەمەیەکەوە خەریك بکەم، کە ڕۆژانی دواتر لە ڕۆمانەکانمدا لەو جۆرە گەمەیەم دەکرد. بوتڵی شووشە و فلچەکان و سندووقێکی زیویی قفڵدراو کە نەخشی گوڵڕێژی لەسەر بوو، هەرگیز نەمدیبوو دایکم بۆ جارێکیش بیکاتەوە، دەمبردنە ناوەندی مێزەکە و سەرم دەبردە

پێشەوە بۆ نزیکی ئاوێنە سێ لایەکە، هەتا لە تەبەقی ناوەڕاست خۆم ببینم. دواتر، هەردوو لاکەی تری ئاوێنەکەم بۆ ناوەوە یان بۆ دەرەوە دەکردنەوە، هەتا هەردوو لاکە ڕەنگی یەکدییان دەدایەوە و هەزاران ئۆرهانم لەناو شووشە ڕەنگکراو و قووڵ و ساردەکەدا دەبینی. زۆر بەسەیری تەماشای نزیکترین ڕەنگدانەوەی پشتی سەرم لە ئاوێنەکەدا دەکرد، بە جۆرێك ئەوەندە سەیر بوو کە سەرسامی دەکردم، یان سەیری گوێکانم دەکرد کە شێوەیەکی بازنەی گەشتبوون بە هەمان خاڵ و هەر وەکو گوێکانی باوکم، یەکێکیان لەوی تریان جیاوازتر بوو. لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر پشتەملم بوو، بە جۆرێك دەردەکەوت وەك ئەوەی کەسێکی نامۆم لە جەستەمدا هەڵگرتبێت _ئەم بیرۆکەیە هەتا ئێستاش موچوڕکە دێنێت بە لەشمدا. لەنێوان هەرسێ لاکەی ئاوێنەکە وەستابووم، هەر جارێك لایەکی ئاوێنەکەم دەجووڵاند، سەدان و هەزاران ئۆرهانم دەبینی بە شێوازێکی تەواو جیاواز لەوانی تر. کاتێك دەمدی هەریەك لە ڕەنگدانەوەکانی ناو زنجیرەی ناو ئاوینەکە وەك کۆپلە لاسایی جووڵەکانم دەکەنەوەم، شانازیم بە خۆمەوە دەکرد. هەموو جۆرە ئاماژەیەکم تاقی دەکردەوە، هەتا ئەو کاتەی دڵنیا دەبووم بەتەواوەتی لاسایی من دەکەنەوە. هەندێك جار سەیری دوورترین ئۆرهانم دەکرد، هەندێك جاریش وا دەردەکەوت کە بەشێکی کەم لە لاساییکەرەوە ڕاستگۆکانم دەستیان یان سەریان ڕێك وەك من لە هەمان کاتدا ناجووڵێنن، بەڵکو چەند چرکەیەك دواتر دەیکەن. ترسناکترین کات ئەو کاتە بوو، کاتێك شێوەی دەموچاوم دەگۆڕی _ڕومەتەکانم پڕ دەکرد لە هەوا، برۆکانم بەرز دەکردەوە، زمانم دەردەهێنا، یان لە سووچێکەوە هەشت ئۆرهانم لەناو سەدان دانەدا جیا دەکردەوە_ دواتر (سەرنجی ئەوەم نەدابوو کە دەستم جووڵاندووە) بە بیرکردنەوەی خۆم گرووپێکی گومڕا و بچووکی زۆر دوورم دەبینی کە لەنێوان خۆیاندا ئاماژەیان بۆ یەکتر دەکرد.

ونکردنی خۆم لەناو ڕەنگدانەوەکانی ناو ئاوێنەکە، دەبوویە یاریی چاوشارکێ، یان ڕەنگە ئەم گەمەیەم بۆ ئەوە کردبێت هەتا خۆم ئامادە بکەم بۆ ڕوودانی ئەو شتانەی کە زۆر لێیان دەترسام. هەرچەندە نەمدەزانی دایکم لە تەلەفۆنەکانی چی دەڵێت، یان باوکم لە کوێیە و کەی دەگەڕێتەوە، بەڵام بەدڵنیایەوە دەمزانی ڕۆژێك دایکیشم ون دەبێت.

هەندێك جار دایكیشم ون دەبوو، بەڵام هۆكارێكیان پێ دەگوتین، شتێكی وەكو "دایكت نەخۆشە و چووە بۆ لای پوورە نەریمان پشوو بدات." من خۆم یەكلایی كردبوویەوە لەگەڵ ئەم ڕوونكردنەوانە، هەر بەو جۆرەی لەگەڵ ڕەنگدانەوەكانی خۆم كردبووم لە ئاوێنەكەدا: دەمزانی هیچیان ڕاست نین، بەڵام قبوڵم دەكردن و ڕێگەم بە خۆم دەدا كە وەك گەوجێك هەڵسوكەوتم لەگەڵ بكەن. چەند ڕۆژێك تێدەپەڕی، دواتر لەگەڵ براكەم دەدراینە دەست بەكری چێشتلێنەر و ئیسماعیلی پاسەوان. لەگەڵیان بە بەلەم یان بە پاس بە هەموو ڕێگاكانی ئەستەنبوڵدا دەڕۆشتین بۆ لای خزمەكانی بەشی ئاسیا لە شاری ئێرینكۆی، یان بۆلای خزمەكانی شارۆچكەیەكی بۆسفۆر لە ئیستینیە، تاوەكو چاومان بە دایكمان بكەوێت. ئەو سەردانانە ناخۆش و خەمباركەر نەبوون، بەڵكو جۆرێك بوون لە سەركەشی بۆ من و براكەم. بیرم دەكردەوە، دەتوانم پشت بە براكەم ببەستم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو مەترسییەكان. ئەو خانوو و *یالانەی* كە سەردانمان دەكردن، هەموویان ئەو كەسانەیان تێدا دەژیان كە خزمی دوور و نزیكی دایكم بوون. لەپاش ئەوەی پوورە میهرەبان و بەتەمەنەكان، لەگەڵ خاڵە توكن و ترسێنەرەكان تەواو دەبوون لە ماچكردن و قورنوچگرتن لە ڕومەتەكانمان، سەرنجیان بۆ هەر شتێك كە نامۆ بوو لە ماڵەكەیاندا، ڕادەكێشاین. یەكێك لەو كەلوپەلانە گەرمیپێوێكی ئەڵمانی بوو، كە وا بیرم دەكردەوە لە هەموو ماڵێكی نەریت خۆرئاواییدا هەبێت (ژن و پیاوی باڤەریانی ئەڵمانی چوونە دەرەوە و گەڕانەوەیان بەپێی كەشوهەوایە)، یان ئەو كاتژمێرەی سەر دیوارەكەیان پەپوویەكی تێدا بوو، كە هەموو كاتژمێرێك دەرگاكە دەكرایەوە و سەری دەردەهێنا و بەخێرایی دەگەڕایەوە ناو ئەشكەوتەكەی خۆی، یاخود كەنارییە ڕاستەقینەكە كە دەیخوێند و وەڵامی ئامۆزا میكانیكییەكەی (پەپووەكە) دەدایەوە _دواتر ڕەوانە دەكراین بۆ ژوورەكەی دایكمان.



ڕووخساری دایکم بە هۆی ئەو ڕووناکییە بریقەدارەی کە لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورەوە و بە هۆی جوانیی گڵۆپەکانەوە دەبریسکایەوە (هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە، هەمیشە ئەو ڕووخسارانەی وێنەکانی ماتیسم خۆش دەوێت کە لە پەنجەرەکەوە دەڕواننە باشوور). بەخەمبارییەوە بیرمان دەکردەوە، دایکم ئێمەی جێ هێشتووە بۆ ئەم شوێنە خۆشە، بەڵام لە هەمان کاتدا بینینی هەندێك شتی ناسراو، وەکو هەمان موکێشەکان، شووشەی عەتر، فڵچەی قژ ڕەنگکردن و بۆنە خۆشە بێ ڕکابەرەکەی کە لە هەوادا بڵاو دەبوویەوە، لەسەر مێزی خۆڕازاندنەوەکەی ئاسوودەی دەکردین. هێشتاش لەیادم ماوە کە چۆن دایکم یەك لەدوای یەك بەگەرمی باوەشی پێدا دەکردین، چۆن ڕێنمایی دەدایە براکەم کە چی بڵێت، چۆن هەڵسوکەوت بکات و لەکوێ ئەو شتانە بدۆزێتەوە کە جاری داهاتوو هاتینەوە بیانهێنین_دایکم هەمیشە حەزی بە ڕێنماییکردن بوو. لە کاتێکدا دایکم لەگەڵ براکەم خەریکی قسەکردن بوو، من بایەخم بە گفتوگۆکەیان نەدەدا و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، هەتا نۆرەم دەهات، لە باوەشیا دانیشم.



لە ماوەی یەکێك لە ونبوونەکانی دایکم، ڕۆژێکیان باوکم لەگەڵ دایەنێك هاتە ژوورەوە. دایەنەکە جوان نەبوو، کورت و خڕ و پێست زەردهەڵگەڕاو بوو و هەمیشە زەردەخەنە لەسەر لێوی بوو. کاتێك کاری سەرپەرشتیکردنی ئێمەی وەرگرت، بە

ڕووکەشێکی زیرەکانەوە کە وا دەردەکەوت شانازی بە خۆیەوە بکات، بە ئێمەی دەگوت، بەو جۆرە هەڵسوکەوت بکەین کە ئەو دەیەوێت. جیاواز لە دایەنی خێزانەکانی تر کە بینیبوومان، دایەنەکەی ئێمە تورك بوو، ئەمەش ئێمەی بێهیوا کرد و هەرگیز هۆگری نەبووین. ئەو دایەنانەی کە دەماننناسین، زۆربەیان ئەڵمانی بوون. کاتێك لەگەڵ براکەم شەڕمان دەکرد، دایەنەکە دەیگوت: "ژیر و بێدەنگ بن، تکایە ژیر و بێدەنگ بن!" دواتر لەبەرچاوی باوکم لاساییمان دەکردەوە و باوکمان دەهێنایە پێکەنین. لەدوای ماوەیەك، ئەم دایەنەش ون بوو.

ساڵانی دواتر کاتێك باوکم دیسانەوە لە ماڵ ون دەبوو، شەڕی بەردەوامی من و براکەم، دایکمی پەست دەکرد و زۆر جار ئارامیی لەدەست دەدا و دەیگوت: "ئێستا دەڕۆم و جێتان دەهێڵم!" یاخود "ئێستا لە پەنجەرەکەوە خۆم فڕێ دەدەمە خوارەوە."، هەموو قسەکانی بێسوود بوون. بەڵام کاتێك دەیگوت: "دواتر باوکتان لەگەڵ ژنێکی تر هاوسەرگیری دەکات!" بیرم دەکردەوە ڕەنگە هەڵبژاردنی دایکە تازەکە، یەکێك نەبێت لەو ئافرەتانەی کە دایکم هەندێك جار لە کاتی تووڕەییدا ناوەکەیانی لەدەم دەردەچوو، بەڵکو دایەنە قەڵەو و ڕەنگزەرد و دڵپاکەکە دەبێت.

لەبەر ئەوەی هەموو ئەم درامایانە لەسەر تەختێکی بچووك نمایش دەکران، زۆربەمان هەمیشە باسی یەك شتمان دەکرد و هەمان خواردنمان دەخوارد و تەنانەت هەموو گفتوگۆکان مردوو و بێزارکەرن (دواتر زانیم کە ئەم دۆخە لە هەموو خێزانێکی تردا هەیە و ڕۆتین بووبووە سەرچاوەی هەموو خۆشبەختی و مردن و گرەنتی ژیان)، هەر بۆیە وەك جۆرێك لە ڕزگاربوون لە بێتاقەتی، خۆم بۆ پێشوازیکردنی ونبوونە کتوپڕییەکان ڕاهێنابوو، کە هەروەك ئاوێنەکانی دایکم، خۆشییان پێ دەدام و دەرگای جیهانێکی تریان بۆ دەکردمەوە. ڕاکێشی شوێنێکی تاریکیان دەکردم و دەیانگەڕاندمەوە بۆ ئەو تەنیاییەی کە هەوڵم دابوو لەبیرم بچێتەوە.

زۆربەی دەمەقاڵێکان لەسەر مێزی خوانەکان دەستیان پێ دەکرد، بەڵام ساڵانی دواتر زۆربەی شەڕەکان زیاتر لەناو ئۆتۆمبێلەکەی باوکم (ئۆپڵی مۆدێل ١٩٥٩ بوو) ڕوویان دەدا. هەر بۆیەش مشتومڕەکان زیاتر درێژەیان دەخایاند، چونکە جێ هێشتنی ئۆتۆمبێلە خێراکە، قورستر بوو لە جێ هێشتنی مێزی نانخواردنەکە. هەندێك جار

دەستمان کردبوو بە گەشتەکە و لەناو ئۆتۆمبێلەکە نەخشەمان بۆ ڕۆژانی دواتر دادەنا، یان هەر لەو ساتەی بەڕێ دەکەوتین و هێشتا ماڵمان جێ نەهێشتبوو، لە ماوەی چەند خولەکێکدا شەڕ دەستی پێ دەکرد. من و براکەم گرەومان دەکرد لەسەر ئەوەی کە لەپاش پردی یەکەم یاخود لەپاش یەکەم بەنزینخانە، باوکم لەناکاو دەست دەنێت بە برێکدا و (وەك ئەو کاپتنە توورەیەی کە پاپۆڕەکەی دەگەڕێنێتەوە شوێنی سەرەتا) دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەوە و دواتر خۆی و ئۆتۆمبێلەکەی دەڕۆن بۆ شوێنێکی تر.

شەڕ و دەماقاڵێکان کاریگەریی زۆری هەبوو لە سەرمان، هەندێك جاریش کەشێکی شاعیرانەی دروست دەکرد. ئێوارەیەکیان کاتێك لەبەردەم مێزی نانخوارن دانیشتبوون لە ماڵە هاوینییەکەمان لە حیبەلەدیە، دایك و باوکم بوو بە دەمەقاڵێیان و هەردووکیان مێزەکەیان جێ هێشت (من دڵخۆش بووم ئەمە ڕووی دا، چونکە بەو جۆرەی کە خۆم دەمویست نانم دەخوارد نەك بەو جۆرەی کە دایکم پێی دەگوتم). بۆ ماوەیەك من و براکەم بێدەنگ سەیری قاپەکانمان دەکرد و گوێمان بۆ هاتوهاواری دایك و باوکمان دەگرت، دواتر بەبێ بیرکردنەوە، چووینە نهۆمی سەرەوە بۆ ئەوەی سەیریان بکەین (هەرگیز هیچ ئارەزوویەکم لە وەبیرهێنانەوەی ئەم ڕووداوانە نییە). کاتێك دایکم ئێمەی بینی، پاڵی پێوە ناین بۆ ژووری تەنیشت و دەرگاکەی دادەخست. ژوورەکە تاریك بوو، بەڵام ڕووناکیی گڵۆپێکی گەورە لەسەر نەخشی ناڤۆی سەر شووشە تەڵخەکانی سەر دوو دەرگا گەورە فەرەنسییەکەی ژوورەکان دەدرەوشایەوە. من و براکەم لە ڕێگای شووشە ڕووناکبووەکانەوە باوك و دایکمان دەبینی، وەك ئەوەی لە یەك سێبەردا تێکەڵ بووبن، لە یەك نزیك دەبوونەوە، پاڵیان بەیەکەوە دەنا و دەیاننەڕاند بەسەر یەکدا. کتومت وەك ئەو کاتانە بوو کە سەیری شانۆگەریی بووکەشووشەی قەرەگوێزمان دەکرد دواتر ئەم گەمەی سێبەرانە دەگۆڕان بۆ جۆرێك لە توندوتیژی کە پەردەکان (شووشە تەڵخەکان) دەلەرزین، هەموو شتێك دەبوویە ڕەش و سپی.

# ٩

# جیهانگیر

وەك لە زستانی١٩٥٧ڕووی دا، هەندێك جار خێزانەکەم هەموویان پێکەوە ون دەبوون. لەو ساڵەدا براکەم نێردرا بۆ دوو نهۆمی سەرەوەتر، بۆ ئەوەی ماوەیەك لەگەڵ مام و پوورم بمێنێتەوە. بە هەمان شێوە، منیش بەیانییەکیان پوورێکم هات بۆ نیشانتاشی و بردمی بۆ ماڵەکەی خۆی لە جیهانگیر. پوورم ئەوەندەی کە دەیتوانی هەموو شتێکی دەکرد، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە من هەست بە بێزاری ناکەم. ئەو کاتەی هێشتا لەناو ئۆتۆمبێلەکە (شوفەرلێتی ١٩٥٦ بوو، لە ماوەی شەستەکاندا زۆر باو بوو لە ئەستەنبوڵ) بووین، پوورم دەیگوت: "بە چەتینم گوتووە، ئەم بەیانییە ماستت بۆ بهێنێت."، ئەوەندەی لە بیرم بێت کە هەرگیز حەزم لە ماست نەبووە، بەڵام ئەوەی زۆر سەرسامی کردم لەو کاتەدا، ئەوە بوو ئەوان شوفێری تایبەتیان هەبوو. کاتێك گەشتینە باڵەخانە گەورەکەیان (لە باپیرمەوە بۆیان جێ مابوو، چەند ساڵ دواتر منیش لە یەکێك لە نهۆمەکانی دەژیام)، بینیم ئەپارتمانەکەیان ئاسانسواری کارەبایی و گەرمکەرەوەی نییە و نهۆمەکانیش زۆر بچووکن، تەواو هیوا لێبڕاو بووم. بۆ ئەوەی شتەکان خراپتر بکەم، ڕۆژی دواتر کاتێك دەمویست بە ڕووخسارێکی مرومۆچەوە خۆم ڕابێنم لە ماڵە نوێیەکە، سوپرایزێکی خراپم هەبوو: لەپاش ئەوەی ئێوارەوەنەوزێکم کرد و لەسەر جێگای خەوەکەم وەك منداڵێکی بەناز ڕاکشابووم، هەروەك ماڵی خۆمان بانگی خزمەتکارەکەم کرد: "ئامینە خان، وەرە بەرزم بکەرەوە و جلەکانم لەبەر بکە ! "، تەنها بۆ ئەوەی لەبەرامبەردا وەڵامێکی سەرزەنشتکەر و توندەڕەوانەم بدرێتەوە. ئەو

ماوەیەی لەوێ بووم، هەوڵم دەدا گەورەتر لە تەمەنی خۆم هەڵسوکەوت بکەم. ئێوارەیەکیان کاتێك ژەمی ئێوارەم لەگەڵ پوورم، هاوسەرەکەی شەوکەت ڕادۆ، (شاعیر بوو و بڵاوکەرەوەی چاپی دەقاودەقی کتێبەکەی مێلین بوون)، هەروەها پوورزا دوازدە ساڵەکەم (موحەمەد)، دەخوارد، بەدەم سەرنجی وێنەی منداڵە هاوشێوەکەمەوە کە لە چوارچێوە سپییەکەیەکەی سەر دیوارەکە سەیری خوارەوەی دەکرد، لەناکاو دەستم کرد بە باسکردنی ئەوەی کە عەدنان مەندرس، سەرۆکوەزیران، مامی منە، بەڵام تێبینییەکەم بەو شێوە ڕێزەوە پێیان نەگەیشت کە ئاواتم دەخواست، چونکە بە قسەکەم هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، هەستم کرد شتێکی هەڵە ڕووی داوە، چونکە پێم وا بوو سەرۆکوەزیران هەر بەڕاستی مامی منە.



لە سووچێکی مێشکی خۆمدا دامنابوو، کە ئەو مامی منە. مامە ئۆزهان و سەرۆکوەزیران عەدنان مەندرس، هەردووکیان ناوەکەیان لە شەش پیت پێك هاتبوو و بە هەمان دوو پیتی وەك یەك کۆتاییان دەهات. سەرۆکوەزیران لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەژیا، مامی منیش دوو ساڵ بوو ڕۆشتبوو بۆ ئەوێ. هەموو ڕۆژێك چەندین جار سەیری وێنەی هەردووکیانم دەکرد (وێنەی سەرۆکوەزیران لە لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان، وێنەی مامم لە هەموو لایەکی ژووری دانیشتنەکەی داپیرەم هەڵواسرابوو). لە هەندێك لە وێنەکاندا زۆر لە یەك دەچوون _کەواتە سەیر نەبوو کە ئەم جۆرە خەیاڵەم لا دروست بووبوو. لە ساڵانی دواتری ژیانمدا سەرکەوتوو نەبووم لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە بیرکردنەوە میکانیزییە، بۆ ئەوەی ڕزگارم بێت لە چەندین بیروباوەڕ، هەستی گومانناوی، پەسەندکردن و دادپەروەریکردنی نێوان شتەکان. بەمنداڵی زۆر ڕاستگۆیانە

باوەڕم وا بوو ئەگەر دوو کەس یەك ناویان هەبێت، ئەوا کەسایەتییشیان وەك یەکە. دوو وشەی نەناسراو، ئەگەر تورکی یان بیانی بن، لە ڕووی ماناوە یەك واتایان هەیە ئەگەر وەك یەك بنووسرێن. ئافرەتێك کە ڕوومەتی چاڵی تێدا بێت، هەندێك شتی تێدایە کە لە ئافرەتێکی تری ڕوومەت بە چاڵدا هەیە. خەڵکە قەڵەوەکان هەموو وەك یەکن. هەژارەکان هەموویان لە یەك دەستەی برایەتین، کە من هیچ زانیەرییەکم نەبوو لەسەری. پەیوەندییەك لەنێوان بەزالیا و بەرازیل هەیە، نەك لەبەر ئەوەی ناوەکەیان لەیەك دەچێت، بەڵکو ئالآی بەرازیل بە جۆرێك بوو وەك ئەوەی بەزالیایەکی گەورەی لەسەر بێت. ئەمەریکییەکان بە هەمان شێوە، پەیوەندی لەنێوان باڵندەی قەل و تورکیا دروست دەکەن _لە زمانی ئینگلیزی، وشەی قەل و تورکیا هەمان نووسینیان هەیە. مامم و سەرۆکوەزیران لە بیری مندا، هەتا ئەمڕۆش بەیەکەوە بەستراون، ڕۆژێك پەیوەندییەکە دروست بووە و هیچ شتێك ناتوانێت بیپچڕێنێت. کاتێك بیر لەو خزمە دوورەم دەکەمەوە کە جارێکیان لە خواردنگایەك بینیم، سپێناخ و هێلکەی پێکەوە دەخوارد (یەکێك لە خۆشییەکانی منداڵی، ڕاکردنە بۆ لای ئەو خزم و ناسراوانەی لە هەر شوێنێکی شارەکە بیانبینی)، شتێك لە ناخمدا پێم دەڵێت، ئەم خزمە ئێستاش لەو چێشتخانەیە، هێلکە و سپێناخ پێکەوە دەخوات.

بەهرەی خەیاڵکردن بۆ خۆشکردنی ژیانم، لەمماڵەشدا خزمەتی کردم. لەم ماڵەدا وا هەستم دەکرد لەوان نیم و بێزار دەبووم. هەر زوو بە تاقیکردنەوەیەکی نوێ و ئازایانە، سواری کەشتیی خەیاڵەکانم دەبووم. هەموو بەیانییەك لەپاش ئەوەی پووررزاکەم دەچوو بۆ قوتابخانەیەکی ئامادەیی ئەڵمانی، یەکێك لە کتێبە گەورە و نایابەکانیم دەردەهێنا (وا بزانم چاپی براکهاوس بوو)، لەبەردەم مێزەکەی دادەنیشتم و دێڕەکانیم دەنوسینەوە. زمانی ئەڵمانیم نەدەزانی و زۆر بەکەمییش دەمتوانی بخوێنمەوە، لەبەر ئەوە وەك ئەوەی پەخشانێکم لەبەردەست بێت، لە هەموو دێڕ و ڕستەیەك، وێنەیەکم دروست دەکرد. لەپاش ئەوەی وێنەی وشەکەم دەکێشا کە لە پیتە قورسەکانی جەرمانی پێك هاتبوو، وەکو وێنەکێش سافێڤیم دەکرد کە لەپاش کێشانی وێنەی دانەبەدانەی هەزاران گەڵای درەختێکی گەورە دەیکرد: بە سەیرکردنی نێوان

بینای ئەپارتمانەکان، ڕووبەرە چۆڵەکان، ئەو کۆڵانانەی بەرەو دەریاکە دەچوون، یان ئەو کەشتییانەی بە بۆسفۆردا دەهاتن و دەچوون، وچانێکم دەدا بە چاوەکانم.

لە جیهانگیر (ئەو شوێنەی کە هەموو خێزانەکە لەدوای لەناوچوونی سامانەکەمان لەوێ ژیانمان بەسەر برد)، بۆ یەکەم جار فێر بووم کە ئەستەنبوڵ تەنها شاری دیوارە بەرز و نەناسراوەکان نییە _دارستانی ئەو باڵەخانانەی کە کەس نازانێت کێ مردووە و کێ ئاهەنگ دەکات لەناویاندا_ بەڵکو وەکو شارێکی چەندین دوورگەیی وایە، چەندین ناوچەی لەخۆ گرتووە کە هەموو کەس یەکتر دەناسێت. کاتێك لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، تەنها بۆسفۆر و ئەو کەشتییانەم نەدەبینی کە بەهێواشی بەرەو بەندەرەکان دەچوون، بەڵکو باخچەی نێوان خانووەکان، کۆشکە دێرینەکان کە هەتا ئەوکات نەڕووخابوون و ئەو منداڵانەم دەبینی کە لەنێوان دیوارە ڕووخاوەکان یارییان دەکرد. لە جیهانگیر، خانووییەکی زۆر هەبوون کە ڕوویان لە بۆسفۆر بوو. لەبەردەم بیناکان، چەندین کۆڵانی پێچاوپێچ و چەوڕێژکراو هەبوون، کە بەرەو دەریاکە درێژ ببوبوونەوە. لە ئێوارە بەفراوییەکاندا لەگەڵ پوورم و پوورزاکەم لەدوورەوە ڕادەوەستاین و سەیری ژاوەژاوی ئەو منداڵانەمان دەکرد کە بەدڵخۆشییەوە لەسەر گالیسکەی بەفرین و کورسی و پارچە تەختەیەکی درێژ لەم کۆڵانە تەسکانەدا، گەمە و خلیسکێنەیان دەکرد.



لەو ڕۆژگارەدا، تورکیا لەپاش هیندستان پلەی دووەمی هەبوو لە بەرهەمهێنانی فیلم و هەموو ساڵێك حەوت سەد فیلم بەرهەم دەهات، ناوەندی دروستکردنی فیلمەکانیش بیۆگڵو بوو، بەتایبەت لە شەقامی یەشیلچامو کە تەنها دە خولەك لە ئێمەوە دوور بوو. لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەکتەرەکان لە جیهانگیر دەژیان، ناوچەکە پڕ بوو لەو مام و پوورە پڕ لە میکیاجانەی کە هەمان ڕۆڵیان دەگێڕا کە لە فیلمەکاندا بینیبوویان .کاتێك منداڵان، ئەکتەرەکانیان لە شەقامەکاندا دەبینی، تەنها لە ڕێگای ئەو ڕۆڵ و کەسایەتییانەوە دەیانناسینەوە کە لە فیلمەکاندا هەیانبوو (بۆ نموونە" ڤاهی ئۆز، هەمیشە ڕۆڵی کەسێکی قەڵەو و فێڵبازی یاریی کارتی دەبینی، کە ئازاری خزمەتکارە گەنجە بێتاوانەکانی دەدا) ڕێگەیان پێ دەگرتن و پرسیاری بێمانایان



دەکرد. لە ڕۆژە باراناوییەکاندا، ئۆتۆمبێلەکان لە بەشی سەرەوەی کۆڵانە لێژەکان و لەسەر چەوە تەڕەکە یاریی خلیسکێنەیان دەکرد، بارهەڵگرەکانیش دەبوو ململانێیەکی زۆر بکەن، هەتا بگەنە لوتکەی کۆڵانەکە. هەر ڕۆژێك هەتاو بووایە، پاسێکی بچووك دەردەکەوت کە کەس نەیدەزانی لەکوێوە هاتووە و ئەکتەر و پیاوانی کاری ڕووناکی و باندی فیلمەکە کۆ دەبوونەوە. لەپاش ئەوەی لە ماوەی دە خولەکدا دیمەنێکی ئەڤینداریيان وێنە دەگرت، دووبارە دیار نەدەمان. لەپاش چەند ساڵ، کاتێك سەیری ئەم فیلمە ڕەشوسپییانەم دەکرد، دەمزانی بابەتی سەرەکیی فیلمەکە ڕووداوی ئەڤینداری نییە، بەڵکو بۆسفۆرە کە لەدوورەوە دەبریسکایەوە.

لە کاتێکدا لەنێوان باڵەخانەکانەوە سەیری بۆسفۆرم دەکرد، شتێکی تر دەربارەی ژیانی ئەم ناوچەیە فێر دەبووم: هەمیشە ناوەندێك هەبوو (زۆر جار دوکانێك) بۆ

لێکدانەوە و قسەوباسەکانی خەڵك. لە جیهانگیر، دوکانێکی میوەفرۆش و خواردەمەنی کە لە نهۆمی ئەرزی باڵەخانەکەی ئێمە بوو، بووبووە ناوەندی کۆبوونەوە و قسەکردنی ئەو ناوچەیە. دوکاندارەکە، لیگۆر، (هەر وەکو زۆربەی خێزانەکانی تری ئێرە) ڕۆمانی بوو. ئەگەر کەسێك شتێکی بویستایە، لە نهۆمەکەی خۆیەوە سەری دەردەهێنا، سەبەتەیەکی شۆردەکردە خوارەوە و بە دەنگی بەرز داخوازییەکەیان دەگوت بە لیگۆر. چەند ساڵ دواتر، کاتێك بە ماڵەوە هاتین بۆ ئەم باڵەخانەیە، دایکم وەك دراوسێکانی لەسەرەوە هاواری نەدەکرد هەتا داوای هێلکە و نان بکات، بەڵکو لای شیاوتر بوو داخوازییەکەی لەسەر کاغەزێك بنووسێت و بیخاتە سەبەتەیەکەوە کە زۆرتر مۆدێرن بوو لەچاو ئەوەی دراوسێکان، ئینجا ڕەوانەی خوارەوەی بکات. (کوڕە لاسارەکەی پوورم، کاتێك پەنجەرەکەی دەکردەوە، لەسەرەوە تفی دەکردە خوارەوە بۆ ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە ململانێیان دەکرد بۆ ئەوەی بگەنە لوتکەی کۆڵانەکە، یاخود نینۆکی فڕێ دەدایە خوارەوە، یان تەرەقەی ئاگرینی بە شێوەیەکی زیرەکانە بە شێوەی زنجیرە دەوەشاندە خوارەوە. تەنانەت ئەمڕۆش کاتێك لە پەنجەرەیەکی بەرزەوە سەیری شەقامەکەی خوارەوە دەکەم، بیر لەوە دەکەمەوە کە دەبێت هەستێکی چۆن بێت، ئەگەر تف فڕێ بدەیت بۆ ئەوانەی خوارەوە.



شەوکەت ڕادۆ، هاوسەری پوورم، لە ڕۆژانی پێشووی ژیانی تێکۆشابوو هەتا ببێتە بە شاعیر، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو و دواتر بوو بە ڕۆژنامەنووس و بڵاوکەرەوە. ئەوکات

من لەوێ بووم، خەریکی چاپکردنی کتێبی *مەیات* (ژیان)، دواتر گۆڤارێکی باوی هەفتانە بوو. ئەوکات تەمەنم پێنج ساڵان بوو و کارەکەیم زۆر بەبایەخ نەبوو لەلام. هەروەها هاورێ و هاوپۆلی ئەو کەسانە بوو، کە دواتر کاریگەریی زۆریان لەسەر بیرۆکەکانم دەربارەی ئەستەنبوڵ هەبوو. بازنەی هاورێکانی پێك هاتبوو لە یەحیا کەمال، ئەحمەد حەمدی تانپنار و کەمالەدین توگجو، کە نووسەری کورتەچیرۆکی میلۆدرامایی منداڵان بوو، کە باسیان لە ژیانی ئەو منداڵانە دەکرد کە لە گەڕەکە هەژارنشینەکان لەسەر شەقامەکان دەمانەوە. ئەوەی کە منی دڵخۆش دەکرد ئەوە بوو سەدان کتێبی منداڵان هەبوون کە کاکە شەوکەت کاری چاپ و بڵاوکردنەوەی بۆ دەکردن. لەپاش ئەوەی فێری خوێندنەوە بووم، چەند کتێبێکی وەکو (کورتەچیرۆکی هەزار و یەك شەوە، زنجیرە چیرۆکی براکانی هەڵۆ، ئەنسکلۆپیدیای دۆزینەوە و داهێنانەکان)ی بەدیاری پێ دام.

هەفتەی جارێك پوورم دەیبردم بۆ نیشانتاشی بۆ بینینی براکەم، کە هەموو جار دەچوومەوە بۆی باس دەکردم کە چەندە دڵخۆشە لە پاموك: کە چۆن هەموو بەیانییەك بۆ نانی بەیانی، ماسی دەخوات. چۆن لە ئێوارنادا کۆ دەبنەوە و گاڵتە و هەموو ئەو شتانە دەکەن کە زۆر بیرم دەکردن، وەکو یاریی تۆپی پێ لەگەڵ مامم، گەشتی یەکشەممان بە ئۆتۆمبێلە دۆجەکەی مامم بۆ بۆسفۆر و گوێگرتن لە کاتژمێری وەرزش لە رادیۆ و ئەو یارییانەی حەزمان لێیان بوو. دواتر شەوکەت دەیگوت: "کاتی ڕۆشتنە، زۆر دوور نەکەویتەوە !"

کاتێك وەختی گەڕانەوە بۆ جیهانگیر نزیکتر دەبوویەوە، زۆر گران بوو لەسەرم براکەم جێ بێڵم، تەنانەت نەمدەتوانیماڵئاوایی بکەم. جارێکیان لە ساتی جیابوونەوە، هەوڵم دا بە خۆهەڵواسین بە ڕادێتەری ناو هۆڵەکەوە خۆم بدزمەوە. کاتێك ئەوانی تر دەیانویست دەستم بگرن، بە دەنگێکی بەرزتر دەگریام و پێم وا بوو شەرمەزارییە ئەگەر دەستیان بدەمێ، لەبەر ئەوە کاتێکی زۆر خۆمم بەهەڵواسراوی هێشتەوە _هەستم دەکرد یەکێکم لە پاڵەوانەکانی ناو پەرتووکە کارتۆنییەکەم کە لەلێواری لاپاڵێکدا خۆی بە تاقە لقێکەوە هەڵواسیبوو.

ئایا هۆگری ئەو ماڵە بووم؟ پەنجا ساڵ دواتر گەڕامەوە هەمان باڵەخانە، بەڵام هەمان ئەو ژوور و کەلوپەلە جوانانەی پێشووی نا. چەند ساڵ دواتر ئەم ماڵە بۆ من،

وەك ناوەندی جیهان بوو _هەڵهاتن لە هەموو شتە باش و خراپەكان. لەباتی ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی كێشەكان ببمەوە_ دەمەقاڵێكانی دایك و باوكم، موفلیسبوونەكەی باوكم، شەڕە بێكۆتاییەكانی خێزانەكە و لەناچوونی سامانەكەمان _بە خەریكبوون بە یارییە ئەقڵییەكانەوە خۆمم فریو دەدا و دۆخەكەم دەگۆڕی، یاخود لە تەمومژێكی لێڵدا خۆمم ون دەكرد.

دەكرێت ئەم دۆخە ئاڵۆز و سەلێشێواوییە ناو بنێین دڵتەنگی یاخود بە ناوە توركییەكەی ناوی بنێین *هوزن* كە زیاتر گشتییە و لەناو خەڵكدا باوە. *هوزن* ئارامیمان دەكاتەوە و ڕوانینەكانمان دەگۆڕێت، هەروەك ئەو دڵۆپە ئاوانەی كە لەسەر شووشەی پەنجەرەكە دروست دەبن، كاتێك لە ڕۆژێكی زستاندا كترییەك هەڵم دەكات و دروستیان دەكات. پەنجەرە هەڵماوییەكان وام لێ دەكەن هەست بە *هوزن* بكەم، هەتا ئێستاش حەز دەكەم هەستم و بڕۆم بۆ لای پەنجەرەكە و وشەی لەسەر بنووسم، ئەوكات *هوزن* لە ناخمدا كەم دەبێتەوە و دەتوانم هێمن ببمەوە. لەپاش ئەوەی هەموو نووسینەكان و وێنەكانم لەسەر شووشەی پەنجەرەكە تەواو دەكرد، دەمتوانی بە پشتی دەستم هەموویان بسڕمەوە و سەیری دەرەوە بكەم.

بەڵام دیمەنی دەرەوە، لەوانەیە هەر خۆی *هوزن* دروست بكات. كاتی ئەوەیە بەباشی لەم هەستە بگەین، كە ئەستەنبوڵ وەك چارەنووسی خۆی لەخۆی گرتووە.

١٠

# هوزن، ماتەمینی، خەم

*هوزن* وشەیەکی تورکییە بە مانای خەم دێت. ڕەگی ئەم وشەیە عەرەبیە: لە قورئاندا وەك *حزن* یان *حەزین* هاتووە، کە هەمان واتای وشە تورکییەکەیە. هەروەها (موحەمەد پێغەمبەر) ئاماژەی پێ کردووە بۆ ئەو ساڵەی کە خەدیجەی هاوسەری و (ئەبو تالیب)ی مامی لەدەست داوە و ساڵەکەی ناو ناوە (*سنه الحزن*) واتە ساڵی ماتەمینی. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، ئەم وشەیە مانای هەستێکی قوڵ دەگەیەنێت کە بە هۆی لەدەستدانێکی ڕۆحی و دەروونییەوە دروست دەبێت. کەواتە ئەگەر *هوزن* بۆ دەربڕینی هەستی لەدەستدانی ڕۆحی هاتبێتە بوون، ئەوا خوێندنەوەی من بۆ ئەم وشەیە، هەڵەیەکی فەلسەفی لەخۆ دەگرێت کە لە سەدەکانی داهاتووی مێژووی ئیسلامدا گەشەی سەندووە. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، دوو *هوزنی* تەواو جیاواز لە یەك دەبینین کە هەریەکەیان دوو شێوازی تەواو جیاواز لەیەك دەگرن.

بەپێی شێوازی یەکەم، کاتێك بەتەواوەتی خۆمان پەیوەست بکەین بە خۆشییەکانی دونیا و دەسکەوتە ماددییەکان، لەگەڵ ئەو شتەی پێی دەگوترێت *هوزن* ئەزموون پەیدا دەکەین، چونکە چەمکی ئەم شێوازە دەڵێت: "ئەگەر خۆت بەتوندی پەیوەست نەکەی بە دونیای کاتییەوە، ئەگەر تۆ مسوڵمانێکی ڕاست و باش بیت، ئەوا زۆر بایەخ نادەیت بەو بابەتە دونیایانەی کە لەدەستت داون." شێوازی دووەم، کە لەناو سۆفیگەریدا سەری هەڵداوە، شرۆڤەیەکی زیاتر ئەرێنی و سۆزداری بۆ وشەکە دەکات. بە تێڕوانینی سۆفییەکان، *هوزن* ئازارێکی دەروونییە، لە ئەنجامی دوورکەوتنەوە و

گوێڕایەڵینەکردنی خودا هەستی پێ دەکەین. شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی سۆفیگەری، بایەخ بە هەندێك شتی دونیایی نادات، بەڵکو ئازاری خەم دەچێژێت، چونکە وا هەست دەکات بەتەواوەتی لە خودا نزیك نیە، چونکە تێگەشتنی لە خودا بەتەواوەتی قووڵ نییە. لەبەر ئەوە نەبوونی *موزن* نەك بوونی، دەبێتە هۆی ئەوەی هەستی پێ بکات: ئازار دەکێشێت، لەبەر ئەوەی وا هەست دەکات ئازاری نەکێشاوە. کەواتە لە ڕێگای ئەم شیکردنەوە لۆژیکییەوە، دەگەینە ئەو ئاکامەی کە کلتووری ئیسلامی *موزنی* لە پلەیەکی پیرۆزدا داناوە. ئەگەر *موزن* لە بنچینەی کلتوور و ئەدەب و ژیانی ڕۆژانەی دوو سەدەی پێشووی ئەستەنبوڵ هەبێت، ئەگەر زاڵ بووبێت بەسەر موزیکدا، لەبەر ئەوە بووە کە *موزن* لای ئێمە پیرۆز بووە. بەڵام بۆ تێگەشتن لەوەی کە *موزن* لە سەدەکانی پێشوودا چی واتایەکی هەبووە، تەنها ئەوەندە بەس نییە وەك چەمکێکی پیرۆز قسەی لەبارەوە بکەین، کە لە شێوازی سۆفییەکاندا ئەو واتایەی هەبووە. بۆ تێگەشتن لە کاریگەریی *موزن* لەسەر موزیکی سەدان ساڵەی پێشووتری ئەستەنبوڵ، بۆ تێگەشتن لەو وەڵامەی کە بۆچی *موزن* تەنها دەستی نەگرتووە بەسەر شیعری مۆدێرنی تورکی (وەکو لە هۆنراوەکانی دیڤان)، بەڵکو لە سیمبۆلیزمیشدا ڕەنگی داوەتەوە، بۆ تێگەشتن لە گرنگیی *موزن* کە وەك چەمکێکی کلتووری شکستە دنیاییەکان، هیلاکی و ئازارە دەروونییەکان دەردەبڕێت، تەنها شرۆڤەکردنی مێژووی وشەکە و ئەو پیرۆزییەی لە ژیانماندا هەیبووە بەس نییە. بۆ گەیشتن بە واتای تەواوی *موزن*، کە ئەستەنبوڵ وای لێ کردم وەك منداڵێك هەستی پێ بکەم، ئەوا پێویستە باسی مێژووی شارەکە لەپاش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەو مێژووە بکەم کە لە دیمەنی جوانی شارەکە و خەڵکەکەیدا ڕەنگی داوەتەوە. *موزنی* ئەستەنبوڵ تەنها لە شیعر و موزیکدا بەرچاو ناکەوێت، بەڵکو لە ژیانی ڕۆژانەشدا کە دەمانبەستێتەوە نەك تەنها بە دۆخە دەروونییەکەوە، بەڵکو بە هزر و ئاوەزیشمانەوە. بۆ دۆزینەوەی واتای تەواوی وشە فرەماناکە، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای ئەو زانایانەی کە وەك چەمکێکی شاعیرانە نا، بەڵکو وەك نەخۆشییەك بینیویانە. بە تێڕوانینی (ئەلکیندی)، *موزن* تەنها پەیوەندی نییە بە لەدەستدان و مردنی کەسی خۆشەویست، بەڵکو پەیوەندیی بە ئازارە دەروونییەکانی تری وەکو تووڕەیی، خۆشەویستی، ترس و ڕق لێبوونەوەوە هەیە.

دکتۆر و فەیلەسووف (ئیبن سینا)، بە هەمان بیرکردنەوە سەیری *موزنی* کردووە و پێشنیاری کردووە، باشترین ڕێگا بۆ تێگەشتن لە ئازارە سۆزدارییەکانی کوڕێك، پرسیارکردنە لەو کوڕەی کە دڵی بۆ کچێك لێدەدات. ئەم ڕوونکردنەوەیەی زانا ئیسلامییە کلاسیکەکان، وەك ئەو شیکردنەوەیە کە پرۆفیسۆری زانکۆی ئۆکسفۆرد (ڕۆبێرت بێرتن)، لە سەدەی حەڤدەیەم لە کتێبی (شیکردنەوەی ماتەمینی) ڕاڤەی کردووە. (کتێبەکە ١٥٠٠ لاپەڕەیە، کە کتێبە گەورەکەی ئبن سینا (فی الحزن) وەك نامیلکەیە بە بەراورد لەگەڵ ئەودا). هەروەك ئبن سینا، (بێرتن) تێڕوانینێکی گشتی هەبووە بۆ (ئازاری ڕەش) کە ترسان لە مردن، خۆشەویستی، شکست، خراپەکاری و هەندێك خواردن و خواردنەوە دەگرێتەوە، کە دەبنە هۆی *موزن*. لە ڕێگای بەستنەوەی فەلسەفە و زانستی پزیشکی بەیەکەوە، بێرتن ئامۆژگاریی خوێنەرەکانی دەکات کە لەناو ژیری، کار، ڕەوشت، مەشقکردن و ڕۆژووگرتن بەدوای ئارامیدا بگەڕێن. جێگای سەرنجە کە ئەم دوو کتێبە، سەرەڕای ئەوەی لە دوو کلتووری جیاوازن، کۆمەڵێك خاڵی بنچینەیی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە.

کەواتە *موزن* وەك ماتەمینی، لە (سۆزی ڕەش)ەوە ڕەگی داکوتاوە. مێژووی دەرکەوتنی وشەی ماتەمینی، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەرستۆ. لێرەوە دوو جیاوازی دەبینین لە وشەکەدا، بێرتن شانازی بە ماتەمینیی خۆیەوە کردووە، چونکە پێی وا بووە هەستی ماتەمینی و خەم، دەیگەیەنێت بە چێژی تەنیایی و بەهێزکردنی توانا خەیاڵییەکانی. لە هەردوو بارەکەدا، بێرتن تەنیایی وەك دڵ و کرۆکی ماتەمینی بینیوە. بەپێچەوانەوە، (الکندی) *موزنی* وەك نەخۆشی، یان وەك بارێکی سۆفیگەری (پەیوەندیی ئامانجی هاوبەشی هەموومان بە خوداوە) هەیە، بینیوە نەك وەك هۆکارێك بۆ تەنیایی. هەر وەکو زۆربەی زانا ئیسلامییە کۆنەکان، خاڵی بنچینەیی (جماعة)، یاخود کۆمەڵەی باوەڕداران بووە. کەواتە (الکندی)، وەك ئەزموونێکی گشتی سەیری *موزنی* کردووە.

خاڵی سەرەتا، لە هەستی ئەو منداڵەوە دەست پێ دەکەم کە لە شووشەی پەنجەرەیەکی تەماوییەوە سەیری دەرەوە دەکات. لێرەوە دەست دەکەین بە باسکردنی *موزن*، نەك وەك خەم و ماتەمینی کەسێکی دوورەپەرێز و تەنیا، بەڵکو وەك

دۆخێکی تاریك لەنێوان ملیۆنەها خەڵکدا دابەش کراوە. ئەوەی دەمەوێت باسی بکەم، موزنی هەموو شارەکەیە: موزنی ئەستەنبوڵ.

پێش ئەوەی وێنەی ئەم هەستەم بکێشم کە تایبەتە بە ئەستەنبوڵ و هەموو خەڵکەکەی بەیەکەوە بەستووە، دەبێت بە بیری خۆمانی بهێنینەوە کە ئامانجی سەرەکیی نیگارکێشی دیمەنەکان، ئاگادارکردنەوەی بینەرەکانیەتی لەو هەستەی کە دیمەنەکە لە ناخی خودی هونەرمەندا دروستی کردووە. ئەم هەستە بە شێوەیەکی بەربڵاو لەناو نووسەرە ڕۆمانتیکییەکانی سەدەی نۆزدەیەم ڕەنگی داوەتەوە. کاتێك (بۆدلایر) سەرنجی نیگارەکانی (ئیوجین دیلاکرۆ)ی داوە، ئەو شتەی زۆر کاری تێ کردووە ئەو کەشی ماتەمینییە بووە کە لە وێنەکانیدا هەبووە، هەروەها وشەیەکی شیاوی وەکو پیاهەڵدانی بەکارهێناوە بۆ ناونانی ئەو هەستە. لەپاش شەش ساڵ لە بیرۆکەکانی (بۆدلایر) لەسەر وێنەکانی (دیلاکرۆی)، (لە ساڵی ١٨٦٤) هاوڕێکەی (تۆفلّ جوتیر)، نووسەر و ڕەخنەگر، لە کتێبەکەی (قونستەنتینیە)، کە بیرۆکەکانی دواتر کاریگەریی زۆری لەسەر هەندێ لە نووسەرەکانی ئەستەنبوڵ وەك و (یەحیا کەمال و تانپنار) هەبوو، گەشتی بۆ ئەستەنبوڵ کردووە و وەك پیاهەڵدانێك باسی ماتەمینیی دیمەنەکانی شارەکەی کردووە.





ئەوەی دەمەوێت باسی بکەم، تەنها ماتەمینیی ئەستەنبوڵ نییە، بەڵکو ئەو *مۆزنە*یە کە هەمووان تێیدا ڕەنگیان داوەتەوە. ئەو *مۆزنە*ی کە گشتییە و لەنێوان هەموواندا دابەش کراوە. بۆ هەستکردن بەم *مۆزنە*، سەیرکردنی دیمەنەکان و گەڕانەوە بۆ بیرەوەرییەکانی شارەکەیە. دەمەوێت باسی ئەو ئێوارانە بکەم کە خۆر زووتر ئاوا دەبێت، ئەو باوکانەی بە جانتاکانی دەستیانەوە لەژێر ڕووناکیی گڵۆپی شەقامەکان بەرەو ماڵەوە دەگەڕێنەوە، ئەو کەشتییانەی کە لەناوەڕاستی زستاندا لە مەیدانەکانیان لە بۆسفۆر بەستراونەتەوە، کە لەویّ کەشتیوانە خەواڵووەکان، سەتڵێکیان لە دەستە و خەریکی سڕینەوەی ڕووی کەشتییەکانن و بە چاوێکیش سەیری ئەو تەلەفزیۆنە ڕەشوسپییە دەکەن کە لەدوورەوە دیارە، ئەو کتێب فرۆشانەی کە چاوەڕێی دەرکەوتنی کڕیارەکانیان دەکەن، ئەو سەرتاشانەی کە هەمیشە گلەیی ئەوە دەکەن لەدوای قەیرانی ئابووری، پیاوان سەر و ڕیش ناتاشن، ئەو منداڵانەی کە لەنێوان ئۆتۆمبێلەکانی سەر کۆڵانە چەوریژکراوەکان یاریی تۆپی پیّ دەکەن، ئەو ئافرەتە باڵاپۆشانەی کە لە وێستگەی وەستانی پاسەکان وەستاون، جانتای بازاڕکردنیان لە دەستە، لەگەڵ کەس قسە ناکەن و چاوەڕێی ئەو پاسانە دەکەن کە هەرگیز ناگەنە مەیدانی بەلەمی ڤێلاکانی بۆسفۆر کە ئێستا چۆڵ کراون، ئەو چایخانانەی کە پیاوانی دەستبەتاڵی لێیە، ئەو بازرگانی سۆزانیانەی کە لە ئێوارانی هاویندا بۆ دۆزینەوەی

گەشتیارێکی تری سەرخۆش، بەخێرایی بەرەو یەکێك لە گەورەترین گۆڕەپانی شارەکە دەڕۆن، چەرخوفەلەکی شکاوی منداڵان لە پارکە چۆڵەکان، هۆڕنی ئەو کەشتییەی بەناو تەمدا دەڕوات، ئەو کۆشکانەی کە تەختەکەیان جیڕەجیڕ دەکات و هەرچەندە کاتی خۆی کۆشکی عوسمانییەکان بوون، بەڵام بوونەتە بینای شارەوانی و کاروباری میری، ئەو ژنانەی ئێواران لەپشت پەردەکانەوە بەدزییەوە سەیری دەرەوە دەکەن و چاوەڕێی هاتنەوەی هاوسەرەکانیان دەکەن کە هەرگیز ناتوانن لە ئێواراندا بگەڕێنەوە، ئەو مامەپیرانەی لەبەردەم مزگەتەکاندا کتێبی بچوکی ئایینی و تەسبیح و ڕۆنی حەج دەفرۆشن، ئەو هەزاران باڵەخانانەی کە دەرگای چوونەژوورەوەیان وەك یەکە و دیواری دەرەوەیان بە هۆی چڵك و ژەنگ و دووکەڵ و تەپوتۆزەوە بێڕەنگ بوون، ئەو ئاپۆڕەی خەڵکەی کە لە ئێوارانی زستاندا بەلێشاو بەرەو کەشتیی پەڕینەوەکان دەڕۆن بۆ ئەوەی زوو بگەڕێنەوە ماڵەوە، ئەو دیوارانەی شار کە لە کاتی ڕووخانی ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتین بەتێکشکاوی ماونەتەوە، ئەو بازاڕانەی لە ئێواراندا چۆڵ دەبن، خانەقا و تەکیەی دەروێشەکان کە بەرەو داڕووخان دەچن، ئەو نەورەسانەی کە لەسەر ئەو کەشتییانە دەنیشنەوە کە بە قەوزە و سەدەف داپۆشراون و لەژێر ئاوی پیسی باراناودا دەمێننەوە، ئەو دووکەڵەی کە لە ساردترین ڕۆژەکاندا لە دووکەڵکێشی کۆشکێکی کۆنی سەدان ساڵەوە دێتە دەرەوە، ئەو هەزاران پیاوەی لەکەناری پردی گەلاتا ڕاوەماسی دەکەن، ژووری ساردی کتێبخانەکان، وێنەگری سەر شەقامەکان، ئەو بۆنی هەناسانەی لە هۆڵی سینەماکان بەرز دەبنەوە کە ڕۆژێك زۆر شیك و گەشاوە بوون، دواتر گۆڕان بۆ سینەمای فیلمە ورووژێنەرەکان و لەلایەن پیاوە شەرمنەکانەوە سەردان دەکرێن، ئەو شەقامانەی لەدوای خۆرئاوابوونەوە ئافرەتی تەنیایان تێدا نابینرێن، ئەو جەنجاڵییەی لە ڕۆژانی گەرم و ڕەشابایدا لەبەردەم دەرگای چاودێریکراوی خانەی سۆزانییەکاندا هەیە، ئەو کچە گەنجانەی لەبەردەم دوکانێکدا لە نۆرەی فرۆشتنی cut-rate گۆشتدا وەستاون، ئەو ڕووناکییە کوژاوانەی لە ڕۆژانی جەژندا بە ماهیایی نێوان منارەکانەوە هەڵواسراون، ئەو دیوارانەی بە پۆستەری پڕوپاگەندە ڕەش و کۆنەکان داپۆشراون، ئەو ئۆتۆمبێلە شۆفەرلێتە کۆن و هیلاکانەی پەنجاکان کە دەبێت لە مۆزەخانەی شارێکی ڕۆژئاوایی دابنرێن، بەڵام لێرە وەك تاکسی بەکاردێن و دەبنە هۆی دروستبوونی دووکەڵ

بۆ کۆڵانە تەسکەکان و شەقامە گشتییەکانی شارەکە، ئەو پاسانەی جەنجاڵییەکی زۆری سەرنشینەکانیان تێدایە، ئەو مزگەوتانەی کە پلێت و قورقوشم و مەنهۆڵی ئاوەکانیان بۆ هەمیشە دزراون، ئەو گۆڕستانانەی وەك دەروازەی دونیاکەی تر دەردەکەون و ئەو دار چنارانەی لەوێ سەوز بوون، ئەو ڕووناکییە کزەی لە ئێوارانداا لەو بەلەمانەوە دێن کە لە کادیکۆی بەرەو کەرەکۆی دەڕۆن، ئەو منداڵە بچووکانەی دەیانەوێت پاکەتی کلێنس بفرۆشن بەو کەسانەی بە شەقامەکەدا تێدەپەڕین، کاتژمێری ئەو قوللانەی کە تا ئێستا کەس سەرنجی نەداون، ئەو کتێبە مێژووییانەی کە منداڵان لەبارەی سەرکەوتنەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەیانخوێنن و لێدانی هەمان ئەم منداڵانە لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە، ئەو ڕۆژانەی لە کاتی جیاکردنەوەی دەنگەکانی هەڵبژاردن یان لە کاتی سەرژمێریکردن هەموو کەس لە ماڵەوە دەمێنێتەوە، ئەو ڕۆژانەی کاتێك لەپڕ حکومەت بۆ کارئاسانیی دۆزینەوەی تیرۆرستان، قەدەغەی هاتوچۆ ڕادەگەیەنێت و هەموو کەسێك لە ماڵەوە بەترسەوە دادەنیشێت و چاوەڕوانی بڕیاری کاربەدەستان دەکات، ئەو وشانەی کە لە سووچی لاپەڕەیەکدا نووسراون و تا ئێستا نەخوێنراونەتەوە، ڕایدەگەیەنن گومەزیی مزگەوتی ناوچەکەیان کە ٣٧٥ ساڵە دروست کراوە، بەرەو داڕووخان دەچێت و دەپرسن کە بۆچی تا ئێستا حکومەت هیچ هەنگاوێکی نەناوە تا چاکی بکاتەوە، ڕێگای جەنجاڵی ژێر پردەکان، ڕێگای سەرپردەکان کە هەموو هەنگاوێکیان بە شێوەی جیاواز شکاوە، ئەو کیژانەی وتاری خوشکی گەورە لە ڕۆژنامەی (*ئازادی*) دەخوێننەوە، ئەو سواڵکەرانەی کە هەموو ڕۆژێك لە هەمان شوێنی گونجاو یەخەت دەگرن و دەپاڕێنەوە، بۆنی ناخۆش و بێزارکەری میز لە شەقام و کەشتی و کۆڵان و ژێر پردەکان بێزارت دەکات، ئەو پیاوانەی کارتی پۆستە لە هەمان شوێنی چل ساڵی پێشوو دەفرۆشن، بریقەدانەوەی پرتەقاڵیی سووربای شووشەی پەنجەرەکانی ناوچەی ئۆسکودەر لە کاتی خۆرئاوابووندا، ئەو بەرەبەیانیانەی جگە لەو ماسیگرانەی لە دەریاکە خەریکی ڕاوەماسین هیچ کەسی تر بەخەبەر نییە، ئەو سووچەی پارکی گوڵخانە کە ناوی خۆی ناوە باخچەی ئاژەڵان، بەڵام تەنها دوو بزن و سێ پشیلەی ماندووی تێدایە کە لە قەفەزەکانیاندا لاواز و بێهێزبوون، ئەو گۆرانیبێژە تازانەی کە هەموو هەوڵێکی خۆیان دەدەن بۆ ئەوەی لاسایی گۆرانیبێژە ئەمەریکییەکان

و گۆرانییبێژە بەناوبانگەکانی تورکیا و ئەستێرەکانی تری پۆپی تورکی بکەنەوە، کە لە یانە شەوانە گرانەکان گۆرانی دەڵێنەوە، ئەو قوتابییە ماندووانەی کە لە قوتابخانەیەکی دواناوەندیی ئینگلیزی وانە دەخوێنن، کاتێك قوتابخانە تەواو دەکەن، جگە لە وشەی "yes " یان "no"، هیچی دیکە فێر نەبوون، ئەو کۆچبەرانەی لە بەندەرەکانی گەلاتا چاوەڕێ دەکەن، ئەو میوە، سەوزە، زەرف، کاغەز، سندووق، پاکەت و توورەکە بەتاڵانەی کە لە ئێوارانی زستاندا لە شەقامی بازاڕەکاندا پەرشوبڵاو بوونەتەوە، ئەو ژنە باڵاپۆشە جوانانەی کە لە بازاڕەکان بەترسەوە خەریکی شمەك کڕینن، ئەو دایکە گەنجانەی لەگەڵ سێ منداڵەکەیان بەرەو خوارەوەی کۆڵانەکە دەڕۆن، ئەو کەشتییانەی کە لە بەیانیاندا دەنگی هۆڕنەکانیان ئەو دەمە دێنێتەوە یادت کە هەموو شارەکە کە لە کاتژمێر ٩:٠٠ی بەیانی، لە بەرواری دەیەم ڕۆژی تشرینی دووەم، بەڕێزەوە ڕاوەستابوون و سلاوێکی سەربازییان لە ئەتاتورك دەکرد، ئەو قادرمە چەوریژکراوانەی کە قیرتاو کران و چیتر جێگەی هەنگاوەکان دیار نییە لەسەریان، ئەو مەڕمەڕە شکاوانەی کە چەندین سەدە بوو کانیاوی گەڕەکەکانیان تێدا بوو کە ئێستا وشك بوون و بۆرییەکانیان دزراون، بینای ئەپارتمانەکانی کەنار شار کە لە ڕۆژانی منداڵیم خەڵکی چینی ناوەڕاست بوون _دکتۆر، پارێزەر، مامۆستا، هاوسەر و منداڵەکانیان_ لێرە دەژیان و ئێواران گوێیان بۆ دەنگی ڕادیۆ دەگرت، بەڵام ئێستا کراون بە گارکەی چنین و دروومان و کچانی گەنج بە کرێیەکی کەم کارییان تێدا دەکەن، سەیرکردنی دیمەنەکانی کەنداوی زێڕین و ئەیوب لە پردی گەلاتاوە، ئەو فرۆشیارانەی لەسەر شۆستەی کەنار ئاوەکە سمیت دەفرۆشن و چاوەڕێی کڕیار دەکەن، هەموو ئەو شتانەی کە بێکەڵك بوون و گرنگییان لەدەست داوە، باڵندەی لەقلەقەکان کاتێك پاییز نزیك بوویەوە لە باڵکان و باکوور و ڕۆژئاوای ئەورووپاوە بەرەو باشوور دەفڕن و کاتێك بەسەر بۆسفۆر و



دوورگەکانی دەریای مەڕمەڕدا دەڕۆن، سەیری تەواوی شارەکە دەکەن، ئاپۆڕەی ئەو پیاوانەی کە دوای یەکێك لە یارییە دووگۆڵیەکانەوە جگەرە دەکێشن.



لە کۆتایی چاوخشاندنمان بە شەقام و دیمەن و خەڵکی شارەکە، هەست بە *موزن* دەکەین. لە بەیانییەکی ساردی زستاندا، کاتێك تیشکی خۆر لەناکاو دەکەوێتە سەر بۆسفۆر و هەڵمێکی کاڵ لەسەر ڕووی ئاوەکە بەرز دەبێتەوە، *موزن* لە ناخماندا چڕتر دەبێتەوە و بەسانایی هەروەك فیلمێك لەلایەن هەموو دانیشتووانی شارەکەوە دەبینرێت و بڵاو دەبێتەوە، هەستی پێ دەکەین.



هەرچەندە جیاوازییەکی میتافیزیکیی زۆر لەنێوان *موزل* و ئەو ماتەمینییە هەیە کە (بێرتن) بە گەیشتن بە گۆشەگیری و تەنیایی ناساندوویەتی. بەڵام لێکچوونێك لەنێوان *موزل* و شێوازێکی تری خەم هەیە کە (کلود لیڤی ستڕۆس) لە کتێبی (*خەمباریی شارە خولگەییەکان*) باسی کردووە. ئەم شارە خولگەییانەی لیڤی ستڕۆس، کەمێك لە ئەستەنبوڵ دەچن. لەبەر ئەوەی ئەستەنبوڵ دەکەوێتە سەر هێڵی (٤١)ی ستوونی زەوی، کەشوهەوای فێنکترە و هەژارییش زۆر قورس نییە، بەڵام لاوازیی دانیشتووانەکەی و شێوازی هەڵسوکەوتیان پێکەوە، هەروەها ئەو جیاوازییەی هەستی پێ دەکەن لەگەڵ خۆرئاوا، وای کردووە ئەستەنبوڵ ببێتە شارێك کە تازە گەیشتووە بە خۆرئاواییەکان و دۆخێکی ئاڵۆزی ڕەخساندووە. بەو جۆرە *موزل* لەو خەمبارییە دەچێت، کە لیڤی ستڕۆس باسی کردووە.



خەمەکەی (لیڤی ستڕۆس) تەنها ئازارێك نییە کاریگەریی لەسەر تاکی دوورەپەرێز هەبێت، بەڵکو لەگەڵ مۆزن هەردووکیان هەستێکن یان کلتوورێکی کۆمەڵایەتین لەنێوان ملیۆنەها خەڵکەوە دابەش کراوە. بەڵام ئەو هەستەی ئەم دوو وشەیە وەسفی دەکەن، بەتەواوەتی چوونیەك نین. ئەگەر بمانەوێت جیاوازییەك دەربخەی،ن تەنها ئەوەندە بەس نییە کە بڵێین ئەستەنبوڵ کەمێك دەوڵەمەندترە لە ساوپۆولۆ و دەلهی. (ئەگەر سەرنج بدەیت، هەژاری لە زۆربەی ناوچە هەژارنشینەکان وەك یەکە) جیاوازیی نێوانیان لەوەدا دەردەکەوێت کە ئەستەنبوڵ پاشماوەی شارستانیەتێکی گەورە و شکۆداری ڕابردووە کە لە هەموو لایەکیەوە دیارە. گرنگ نییە شارستانیەتەکە چەندە بەخراپی پارێزگاریی لێ کراوە یان چۆن پشتگوێ خراوە و باڵەخانەی زەبەلاحی کۆنکریتکراو و مزگەوتە گەورەکان و بیناکانی تری ئەستەنبوڵ شوێنیان گرتوونەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پاشماوەی کەم و وێرانەی ئیمپراتۆرەکە _کۆشکە بچووکەکان، مزگەوتەکان و کانیاوەکان_ لە شەقامەکانی کەنار و سووچەکان، دەبنە هۆی خەم و دڵتەنگی بۆ ئەوانەی لەنێوانیان دەژین.

لە شارە ڕۆژئاواییەکان هیچ پاشماوەیەکی وەکو ئیمپراتۆرە گەورەکان نییە، هەتا بکرێتە مۆزەخانەیەکی مێژوویی و بەشانازییەوە پیشانی کەسانی تری بدەن. خەڵکی ئەستەنبوڵ بەسادەیی ژیان لەنێوان ئەم پاشماوە دێرینانەدا بەڕێ دەکەن. زۆربەی نووسەر و ڕێبوارەکان ئەم جۆرە ژیانەیان زۆر بەلاوە جوان بووە. بەڵام بۆ خەڵکی شارەکە، نیشتەجێبوون لەناو ئەم پاشماوانەدا، شتێکی هەستیارە، چونکە ئەم کاولکاری و پاشماوانە، بەبیرهێنانەوەی هەژاری و ئاڵۆزیی ئێستای ئەو شارەن، کە هەرگیز ناتوانێت بگات بە خەونی کلتور و سامان و توانا بەهێزەکەی ڕابردووی. چیتر گونجاو نییە کە شانازی بکەین بە ماڵێکەوە، کە تۆز و چڵك و قوڕ دەوری دابێت، یان گەشبین بیت بەو خانووە جوان و تەختانەی کە من وەك منداڵێك دەمبینی چۆن یەکبەیەك بەرەو لەناوچوون و داڕووخان دەچوون.

لە کاتێکدا گەشتی دەکرد بە سویسرادا، دۆستۆفسکی هەوڵی دەدا تێبگات لەو شانازییەی جنێڤانەکان دەیانکرد بە وڵاتەکەیانەوە. نووسەر وەك دژی دەمارگیریی ڕۆژئاواییەکان، لە یەکێك لە نامەکانیدا نووسیویەتی: "بە جۆرێك تەماشای سادەترین

شتی شارەکەیان کردووە، وەك ستوونی کارەبایی سەر شەقامەکان، وەك ئەوەی نایابترین و بەنرخترین شت بێت. جنێڤانەکان بە ڕادەیەك شانازی دەکەن بە شارەکەیانەوە و مێژووی شارەکەیان، بۆ نموونە" ئەگەر پرسیارێکی سادەی وەك ناونیشانی شوێنێکیان لێ بکەیت، بە جۆرێك وەڵامت دەدەنەوە کە شانازیبوونی پێوە دیارە. بۆنموونە" دەڵێن: "بەڕێزم لەم کۆڵانەوە ڕێك برۆ، ئینجا بەلای کانییە جوان و برۆنزییەکەدا تێپەڕە." ئەگەر دانیشتوویەکی ئەستەنبوڵ پرسیار لە ناونیشانێك بکات، لەوانەیە بە جۆرێك وەڵام بدرێتەوە، وەك ئەو ڕستەیەی کە نووسەری گەورە ئەحمەد



ڕەسیم (١٨٦٥-١٩٣٢) لە چیرۆکی (بیدیا و ئەڵەنی جوان) ئاماژەی پێ داوە: "بەلای گەرماوەکەی ئیبراهیم پادشادا تێپەڕە، کەمێك دوورتر برۆ، لەلای دەستە ڕاستەوە، خانوویەکی داڕووخاو دەبینی کە بەرامبەر ئەو وێرانەیە (گەرماوەکە)، کە کەمێك پێش ئێستا بەلایدا تێپەڕیت."

دانیشتوویەکی دڵسۆزی شارەکە ڕەنگە لای پەسەندتر بێت، دوکانی سەوزەفرۆشێك یان دوکانی قاوەخانەیەك بکاتە ناونیشانی شوێنێك، ئەم شێوازە زۆرتر باوە وەك ئەوەی ئەم شوێنانە گەورەترین گەنجینە و سامانی ئەستەنبوڵی مۆدێرن بن. بەڵام موزن لەم شوێنە خاپوورانەوە دەست پێ دەکات و کاتێك ئەم یادگارییە مێژووییانە پشتگوێ دەخرێن و هیچ بایەخێك بە ناوەکانیان یاخود بە تایبەتمەندیی دروستکردنیان نادرێت. زۆربەی هاوڵاتیانی ئەستەنبوڵ پێیان وایە بایەخدان بەم شوێنەوارانە، زیاتر خزمەتیان دەکات و بە بۆچوونی ئەوان، مێژوو وەك وشەیەکە کە هیچ واتایەکی نییە و دەتوانن بەردی بینا

کۆنەکان لە دروستکردنی تەلار و خانووی نوێ و مۆدێرن بەکار بێنن، یاخود نوێیان بکەنەوە و سەرلەنوێ کونکریتیان بکەن. بەڵام بە شوێنیاندا *موزن* دێت: بە بایەخنەدان بەم شوێنەوارانە و برینی پەیوەندی لەگەڵیان، *موزن* دەست پێ دەکات، لە مەبەست و ئامانجی بێبایەخ و لە ئازاری ئەو شتانەی دەست پێ دەکات کە لەدەستیان داوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ناچاریان دەکات بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوت و ڕێگای نوێ، بۆ پیشاندانی هەژاری و بێدەسەڵاتییان.

ئەو خەمەی (لیڤی سترۆس) باسی دەکات، هەستی کەسێکی خۆرئاواییە، کاتێك لێکۆڵینەوە بۆ شارە هەژارنشینە خولگەییەکان و بەدبەختیی ژیانیان دەکات. بەڵام لێڤی بەدبەختییەکانیان لە چاوی خۆیانەوە نابینێت، بەڵکو پێی وا بووە خەمەکەیان، هەستکردن بە گوناح و ئازارە. لە لایەکی ترەوە، *موزن* هەستێك نییە بینەرێکی دەرەوە پێی بگات. زۆر جار بەراوردکردن لەنێوان جیاوازییەکانی ئێستا و ڕابردوو، دەبێتە هۆی ئازارێکی دەروونی و خەم، بە نموونە جیاوازی لەنێوان مۆسیقای کۆنی عوسمانی و مۆسیقای باوی ئێستای تورکی وەکو شێوازی ئەرەبێسك، کە لەپاش ساڵی ١٩٨٠ سەری هەڵداوە. هەروەها ئەو خۆرئاواییانەی هاتوون بۆ شارەکە، لە درککردن بەم جیاوازییانە سەرکەوتوو نەبوون. تەنانەت جیرارد دی نیرڤال (خەمەکەی بووە هۆی ئەوەی لە کۆتاییدا خۆی بکوژێت)، باسی لەوە کردووە کە ڕەنگی شارەکە، ژیانی شەقامەکان، توندوتیژی و نەریتەکانی شارەکە، ئارامیی پێ دەبەخشن و باسی ئەوەی کردووە کە گوێبیستی پێکەنینی ژنان بووە لەسەر گۆڕستانی شارەکە، ئەمەش دەشێ لەبەر ئەوە بووبێت کە نیرڤال کاتێك سەردانی شارەکەی کردووە، کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سەردەمی شکۆداری و دەسەڵاتدا بووە، یاخود لەوانەیە ویستبێتی لە خەمی تایبەتی خۆی هەڵبێت و زۆربەی لاپەڕەکانی کتێبەکەی (گەشتێك بۆ ڕۆژهەڵات) بەم خەیاڵ و دیمەنەکانی ڕۆژهەڵات برازێنێتەوە.

ئەستەنبوڵ *موزنی* وەك (نەخۆشییەك کە چارەسەری نەبێت)، یاخود (ئازارێکی نەویستراو کە بتەوێت لێی ڕزگار بیت) نەگرتۆتە خۆی، بەڵکو بە هەڵبژاردن بووە. بۆ ئەم مەبەستەش دەگەڕێینەوە بۆ لای بێرتن، کاتێك دەڵێت: "هەموو خۆشییەکان هیچ چێژێکی شیرینیان نییە، وەك ئەو چێژەی کە خەم هەیەتی."، ئەم قسەیەشی لە

ڕەنگدانەوەی گرنگی خەمەوە بۆ ئەستەنبوڵ ڕەگی داکوتاوە. هەروەها هۆنراوە تورکییەکانی پاش دروست بوونی کۆماری، هەمان خەم و پەژارە دەردەخەن کە هیچ کەس ئاوات ناخوازیت لێیان هەڵبێت، ئازارێك کە لە کۆتاییدا دەروونمان ئاسوودە دەکات و وامان لێ دەکات لە ناخەوە هەست بە خۆمان بکەین. بۆ شاعیرێك، *موزن* پەنجەرەیەکی دووکەلاّوییە لەنێوان خۆی و جیهان، ئەو بەشەی ڕووی لە ژیانە، زۆر بەئازارە، چونکە خودی ژیان خۆی بەئازارە. بۆ هاولاّتیانی ئەستەنبولیش بە هەمان جۆرە، کاتێك خۆیان ڕادەستی هەژاری و خەم دەکەن. *موزن* لە ئەدەبی سۆفیگەریدا، تێکەڵی ڕێز و ڕاستی کراوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەڵبژاردنەکەیان بە قایلبوون بە شکست، دوودڵی، دۆڕان یان شانازی پێوەکردن بووە، پێیان وا بووە *موزن* لە ئەنجامی نیگەرانییەکانی ژیان و لەدەستدانەکانیەوە نییە، بەڵکو بە هۆی ئامانجە سەرەکییەکانی خۆمانەوەیە. کەواتە هەموو پاڵەوانەکانی فیلمە تورکییەکان و پاڵەوانەکانی ژیانی ڕاستەقینە لە سەردەمی منداڵیم و لاوێتیم، هەمان هەستیان، وەکو زۆر شەیداییان بۆ پارە و سەرکەوتن، یاخود ئەو ئافرەتەی خۆشیان ویستووە، پیشان دەدا کە لە سەردەمی منداڵییەوە لە ناخیاندا هەڵیانگرتووە. کەواتە *موزن* بەتەنها هاولاّتییانی ئەستەنبوڵی ئیفلیج نەکردووە، بەڵکو ئازادییەکی پێ داون بۆ ئەوەی تووشی ئەو سستییە بن.

ئەم جۆرە هەستە لە قارەمانانی وەکو (ڕاستیناکی) پاڵەوانی (بەلزاك) ڕەنگی نەداوەتەوە، کە ئەم پاڵەوانە بەرزخوازییەکەی وای لێ کردووە ناخی شارێکی مۆدێرن یان شکۆدار دەربپڕێت. لە *موزنی* ئەستەنبوڵ، تاك دژی کۆمەڵ نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هانمان دەدات کە ئاسوودە بین بە بوونی بەها کۆمەلاّیەتییەکان و یەکگرتوویی و سادەیی، فێری ئارامگرتنمان دەکات لە کاتی هەژاری و بێدەسەلاّتیدا، هانمان دەدات لەبارەکەی ترەوە سەیری ژیان و مێژووی شارەکەمان بکەین. هەروەها ئەستەنبولییەکان هان دەدات، وەك کۆتاییەکی مێژوویی بیر لە هەژاری و شکست نەکەنەوە، بەڵکو وەك سەرەتایەکی شکۆدار کە لەپێش لە دایك بوونیانەوە لەگەڵیان چەسپاوە. کەواتە ئەستەنبوڵ وەك نەخۆشییەکی چارەسەرنەکراو، وەك هەژارییەکی

جێگیر، یاخود وەك شکستێکی ناخۆش کە لە دیمەنە ڕەشوسپییەکاندا دەبینرێت سەیری *موزن* ناکات، بەڵکو بە شکۆمەندییەوە مامەڵ لەگەڵ *موزن* دەکات.

لە سەرەتاکانی ساڵی (١٥٨٠)، مۆنتەیجن پێی وا بووە کە خەم هیچ شکۆمەندییەکی تێدا نییە (لە کاتێکدا خۆیشی کەسێك بووە ئەم هەستەی لەگەڵ بووە. چەند ساڵ دواتریش، فلاوبێر هەروەك ئەم بیری کردۆتەوە). بە تێڕوانینی مۆنتەیجن، خەم و دڵتەنگی دژی تاکگەری و سەربەخۆیی تاکەکەسییە، پێی باش بووە وەك ئیتالییەکان ئەم وشەیە ببەستێتەوە بە شێتی و زیانەوە، یان وەك سەرچاوەیەك بۆ خراپییە نەژمێراوەکان. خەمی مۆنتەیجن، خەمخواردنێکی تاکەکەسی بووە کە کاری لە بیرکردنەوەی پیاوێك کردووە، بەتەنها لەگەڵ کتێبەکەیدا ژیاوە. بەڵام خەمی ئەستەنبوڵ، هەموو شارەکە پێکەوە هەستیان پێ کردووە. هەر وەکو پاڵەوانەکانی ڕۆمانی (ئاشتی)، یەکێکە لە گەورەترین ڕۆمانەکان لەلایەن ونوسەر (تانپنار) نووسراوە دەربارەی ئەستەنبوڵ: لەبەر ئەو *موزنەی* کە هەیانبووە، لە مێژووی شارەکە بێبەش کراون و ئازار دراون. ئەوە *موزنە* بڕیار دەدات کە هیچ خۆشەویستییەك بە خۆشی کۆتایی نەیەت، هەروەك لە فیلمە ڕەشوسپییەکان، ئەگەر شوێنەکە ئەستەنبوڵ بێت، هەر لە سەرەتای فیلمەکەوە ڕوونە کە ئەو خەمەی پاڵەوانەکە لە منداڵییەوە لەگەڵیەتی، چیرۆکەکە دەگۆڕێت و بۆ چیرۆکێکی میلۆدرامایی.



لەو فیلمە ڕەشوسپییانەی کە لە ئاستێکی هونەریی بەرزدان، وەکو فیلمی *(ئاشتی)* کە (تانپنار) نووسیویەتی، دۆخەکە بە هەمان جۆرە. کاتێك قارەمانەکان لە پێشاندانی کەسایەتیی ڕاستەقینەی خۆیان شکست دێنن، ئەوا خۆیان ڕادەستی ئەو بارودۆخە دەکەن کە لەلایەن مێژوو و کومەڵگاوە سەپێنراوە بەسەریاندا، ئەوکات ئێمە و هەموو شارەکە بەو جۆرە نواندنەیان قایل دەبین. گرنگ نییە کە چۆن دیمەنە جوان و بەناوبانگەکانی ناو دراماکە لە شەقامێکی ڕەشوسپیی شارەکە گیرا بن، چونکە ئەوانیش بە هەمان شێوە ڕەنگدانەوەی *موزنیان* تێدایە. زۆر جار کاتێك کەناڵێکی تەلەفزیۆن دەگۆڕم، دەکەوێتە سەر یەکێك لەم فیلمانە، فیلمەکەش گەشتۆتە نیوە، ئەوکات بیرۆکەیەکی سەیرم بۆ دێت: کاتێك سەیری قارەمانەکە دەکەم بە کۆڵانێکی چەوریێژکراودا تێدەپەڕێت و سەیری پەنجەرەی ئەو خانووە تەختەیە دەکات کە ماڵی خۆشەویستەکەیەتی کە لەگەڵ کەسێکی تر هاوسەرگیری دەکات، یاخود کاتێك



پاڵەوانەکە بە سادەیی و شانازییەوە وەڵامی خاوەن کارە دەوڵەمەندەکەی دەداتەوە، ژیان بەو شێوەیەی کە هەیە، قبوڵی دەکات و ڕوو دەکاتە لایەکەی تر و تەماشای بۆسفۆر دەکات. بە بۆچوونی من، موزن لە چیرۆکە بەئازارەکە و دڵی شکاوی پاڵەوانەکە، یاخود شکستهێنانی بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستەکەی دەست پێ ناکات، بەڵکو لە شەقام و دیمەنەکان و هەناسەکانی شارەکەوە دزەی کردۆتە ناو دڵی پاڵەوانەکەوە. بۆ قارەمامانی فیلمە دیارەکان، وەك

فیلمی (*ئاشتی ئانپنار*)، تەنها دوو ڕێگە هەیە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی دۆخەکە ببنەوە: دەبێت پیاسە بکەن بەدەوری بۆسفۆردا، یان سەرێك بدەن لە کۆڵانەکانی پشتەوە و سەیری پاشماوەی وێرانکارییەکان بکەن.

شوێنی قارەمانەکان، تەنها ناو کۆمەڵگایە. بەڵام دۆخەکە ئاڵۆزتر دەبێت، کاتێك هەندێك لە نووسەر و شاعیرە ئەستەنبوڵییەکان کلتووری ڕۆژئاوایان لا پەسەندترە و هیواخوازن تێکەڵی جیهانی مۆدێرن ببن. لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەیەم، کۆمەڵێك نووسەر لەژێر ئەم کاریگەرییانە وێنەی ئەستەنبوڵیان کێشاوە، کە دەبێت ئەم وێنەیە بەشێك بێت لە شارەکە و بەشێك بێت لە چیرۆکەکەی من. کاتێك ئەم کتێبەم دەنووسی بەبەردەوامی _هەندێك جار بەتوڕەییەوە_ دیالۆگم لەگەڵ نووسینەکانی ئەم چوار نووسەرە تەنیایە هەبوو، کە ماتەمینی ئەستەنبوڵی مۆدێرنیان باس کردووە.

١١

# چوار نووسەرە خەمبارە تەنیاکە

کاتێك منداڵ بووم، کەمێکم دەربارەی ئەم نووسەرانە دەزانی. یەکێکیانم بە شاعیرە قەڵەوەکە دەناسی و هەندێك لەو هۆنراوانەیم خوێندبوویەوە کە لە هەموو شارەکەدا ناوبانگیان هەبوو، ئەویش (یەحیا کەمال) بوو. یەکێکی تریان (ڕەشات ئەکرەم کۆچو) بوو، کە لە لاپەڕەی پاشکۆی مێژوویی ڕۆژنامەکان ناسیبووم _زۆر ئارەزووم لە خوێندنەوەی ئەو بابەتانە بوون کە دەربارەی شێوازی سزادانی عوسمانییەکان بوون، ئەم نووسەرەش لەو بوارەدا بابەتی دەنووسی. کاتێك تەمەنم گەیشتە دە ساڵی، هەر چوار نووسەرەکەم دەناسی، چونکە لە کتێبخانەکەی باوکم کتێبی هەموویانی تێدا بوو. بەڵام ئەوکات کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر بیرۆکەکانم لەبارەی ئەستەنبوڵ نەبوو. ئەو ڕۆژەی من هاتوومەتە دونیاوە، ئەم نووسەرانە لەم شارەدا بە تەندروستییەکی باشەوە ژیانیان بەڕێ کردووە. بە تێپەڕبوونی کات، کاتێك گەیشتمە تەمەنی دە ساڵی، هەموو ئەم نووسەرانە کۆچی دواییان کردووە و هیچکامیانم بە چاوی خۆم و لە ماوەی ژیانمدا نەدیوە.

لە ساڵانی دواتر، کاتێك لە هزری خۆمدا وێنەی ئەستەنبوڵی سەردەمی منداڵیم بە دیمەنە ڕەشوسپییەکانییەوە دەکێشا، هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەستەنبوڵی چوار نووسەرەکە، تێکەڵی وێنەکەم دەبوون. کاتێك تەمەنم سی و پێنج ساڵان بوو، خەونم بە نووسینی ڕۆمانێکی مەزنی لەبارەی ئەستەنبوڵ دەبینی، کە لە دێڕەکانی (یولیسێس) درێژتر بێت. بیرم لەوە دەکردەوە ئەم چوار نووسەرە بە هەمان شەقامدا گەڕاون، کە

من بەمنداڵی پێیدا تێپەڕیوم و گەڕاوم. بۆ نموونە، دەمزانی شاعیرە قەڵەوەکە، زۆر جار لە چێشتخانەی عەبدوڵا ئەفەندی لە بیۆگڵو نانی خواردووە، بۆ ماوەیەك داپیرەشم هەفتەی ڕۆژێك سەردانی هەمان چێشتخانەی دەکرد و لەماڵەوە گازندەی لەبارەی خواردنەکانەوە دەکرد. بیرم دەکردەوە، ڕەنگە لەو کاتانەی شاعیرە ناودارەکە لە خواردنگەکە ژەمی نیوەڕۆ دەخوات، کۆچوی مێژوونووس، کاتێك بەدوای زانیاریدا دەگەڕێت بۆ کتێبەکەی (*ئنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ*)، بەلای پەنجەرەی خواردنگەکەدا تێبپەڕێت. مێژوونووسە ڕۆژنامەنووسەکە، بە سەرسامی لاوە زەریفەکان ناوی دەرکردبوو، لەبەر ئەوە خەیاڵم دەکرد کە گەنجێکی خوێنشیرین ئەو ڕۆژنامەیەی پێ دەفرۆشێت، کە تانپنار بابەتی تێدا نووسیوە. لە هەمان خولەکدا، خەیاڵم دەکرد یادنامەنووسە دەستکێش سپییەکەی بۆسفۆر، عەبدولحەق شناسی حیسار کە پیاوێکی لاواز بووە، بەکەمی لە ماڵ چووەتە دەرەوە و لە پاکوخاوێنیدا، کەسێکی ڕاڕا بووە، دەمەقاڵێی دەکرد لەگەڵ گۆشتفرۆشێك، چونکە ئەو جگەرەی ئامادەی کردبوو بۆ پشیلەکەی، نەیپێچاندبوو بە لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکی خاوێنەوە. لە خەیاڵەکەمدا هەرچوار شاکارەکە لە یەك شوێن و کات و لە هەمان کۆڵان و بەژێر هەمان شەستەباراندا ڕێ دەکەم.



کاتێك سەیری نەخشە بەناوبانگەکەی بێۆگلو-تاقسیم-جیهانگیر-گەلاتام دەکرد کە (گرۆتیان پێرڤیچ) کێشابووی، هەموو ئەو باڵەخانە و شەقامانەم دەبینی کە نووسەرەکان بەلایاندا تێپەڕ بووبوون. کاتێك هەموو شتەکانم بەتەواوەتی نەدەهاتنەوە یادم، بە خەیاڵ هەموو ئەو دیمەنانەم دەخوڵقاند: دوکانی گوڵفرۆش، قاوەخانە، دوکانی شیرینی و مەیخانەکانم دەهێنایە پێشچاوی خۆم، کە ئەم نووسەرانە بەبەردەوامی سەردانیان کردبوون. بۆنی خواردنی دوکانەکان، قسەی بێمانا و دووکەڵی جگەرە و بۆنی مەیی مەیخانەکان، ڕۆژنامەکان کە لە قاوەخانەکان دەخوێنرانەوە و دواتر قەد دەکران، پۆستەری سەر دیوارەکان، فرۆشیاری سەر شەقامەکان، ئەو نامانەی کە سەردێڕی هەواڵەکانیان تێدا دەنووسرا لە لوتکەی ئەپارتمانێکی گەورە (ئێستا ڕووخاوە) لە گۆڕەپانی تاقسیم پیشان دەدران _دەمهێنایە پێشچاوی خۆم، چوار نووسەرەکە لەم شوێنانە بیرۆکەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکەن. هەر کاتێك پێکەوە بیر لەم چوار نووسەرە دەکەمەوە، ئەوەم دێتەوە یاد کە ئەو تایبەتمەندییەی شارەکە هەیەتی، جوگرافیا و بینا بەرزەکانی نییە، بەڵکو هەموو یادگاری و نامە و ڕەنگ و وێنەیەکە کە لەناو جەنجاڵییەکەدایە و خەڵك خۆیان پێدا دەخشێنن، هەر وەکو ئەو ڕۆژانەی منداڵیم، کاتێك بە شەقامێکی قەرەباڵغدا تێدەپەڕیم و خەڵك خۆیان پێمدا دەخشاند. لە خەیاڵەکانمدا، هەمیشە تێکۆشاوم ئەم چوار نووسەرە لە هەمان شوێنی سەردەمی منداڵیم بهێنمە پێشچاوم.



لە ماوەی ئەو گەشتانەی لەگەڵ دایکم بۆ تاقسیم دەمانکردن و زۆر جاریش دەچووین بۆ دوکانێکی کتێبفرۆشی و بڵاوکەرەوە لە تونێل، کە تانپنار، ئەو نووسەرەی کە وا هەستم دەکرد زۆر نزیکە لێمەوە، ناوەناوە سەردانی کردووە و ڕەنگە لەسەر ڕێگاکە بەلای یەکدا تێپەڕ بووبێتین. تانپنار (نازناوی بێنرخی دابووە خۆی)، لە ژوورێکی بچووک لە باڵەخانەی ئەرمانلی لەبەرامبەر شەقامی کتێبخانەکە ژیاوە. ماوەیەك پێش لەدایکبوونی من، ئەو کاتەی ئەپارتمانەکانی پاموك هێشتا بەتەواوەتی تەواو نەبووبوون، خێزانەکە لە باڵەخانەکانی ئۆنگان دەژیان لە ئەیاز پادشا، لە شەقامەکەی بەرامبەر هۆتێلی پارك هەبوو کە یەحیا کەمال، مامۆستای تانپنار، کۆتاییەکانی ژیانی تێدا بەسەر دەبرد. ڕەنگە ئەو ڕۆژانەی من لە شەقامەکەی بەرامبەر ژیانم گوزەراندووە، ڕۆماننووس تانپنار، ئێواران سەردانی مامۆستاکەی کردبێت. لەوانەشە لەپاش ئەوەی ماڵمان گواستەوە بۆ نیشانتاش، بە جێهەنگاوەکانیاندا ڕۆشتبێتم، چونکە زۆر جار لەگەڵ دایکم بۆ کێك کڕین، دەچووین بۆ شیرنەمەنیی هوتێلەکە. عەبدولحەق شیناسی حیسار، کە من ناوم ناوە یادنامەنووسی بۆسفۆر، زۆر جار بۆ بازاڕکردن و نانخواردن هاتووە بۆ بیۆگلۆ، هەر وەکو مێژوونووسی بەناوبانگ کۆچو، لەوانەیە بە جێهەنگاوەکانی ئەمانیشدا ڕۆشتبێتم.

نەمدەزانی وەك هەوادارانی سەرسەختی ئەستێرەکان بکەم، کە هەموو زانیارییەکیان دەربارەی ژیان و فیلمی ئەو ئەستێرانەی کە خۆشیان دەویستن، کۆ دەکردەوە و لە خەیاڵەکانیان بەکاریان دەهێنان و چاویان پێیان دەکەوت. بەڵام من جاروبار لەم کتێبەدا، گفتوگۆ لەگەڵ ئەم چوار نووسەرە دەکەم کە کتێب و شیعر و ڕۆمان و چیرۆك و یادنامە و بابەت و ئنسکلۆپیدیاکەیان چاویان کردمەوە، هەتا ئاشنای ڕۆحی شارەکەم ببم. ئەم چوار نووسەرە، هەموو تێکۆشاون بۆ وەدەرخستنی جیاوازیی نێوان ئێستا و ڕابردوو، نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و فێریان کردم چۆن هۆگری هونەری مۆدێرن و ئەدەبی ڕۆژئاواییەکان ببم، کە گونجاو بێت لەگەڵ کلتووری شارەکەم.

هەر چوار نووسەرەکە سەرسامی جوانی و نایابی ئەدەب و هونەری ڕۆژئاوا (بەتایبەت فەرەنسا) بوون. یەحیا کەمالی شاعیر، نۆ ساڵ ژیانی لە پاریس بەسەر بردووە، لە هۆنراوەکانی ڤێرلەین و مالارم بیرۆکەی (هۆنراوەی ڕەسەنی) وەرگرتووە.

ڕۆماننووس تانپنار، کە یەحیا کەمالی لە جێگەی باوکی داناوە، هەروەك ئەو سەرسامی ئەو شاعیرانە بووە. (ع. ش. حیسار) هەروەك یەحیا کەمال و تانپنار، سەرسامی ئەندرێ گاید بووە. هەروەها لە



تۆفلێ جوتیەر، کە یەحیا کەمال شوێنکەوتووی بیرۆکەکانی بووە، تانپنار فێر بووە کە چۆن دیمەنەکان بکاتە وشە.

ئەم نووسەرانە لە دەمی لاوێتیانـدا، تێڕوانینێکی بەرز و هەندێك جار ساویلکەییان هەبووە بەرامبەر کلتووری ڕۆژئاوا بەگشتی و ئەدەبی فەرەنسا بەتایبەتی و ئەم نزیکبوونەوە مۆدێرنە ـ ڕۆژئاواییە ـ لە کارەکانیناندا ڕەنگی داوەتەوە. نیازیان بووە وەك کەسێکی فەرەنسی بنووسن. گومانی تێدا نییە، توانیویانە بەو جۆرە بکەن، بەڵام لە لایەکی ترەوە زانیویانە ئەگەر وەك نووسەرێکی ڕۆژئاوایی بنووسن، ئەوا بەتەواوەتی ناتوانن ببنە نووسەرێکی ڕۆژئاوایی ڕەسەن. ئەو وانەیەی کە لە کلتووری فەرەنسییەوە وەریانگرتبوو، فێری دەکردن بۆ بوون بە نووسەرێکی گەورە، دەبێت ڕەسەن و ڕاستگۆ بن. لەبەر ئەوە ئەم نووسەرانە لەنێوان ئەم دووجەمسەرەدا دامابوون ـ وەك نووسەرێکی ڕۆژئاوایی یان وەك نووسەرێکی ڕەسەن بن، لە هەمان کاتدا ـ ئەم دوودڵییە لە کارەکانی پێشوویاندا کاریگەری دیارە.

ئەوەی لە نووسەرانی وەکو جوتیەر و مالارمێ فێر بوون، کە یارمەتیی دان چۆن ڕەسەنایەتی و ڕاستگۆیی لە کارەکانیاندا بەدەست بێنن، ئەویش چەمکی (ئەدەب لەپێناو ئەدەب) یان (شیعری پاکیزە) بوو. بەڵام شاعیر و ڕۆمانووسەکانی تری سەردەمی خۆیان، کاتێك نووسەرە فەرەنسییەکانیان بە هەمان هەستەوە دەخوێندەوە،

ئەوەی لێیانەوە فێر دەبوون، گرنگی و بایەخی ڕەسەنایەتی نەبوو، بەڵکو گرنگییان بە خودی کارەکە دەدا کە چەندە بە سوود و زانیاری بەخشە، ئەمەش گران بووە لەسەر شانیان، چونکە نووسەرەکانیان هان داوە لەسەر ڕێگای ئەدەبێکی جوان و خاوێن یان لە بازنەی ململانێی نێوان سیاسییەکان بمێننەوە. لە کاتێکدا گرووپی نووسەرەکانی تر، لاسایی هۆگۆ و زۆلایان دەکردەوە، نووسەرانی وەکو یەحیا کەمال، ع. ش. حیسار و تانپنار هەوڵیان داوە کە سوود لە بیرۆکەکانی ڤێرلاین، مالارمێ و پرۆست وەربگرن، بەڵام ڕێگری سەرەکییان بۆ گەیشتن بەم خواستەیان، کێشە سیاسییە ناوخۆییەکان بوون. لە سەردەمی لاوێتییان، نووسەرەکان شایەتحاڵی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ڕۆژانی دواتر بوون، کاتێك تورکیا خەریك بووە ببێتە ژێردەستەی ڕۆژئاوا و دواتر سەرهەڵدانی دەوڵەتی کۆماری و سەردەمی نەتەوایەتی.

لەو جوانیناسییەوە کە لە ئەدەبی فەرەنسییەوە دەستیان کەوتبوو، درکیان بەوە کرد کە لە تورکیا هەگیز دەنگێکی بەهێز و جوانی وەك مالارمێ و پرۆستیان دەست ناکەوێت. بەڵام لەپاش بیروڕا گۆڕینەوەیەکی زۆر، بابەتێکی گرنگ و جوانیان دۆزییەوە: لەناوچوون و ڕووخانی ئەو ئیمپراتۆرە گەورەیەی کە لە ڕۆژانی دەسەڵاتی ئەودا لەدایك بووبوون. شرۆڤەی قووڵیان بۆ شارستانیەتی عوسمانی و لەناوچوونی، یارمەتی دان و ڕێگای بۆ خۆشکردن کە لە تۆڕی نۆستالجیا و شانازی مێژوویی و نەتەوایەتی و کۆمیونتاریزم دووربکەونەوە و ڕزگاریان ببێت. نووسەرەکان، توانییان ئەو دەنگەی لە ناخیاندا بوو، بیدۆزنەوە و هەموو وێرانکارییەکانی شارەکە ببنە هەوێنی هۆنراوە و نووسینە خەمبارەکانیان.

ئێدگار ئالان پۆو، هەروەك کۆلیریج، لە (فەلسەفەی داڕشتن) بە چەند دێڕێکی ساردوسڕ نووسیویەتی، کە گەورەترین نیگەرانیی ئەو لە کاتی داڕشتنەوەی شیعری (قەلەڕەش)، دروستکردنی تۆنێکی (ماتەمینی) بووە بۆ شیعرەکەی: "پرسیارم لە خۆم کرد، لە هەموو بابەتەکانی ماتەمینی، چی شتێك بەپێی پێوەری تێگەیشتنی مرۆڤ زۆرترین هۆکاری خەمباربوونە؟ مردن وەڵامە ڕوونەکە بوو!" پۆو، بە لۆجیکێکی ئەندازیاری، درێژە بە پرسەکەی دەدات و دەریدەخات کە بۆچی کچێکی جوانی مردووی کردووەتە دڵی هۆنراوەکەی.

ئەو نووسەرانەی کە لە خەیاڵەکانی منداڵیم، چەندین جار بەشوێن هەنگاوەکانیاندا ڕێگەم کردبوو، هەرگیز دوای ئەو یاسا لۆجیکییەی ئێدگار پۆو نەکەوتبوون، بەلام باوەڕیان وا بوو بە سەیرکردنی ڕابردووی شارەکەیان، دەتوانن ئەو دەنگە جوانەی ناخیان بدۆزنەوە و سرووشیان بۆ بێت بۆ نووسینەوەی خەمەکەیان. کاتێك ڕووی جوان و گەشی شارەکەیان بیر دەکەوێتەوە، کاتێك چاویان دەکەوێتە سەر جەستەیەکی مردوو لەکەنار شەقامێك ڕاکشاوە، کاتێك دەربارەی ئەو وێرانکارییانەی دەوربەریان دەنووسن، ئەوا دارشتنێکی جوان بۆ ڕابردووی شارەکەیان دەهۆننەوە. ئەم تێڕوانینە کە بە (ماتەمینی وێرانکارییەکان) ناوی دێنم، ئەم نووسەرانەی کردووەتە کەسێکی نەتەوەپەرست بە جۆرێك بگونجێت لەگەڵ دەوڵەتی ستەمکار، لە هەمان کاتدا ڕزگاری کردوون لەو بڕیارە زۆردارانەی کە دەبێت خۆیان ببەستن بە بایەخدان بە مێژووەکەیەوە. ئەو شتەی وامان لێ دەکات سەرسامی یادنامەکەی نابۆکۆڤ بین، بەبێ ئەوەی لەژێر کاریگەریی خێزانە ئەرستۆکراسی دەوڵەمەندەکەی و هەمەچەشنی ئەو زمانانەی جیاوازانەی بین کە نووسەر لە سەردەمی جیاوازدا بەکاری هێناون، ئەویش ئەوەیە کە ئەم سەردەمەی ئێمەش، ڕۆژێك ون دەبێت و هەرگیز ناگەڕێتەوە. یاریی کات و بیرەوەری، زۆر گونجاوە بۆ شێوازەکانی بیرگسۆنیان کە بابەتێکی ئەندێشەیی وروژاندووە: ڕابردوو هەمیشە زیندووە. بە بەکارهێنانەوەی هەموو ئەم تەکنیکانە، چوار نووسەرەکە وێنەی ئەستەنبوڵیان بە وێرانییەکانیەوە بۆ کێشاوین.

لە ڕاستیدا ئەم وێنەیەیان وەك یارییەك پیشان داوە، کە ئازار و مردن دەبەستێتەوە بە جوانییەکەیەوە، بەلام خاڵی دەستپێکیان ئەوەیە کە جوانیی ڕابردوویان بۆ هەمیشە لەدەست داوە.

کاتێك ع. ش. حیسار بۆ لەدەستدانی (شارستانیەتی بۆسفۆر) ئازاری کێشاوە، هەندێك جار بۆ ماوەیەکی کەم وەستاوە و (وەك ئەوەی ڕێك لەو کاتەدا بیرۆکەکەی بۆ هاتبێت) بیری کردووەتەوە "هەموو شارستانیەتەکان وەکو مرۆڤەکانی ناو گۆڕستانەکان، دەبێت ڕۆژێك لەناو بچن. وەك چۆن دەبێت هەموومان بمرین، بە هەمان شێوە دەبێت ڕازی بین کە ئیتر گەڕانەوەیەك نییە بۆ ئەو شارستانیەتەی کە ڕۆژێك

هاتووه و ڕۆژێکی تر لەناو چووە." ئەوەی ئەم چوار نووسەرە کۆ دەکاتەوە، ئەو تۆنە خەمبارەیە لە نووسینەکانیاندا هەیە.

لە ماوەی دوای جەنگی جیهانیی یەکەم، یەحیا کەمال و تانپنار توێژینەوەیەکیان لەبارەی ماتەمینی (عوسمانییە تورکەکان) و ئەستەنبوڵ ئەنجام دا، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ دەستنووسینێکی دێرینی تورکیان دەست نەکەوت، ناچار سوودیان لە سەرچاوەی ڕێبوارە ڕۆژئاواییەکان وەرگرت. هەروەها بە گەڕان بەناو کۆڵانە هەژارنشینە خاپوورکراوەکاندا، بەدوای سەرچاوەدا گەڕاون. ئەو دەمە ژمارەی دانیشتووانی ئەستەنبوڵ نیو ملیۆن کەس بووە. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٥٠، کاتێك من چوومە قوتابخانە، ئەو ئامارە بوویە دوو هێندە. لە ساڵی ٢٠٠٠، گەیشتە دە ملیۆن. ئەگەر شارە کۆنەکە و پێرا و بۆسفۆر بخرێنە یەك لا، ئەوا ئەستەنبوڵی ئێستا، دە جار گەورەترە لەو ئەستەنبوڵەی ئەو نووسەرانە وێنەیان کێشاوە.

تا ئێستاش، زۆربەی دانیشتووانی شارەکە بۆ کێشانی وێنەی شارەکەیان، پشت بە نووسینەکانی ئەم نووسەرانە دەبەستن، چونکە نە لە دانیشتوویەکی ڕەسەن و نوێیەکانی پەنجا ساڵ لەمەوبەر، نە لەو کۆچبەرانەی لە بۆسفۆر دەژین، نە لە شارە دێرینەکە و کۆڵانە مێژووییەکان، هیچ وێنەیەکی کۆنی ئەستەنبوڵیان بەدەست نەگەیشتووە. زۆر جار گوێبیستی خەڵك دەبین کە گلەیی دەکەن و دەڵێن: "منداڵی دە ساڵە هەیە، کە تا ئێستا بۆسفۆری نەدیوە!"، هەروەها توێژینەوەکان دەریانخستووە کە ئەو کەسانەی لە ناوچە نوێیەکانی کەنار شار دەژین، خۆیان زۆر وەك ئەستەنبوڵی لەقەڵەم نادەن. شارەکە لەنێوان کلتووری ڕەسەنی خۆی و کلتووری ڕۆژئاوا وەستاوە، دەوڵەمەندەکان کەمینە و هەژارەکان زۆربەی دانیشتووانیان پێك هێناوە. بە هۆی هاتنی لێشاوی کۆچبەرانەوە، شارەکە جەنجاڵتر بووە و ئەستەنبوڵ شوێنێکە کە لە ١٥٠ ساڵی ڕابردوو، کەس بەتەواوەتی هەستی نەدەکرد کە لە نیشتمانی خۆی بێت.

چوار نووسەرە خەمبارەکە، ڕەخنەی ئەوەیان لێ گیرا کە زۆر خۆیان بە عوسمانییەکان و ڕابردووی شارەکە، لە سەرەتاکانی دروستبوونی دەوڵەتی کۆماری، خەریك کردووە، لە کاتێکدا بە تێڕوانینی ئەم ڕەخنەگرانە، نووسەرەکان دەبووایە لەبری

ئەوە، هەوڵیان بدایە شارێکی نموونەیی شێوە ڕۆژئاوایی دروست بکەن. لەبەر ئەوە، بە کۆنەپەرست سەرزەنشت کران.

لە ڕاستیدا ئامانجی سەرەکیی نووسەرەکان سوودوەرگرتن بووە لە هەردوو کلتوورەکە _کلتووری ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات_ هاوبەشی ئازار و خەمەکانی شارەکەیان کردووە، لە هەمان کاتدا ویستوویانە بە سەیرکردنی ئەستەنبوڵ بە چاوی کەسێکی ڕۆژئاوایی خەمەکانیان دەرببڕن. بەپێچەوانەوە، ڕەفتاریان کردووە: (ڕۆژهەڵاتییەك) بوون، کاتێك داوایان لێ کراوە وەك (ڕۆژئاواییەك) بن و وەك (ڕۆژئاواییەك) خۆیان دەرخستووە کاتێك دەبوو وەك (ڕۆژهەڵاتیەك) بن _ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە ڕێگەی بۆ خۆش کردوون هەتا ئەو گۆشەگیرییەی کە زۆر پەرۆشیی بوون، فەراهەم بێنن.

بیرەوەرینووس عەبدولحەق شیناسی حیسار، شاعیر یەحیا کەمال، ڕوماننووس ئەحمەد حەمدی تانپنار و مێژوونووس و ڕۆژنامەنووس ڕەشات ئەکرەم کۆچو، هەموویان ئەو نووسەرە خەمبارانە بوون کە بەتەنیا ژیانیان بەسەر بردووە و بەتەنیا مردوون، بەبێ ئەوەی هاوسەرگیری بکەن. جگە لە یەحیا کەمال، بەبێ ئەوەی بە خەونەکەیان بگەن، هەموویان کۆچی دواییان کردووە. کۆمەڵێك کتێبی تەواونەکراویان لەدوای خۆیان جێ هێشتووە، هەروەها ئەو کتێبانەش کە لە سەردەمی خۆیان بڵاو کرانەوە، هەرگیز نەگەیشتن بە دەست ئەو خوێنەرانەی کە ئەمان دەیانویست و بەدوایدا دەگەڕان: بەڵام یەحیا کەمال، کە گەورەترین و کاریگەرترین شاعیری ئەستەنبوڵ بوو، لە سەردەمی خۆی، نەیهێشت هیچ لە کتێبەکانی بڵاو بکرێنەوە.

## ١٢

# داپیرەم

ئەگەر کەسێك پرسیاری لێ بکردایە، داپیرەم دەیگوت کە پرۆژە ڕۆژئاواییەکانی ئەتاتورکی لا پەسەندترە، بەڵام لە ڕاستیدا هەر وەکو کەسێکی تری شارەکە، سەرسامی نە ڕۆژئاوا نە ڕۆژهەڵات نەبووە. زۆر بەدەگمەن لە ماڵ دەچوویە دەرەوە و وەکو زۆربەی خەڵك بە ئاسوودەیی لە شارێکدا دەژیا، کە هیچ سەرسامی یادگاری و مێژوو و یان (جوانییەکانی) نەبوو. سەرەڕای ئەو ڕاستییەی کە بەشی مێژووی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩١٧ لەپاش ئەوەی دەزگیرانی باپیرەم بووە، شتێکی ئازایانەی کردووە کە بۆ ئەو دەمەی ئەستەنبوڵ زۆر باو نەبووە: لەگەڵ دەزگیرانەکەی چووەتە دەرەوە بۆ خواردنگەیەك، پێکەوە لەسەر یەك مێز بەرامبەر یەك دانیشتوون و داوای خواردنیان کردووە. دەمەوێت بیهێنمە پێشچاوی خۆم، کە هەردووکیان لە کافێی خواردنگەیەك لە پێری دانیشتوون، کاتێك باپیرەم پرسیاری لێ کردووە کە حەزی لە چی خواردنەوەیەکە (مەبەستی چا یان شەربەتی میوە بووە)، بەڵام داپیرەم وا بیری کردۆتەوە کە باپیرەم شتێکی زیاتر لەمانەی پێشکەش دەکات، کەمێك بەڕەقی وەڵامی داوەتەوە.

"بەڕێزم، دەبێت بزانیت کە من هەرگیز دەستم لە مەی نەداوە."

چل ساڵ دواتر، کاتێك کەسێك چیرۆکەکەی (بەسەرهاتی کافێکە) لە بۆنەی هاوسەرگیری و خوانە خێزانییەکانی ساڵی تازە دەگێڕایەوە، داپیرەم قومێکی لە پەرداخی بیرەکە دەدا و قاقا پێدەکەنی. لە ڕۆژە ئاساییەکاندا، لەسەر کورسییە تایبەتەکەی خۆی لە ژووری دانیشتنەکە دادەنیشت و پێدەکەنی، دواتر کەمێك

فرمێسکی دەڕشت بۆ مەرگی پێشوەختی ئەو پیاوەی کە تەنها لە وێنەکاندا بینیبووم. کاتێك داپیرەم دەگریا، خەیاڵم دەکرد کە لەگەڵ باپیرەم لە شەقامەکانی شارەکەدا دەگەڕان، بەڵام بۆم ئاسان نەبوو ئەو ژنە بەتەمەنە قەڵەو و لەسەرخۆیە، وەك ئەو ئافرەتە باڵابەرز و لاواز و نیگەرانەی تابلۆیەکی مۆدیگلیانی، بهێنمە پێشچاوی خۆم.



لەپاش ئەوەی باپیرەم کۆچی دوایی کردووە و سەرمایەیەکی زۆری لەدوای خۆی جێ هێشتووە، داپیرەم بووەتە سەرۆکی خێزانە گەورەکەمان. بەکر، چێشتلێنەر و هاوڕێی دێرینی داپیرەم، بەگاڵتەجارییەوە پێی دەگوت (سەرۆك) هەرکات لەدەست داواکارییە بێکۆتاییەکانی داپیرەم هیلاك دەبوو، دەیگوت: "فەرمان دەکەی، سەرۆك!" بەڵام داپیرەم جگە لەوەی خاوەنی کلیلێکی زۆری ماڵەکەمان بوو، لەناو خێزانەکە دەسەڵاتێکی ئەوەهای نەبوو. کاتێك باوکم و مامم کارەکەی خۆیان لەدەست دا، لە تەمەنێکی زۆر کەمدا بوونە میراتگری سامانەکەی باپیرەم. لەپاش ئەوەی بەهەڵەشەیی دەستیان کرد بە چەند پرۆژەیەکی بنیاتنان و شکستهێنانانیان، لە ئاکامدا زۆریان لە داپیرەم کرد کە هەموو پشکەکانی خێزانەکە یەك لەدوای یەك بفرۆشێت، داپیرەشم کەمێك فرمێسکی دەڕشت و ئامۆژگاری دەکردن کە جاری داهاتوو کەمێك بەوریاییەوە کار بکەن. داپیرەم، بەیانیانی لەناو جێگەی خەوەکەی بەسەر دەبرد. لەژێر لێفیکی گەورە ڕادەکشا و پاڵی بە چەند سەرینێکی گەورەی ڕیزکراوی سەر جێگاکەی، دەدایەوە. هەموو بەیانییەك بەکری چێشتلێنەر لەسەر سینییەکی گەورە هێلکەی کوڵاو،

زەیتوون، پەنیری بزن و نانی برژاوی بۆ دەبرد و سینییەکەی لەسەر ئەو سەرینە دادەنا کە لەسەر لێفەکەی دانابوو (ئێستا ئەو نەریتە نەماوە کە رۆژنامە کۆنەکان لەنێوان سەرینە بە گوڵ چنراوەکان و سینییە زیوییەکەدا دابنرێت). داپیرەم زۆر بەهێواشی و کاتێکی زۆر نانی سبەینانی دەخوارد، رۆژنامەی دەخوێندەوە و منداڵەکانی سەردانیان دەکرد. (لە داپیرەمەوە فێری چێژ و تامی چای شیرین لەگەڵ پەنیری بزن بووم). مامم پێش ئەوەی بڕوات بۆ سەر کارەکەی، سەردانی داپیرەمی دەکرد و ماچی دەکرد، لەپاش ئەویش ئامۆژنم بە جانتا دەستییەکەیەوە سەردانی دەکرد. ماوەیەك پێش ئەوەی قوتابخانە بکرێتەوە، ئەو ساڵەی کە دەبوو منیش دەست بکەم بە خوێندن. هەموو بەیانییەك، وەك براکەم کە پێشتر دەیکرد، بە دەفتەرێکەوە دەچوومە ژوورەکەی داپیرەم، لەسەر لێفەکەی دادەنیشتم و هەوڵم دەدا ئەو ئەلفوبێ ئاڵۆزە فێر بم کە داپیرەم بۆی دەخوێندمەوە. ئەو کاتەی کە رێکەوتی کردنەوەی قوتابخانە نزیك بوویەوە، هەستم بە بێزاری دەکرد کاتێك کەسێکی تر جگە لە داپیرەم فێری نووسینی دەکردم، یاخود هەر کاتێك کاغەزێکم لەدەست بووایە، بە دروستکردنی وێنە رەشم دەکردەوە.

هەموو کاتێك کە سەرگەرمی خوێندن و نووسین دەبووین، بەکر دەهاتە ژوورەوە و دەیگوت: "ئەمڕۆ چی خزمەتێك دەفەرموون؟"

هەموو کاتێك ئەوەندە بە گەرمی و رێکوپێکی ئەم پرسیارەی دەکرد، وەك ئەوەی بەرپرسی چێشتخانەی نەخۆشخانەیەك یان سەربازگەیەك بێت. گفتوگۆیان لەبارەی ئەوەی چی خواردنێك ئامادە بکەن و لە کامە نەۆم ژەمی نیوەڕۆ و ئێوارە بخۆن، پرسیاری دەکرد. دواتر داپیرەم ساڵنامەیەکی گەورەی دەردەهێنا، کە پڕ بوو لە زانیاریی ئاڵۆز و وێنەی کاتژمێر، ئینجا سەیری لیستی خواردنەکانیان دەکرد و پلانی جۆری خواردنەکەیان دادەنا. لە کاتی گفتوگۆکانیان، هەمیشە سەیری ئەو قەلەڕەشەم دەکرد کە لە باخچەکەی پشتەوە، لەنێوان لقی درەختەکان هەڵدەفڕی.

بەکر، سەرەڕای ئەو هەموو ئەرکە قورسانەی لەسەری بوون، هێشتاش لە گاڵتەوگەپ نەدەکەوت. هەر لە داپیرەمەوە هەتا بچووکترین ئەندامی خێزانەکە، نازناوێکی بۆ دانابوو. بە منی دەگوت: "قەلەڕەش." چەند ساڵ دواتر پێی گوتم، لەبەر

ئەوەی هەمیشە سەیری قەلەڕەشێکم کردووە یان لەبەر ئەوەی زۆر لاواز بووم، ئەم ناوەی بۆ داناوم. برا گەورەم لەبەر ئەوەی خووی گرتبوو بە ورچە بووکوڵەکەی و لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ هەموو شوێنێك، ناوی نابوو (دایەن) ئامۆزایەکم چاوی بچووك بوو، پێی دەگوت (ژاپۆنی)، یەکێکی تریان زۆر لاسار بوو پێی دەگوت (بزن). پوورزایەکم بە شەش مانگی لەدایك بووبوو نازناوی (شەش مانگەی) بۆ دانابوو. بۆ ماوەی چەندین ساڵ، هەموومانی بە نازناوێك بانگ دەکرد، هەروەها گاڵتەپێکردنەکانی زۆر بەمیهرەبانییەوە بوون.

هەر وەکو ژوورەکەی دایکم، لە ژوورەکەی داپیرەشم مێزێکی خۆڕازاندنەوە و ئاوێنەیەکی چەند لا هەبوو، کە حەزم دەکرد هەروەك ئەوەی دایکم لاکانی بکەمەوە و خۆم ون بکەم لەناو ڕەنگدانەوەکانی وێنەکەم، بەڵام هەرگیز ڕێگەم پێ نەدەدرا دەستی لێ بدەم. داپیرەم نیوەی ڕۆژەکەی لەناو جێگەی خەوەکەی بەسەر دەبرد و هەرگیز مکیاجی نەدەکرد. مێزەکەی بە جۆرێك دانابوو کە دەیتوانی لە ئاوێنەکەوە هەموو ڕێڕەوەکان ببینێت، هەروەها ڕێك بەرامبەر پەنجەرەی ژووری دانیشتنەکەی بوو کە ڕوویان لەدەرەوە بوو، بەم جۆرە چاودێریی هەموو جمووجووڵێکی ناو ماڵەکەی دەکرد _ هەموو هاتن و چوونەکان، گفتوگۆی سووچەکان و شەڕی نەوەکانی_ بەبێ ئەوەی لەسەر جێگاکەی هەستێتەوە. لەبەر ئەوەی ماڵەکە هەمیشە تاریك بوو، هەندێك جار جمووجووڵەکانی بەتەڵخی دەبینی. هەر لەبەر ئەوە زۆر جار بانگی دەکرد کە ئاگاداری بکەنەوە چی ڕوو دەدات _بۆ نموونە: لەتەنیشت مێزە ڕازاوەکەی ژووری دانیشتنەکەی_ بەکر بەپەلە ڕایدەکرد و دەهات پێی دەگوت کە چی ڕوو دەدات.

هەر کاتێك داپیرەم لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤاری نەخوێندایەتەوە، خۆی بە چنینی نەخشی گوڵ لەسەر بەرگی سەرینەکان خەریك دەکرد. دوانیوەڕوانیشی بە جگەرەکێشان و گەمەی کارت لەگەڵ هاوڕێ هاوتەمەنەکانی خۆی لە نیشانتاشی بەسەر دەبرد. زۆر جار لە بۆنەکاندا، یاریی پۆکەریان دەکرد. لەناو دانەی پۆکەرەکاندا، کە لەناو جزدانێکی سووری قەیفەی ساف دایانابوون، چەند پارەیەکی ئاسنینی کۆنی عوسمانییەکان هەبوو کە لێوارەکانیان بە شێوەی مشار بوون و ناوی ئیمپراتۆرەکانی لەسەر هەڵکۆڵرابوو، زۆر حەزم دەکرد بیانبەمە سووچێکەوە و یارییان پێ بکەم.

یەکێك لەو ژنانەی دەوری مێزی یارییەکەیان، پێشتر لە حەرەمسەرای سوڵتان بووبوو، لەپاش ڕووخانی ئیمپراتۆرەکە، کاتێك خێزانی عوسمانییەکان _ناتوانم وشەی خێزانی دەسەڵاتدارییان بۆ بەکار بێنم_ زۆریان لێ کراوە ئەستەنبوڵ جێ بهێڵن و دەرگای حەرەمسەرا داخراوە، ئەم ئافرەتە لە حەریمەکە هاتووەتە دەرەوە و لەگەڵ یەکێك لە هاوپۆلەکانی باپیرەم هاوسەرگیریی کردووە. من و براکەم هەمیشە گاڵتەمان پێ دەکرد، چونکە زۆر بەڕێزەوە قسەی دەکرد: سەرەڕای ئەوەی هاوڕێی زۆر نزیکی داپیرەم بوو، بەڵام بە (خاتوون) ناوی یەکیان دەهێنا. تەنانەت لەو کاتانەش کە بەدەم خەندەوە دادەنیشتن و ئەو نانە خڕە بە پەنیر چەورکراوەیان دەخوارد کە بەکر بە فڕن بۆی ئامادە کردبوون. هەردووکیان قەڵەو بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا لە سەردەم و کلتوورێکدا دەژیان، ئەو جۆرە کێش زیادییەیان لەکەداری نەکردبوون، تەنانەت زۆر ئاسوودە بوون. داپیرە قەڵەوەکەم نیازی بووایە بچێتە دەرەوە یان بۆ شوێنێك کە بانگهێشت کرابوو _لەدوای چل ساڵی زۆر بەدەگمەن ڕووی دەدا بچێتە دەرەوە_ ئامادەکارییەکانی زۆری دەخایاند. هەموو جار لە کۆتایی خۆتەدارەکدانەکەیدا، بانگی قەمەر خانی هاوسەری پاسەوانەکەی دەکرد تا بێتە سەرەوە و بە هەموو هێزێکیەوە پاڵ بنێت بە زنجیری کۆرسییەکەی کەمەریەوە هەتا دابخرێت. کاتێك داپیرەم دەیگوت: "هێواش، کچێ هێواش!"، منیش بەبێدەنگی تەماشای پاڵنان و ڕاکێشی کۆرسییەکەم دەکرد. دەمزانی داپیرەم پارەی دەدا بە ئافرەتی ئارایشتگایەك، بۆ ئەوەی بێتە ماڵەوە نینۆکی بۆ چاك بکات. ئەم خاتوونە ئارایشتە، کاتێك دەهات، ماوەی چەند کاتژمێرێك دەمایەوە و قاپێکی پڕ لە ئاوی سابووناو و چەند کەلوپەلێکی سەیری لەدەوری خۆی دادەنا. کاتێك بۆیەی سووری دەدا لە نینۆکەکانی، داپیرەم و تۆپی خڕی لۆکەی بە پەنجەکانی قاچیدا دەهێنا، بەواقوڕماوییەوە ڕادەوەستام و سەرنجم دەدا.

بیست ساڵ دواتر کاتێك لە خانوویەکی تر و بەشێکی تری ئەستەنبوڵ دەژیاین، ناوەناوە بۆ دیدەنی داپیرەم دەچوومەوە بۆ باڵەخانەکانی پاموك. ئەگەر بەیانییان بگەشتمایە، داپیرەم هەر لە جێگای خەوەکەی جارانی دەبینی، کە بە هەمان جانتا و ڕۆژنامە و سەرین و سێبە دەورە درابوو. بۆنی ژوورەکەی _کە تێکەڵەی بۆنی سابوون،

قۆلۆنیا، تۆز و تەختە بوو_ هەروەك خۆی بوو و نەگۆڕابوو. هەمیشە دەفتەرێکی لاپەڕە تەنکی چەرمنی لەلاوە بوو، کە هەموو ڕۆژێك کۆمەڵێك شتی تێدا دەنووسی. دەفتەرەکەی کە لیستی خواردنەکان، یادگارییەکان و نرخی خواردنەکان، پلان و گۆڕانی کەشوهەوای تێدا دەنووسی، شێوازێکی پرۆتۆکۆلی پێوە دیار بوو. ڕەنگە بە هۆی ئەوەی کە مێژووی خوێندبوو، بەو جۆرە ئارەزووی لە ئەتەکیەت و ڕەسمیات هەبوو، یان لەوانەیەشە سەرسامیی بۆ شێوازی پرۆتۆکۆلی عوسمانییەکان هۆکارێکی تر بووبێت _ناوی هەموو نەوەکانی بە ناوی سوڵتانێکی سەرکەوتوو و ئازاوە ناو نابوو. هەموو کات کە سەردانیم دەکرد، دەستیم ماچ دەکرد، دواتر ئەویش هەندێك پارەی پێ دەدام کە بەشەرمەوە (هەروەها بەشادومانییەوە) دەمخستە گیرفانمەوە، ئنیجا باسی دایکم و باوکم و براکەم بۆ دەکرد. داپیرەم هەندێك جار ئەو شتانەی بۆ دەخوێندمەوە، کە لە دەفتەرەکەی نوسیبوونی.

"کوڕەزاکەم ئۆرهان، ئەمڕۆ هات سەردانی کردم، زۆر زیرەك و شیرینە. لە زانستی تەلارسازی دەخوێنێت. ئەوە دە لیرەم پێ دا. بە یارمەتیی خودا، ڕۆژێك دەبێتە کەسێکی سەرکەوتوو و بە هۆی ئەو، جارێکی تر خێزانی پاموك بەڕێزەوە ناو دەهێنرێت، هەروەك ئەو کاتانەی باپیری لە ژیان بوو."

لەپاش ئەوەی ئەم نووسینەی بۆ دەخوێندمەوە، بە چاویلکەکانیەوە سەیرێکی دەکردم کە زیاتر پەرێشانیی پێوە دیار بوو و زەردەخەنەیەکی بۆ دەکردم، منیش لەو کاتەی هەوڵم دەدا هەمان زەردەخەنەی بۆ بکەمەوە، خەیاڵم دەکرد، لەوانەیە داپیرەم بە خۆی پێکەنیبێت، یاخود زانیبێتی کە ژیان چەندە بێمانایە.

## ١٣

# خۆشی و ناخۆشییەکانی قوتابخانە

یەکەم شت لە قوتابخانە فێری بووم، ئەوە بوو کە هەندێ کەس بەڕاستی گێلن. دووەم شت فێری بووم، هەندێ هەن لەوەش خراپترن. ئەوکات زۆر منداڵ بووم کە تێبگەم کەسی ڕەوشتبەرز لەناو هەموو ئایین، چینایەتی، ڕەگەز، ئابووری و کلتوورە جیاوازەکانی کۆمەڵگادا، دەبێت نواندنی کەسی بێتاوان بکات. بێتاوانیی من ئەوە بوو هەموو جارێك مامۆستا پرسیاری دەکرد، خێرا دەستم هەڵدەبڕی هەتا بۆ مامۆستای ڕوون بکەمەوە کە وەڵامەکە دەزانم.

لەپاش چەندین مانگ، مامۆستا و هاوپۆلەکانم زانییان کە من قوتابییەکی زیرەکم، بەڵام من هەستم بە ناچاری دەکرد بۆ ئەوەی بەردەوام دەستم هەڵبڕم. دوای ئەوە، مامۆستا بەدەگمەن هەڵیدەساندم، بۆ ئەوەی هەلی بەشداربوون بدات بە قوتابییەکانی تریش. بەڵام من هەردەم دەستم هەڵدەبڕی، تەنانەت ئەگەر خواستیشم لێ نەبووایە، یاخود وەڵامەکەم بزانیایە یان نا. ئەگەر ویستبێتم لەناو پۆلەکەم خۆم بنوێنم، وەك ئەوەی کەسێك لەسەر جلوبەرگی ئاسایی و وەرزشی، پارچەیەك ئاڵتوونی ناشرین بپۆشێت، لەبەر ئەوە بووە کە مامۆستاکەم لا پەسەند بوو. زۆر جار نواندنەکەم لەدەرەوەی ویستی خۆم بوو.

شتێکی تر کە زۆر لام پەسەند بوو لە قوتابخانە، ئەویش (دەسەڵاتی مامۆستا) بوو. لە ماڵی ئێمە، لە نهۆمە شپرز و جەنجاڵەکانی پاموك، هیچ شتێك ڕوون نەبوو، کاتێك لەسەر مێزی نانخواردن دادەنیشتی،ن هەموو کەس لە یەك کاتدا قسەی دەکرد. ڕۆتین و

خووە خێزانییەکانمان، خۆشەویستیمان بۆ یەکتر، گفتوگۆکان، ژەمی خواردنەکان و گوێگرتن بۆ ڕادیۆ، هیچ کامیان بەپێی پلانی پێشووتر نەبوون، بەڵکو هەموویان بەرێکەوت بوون. باوکم کەمێك دەسەڵاتی هەبوو لەماڵەوە، بەڵام زۆربەی کاتەکان لە ماڵ نەبوو. هەرگیز باوکم سەرزەنشتی من و براکەمی نەدەکرد، یان کاتێك شتێکی بەدڵ نەبووایە، هەرگیز برۆکانی گرژ نەدەکرد. لە ساڵانی دواتر، کاتێك من و براکەمی دەناساند بە هاوڕێکانی، دەیگوت: "ئەمە دوو هاوڕێ بچکۆلەکەی منن." بە بۆچوونی من، وەك ئەوەی دیار بوو، دایکم تاکە دەسەڵاتدار بوو لە ماڵەوە، بەڵام هەرگیز دەسەڵاتەکەی بەتیژڕۆیی بەکار نەدەهێنا، بەڵکو دەسەڵاتەکەی بۆ دروستکردنی ڕکابەرایەتی لەنێوان من و براکەم بوو بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستیی زیاتری ئەو. لەبەر ئەوە، زۆر سەرسامی ئەو دەسەڵاتەی مامۆستا بووم کە بەسەر بیست و پێنج قوتابیدا هەیبوو لە پۆلێکدا.

لێکچوونێك لەنێوان دەسەڵاتی دایکم و مامۆستاکەمدا هەبوو، چونکە ڕێنماییەکانی دایکم زۆر بەدڵ بوون و بێزاریان نەدەکردم. زۆر جار مامۆستاکەم دەیگوت: "دەست مەجووڵێنن و بەژێری دانیشن،" بەبێ جووڵە و بەئارامییەوە سەرنجی وانەکەم دەدا. بەڵام ئەم بایەخپێدانەم بەهێواشی بەرەو کۆتایی دەچوون و ئیتر شتەکان وەك جاران نوێ نەبوون بەلامەوە، ئیتر وەك جاران



زانینی هەموو وەڵامەکان، بەدەستهێنانی نمرەی بەرز و چارەسەرکردنی کێشە یەك لەدوای یەکەکان لەبەرچاوی ئەوانی تر، بەچێژ نەبوو بەلامەوە.

کاتێك ئەو کچە قەڵەو و گەمژەیە، کە هەمیشە هەمان زەردەخەنەی بێلەزەت و پڕمتمانەی بۆ مامۆستا و پاسەوان و هاوپۆلەکانی دەکرد، لەسەر تەختەڕەش دەینووسی، ڕووم وەردەگێڕا و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد. تەماشای لقەکانی ئەو دار کەستانە کە لەنێوان

باڵەخانەکاندا بەرز بووبوویەوە و ئەو قەلەڕەشەم دەکرد کە لەسەر لقەکانی دەنیشتەوە. لەبەر ئەوەی لەخوارەوە سەیرم دەکرد، لەپشتیەوە پەڵەهەورێکی بچووکم بینی، کاتێک دەجووڵایەوە، شێوەی هەر جارە و جۆرێك بوو. سەرەتا شێوەی لووتی ڕێوی، دواتر شێوەی سەر، دواتریش وەك سەگ بوو. ئارەزووم دەکرد شێوەکەی وەك سەگ بمێنێتەوە و نەگۆڕێت، بەڵام هەورەکە لە گۆڕینی شێوەکەی بەردەوام بوو، ئەمجار شێوەی گۆڕا بۆ شەکردانە زیوییە چوار قاچەکەی داپیرەم کە هەمیشە لەناو سندووقێکی داخراودا دانرابوو.

بە هەمان شێوە، لە ماڵی خۆمان لە سێبەرە بێدەنگەکان شێوەم دەئافراند. جارێکیان، لەو کاتەی نیازمان بوو بچین بۆ بۆسفۆر، وەك ئەوەی خەونێك بێت، باوکم لەپڕ لەناو سێبەرەکان هاتە دەرەوە. دواتر پەنجەرەی باڵەخانەی بەرامبەر قوتابخانەکە کرایەوە و خاتوونێکی خزمەتکار لە پەنجەرەکەوە سەری دەرهێنا، پارچە پەڕۆ تۆزاوییەکەی دەتەکاند و بەخەواڵوویی سەیری شەقامەکەی دەکرد. ئەو شەقامەی کە من نەمدەتوانی ببینم و هەموو کات ئاواتم دەخواست کە بزانم لەخوارەوە چی دەگوزەرێت. گوێم لە دەنگی ئەو ئەسپ و عەرەبانەیە بوو کە بەسەر ڕێگا چەوریژکراوەکەدا دەچوو و هاواری دەکرد: "کەلوپەلی کۆنۆۆۆنە!" خزمەتکارەکە سەیرێکی کۆنەفرۆشەکەی دەکرد، دواتر سەری دەبردە ژوورەوە و پەنجەرەکەی دادەخستەوە. پاشان لەتەنیشت پەنجەرەکەوە پەڵەهەورێکی ترم بینی کە بەخێرایی بە ئاراستەیەکی جیاواز دەچوو، سەیری پەڵەهەورێکی تریشم کرد، دواتر سەرنجم گەڕایەوە پۆلەکە بینیم کە هاوپۆلەکانم دەستیان هەڵبڕیوە، منیش بەپەرۆشەوە دەستم هەڵبڕی. کەمێك پێش ئەوە، وەڵامی پرسیارەکەی مامۆستام لە هاوپۆلەکانمەوە بیستبوو، باوەڕم بە خۆم بوو کە وەڵامەکە دەزانم.

شتێکی تر کە سەرنجڕاکێش بوو بەلامەوە، هەرچەندە هەندێك جاریش ئازاربەخش بوو، ناسینی هەریەکە لە هاوپۆلەکانم و زانینی ئەو ڕاستییەی کە چەندە جیاوازن لە من. لە پۆلەکەم کوڕێکی خەمبار هەبوو، هەر کات مامۆستا داوای لێ بکردایە بە دەنگی بەرز بخوێنێتەوە، نیوەی دێڕەکانی دەپەڕاند، بەڵام هەڵەکانی کوڕە داماوەکە هەروەك پێکەنینی ناو پۆلەکە نەخوازراو بوو. کچێکی زیرەك هەبوو، هەمیشە قژە سوورەکانی

لەدواوە وەك كلكی ئەسپ دەبەست، بۆ ماوەیەك لەتەنیشت منەوە دادەنیشت، هەرچەندە جانتاكەی پڕ بوو لە لەتە سێو، سمیت، كونجی و قەڵەم و تەوقەی قژ بەستن، بەلآم هەمیشە بۆنی گوڵە لاوەندەری وشككراوەی لێ دەهات كە زۆر خۆش بوو بەلامەوە. ئەم كچە زۆر بەڕاشكاوانە باسی شتە هەڵە و قەدەغەكراوەكانی كۆمەڵگای دەكرد، ئەوەش شتێكی تری بوو كە سەرنجی ڕادەكێشام. ئەگەر لە كۆتایی هەفتەكاندا نەمبینیایە، زۆر بیرم دەكرد. هاوڕێیەتیی كیژێكی دیكەشم دەكرد، زۆر بچووك و نەرمونیان بوو. هەمیشە دەمپرسی: چۆن دەبێت ئەو كوڕە بەردەوام بێت لەسەر درۆكردن لە كاتێكدا دەزانێت كەس باوەڕی پێ ناكات؟ چۆن دەبێت ئەو كچە بەو جۆرە بایەخ نەدات بەو شتانەی لە ماڵەوە ڕوو دەدەن؟ ئایا ئەو كچەی تر دەتوانێت بەڕاستی فرمێسك بڕێژێت، كاتێك شیعرێك دەربارەی ئەتاتورك دەخوێنێتەوە؟

هەروەك چۆن خووم گرتبوو سەیری پێشەوەی ئۆتۆمبێلەكان بكەم و وێنەی لووتیان لێ دروست بكەم، بە هەمان شێوەش ورد دەبوومەوە لە هاوپۆلەكانم بۆ ئەوەی بزانم شێوەیان لە كامە ئاژەڵ دەچێت. ئەو كوڕەی لووتێكی پانی هەبوو، وەك ڕێوی وا بوو. ئەو كوڕەی تر كە لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو، كەتە و قەڵەو بوو، هەروەك ئەوەی هەمووان پێیان دەگوت، شێوەی ورچی هەبوو، دانەیەكی تر هەبوو قژێكی پڕی هەبوو لە ژووژك دەچوو... لەبیرم دێت، كچێكی جوولەكە لە پۆلەكەمان هەبوو ناوی ماری بوو، باسی جەژنی جولەكەكانی بۆ دەكردین و دەیوت كە لە ڕۆژەكانی جەژن، كەس لە ماڵ داپیرەی نییە و بەئازادانە دەستكاریی سویچپلاكەكان دەكات. كچێكی تر بۆی گێڕاینەوە كە ئێوارەیەكیان كاتێك لە ژوورەكەی خۆی بووە، بەخێرایی بەدەوری خۆیدا خولاوەتەوە تا سێبەری فریشتەیەكی بینیوە! _هەمیشە ئەم چیرۆكە ترسناكەم بەبیر دەهاتەوە. كچێكی لاقدرێژمان لەگەڵ بوو كە گۆرەوییەكی درێژی لەبەر دەكرد، هەردەم ڕووخساری بە جۆرێك دەردەكەوت، وەك ئەوەی خەریكە دەست بكات بە گریان. باوكی وەزیر بوو، لە ڕووداوی پێكدادانی فڕۆكەدا، هەر لەو ڕووداوەدا عەدنان مەندرس، سەرۆكوەزیران، توانیی بەبێ زیان ڕزگاری ببێت، گیانی لەدەست دابوو. دڵنیا بووم پێش ڕووداوەكە گریاوە، چونكە پێشوەخت دەیزانی چی شتێك ڕوو دەدات. زۆربەی قوتابییەكان لەگەڵ ددانیان كێشەیان هەبوو و هەندێكیان تەلی ددان ڕێككردنەوەیان بۆ

دانرابوو. باڵەخانەیەکی نزیك قوتابخانەکە، کە لەتەنیشت دەرمانخانەیەکەوە بوو، نهۆمی سەرەوەی بەشەناوخۆیی قوتابییانی دواناوەندی و هۆڵی داخراوی وەرزشی بوو، دەوترا ڕەنگە ببێتە جێگەی پزیشکی ددانسازی. هەموو جار مامۆستاکە هەڕەشەی لە قوتابییە لاسارەکان دەکرد بەوەی کە دەیانرێت بۆ ئەو شوێنە. بۆ ئەوەی سەرپێچیی قوتابییان کەم بکەنەوە. هەنێك جار کە سزایان دەدان، دەبوو لە سووچی نێوان تەختەڕەشەکە و دەرگای پۆلەکە، لەسەر یەك قاچ ڕاوەستێت و پشت لە قوتابییەکانی دیکە بکات. هەموومان زۆر بەپەرۆشی بینینی ئەم سزایە بووین، بۆ ئەوەی بزانین تاکو چەندە قوتابییەکە دەتوانێت لەسەر یەك قاچ بوەستێت، بەڵام ئەم جۆرە سزادانە زۆر بەدەگمەن ڕووی دەدا.

لە کتێبی (*فەلاقە و شەو*)، ئەحمەد ڕاسیم زۆر بە دوورودرێژی باسی شێوازی سزادانی سەردەمی خۆی کردووە، کە سەدەیەك لەپێش ئێمەوە بووە. لە سەردەمی عوسمانییەکان، کاتێك قوتابییەکان سزا دراون، بە شووڵی دار لێیان دراوە، بەبێ ئەوەی لەسەر کورسییەکانیان هەڵسابنەوە. مامۆستاکانمان زۆر هانیان دەداین بۆ ئەوەی ئەم کتێبە بخوێنینەوە، دەبێت لەبەر ئەوە بووبێت پیشانمان بدەن کە ئێمە چەندە بەبەختین کە لە سەردەمی پێش ئەتاتورك و کۆماری، قوتابی نەبووین. بەڵام تەنانەت لە ناوچەیەکی دەوڵەمەندی نیشانتاش، لە قوتابخانەی دواناوەندیی عیشقی نموونەیی، مامۆستا بەتەمەنەکان، ئەوانەی لەدوای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جێ مابوون، هێشتاش هەر سزای قوتابییانیان دەدا بە بەکارهێنانی شێوازی نوێی سزادان: وەك فەرمانڕەوا فەرەنسییەکان، کانزایەکی باریك و ڕەقیان دەکرد بە کەمەریانەوە، یان بە دەستیانەوە دەگرت کە زۆر لە شووڵی دارەکەی بەئازارتر بوو.

گەلێك شادومان دەبووم، کاتێك دەمبینی قوتابییەکی تەمبەڵ و گەمژە و ئەو کیژە دەوڵەمەندەی کە لە لەگەڵ شوفێری تایبەت دەهات بۆ قوتابخانە، سزا دەدرێن. ئەو کچەی کە نازدارەکەی مامۆستا بوو، هەمیشە لەپێش ئێمەوە دەوەستا بۆ ئەوەی گۆرانیی (زەنگ لێدە) بە ئینگلیزی بڵێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەرکی ماڵەوەی ئامادە نەکردایە، ئەوا میهرەبانیی مامۆستای لەدەست دەچوو. هەندێك قوتابی هەبوون، ئەرکی ماڵەوەیان ئامادە نەکردبوو، بەڵام وا خۆیان پیشان دەدا کە لە سووچێکی

دەفتەرەکەوە نووسیویانەتەوە و ئێستا نایدۆزنەوە، دەیانگوت: "مامۆستا، ئێستا ناتوانم بیدۆزمەوە لەکوێدا نووسیومە"، تەنها بۆ ئەوەی کەمێك سزاکەیان دوا بخەن، بەڵام بەم کارەیان مامۆستایان تووڕەتر دەکرد و زللەیەکی لێ دەدان یان گوێی رادەکێشان.

کاتێك پۆلێکمان تێدەپەڕاند بۆ پۆلێکی تر، کاتێك مامۆستایەکی ئافرەتی شیرین و دڵسۆز دەگۆڕا بە مامۆستایەکی پیاوی پیر و توندڕەو کە وانەی ئایین و موزیك و وەرزشی پێ دەگوتین، ئەوکات وانەکانیش زۆر بێزارکەر و ناخۆش دەبوون بۆم. بەڵام کاتێك خۆشییەکانی سزادان لەم وانە ناخۆشانە دەستی پێ دەکرد، بۆ ماوەی چەند خولەکێك شادومان دەبووم.

کیژێکی دیکەی هاوپۆلم هەبوو، کە زۆر سەرنجراکێش بوو بەلامەوە، ئەوەش ڕەنگە بە هۆی جوانپۆشی و پاکوخاوێنییەکەیەوە بووبێت، یاخود لەبەر ئەوەی کچێکی لاواز بوو و کاتێك مامۆستا سزای دەدا، زوو دەشکایەوە، چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسك و ڕووخساری سوور هەڵدەگەڕا، هەر لەو کاتەدا خۆزگەم دەخواست، بتوانم لە سزاکەی ڕزگاری بکەم. هەروەها کوڕێکی مووزەردی قەڵەو هەبوو، کە لە وچانی نێوان وانەکاندا ئازاری دەدام، هەمیشە مامۆستا بە هۆی ئەوەی لە کاتی وتنەوەی وانەکە قسەی دەبڕزکاند، سزای دەدا و منیش بەخۆشحاڵییەوە لێم دەڕوانی. کوڕێکی تر کە پێم دەگوت گێلە بێهیواکە، چەندە سزاکان قورستر دەبوون لەسەری، بەڵام ئەو هەر لەسەر ڕەفتاری خۆی بەردەوام بوو. هەندێك مامۆستا هەبوون، کاتێك قوتابییەکیان هەڵدەستاند بۆ لای تەختەڕەشەکە، بۆ تاقیکردنەوەی ئاستی زیرەکی نەبوو، بەڵکو بۆ پیشاندانی تەمبەڵی و گەمژەییان بوو. یان مامۆستاکان بەتەواوەتی تووڕە دەبوون، کاتێك دەیانبینی لاپەڕەی دەفتەرێك بە هەڵە پڕ کراوەتەوە، یان تەنانەت بە چەپەچپی قوتابییەك تووڕە دەبوون و لێیان دەدا. قوتابییەکان کاتێك وەڵامی پرسیارێکی ئاسانیان بزانیایە، وەك ئەو کەروێشك وا بوون کە بەخێرایی بەبەردەم ڕووناکییەکەی پێشەوەی



ئۆتۆمبێلێکدا ڕادەکات، بەڵام هەندێکی تر _کە من ئەم شێوازەم زۆرتر لا پەسەند بوو_ کاتێك وەڵامەکەیان نەزانیایە، هەموو ئەو شتانەیان دەگوت کە دەیانزانی بەهیوای ئەوەی ڕزگاریان بکات.

لەناو پۆلدا تەماشای هەموو دیمەنەکانم دەکرد: سزادانی قوتابییەکان، لە کاتێکدا هەموو پۆلەکە وەك پەیکەر دادەنیشتن، سوپاسگوزار بووم کە من یەکێك نەبووم لەو قوتابییە بێبەختانە کە زەبوون و کەم دەکرانەوە لەناو پۆلدا. لە پۆلی سێیەمەوە، هەستم بە بەختباشیی خۆم کرد. ئەگەر قوتابخانەیەك قوتابییەکانی لە هەموو چینە جیاوەزەکانی کۆمەڵگاوە هاتبن، ئەوا بەئاسانی قوتابیی بەبەخت، لەوانی دیکە جیا دەکرێتەوە، بەڵام قوتابخانەکەی ئێمە تایبەت بوو هەموو قوتابییەکانی لە خێزانە زەنگینەکانەوە بوون. کاتێك لە یاریگای قوتابخانەکە گەمەمان دەکرد و چێژمان لە منداڵی خۆمان وەردەگرت، هیچ هێڵێکی جیاواز لەنێوانمان دەرنەدەکەوت. کاتێك قوتابییەك سەرزەنشت دەکرا و لێی دەدرا، پرسیارم لە خۆم دەکرد، بۆچی دەبێت هەندێك ئەوەندە تەمبەڵ و بێمێشك و درۆزن بن، بەڵام هیچ وەڵامێکم نەدۆزییەوە بۆ پرسیارەکەم، تەنانەت لە کتێبی کارتۆنییەکانم کە کەسایەتییە خراپەکان بە دەمی کراوە و دانی جیڕەوە وێنەیان کێشرابوو. بە تێپەڕبوونی کات، ئەم پرسیارە لە هزرمدا نەما، چونکە لە قووڵایی دڵە سپییەکەی منداڵیم هیچ جۆرە وەڵامێك نەبوو بۆ ئەو پرسیارە. ئیدی تێگەیشتم ئەو شوێنەی پێی دەگوترێت قوتابخانە، هیچ وەڵامێکی تێدا نادۆزرێتەوە بۆ ئەو پرسیارە پڕماناییانەی کە پەیوەندییان بە ژیانەوە هەیە، بەڵکو قوتابخانە زیاتر ئامادەکردنی ئێمەیە بۆ ژیانێکی ڕاستەقینە. هەتا گەیشتمە قۆناغی ئامادەیی، پێم باش بوو هەمیشە دەست هەڵبڕم و بەئاسوودەییەوە لەسەر هێڵە ڕاستەکە بمێنمەوە.

ئەو شتەی لە قوتابخانە فێری بووم، ئەوە بوو کە بەتەنها ڕازی بوون بە ڕاستییەکانی ژیان بەس نییە، بەبێ ئەوەی پرسیاریان دەربارە بکەین. لە ساڵی یەکەمی قوتابخانەم، مامۆستاکان بۆ هەر پۆزشێك دەگەڕان، بۆ ئەوەی وانەکە ببڕن و گۆرانیمان فێر بکەن. کاتێك وشەکانی گۆرانییە ئینگلیزی و فەرەنسییەکانم دەگوتەوە، هیچ لێیان تێنەدەگەشتم و ئارەزووم نەبوو بیانڵێمەوە، بەڵام حەزم دەکرد سەیری هاوپۆلەکانم

بکەم، کاتێك گۆرانییەکەیان دەگوتەوە. (بە تورکیش گۆرانییمان دەگوت، وەکو گۆرانی "کاکی پاسەوان، کاکی پاسەوان، ئەمڕۆ پشووە، زەنگەکەت لێبدە.") کوڕێکی کورت و قەڵەوی هاوپۆلم هەبوو، زۆر بەئاسوودەیی گۆرانییەکەی دەگوتەوە و هەتا دەیتوانی دەمی دەکردەوە، لە کاتێکدا نیوکاتژمێر لەوەوبەر بە هۆی نەهێنانی دەفتەرەکەیەوە، فرمێسکی بەخوڕی دەڕشت. کیژێکیش کە هەموو جار قژەکانی دەخستە پشت گوێکانییەوە، بە هەمان شێوە گۆرانییەکەی دەگوتەوە، بەڵام لە نیوەی گۆرانییەکە پەرۆشییەکەی کەمتر دەبوویەوە. ئەو کوڕە قەڵەوە کە هەموو جار لە کاتی یاریکردندا ئازاری دەدام، لەگەڵ هاوڕێ دڵڕەقەکەی کە هەموو شتێکی دەربارەی هێڵی نهێنییەکان دەزانی و هەوڵی دەدا لەسەر هێڵە ڕاستەکە بمێنێتەوە، لە کاتی گوتنەوەی گۆرانییەکە، خۆیان وەك فریشتە لێ دەکرد و لەناو مۆسیقاکەدا ون دەبوون. لە نیوەی گۆرانیگوتنەکەدا، کچە جوانپۆشەکە لای دەکردەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بێتەوە کە قەڵەم و دەفتەرەکەی لە جێگەی خۆیانن. کچێکی زیرەکی هاوپۆلم هەبوو، لە وچانی نێوان وانەکاندا، کاتێك داوام لێ دەکرد ببێتە هاوڕێم، لەتەنیشت یەکەوە دەچووین بە ڕێگادا و کاتێك نزیکی پۆلەکە دەبووینەوە، بەهێواشی دەستی دەگرتم، بەوپەڕی چالاکی و هەستەوە گۆرانییەکەی دەگوتەوە. کوڕە چاوچنۆکە قەڵەوەکە، وەکو چاودێریی منداڵێك بکات، هەردوو قۆڵەکانی دەخستە سەر لاپەڕەکەی، بۆ ئەوەی کەس نەیبینێت. کوڕە بێهیوا گەمژەکە، کەم جار هەبوو بەبێ لێدان و بە ویستی خۆی گۆرانییەکە بڵێتەوە. کچە قژسوورەکە، کە لەدواوە وەك کلکی ئەسپ دەیبەستن، هەموو جار لە کاتی گۆرانیوتنەکە سەیرێکی یەکمان دەکرد و زەردەخەنەمان بۆ یەکدی دەکرد. گۆرانییەکەم بەباشی ئەزبەر نەبوو، هەر کات دەگەیشتمە بەشی لا-لا-لا دەنگم بەرز دەکردەوە، هەر لەو کاتەشدا لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد و داهاتووم دەهێنایە پێشچاوی خۆم. لەدوای ماوەیەك کە زەنگەکە لێ دەدرا و پۆلەکە وەك بورکان دەتەقیەوە، یەکسەر دەچووم بۆ لای پاسەوانەکەمان کە چاوەڕێی دەکردم، کاتێك دەستە گەورەکەیم دەگرت و لەگەڵ براکەم دەیبردینەوەماڵەوە، ئەوندە هیلاك بووم، هیچ کام لە هاوپۆلەکانم لەبیر نەدەما، بەڵام کاتێك بیرم دەکەوتەوە دەڕۆمەوە ماڵ و دایکم دەبینم، زۆر خێراتر هەنگاوەکانم دەنا.

## ١٤

# یەکات فت رەکەمە رسە یوهز

لەو ساتەوەی فێری خوێندنەوە بووم، جیهانە خەیاڵییەکەی ناو مێشکم بە پیتەکان ڕازاندەوە. پیتەکان هیچ واتایەك یاخود چیرۆکێکیان دروست نەدەکرد، تەنها دەنگێکیان دروست دەکرد. هەر وشەیەك کە دەمبینی _ئەگەر ناوی کۆمپانیایەك لەسەر تەپڵەکی جگەرە یان پۆستەرێك، سەردێڕی هەواڵ، ڕیکلامێك لەسەر دوکان و چێشتخانەیەك یاخود لەسەر لاتەنیشتی ئۆتۆمبێلێکی بارهەڵگرەوە بوو، گرنگ نەبوو وشەکە لەکوێ نووسراوە، لەسەر پارچە کاغەزێکی لوولدراو، لەسەر نیشانەکانی هاتوچۆ، لەسەر پاکەتی دارچینی سەر مێزی ژەمی ئێوارە، لەسەر قوتووی ڕۆنەکەی مەتبەخ، جێگە سابوونی گەرماوەکە، لەسەر پاکەتی جگەرە، یان لەسەر شووشەی دەرمانەکانی



داپیرەم نووسرابێت_ دەستبەجێ دەمخوێندەوە. هەندێك جار بە دەنگی بەرز، چەند جار وشەکەم دەخوێندەوە، گرنگ نەبوو بەلامەوە وشەکە چی مانایەکی هەیە. خوێندنەوەی پیتەکانم بە جۆرێك بوو، وەك ئەوەی ئامێرێك لەنێوان هەردوو بەشی بینایی و تێگەشتنی مێشکمدا هەبێت، پیتەکان بکاتە برگە و دەنگیان لێ دروست بکات. وەك ڕادیۆیەکی ناو

قاوەخانەیەك كە بەبەردەوامی كار بكات، بەبێ ئەوەی كەس گوێی بۆ ڕابگرێت، ئامێرەكەی مێشكی منیش، هەندێك جار دەكەوتە ئیش بەبێ ئەوەی خۆم هۆشیار بم.

زۆر جار بەهیلاكی لە قوتابخانەوە دەگەڕامەوە و چاوم دەكەوتە سەر وشە و ئامێرەكە دەیخوێندەوە: *"بۆ پاراستنی سامان و داهاتووت. بلیتی پاس. گۆشتی سەوسەجی ڕاستەقینەی ئاپیكۆگڵو. باڵەخانەكانی پاموك."*

جارێكیان لەماڵەوە چاوم كەوتە سەر ئەو سەر دێڕانەی كە لە ڕۆژنامەكەی دەستی داپیرەم نووسرابوون: "مردن یان دابڕان لە قبروس. یەكەم قوتابخانەی بالیە لە توركیا. هەڵهاتنی بەبەختی ئەمەریكییەك لە پەتی سێدارەی نایاسایی توركەكان، بە هۆی ماچكردنی كچێكی تورك لە كۆڵانەكان. نمایشی هێلاهۆپ لەسەر شەقامەكان."

هەندێك جار پیتەكان بە جۆرێكی ئەوەها سەیر دەگونجان پێكەوە، كە دەیانگێڕاندمەوە بۆ ئەو ڕۆژە جادوویيانەی كە یەكەم جار فێری ئەلفوبێ بووم. ئەو بڕیارەی لەسەر هەندێك بەشی چیمەنتۆی سەر شۆستەكەی دەوری كۆشكێكی دەوڵەت لە نیشانتاشی نووسرابوون كە سێ خولەك لە ماڵی ئێمەوە دوور بوو، یەكێك بوو لەوانە. كاتێك دایكم، من و براكەمی لە نیشانتاشەوە بەرەو تاقسیم و بیۆگڵو دەبرد، لەسەر چەند چوارگۆشەیەكەی بەتاڵ، لەسەر شۆستەكە لەنێوان ئەو پیتانەدا كەمێك خەتخەتێنمان دەكرد، كە بەم جۆرەم دەخوێندنەوە:

"یەكات فت رەكەمە رسە یوهز (تكایە تف مەكەرە سەر زەوی)."

ئەو فەرمانە ئاڵۆزەی كە لەسەر شۆستەكە نووسرابوو، وایان لێ دەكردم ڕەتی بكەمەوە و یەكسەر تف بكەمە سەر زەوییەكە. بەڵام نەمدەتوانی وا بكەم، چونكە پۆلیس تەنها دوو هەنگاو لە كۆشكەكەوە دوور بوو. ڕادەوەستام و سەیرم دەكرد. دەترسام لەناكاو بەبێ ویستی خۆم تف لە گەرووم بێتە دەرەوە و بكەوێتە سەر زەوی. بەڵام دەمزانی تفكردن، كاری ئەو منداڵە تەمەڵ و هاروهاجانەیە كە هەمیشە لەلایەن مامۆستاكەیانەوە سزا دەدرێن. بەڵێ، بەو جۆرە، زۆر جار خەڵك دەبینین لەبەر ئەوەی دەستەسڕیان پێ نییە تف یان بەڵغەم هەڵدەدەنە سەر شەقامەكان، بەڵام زۆر بەدەگمەن ڕووی دەدا لەسەر ئەو نووسراوانە یان تەنانەت لە دەوروبەری كۆشكەكەی دەوڵەت بێت. پاش ماوەیەك، كاتێك خوێندمەوە كە لە وڵاتی چین خاڵێك دیاری كراوە

بۆ تفکردن، هەروەها لە زۆربەی بەشەکانی تری جیهان، شوێنێك هەیە بۆ تفکردن، پرسیارم لە خۆم دەکرد کە بۆچی تفکردن لە ئەستەنبول نابێتە نەریتێکی باو. (هەتا ئێستاش کاتێك ناوی نووسەری فەرەنسی (بۆریس ڤیان) دەهێنرێت، هیچ لە کارە باشەکانی نایەنەوە یادت، بەڵکو ئەو کتێبەیت بەبیر دێتەوە کە بە ناوی *(من تف دەکەمە سەر گۆڕەکانتان)* نووسیبووی).

لەوانەیە هۆکاری سەرەکیی ڕەگداکوتانی ئاگاداریی سەر شۆستەکانی نیشانتاش لە بیرەوەریمدا، بە هۆی کاراکردنی ئامێرەکەی مێشکم بووبێت. لەگەڵ ئاگادارییەکانی دایکم لەو کاتانەی کە دەستی دەگرتم لەسەر شەقامەکە، ڕێنمایی دەکردین چی بکەین و چی نەکەین لە ژیانماندا. بۆ نموونە" ئامۆژگاریی دەکردین کە خواردن لەسەر فرۆشیارە پیسەکانی سەر شەقامە چۆڵەکان نەکڕین، یان لە چێشتخانەکان داوای کفتە نەکەین، چونکە گۆشتی چەور و خراپ بەکار دێنن. هەندێك جار ڕێنماییەکانی دایکم لەگەڵ ئەو ئاگادارییانە تێکەڵ دەبوون، کە ئامێری خۆکارەکەی مێشکم چاپی کردبوون: "*دەبێت هەموومان گۆشت لە بەفرگردا دابنێین.*" ڕۆژێکیان دایکم ئامۆژگاریی دەکردین کە خۆمان لە کەسانی نامۆ و نەشناس دوور بگرین، ئامێرەکەم چاپی کردبوو کە *لە خوارووی هەژدە ساڵیەوە ڕێگەپێنەدراوە.* لەسەر پشتەوەی شەمەندەفەرەکان نووسرابوو، *خۆهەڵواسین بە تەنیشتەکانی شەمەندەفەر، ترسناك و ڕێگەپێنەدراوە،* دایکیشم ڕێك بەم جۆرە بیری دەکردەوە. بینینی وشەکانی دایکم لەناو ئاگادارییە میرییەکان تووشی سەرسوڕمانی نەدەکردم، چونکە دایکم هەمیشە دەیگوت، خەڵکی وەك ئێمە هەرگیز خۆیان هەڵناواسن بە شەمەندەفەردا، بۆ ئەوەی گەشتێکی بێمانا بکەن. هەمان ڕێنمایی لەسەر کەشتییەکانی شار نووسرابوون: "*نزیك بوونەوە لە پەروانەکان ترسناك و قەدەغەکراوە.*" دایکم بە دەنگێکی ڕەسمی، ئاگاداری دەکردینەوە کە دەستکاری شتە فڕێدراوەکان نەکەین، بەڵام کاتێك دەمبینی لەسەر پۆستەری سەر دیوارێك بە شێوەیەکی ناڕەسمی نووسرابوو *(دایکی فڕێدراوەکان)* تووشی پەشۆکان دەبووم. کاتێك پێم دەگوترا تەنها دەستی داپیرەت و دایکت ماچ بکە، جگە لەوان دەستی کەسی تر ماچ مەکە، ئەو وشانەم بیر دەکەوتەوە کە لەسەر قوتووی ماسی نووسرابوون: "بەبێ ئەوەی هیچ دەستێکی بەر بکەوێت، ئامادە کراوە." "گوڵەکان لێمەکەرەوە"، یان

"دەستیان لیّ مەدە"_ ئەم دوو ڕێنماییە وەکو ئەوانەی دایکم بوون کە لەسەر شەقامەکان پێی دەگوتین. ڕەنگە پەیوەندی لەنێوان ئەم ئاگادارییانە و ڕێنماییەکانی دایکمدا هەبووبێت، بەڵام دەبێت چۆن تێگەشتبم لەو ڕینماییەی کە دەیانگوت: "هەرگیز ئاوی ناو حەوزەکان مەخۆرەوە!"، لە کاتێکدا دڵۆپێك ئاوم لە حەوزەکان نەدیبوو، یان دەگوترا لەسەر چیمەنی پارکەکان هاتوچۆ مەکەن، لە کاتێکدا جگە لە قوڕ و خاشاك، هیچی ترم نەدیبوو!



بۆ تێگەیشتن لە (ئەرکەکانی شارستانێتیبوون) کە بە شێوەی ڕێنمایی نووسراون و شارەکەیان کردۆتە دارستانی ئاگاداری و هەڕەشە و گلەییکردن، پێویستە سەیرێکی وتارنووسی ڕۆژنامەکانی شار و پەیامنێرەکانی شار بکەین، کە پێشینانی ئەم ڕێنماییانە بوون.

## ١٥

# ئەحمەد ڕاسیم و وتارنووسەکانی دیکەی شارەکە

بەیانییەکی زوو لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٨٨٠ _نزیکەی ئەو کاتەی عەبدولحەمیدی دووەم لە تەمەنی سی ساڵیدا چووە سەر تەخت_ پیاوێکی بیست و پێنج ساڵەی ڕۆژنامەنووس لەسەر کورسییەکەی لە بارەگای ڕۆژنامەی *خۆشییەکان* کە لە بابیالی دەردەکرا، دانیشتبوو، لەپڕ پیاوێکی بالآبەرز کە کلاوێکی سوور و چاکەتێکی قۆڵداری شێوە سەربازی کە لە ئاوریشمی سوور دروست کرابوو، پۆشیبوو و خۆی کرد بە ژوورەکەدا. پەنجەی بۆ ڕۆژنامەنووسە لاوەکە درێژ کرد و و هاواری کرد بەسەریدا: "وەرە بۆ ئێرە!" لاوەکە بەترسەوە هەستایە سەر پێ. "کلآوەکەت لەسەر بکە! دەی بجووڵێ!"

ڕۆژنامەنووسەکە بەدوای پیاوەکەدا بەرەو ئەو گالیسکەیەی لەبەردەم دەرگای دەرەوە چاوەڕێی دەکردن، ڕۆشت و بەڕێ کەوتن. بەبێدەنگی بەسەر پردی گالەتە تێپەڕین. لە نیوەی ڕێگاکە لاوەکە پرسیی کە بۆ کوێ دەچن، پیاوەکە وەڵامی دایەوە: "بۆ بارەگای وتەبێژی سوڵتان دەڕۆین، ڕاسپێراوم یەکسەر تۆیان ڕادەست بکەم."

لەپاش ئەوەی گەیشتنە کۆشکەکە و ماوەیەك چاوەڕێیان کرد، پیاوێکی تووڕەی ڕیش ماشوبرنجی، ڕۆژنامەنووسە گەنجەکەی بەرەو لای مێزەکەی بانگ کرد و هاواری کرد بەسەریا: "وەرە بۆ ئێرە!" لەبەرگیراوەیەکی ڕۆژنامەی *خۆشییەکان* بەکراوەیی لەبەردەمیدا بوو، بەتووڕەییەوە ئاماژەی کرد بۆ ڕۆژنامەکە و لە گەنجەکەی پرسی: "ئەمە چییە، ها؟"



پیاوەکە بەتووڕەییەوە هاواری دەکرد بەسەر ڕۆژنامەنووسەکەدا، ئەویش هێشتا تێنەگەشتبوو کێشە چییە.

"خیانەتکار! سپڵە! پێویستە سەرت بخەینە ناو تۆپ هاوەنێکەوە. ئەوەندەت لێ بدەین، بتکەین بە وێنەی دیوارەکە!"

ڕۆژنامەنووسەکە، کە لە ترسا دەستەوئەژنۆ کەوتبوو، تێبینیی ئەوەی کرد تووڕەیی پیاوەکە، ڕەنگە لەسەر ئەو پارچە شیعرەی بەردەمی بێت کە لەلایەن شاعیرێکی کۆچکردوو نووسرابوو بە ناوی (ئایا بەهار هەرگیز نایەت؟ ئایا بەهار هەرگیز نایەت؟) هەوڵی ڕوونکردنەوەی دا: "گەورەم..."

"هێشتاش دەمدرێژی دەکات! برۆ لەدەرەوە بوەستە!" لەپاش ئەوەی ڕۆژنامەنووسەکە چارەکێك لە دەرەوە هەڵدەلەرزی، دیسانەوە ڕەوانەی ژوورەوە کرایەوە. هەموو جار دەویست بۆیان ڕوون بکاتەوە کە ئەو نووسەری هۆنراوەکە نییە، بەڵام قسەکەیان پێ دەبڕی و بە کۆمەڵێك جنێو سەرزەنشت دەکرا.

"بێنابڕو! سەگ! زۆڵ! بێشەرم! بەدبەخت! نەفرەتیان لێ بکەن! دەبێت ئەم جۆرە کەسانە هەڵبواسرێن!"

کوڕە گەنجەکە زانیی ڕێگەی پێ نادەن قسە بکات، هێزی دایە بەر خۆی و مۆرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و خستیە سەر مێزەکە. کاتێك وتەبێژەکەی سوڵتان سەیری ناوەکەی کرد، ئیتر بۆی دەرکەوت بەهەڵە دەستگیری کردووە.

"ناوت چییە؟"

"ئەحمەد ڕاسیم."

لەپاش چل ساڵ، لە یەکێك لە بیرەوەرییەکانیدا بەناوی (نووسەر، شاعیر، وتارنووس)، ئەحمەد ڕاسیم باسی ئەم ڕووداوەی کردووە. لەدوای ئەوەی وتەبێژەکەی

سوڵتان بۆی دەرکەوتووە کە پیاوەکەی کەسێکی هەڵەی بۆ هێناوە، ئاوازی قسەکانی گۆڕیوە."کوڕم بۆ دانانیشی؟" ئینجا پێی گوتووە: "لە من نیگەران نابی، بەو شێوەیە لێت تووڕە بووم، وانییە؟" چەکمەچەکەی بەردەمی کردۆتەوە و بۆ فریودانی ئەحمەد ڕاسیم، پێنج دانە لیرەی خستۆتە ناو دەستی. "با ئەم کارە لێرەدا کۆتایی بێت و لای کەس باسی مەکە." دواتر ڕەوانەی دەرەوە کراوە.

ڕاسیم چیرۆکەکەی بە گڕوتین و گاڵتەجاڕییەوە گێڕاوەتەوە و بە زمانی قسەکردنی ڕۆژانە ڕازاندوویەتیەوە، کە ئەمەش بۆتە مۆرکی هەموو کارەکانی.

خۆشەویستیی بۆ ژیان، زیرەکی، ئەو چێژ و خۆشییەی لە کارەکانیدا هەبوون، هەموویان هۆکار بوون کە ئەحمەد ڕاسیم ببێتە یەکێك لە نووسەرە گەورە و دیارەکانی ئەستەنبوڵ. توانیویەتی هاوسەنگی لەنێوان ماتەمینیی دوای ڕووخانی ئیمپراتۆرەکە، کە یەحیا کەمال، تانپنار و عەبدولحەق شناسی حیسار تێیدا نقوم بووبوون، لەگەڵ ئەو چالاکی و گەشبینییەی خۆی دروست بکات کە لە کارەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. هەروەك هەموو نوسەرەکانی تری شارەکە، شەیدای ئەستەنبوڵی بووە و بایەخی بە مێژووەکەی داوە و کتێبی لەبارەوە نوسیوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ویستوویەتی زۆر بەوریاییەوە باسی خەمەکەی بکات، هەرگیز خۆی پەیوەست نەکردووە بە (سەردەمی زێڕینی دۆڕاو). زیاتر وەك گەنجینەیەکی پیرۆز سەیری ڕابردووی ئەستەنبوڵ و مێژووەکەی کردووە و بە دەنگێکی ئەوەها ڕەسەن و ڕاستییەوە باسی کردووە کە توانیویەتی بەرهەمێکی نایابی شێوە ڕۆژئاوایی دروست بکات. وەکو زۆربەی ئەوانی دیکە، پێی باش بووە خۆی ببەستێتەوە بەو دەمەی کە ئێستا تێیدا دەژی: ئەستەنبوڵ شوێنێکی خۆش بووە بۆ ئەم و بۆ هەموو ئەوانەی تر کە لێرە ژیاون.

وەکو زۆربەی خوێنەرەکانی، زۆر بایەخی بە پرسیارکردن دەربارەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات نەداوە، یان بە (بەرەوپێشچوون بۆ گۆڕینی شارستانییەتەکەمان). بە تێڕوانینی ئەم نووسەرە، خۆرئاواییبوون شتێکە کە هەموو جووڵە خراپ و خۆدەرخەرەکانی دروست کردووە کە نووسەر بەگاڵتەجاڕییەوە باسی کردوون. کارە ڕووکەشییە ئەدەبییەکانی سەردەمی لاوێتی _ڕۆمان و هۆنراوەی نووسیوە، بەڵام لە هەردوو هەوڵەکەدا سەرکەوتوو نەبووە_ وایان لە نووسەر کردووە، بە گومان و

گاڵتەجارییەوە سەیری هەر کارێك بکات کە بۆ ڕووکەش و خۆدەرخستن بێت. کاتێك دەبینی گاڵتەی بەو شێوازە نوێیەی شاعیرە ئەستەنبوڵییەکان کردووە کە لە کاتی خوێندنەوەی هۆنراوەکانیان نواندنیان کردووە بۆ خوێنەرەکانیان _لاسایی پارناسیانسەکان و دیکەدێنتسەکانیان کردۆتەوە و ویستویانە خەڵك لەسەر شەقامەکان بوەستێنن و لەسەر پێ نواندنەکەیان پیشان بدەن_ کاتێك گەمەی بە هەر ڕۆشنبیرێکی شوێنکەوتووی خۆی کردووە، بە کردنەوەی هەر گفتوگۆیەك کە پەیوەندیی بە کارەکەیانەوە هەبووبێت، هەست بەو جیاوازییە دەکەیت کە لەنێوان ئەحمەد ڕاسیم و گرووپی نووسەرەکانی تر دا هەبووە، کە شێوازی ڕۆژئاواییان بەکار هێناوە و وەك ئەم نووسەرە بنکەیان، بارەگای بلاّوکراوەی بابیالی بووە.

ئەحمەد ڕاسیم وەك وتارنووسی ڕۆژنامە دەنگی خۆی دۆزییەوە، بەلاّم چاودێرانی ستەمکارانی دەوڵەت، تەنها چەند بابەتێکی نەشیاویان بۆ وتارنووسان دەستنیشان کردووە تا لەبارەیانەوە بنووسن. (نووسەر حەزی کردووە ڕوونی بکاتەوە کە چۆن سانسۆریان خستۆتە سەر وتارەکانی و جگە لە بۆشاییەکی بەتاڵ، هیچ شتێکیان بۆ نەهێشتووەتەوە تا لەبارەیەوە بدوێ). هەر بۆیەش نووسەر چارەیەکی نوێی دۆزیوەتەوە و شارەکەی کردۆتە بابەت. "ئەگەر کەسە سیاسییە بیرتەسکەکان هیچ شتێکیان بۆ نەهێشتیتەوە دەربارەی بنووسیت، ئەوا دەربارەی شارەکەت و ژیانی شارەکەت بنووسە، چونکە خەڵك هەمیشە ئارەزوو دەکەن دەربارەی شارەکەیان بخوێننەوە!" ئەمە ئامۆژگاریی وتارنووسێکی ئەستەنبوڵییە، کە سەدان ساڵ لەمەوبەر نووسراوە.

ئەحمەد ڕاسیم بۆ ماوەی پەنجا ساڵی ژیانی دەربارەی ئەو شتانە بابەتی نووسیوە، کە لە ئەستەنبوڵ گوزەراون: لە خواردنەوە هەمەچەشنەکانەوە بۆ فرۆشیارانی گەڕەکە هەژارەکان، لە میوەفرۆشانەوە بۆ جادووکەرەکان، لە جوانیی شارۆچکەکانی دەوروبەری بۆسفۆرەوە، بۆ ئاژاوەگێڕیی ناو میوانخانە و مەیخانەکان، لە هەواڵی ڕۆژانەوە بۆ هەواڵی بازرگانی، لە خۆشیی ناو باخچەکانەوە بۆ مێرگ، پارکە گشتییەکان، بازاڕەکانی ڕۆژانە، چێژی تایبەتیی هەر وەرزشێك، خۆشییەکانی شەڕە بەفر و ڕۆیشتن بە گالیسکەی بەفرین لە زستاندا، گەشەسەندنی بلاّوکراوەکان،

قسەوقسەڵۆکەکانی ناوخۆ و لیستی خواردنی چێشتخانەکان. ئارەزوویەکی زۆر هەبووە بۆ پۆلێنکردنی نەریتە باش و خراپەکانی ناو خەڵك. هەروەك چۆن ڕووەکناسێك خۆشییەکی زۆر دەبینێت لەو جیاوازییانەی لەنیوان ڕووەکە هەمەجۆرەکانی دارستان هەن، بە هەمان شێوە ئەحمەد ڕاسیم خواستێکی زۆر هەبووە دەربارەی جیاوازییەکانی خواستی خۆرئاواییبوون، کۆچەرەکان و ڕووداوە مێژووییەکان، هەموو ئەم شتانە ناچاریان کردەوە و هانیان داوە هەموو ڕۆژێك شتی نوێ لەبارەی شارەکە بنووسێت. ئامۆژگاریی نووسەرە لاوەکانی کردووە، کە دەفتەرێکی تێبینی نووسین بگرن بە دەستیانەوە و بە شارەکەدا بگەڕێن.



باشترین وتارەکانی ئەحمەد ڕاسیم کە لەنێوان ساڵی (١٨٩٥_١٩٠٣) نووسراون، لە یەك بەرگدا کۆ کراونەتەوە بە ناوی (نامەکانی شار). نووسەر هەگیز وەك پەیامنێرێکی شارەکە ئاماژەی بە خۆی نەداوە، بەڵکو زیاتر زمانێکی گاڵتەجاڕی بەکار هێناوە. لە باس و گازندەکانی دژی دەسەلآتدارانی شارەکە و چاودێریکردن و بەئاگابوون لە هەموو لێدانەکانی دڵی شارەکە، جۆرە پسپۆڕییەکی بەکار هێناوە کە لە فەرەنسا لە ساڵی ١٨٦٠ سەری هەڵداوە. لە ساڵی ١٨٦٧، نامیق کەمال کە یەکێك بووە لە دیارترین نووسەرەکانی تورکیای مۆدێرن و سەرسامی (ڤیکتۆر هۆگۆ) بووە، نەك بە هۆی دراما و هۆنراوەکانی، بەڵکو بە هۆی ئەو هەڵچوونە ڕۆمانتیکییەی کە لە کارەکانیدا هەبووە، زنجیرەیەك نامەی لە ڕۆژنامەی (تەسفیر ئەفکار) لەبارەی ژیانی ڕۆژانەی

ئەستەنبوڵییەکان لە مانگی ڕەمەزان نووسیوە. نامەکانی یاخود (وتارەکانی شار)ی نووسەر، بە شێوەی نامەیەکی ئاسایی و بە ئاوازێکی باوەڕپێکراوەوە نووسراون. بە باسکردنی ئەستەنبوڵییەکان وەك خزم، هاوڕێ، خۆشەویست، ئەم نووسەر و نامانە وێنەی شارەکەیان لە زنجیرەی چەند گوندێکەوە گۆڕیوە بۆ یەك وێنەی یەکگرتوو.

ڕۆژنامەنوسێکی تر کە بە عەلی ئەفەندی پێشبینیناس ناسرابوو، بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامەی پێشبینی بوو (ئەم ڕۆژنامەیە لەژێر چاودێری و یارمەتیی کۆشك بڵاو دەکرایەوە، دواتر بە هۆی بڵاوکردنەوەی هەندێك بابەتی نەخوازراو کە داخرا. هەر بە هۆی ناوی ڕوژنامەکەیەوە، ماوەیەك پێی دەگوترا عەلی ئەفەندی پێشبینیناس). کە باسی لە ئاڵۆزی و پەلامارەکانی ژیانی ڕۆژانەی کردووە و ئامۆژگاریی خوێنەرەکانی کردووە کە ڕووبەڕوویان ببنەوە. ئەم ڕۆژنامەنووسە، بە یەکێك لە نامەنووسە بەسەلیقەکانی ئەستەنبوڵی سەردەمی خۆی دادەنرێت.



ئەم وتارنووسانە، وەکو یەکەمین مێژوونووسانی ژیانی ڕۆژانەی ئەستەنبوڵ، ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە لە پیشاندانی ڕەنگ و بۆن و دەنگی شارەکە لە شێوەی

سەرگوزەشتەی خۆش و ڕەنگدانەوەی وێنەی جوان. تێکۆشاون بۆ بەرجەستکردنی ئاکاری ڕەفتارێکی جوان لە شەقام، پارك، باخچە، دوکان، کەشتی، پرد، گۆڕەپانەکان و ڕێگا شەمەندەفەرەکانی ئەستەنبوڵ. لەبەر ئەوەی ئەو کاتە کارێکی ناڕەوا بووە، ئەگەر ڕەخنە لە سوڵتان، دەوڵەت، پۆلیس، سەرباز، کەسە ئایینییەکان، ئەندامانی ئەنجوومەن و چاودێرە ئەدەبییەکان بگرن، تەنها یەك چارەی گونجاویان بۆ دەربڕینی ڕەخنەکانیان بۆ ماوەتەوە، ئەویش تەنها خەڵکی داماو و بێچارە و ئیشکەرانی سەر شەقامەکان، ئەوانەی ململانێیان کردووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ژیان، بوون. ئەوەی کە دەیزانین دەربارەی ئەو ئەستەنبوڵییە بێچارانە کە وەك وتارنووس و ڕۆژنامەنووسەکان زۆر ڕۆشنبیر نەبوون _لە ماوەی (١٣٠)ی ساڵی پێشوو، چییان کردووە لەسەر شەقامەکان، چییان خواردووە، چییان وتووە و ئەو دەنگەدەنگە چی بووە دروستیان کردووە_ دەبێت سوپاسی ئەم وتارنووسە داخلدڵ و ڕەخنەگر و هەندێك جار میهرەبانانە بکەین، کە ئەم خەڵکە ئاساییەیان بەکار هێناوە، هەتا بابەتەکانیان بنووسن.

چل و پێنج ساڵ پاش ئەوەی فێری خوێندنەوە بووم، هەر کات چاوم دەکەوێتە سەر وتاری ڕۆژنامەیەك کە هانم دەدات بگەڕێمەو بۆ ڕەسەنایەتیی خۆم، یاخود بۆ چەند جارە کردنەوەی هەوڵەکانم بۆ ڕۆژئاواییبوون، دەستبەجێ لەو کاتەدا قسەیەکی دایکم بیر دەکەوێتەوە کە پێی دەگوتم: "ئامازە مەکە."

١٦

# بە دەمی کراوەوە بە کۆڵانەکاندا ڕێ مەکەن

لەم بەشەدا، نموونەی هەندێك لە سەرنجڕاکێشترین وتەی ئامۆژگاری، ئاگادارکردنەوە و زنجیرەیەك ڕستەی پڕ لە ژیری و سەرزەنشتکردن دەخەمە ڕوو لە سەدان و هەزاران لاپەڕەوە وەرمگرتوون کە (١٣٠) ساڵ لەمەوبەر لەلایەن چەندین وتارنووسی بیروڕا جیاوازی ئەستەنبوڵەوە نووسراون:

گالیسکەی ئەسپ و عارەبانەکان کە لە پاسی بچووکی فەرەنسییەوە وەرگیراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕێگاوبانەکان زۆر خراپن، بە درێژای ڕێگەکەیان لە بەیازیت بۆئەدرنەکاپی، وەك سوێسکە لەم بەرد دەڕۆن بۆ ئەو بەرد (١٨٩٤).

بێزار بووین، ئەوەندە سەیری لافاوی مەیدانەکانی شار بکەین، چارەسەرکردنی کاری کێیە، با بە زووترین کات چارەسەری بکات (١٩٤٦).



سەرەتا خەرجیی کریێ و باج زیادی کرد، دواتر لە سایەی سەری کۆچبەرەکانەوە، شارەکە پڕ بوو لە فرۆشیاری گوێزان، سمیت، سەدەفی دەریایی، نەعل، دەستەسڕ، چەقۆ و چەتاڵ، خواردنی وشککراوە، کەلوپەلی مندالآن، ئاو و خواردنەوە ساردەمەنییەکان، وەك بڵێی هەر ئەمانە بەس نەبن، فرۆشیاری چکلێت، شیرینی و کەباب، لە ئێستادا هەموو کەشتییەکانی گواستنەوی ئەستەنبوڵییان داگیر کردووە (١٩٤٩).

بە مەبەستی جوانترکردنی شارەکە، پێشنیار کراوە شوفێرانی هەموو گالیسکەکان، دەبێت یەك جۆر جلوبەرگ بپۆشن. چەندە نایاب دەبوو، ئەگەر ئەم بیرۆکەیە سەری بگرتایە (١٨٩٧).

یەکێك لە کارەکانی هێزی سەربازی، دەبێت دڵنیا بێت کە ڕاوەستانی هەموو پاسە بچووکەکانی گواستنەوە لە یەك خاڵی ڕاوەستانە، بۆ ئەوەی ئاژاوەگێڕییەکانی ڕۆژانی زوو دووبارە نەبنەوە (١٩٧١).

شارەوانیی شارەکە، بڕیارێکی دروستی دەرکردووە کە نابێت دوکانی شەربەتەکان، ئەو ڕەنگ و میوانە بەکار بێنن کە پسووڵەی ڕازیبوونی شارەوانییان نییە (١٩٢٧).



کاتێك ئافرەتێکی جوان لەسەر شەقامێك دەبینی، ئەوەندە بەڕقەوە سەیری مەکە وەك ئەوەی بتەوێت بیکوژی، یان ئەوەندەش سۆزی لەڕادەبەدەری پیشان مەدە، تەنها زەردەخەنەیەکی بۆ بکە، ئینجا ڕوو بکە لاکەی تر و لەسەر ڕێگای خۆت برۆ (١٩٧٤).

سوودوەرگرتنمان لەو بیرۆکەیەی لە بابەتێکدا نووسراوە و ڕێگەی گونجاومان پیشان دەدات کە چۆن بە شارەکەدا بگەڕێین، بابەتەکەش پێشتر لە گۆڤارێکی بەناوبانگی پاریس بە ناوی (*بەرەبەیان*) بلاو کرایەوە، کە ڕێنمایی خەڵك دەکات چۆن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵ، وە پێیان دەڵێت: "بە دەمی کراوەوە، بە کۆڵانەکاندا ڕێ مەکەن." (١٩٢٤).

ئەوە ئاواتی هەموومانە کە شوفێر و سەرنشینەکان، بەتەواوەتی ڕەچاوی مەترژمێری تەکسیەکان بکەن کە لەلایەن دەوڵەتەوە دیاری کراوە، ئەوکات شارەکەمان ڕزگاری دەبێت لە چەلەحانێی چۆن و چەندی کرد و لە ڕاکردن بۆ بنکەی پۆلیس، کە بیست ساڵ لەمەوبەر شارەکەی ئیفلج کردبوو. کاتێك مەترژمێری تەکسییەکان چەسپێنرا، شوفێری تەکسییەکان دەیانگوت: "براکەم، هەر ئەوەندەمان بدەرێ کە دەتوانیت." (١٩٨٣).

کاتێك فرۆشیارانی نۆکی وشك و بنێشت، ڕێگە بە منداڵان دەدەن لەبری پارە، پارچەیەك قورقوشمیان بدەنێ، بەم کارە تەنها هانی منداڵان نادەن بۆ دزی، بەڵکو ڕێگەیان بۆ خۆش دەکەن کە هەرچی بەردی کانیاوەکانی ئەستەنبوڵ هەیە، بیدزن و بەلوعەکانیان کە بە قورقوشم داپۆشراوە، لێ بکەنەوە، هەروەها قورقوشمی سەر گومەزی گۆڕ و مزگەوتەکانیش لێ بکەنەوە (١٩٢٩).

بڵندگۆی سەر ئۆتۆمبێلی فرۆشیارانی تەماتە و پەتاتە و غازفرۆشەکان و دەنگی ناسازی ئەم فرۆشیارانە، شارەکەیان وەك جەهەنەم لێ کردووە (١٩٩٢).

پێویستە هەموو سەگە بێسەرپەرشت و ونبووەکانی سەر شەقام لا ببەین و دووریان بخەینەوە. ئەگەر ئەو کارە بەتاقەت لە کاتی پشووەکاندا بکرێت _لەباتی ئەوەی ڕۆژێك یان بە دوو ڕۆژ لا ببرێن_ ئەگەر هەموویان کۆ بکرێنەوە و بنێردرێن بۆ دوورگەی ترسناکی (هایریسزادە)، ئەگەر هەموو سەگە کۆکراوەکان پەرشوبلاو بوونەوە، پێویستە هەرچۆنمان کردبێت، شارەکە پاك بکەینەوە لەو سەگانە بۆ پاراستنی شارەکە... بەڵام هەرگیز ڕوونادات بە کۆڵانێکدا تێپەڕیت و گوێبیستی گفە گفی سەگەکان نەبی (١٩١١).

هەتا ئێستاش کۆڵبەرەکان بەناڕەوایی، توانا و بەرگەگرتنی ئەسپە بارهەڵگرەکانیان بە هەڵگرتن و گواستنەوەی باری قورس، پێیان تاقی دەکەنەوە و لەناوەڕاستی شارەکەدا لەو ئاژەڵە بێچارانە دەدەن (١٨٧٥).

چاوچنۆکی زۆرمان هەیە بۆ ئەوەی یەکەم کەس لە کەشتی یان هەر هۆیەکی تری گواستنەوە دابەزین، بە جۆرێك کە ناتوانین ئەو کەسانە بوەستێنین کە زۆر بەخێرایی لەناو کەشتیەکانی حەیدەرپادشاوە دادەبەزن، تەنانەت پێش ئەوەی کەشتیەکە بەتەواوەتی لە شوێنی لەنگەرگرتنەکەی بوەستێت، گرنگ نییە چەندە هاوار دەکەین: "ئەو گوێدرێژەی یەکەم جار دابەزی." (١٩١٠).

بۆ ئەوەی یارمەتی بدەنە هەژارەکان، ئەسپ و عەرەبانەکانیان دەچنە چەند سووچێکی نائاسایی شارەوەکەوە، یان چەند شوێنێکی کاولبوو کە هیچ مافێکی ژیانی تێدا نییە (١٩٥٦).



ئێستا هەندێك ڕۆژنامە بۆ پرفرۆشکردنی خۆیان، دەستیان کردووە بە دانانی بلیتی بەخت بۆ دەرفەتی گەشتێکی ئاسمانیی تورکیا بەخۆڕایی، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بینیمان کە لە ڕۆژی بڵاوبوونەوەی هەواڵەکەوە، چۆن خەڵکی لە دەوروبەری بارەگای ڕۆژنامەکە نۆرەیان گرتووە (١٩٢٨).

کەنداوی زێڕین، ئیدی وەك جاران نەماوە، ئێستا بووەتە حەوزێکی بچووك کە بە کارگە و کارخانەی بچووك و قەسابخانە دەورە دراوە. کیمیایی کارگەکان، زۆلکاوی کارخانەکان، هاتوچۆی کەشتییەکان و ئاوی ئاوەڕۆ پیسەکان هەموویان ئاوەکەیان پیس کردووە (١٩٦٨).

پەیامنێری شارەکەتان، کۆمەڵێك گلەیی پێ گەشتووە دەربارەی پاسەوانانی شەوانی شارەکە. پاسەوانەکان لەجیاتی ئەوەی چاودێریی بازاڕ و کۆلانەکان بکەن، کاتەکەی خۆیان بە سەرخەوشکاندن لە قاوەخانەکاندا بەسەر دەبەن. لە هەندێك لە کۆلانەکاندا، بەدەگمەن پاسەوانەکان دەبینرێن (١٨٧٩).

نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی (ڤیکتۆر هۆگۆ)، نەریتی بووە بەسواری گالیسکەکەی ڕاست و چەپی پاریس بکات، هەتا بزانێت هاولاتییانی شارەکەی خەریکی چین. دوێنێ ئێمەش هەمان کارمان کرد و گەشتین بەو ئاکامەی کە دانیشتووانی ئەستەنبوڵ زۆر بەکەمی سەرنجی ئەو کارە دەدەن کە دەیکەن. هەروەك کاتێك بە شەقامێکدا پیاسە دەکەن، خۆیان دەکێشن بە یەکدا، بلیت، کاغەزی ئایس کرێم و توێکلی گەنمەشامی فرێدەدەنە سەر زەوییەکە، لە هەموو شوێنێك چەندین پیادەڕۆ هەیە بە ڕێگادا دەڕۆن و چەندین ئۆتۆمبێل لەسەر شۆستەکانن _هەموو ئەمانە بە هۆی هەژارییەوە نین، بەڵکو بە هۆی تەمبەڵی و پشتگوێخستنەوەیە_ هەمووان بەخراپی جلیان پۆشیبوو (١٩٥٢).

هیوادارین بە وازهێنان لە نەریتی ڕەسەنی خۆمان و شێوازی ڕەفتارکردن لە شەقام و شوێنە گشتییەکان و بە لاساییکردنەوەی ئەورووپییەکان، خۆمان لە بێسەروبەری و شپرزەیی شەقامەکان ڕزگار بکەین. بەڵام ئەگەر پرسیار بکەین، چەندە خەڵك شارەزای ڕەفتاری باشی ڕێگاوبانن_ بێگومان ئەمەشیان بابەتێکی جیاوازە (١٩٤٩).



وەکو زۆربەی کاتژمێرەکانی تر کە بۆشاییە گشتییەکانی شارەکەیان ڕازاندۆتەوە، دوو کاتژمێرە گەورەکەی هەردوو لاکەی کاراکۆی کاتەکەیان ڕاست نییە، وەك ئەوەی بڵێیت ئەو کەشتییەی لە شوێنی لەنگەرگرتنی خۆی بەستراوەتەوە، دەمێکە ڕۆیشتووە، یان پێمان بڵێت، ئەو کەشتییەی دەمێکە ڕۆشتووە و ئێرەی بەجێهێشتووە، لە شوێنی لەنگەرگرتنەکەی بەستراوەتەوە (١٩٢٩).

وەرزی باران بارین هات، چەترەکانی شارەکە هەڵکران، خودا یارمەتیمان بدات. ناچارن چەترەکان هەڵبکەن، بەلام پێم بڵێن چەند کەس لە ئێوە دەتوانێت چەترێك هەڵبکات، بەبێ ئەوەی نەیکات بە چاوی کەسێکی تردا و خۆی نەخشێنێت بە چەتری کەسێکی تردا، وەکو ئۆتۆمبێلەکانی ناو پارکی لونا، یان وەك کەسێکی کەلەپووت بەسەر شۆستەکاندا بڕۆین، تەنها لەبەر ئەوەی چەترەکەمان ناهێڵێت باش ببینین (١٩٥٣).



چەند شەرمەزارییە، سینەما وڕووژێنەرەکان و پاس و جەنجاڵی و دووکەڵی ناخۆش، ڕۆشتن بۆ بیۆگلۆیان گران کردووە (١٩٨١).

کاتێك پەتایەك لە هەر بەشێکی شارەکە بڵاو دەبێتەوە، دەوڵەت لێرە و لەوێ دەست دەکات بە بڵاوکردنەوی دەرمان، بەلام خڕبوونەوەی چڵك و پیسی لە هەموو لایەك دەبینرێت (١٩٨١).

شارەوانیی شارەکە دەبوو لەپاڵ قەدەغەکردنی سەگ و گوێدرێژەکان، هەوڵێکی توندی بدایە بۆ لابردنی سواڵکەر و سەرگەردانانی سەر شەقامەکان. نەك هەر ئەم کارە

ئەنجام نەدرا، بەڵکو ئەم جۆرە کەسانە شانازییان دەکرد کە وەك دەستەیەکیان لێ هاتووە (١٩١٤).

دوێنێ بەفر باری. ئایا خەڵك بە شێوەیەکی ڕێکوپێك وەستابوون تا سواری شەمەندەفەرەکان بن، یان هیچ ڕێزێکیان بۆ کەسانی بەتەمەنتر لە خۆیان پیشان دەدا؟ بەداخەوە، تێبینیی ئەوەمان کرد کە چەندە بەخێرایی خەڵکی شارەکە، یاسا و ڕێساکانی ڕێزی کۆمەڵگا لەبیر دەکەن (١٩٢٧).



پاش ئەوەی دیتم کە پارەیەکی زۆر لە گەمە ئاگرینە بێسوود و سەرشێتییەکاندا خەرج دەکرێت، کە هەموو شەوێکی هاوین لە سووچێکی ئەستەنبوڵ چاومان دەکەوێت بەم کارە، پرسیارم لە خۆم دەکرد، ئایا خەڵك بەو جۆرە شتانە ئاهەنگ بگێڕن دڵخۆشتر دەبن _بیهێنە بەرچاوی خۆت کە تۆ ئێستا لە شارێکی دە ملیۆن کەسیدا دەژیت _ئەگەر ئەو پارەیە بۆ خوێندنی منداڵە هەژارەکان خەرج بکرێت، زیاتر مایەی دڵخۆشییە. ئایا ڕاست دەڵێم، یان نا؟ (١٩٩٧).

بەتایبەت لە ساڵانی پێشوودا، لە ناوەندە خۆشەکانی ئەستەنبوڵ، بینا مۆدێرنە بەناو فرانکیشەکان _هونەرمەندە فرانکیشەکان زۆر ڕقیان لێیان دەبوویەوە_ وەك ئەوەی مۆرانە تێی دابن کۆن بووبوون. لەو ساڵانەدا شوێنەکانی وەکو یوکسەککاڵدیریم و

بیۆگڵۆ هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشیان نەبوو، جگە لەو تەلارە ناشیرینانە. نابێت تەنها کۆنیی ئەم بینایان بخەینە سەر ئەوەی کە ئێمە هەژار بووین و بەدەست شەڕەوە ناڵاندوومانە، بەڵکو بە هۆی بایەخپێدانی ناتەندروستی خۆمانەوە بووە بۆ ئاوەدانکردنەوەی شارەکە (١٩٢٢).



١٧

# چێژی نیگارکێشان

ماوەیەکی کەم لەپاش ئەوەی چوومە قوتابخانە، گەڕام بەدوای چێژ و خۆشیی نیگارکێشانم دۆزییەوە. لەوانەیە وشەی *دۆزینەوە* بۆ ئەم ڕستەیە هەڵە بێت، چونکە نیگارکێشان، شتێك بوو وەك ئەوەی شتێکی نوێ و جیهانێکی نوێ چاوەڕێی منی کردبێت تا بیدۆزمەوە. ئەگەر پێشتر ئارەزوویەکی نهێنی یان بەهرەی وێنەکێشان لە مندا خۆی حەشار دابێت، ئاگاداری نەبووم هەتا ئەو کاتەی چوومە قوتابخانە، دەرکەوتنی بەهرەکەم لە ساڵانی دواییدا ڕووی دا.

. هەبوونی بەهرەی نیگارکێشان، خاڵە گرنگەکە نەبوو، بەڵکو لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو، بە نیگارکێشان شادومان دەبووم.

چەند ساڵ دواتر، ئێوارەیەکیان پرسیارم لە باوکم کرد کە چۆن دەزانن من بەهرەیەکی هونەریم تێدایە، باوکم وەڵامی دامەوە: "جارێکیان تۆ وێنەی درەختێکت کێشا، لەسەر لقی درەختەکە قەلەڕەشێکت دانا، من و دایکت سەیرێکی یەکمان کرد، چونکە بە جۆرێك داتنابوو، وەك ئەوەی ڕاستەقینە بێت."

ئەمە بەڕاستی وەڵامی پرسیارەکەی من نەبوو، یان لەوانەیە باوکم بەڕاستی وەڵامی نەدابێتمەوە، بەڵام ئەم چیرۆکە زۆر دڵخۆشی دەکردم، لە هەمووی زیاتر وێنەی قەلەڕەشەکە کە بەدەگمەن لە کاری کوڕێکی حەوت ساڵان دەچوو. ئاشکرایە باوکم هەمیشە گەشبین بوو بە هەر شتێك کە کوڕەکانی ئەنجامیان دەدا و لە ناخی دڵیەوە

باوەڕی دەکرد کە ئەوە بەهرەیەکی لەڕادەبەدەر و دەگمەنە. بۆچوونەکەی باوکم هەمیشە هانی دەدام کە وەك هونەرمەندێکی دەگمەن بیر لە خۆم بکەمەوە.

ئەو شیرینیی خۆشییەی لە کاتی وێنەکێشاندا هەستم پێ دەکرد، وای لێ دەکردم خەیاڵ بکەم کە من ئامێرێك دروست دەکەم وا لە خەڵك دەکات خۆشیان بوێم و ماچم بکەن. لەبەر ئەوە هەر کات بێزار بوومایە، دەستم دەکرد بە وێنەکێشان. خێزانەکەم بەردەوام کاغەز و قەڵەم و قەڵەمی ڕەنگیان بۆ دەکڕیم، منیش بەردەوام وێنەم دەکێشا. پاش ئەوەی نیگارەکەم تەواو دەکرد، یەکەم کەس پیشانی باوکمم دەدا. باوکم هەمیشە بە جۆرێك کاردانەوەوەی هەبوو بۆ وێنەکەم: سەرەتا بە سەرسامی و پەسەندکردنەوە تەماشای دەکرد کە هەرگیز بێهیوای نەدەکردم، دواتر دەستی دەکرد بە لێکدانەوە بۆ وێنەکە: "سەیر بکە چەندە بەجوانی شێوەی ڕاوەستانی ئەم پیاوە ماسیگرەی کێشاوە، وا دیارە لە دۆخێکی خراپدایە، چونکە دەریاکە ڕەشە. ئەم کەسەی تەنیشتی دەبێت کوڕەکەی بێت. باڵندەکان و ماسییەکان وا دەرکەوتوون کە ئەوانیش چاوەڕوانن. چەندە ژیری تۆ!"

خێرا ڕامدەکردەوە ژوورەکەم و کێشانی نیگارێکی دیکە دەهاتە کایەوە. ئەو کوڕەی لەپاڵ ماسیگرەکەوە وەستابوو، وەك هاوڕێی ماسیگرەکە وێنەم کێشابوو، دواتر لەپاش هەڵسەنگاندنی نیگارەکە، ئەم جارە کەمێك بچووکتر وێنەیم دەکێشا. دواتر وێنەکەم پیشانی دایکم دەدا و دەمگوت: "دایکە، سەیر بکە چیم کێشاوە، پیاوێکی ماسیگر و و کوڕەکەی."

"زۆر جوانە ئازیزم، بەڵام کەی وانەکانت دەخوێنی؟"

ڕۆژێکیان لە قوتابخانە وێنەیەکم کێشا، هەموو قوتابییەکان هەتا بیبینن، دەورەیان دام، تەنانەت مامۆستا تووڕەکەمان لەسەر دیواری پۆلەکە هەڵیواسی. هەستم دەکرد وەك جادووکەرێك بم، لەناو قوڵی جلەکانم کەروێشك و کۆتر دەربێنم. لەو کاتەدا هەموو ئەوەی پێویست بوو بیکەم، بەردەوامبوون بوو لەسەر وێنەکێشان و پیشاندانی بە کەسانی تر و بەدەستهێنانی وەسف و پیاهەڵدانەکانیان.

بۆ گەشتن بە بەهرەکەم، ئیتر خۆم بە شارەزایەکی تەواو دادەنا. زۆر بەسەرنجەوە دەمڕوانیە هێڵە سادەکانی نیگاری ناو کتێبەکانی قوتابخانە، پەرتووکە کارتۆنییەکان و

کارتۆنی ڕۆژنامەکان، بەوردی سەیرم دەکردن هەتا بزانم وێنەی خانوو و دار و پیاوە وەستاوەکانیان چۆن کێشاوە. دیمەنی ناو وێنەکانم لە دیمەنی ڕاستەقینەوە وەرنەگرتبوو، بەڵکو لەسەر وێنەیەك دەمکێشا کە پێشتر بینیبووم، لە هزرمدا هێشتبوومەوە و بە شێوەیەکی ئاسانتر دروستم دەکرد. بەڵام وێنە گێڕاوەکان و ئەو نیگارانەی بە ڕەنگی ڕۆنی دروست کرابوون، زۆر ئاڵۆز بوون بەلامەوە و گرنگیم پێ نەدەدان. زۆر حەزم لە کتێبە ڕەنگاوڕەنگەکان بوو. هەموو جار کە لەگەڵ دایکم دەچووین بە دوکانی عەلادین، یەکێك لەو کتێبانەم دەکڕی، دواتر سەیری وێنەکانیم دەکرد و لە هزرم هەڵم دەدا دەمهێشتەوە، هەتا ئەو کاتەی دەمکێشا. هەر کاتێك وێنەی خانوویەك، درەختێك یان شەقامێکم دەکێشا، وێنەکە لە بیرەوەریمدا هەر دەمایەوە.

سەرەتا وێنەی درەختێکم دەکێشا، ئینجا بەخێرایی لق و گەڵاکانیم دروست دەکرد. دواتر وێنەی چەند شاخێکم دەکێشا و لەپشت ئەوانیشەوە یەك یان دوو دانە شاخی گەورەترم دروست دەکرد. دواتر _بیرۆکەکەم لەو وێنە ژاپۆنییانەوە وەرگرتبوو کە پێشتر بینیبوونم_ شاخێکی بەرزتر و گەورەترم لەپشت یەکەم شاخەکانەوە دەکێشا. دەستەکانم بەخۆیان کاریان دەکرد و مێشکی خۆیان هەبوو. باڵندەکانم دروست دەکرد، هەروەك ئەوانەی لە وێنەی پێشتر بینیبوونم. لە کۆتایی وێنەکەدا، دەگەیشتمە ئەو بەشەی کە باشترین بوو بەلامەوە، ئەویش کێشانی کڵاوێکی بەفرین بوو لەسەر لوتکەی شاخەکان.

بەشانازییەوە دەمڕوانییە وێنەکەم، لە ڕاستەوە بۆ چەپ سەیرم دەکرد. لەپێش ئەوەی دایبنێم، لەنزیکەوە چاوم دەبڕییە هەندێك وردەکاری. بەڵێ ئەوەتا، من توانیم ئەم وێنە جوانە دروست بکەم. نەخێر، باشترین نییە، بەڵام هێشتاش توانیم دروستی بکەم و زۆریش جوانە. کێشانی وێنەکان چێژێکی زۆری هەبوو، ئیتر کاتی ئەوە بوو دایبنێم و وا خۆم دەربخەم کەسێکی ترم.

بەڵام هەندێك جار کە بە چاوی کەسێکی ترەوە سەیری وێنەکەم دەکرد، هەندێك کەموکووڕیم تێدا دەدۆزیەوە. یان زۆر جار لە کاتی وێنەکێشانەکە، خواستی بەردەوامبوونم هەبوو لەسەر کارەکە، لەبەر ئەوە دەستم دەکرد بە کێشانی هەوری زیاتر، کەمێك باڵندە و گەڵای زیاتر.

ساڵانی دواتر، هەندێك جار وا بیرم دەكردەوە بەم زیادكردن و دەستكاریكردنە، نیگارەكەم شێواندووە. بەڵام هەر بەردەوام بووم لەم كارە، چونكە دەستكاریكرنی وێنەكان، دەیانگەڕاندمەوە بۆ هەمان چێژ و خۆشی كە لە سەرەتای كێشانی هەمبوو.

چی جۆرە خۆشیەكم دەبینی لە وێنەكێشان؟ لێرە، یادنامەنووسە پەنجا ساڵەكەتان، پێویستە جیاوازییەك بكات لەنێوان ئێستای خۆی و ئەو منداڵە كە هەر خۆی بووە:

١. بەمنداڵی بە نیگاركێشان دڵخۆش دەبووم، چونكە ئەوكات وێنەیەكی كاریگەر و سەرسامكەرم دروست دەكرد، كە هەموو ئەوانەی لەدەورم بوون بەباشی هەڵیاندەسەنگاند. هەموو پیاهەڵدانەكان دەبوونە هۆكاری كێشانی وێنەیەكی دیكە و بەشێك لە خۆشییەكانی وێنەكێشانم.

٢. لەپاش ماوەیەك، دەستیشم وەك چاوەكانم بەتەواوی شارەزای نیگاركێشان بوون. كاتێك وێنەی درەختێكم دەكێشا، دەستەكانم خۆیان دەجووڵان بەبێ ئەوەی ئاگایان لە هزر و ئاوەزم بێت. كاتێك سەیری قەڵەمەكەم دەكرد، بەسەر كاغەزەكەوە دەهات و دەچوو، سەرسام دەبووم، چونكە وەك ئەوە بوو كەسێكی تر بێت لە جەستەی مندا وێنە دەكێشیت. كاتێك سەرنجم دەدا، هیوام دەخواست ببمە هاوشانی. بەشێكی تری مێشكم سەرقاڵ دەبوو بە سەیركردنی لاربونەوەی لقەكان، شوێنی شاخەكان و هەموو وێنەكە، بیركردنەوە لەوەی كە من هەموو ئەم دیمەنانەم لەسەر پارچە كاغەزێكی بەتاڵ دروست كردووە، سەیركردن، تێبینی و توانای شیكردنەوەی كارەكەم جۆرە خۆشیەك بوو كە ئەم شێوەكارە بچووكە هەستی پێ دەكرد. بۆ ئەوەی لە خۆم بڕۆمە دەرەوە و ئەو كەسە بناسم كە لە مندا نیشتەجێ بووبوو، دەبوو سەیری ئەو هێڵانە بكەم كە بە هۆی خشاندنی قەڵەمەكەم بە لاپەڕەكەدا دەركەوتبوون، وەك كوڕێك وا بووم كە بە گالیسكەی بەفرین بەناو بەفردا دەڕوات.

٣. جیابوونەوەی دەستم لە مێشكم، ئەو هەستەی كە دەستم سەربەخۆ كار دەكات، شتێكی هاوبەشی هەبوو لەگەڵ ئەو هەستەی كە بە هەڵهاتن بۆ دنیای خەیاڵەكانم پێی دەگەشتم. بەڵام _بە پێچەوانەی خەونە ئەفسانەییەكانی ناو

خەیاڵەکانم_ هیچ هەوڵێکم نەدەدا بۆ ئەوەی وێنەکانم بشارمەوە، بەڵکو هەموویانم پیشانی هەموو کەس دەدا و چاوەڕێی دەستخۆشیم دەکرد، ئەوەش خۆشییەکی زۆری پێ دەدام. نیگارکێشان دونیایەکی تر بوو کە پیشاندان و نەشاردنەوەی هیچ مایەی شەرمەزاری نەبوو.

٤. گرنگ نەبوو ئەو خانوو، درەخت، هەور و شتەکانی تر کە وێنەم دەکێشان، چەندە خەیاڵین، چونکە هەموویان لە ژیانی ڕاستەقینە بوونیان هەبوو. ئەو خانووەی وێنەم دەکێشا، وا هەستم دەکرد خانووەکەی خۆمانە و خاوەنی هەموو ئەو شتانەی تر بووم کە وێنەم دەکێشان. کێشانی وێنەی هەموو ئەو شتانە کە بوونیان هەبوو، بە جۆرێك کە بتوانم پیشانی هەموو کەسێکی بدەم، هۆکارێکی تر بوو بۆ هەڵهاتن لە بێزاری و بێتاقەتیی ئەو کاتەی کە تێیدا دەژیت.

٥. ئارەزووم لە بۆنکردن و سەیرکردنی کاغەز، قەڵەم، کتێبی سکێچەکان، نیگارەکان و هەموو کەلوپەلەکانی تری وێنەکێشانەکەم بوو. ئارەزووم دەکرد بەخۆشەویستییەوە کاغەزە بەتاڵەکە بگرمە دەستم و دەست بکەم بە وێنەکێشان.

٦. بە زانینی هەموو ئەو خۆشییانەی وێنەکێشان و بە یارمەتیی هەموو ئەو دەستخۆشییانەی بەدەستم دەهێنان، دەمتوانی وەك کەسێکی جیاواز، تەنانەت تایبەت باوەڕ بە خۆم بکەم. حەزم لە خۆهەڵکێشان نەبوو، بەڵام دەمویست بەهرەکەم دەرخەم. ئەو دونیایەی کە لە ڕێگای وێنەکێشانەوە دروستم کردبوو، وەك دنیا خەیاڵییەکەی ترم کە لە مێشکمدا شاردبوومەوە، مەودای ژیانی فراوان کردبووم. هەلی هەڵهاتنی لە جیهانی سێبەراوی و تۆزاویی ڕۆژانەمان بۆ دەڕەخساندم. خێزانەکەم نەك تەنها ئەم خووە نوێیەیان بەدڵ بوو، بەڵکو خۆشحاڵ بوون کە خوویەکی ڕاستم هەڵبژاردووە.

## ١٨

# کۆکراوەی ڕاستی و زانیارییەکانی ڕەشات ئەکرەم کۆچو: (ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ)

لە ژووری دانیشتنەکەی داپیرەم، دۆلابێکی کتێب هەبوو کە لەپشتەوەی قوفڵ درابوو و زۆر بەدەگمەن دەرگا شووشەییەکانی دەکرانەوە. لەپاڵ *ئەنسکلۆپیدیای* ژیان، ڕیزێك ڕۆمانی کچە زەردەکان و کتێبی پزیشکی مامەکەی ئەمەریکام، کە هەموویان تۆزێکی زۆریان لەسەر بوو، کتێبێك هەبوو کە ئەوەندەی ڕۆژنامەیەك پان و درێژ بوو. لەدوای ئەوەی فێری خوێندنەوە، بووم زانیم کتێبەکە بە ناوی (*لە غازی عوسمانەوە هەتا تورك*): *پانۆرامای شەش سەدساڵی مێژووی عوسمانییەکان* بوو، هەڵبژاردنی بابەتەکەم زۆر لا پەسەند بوو. لەو ڕۆژانەی کە لە هەمان نهۆم بووم، یان بە هۆی ئەوەی نەخۆش بووم، نەدەچوومەوە بۆ قوتابخانە، یاخود بەبێ هیچ هۆکارێك نەدەچوومەوە، دەڕۆیشتم بۆ باڵەخانەکەی داپیرەم، لەبەردەم مێزی خوێندنەوەی مامم دادەنیشتم و ئەم کتێبەم دەخوێندەوە. چەندین جار دێڕەکانیم خوێندبوویەوە. لە ساڵانی دواتر کاتێك لە باڵەخانەیەکی بەکرێگیراو بووین، هەر کات سەردانی داپیرەم بکردایە، کتێبەکەم دەردەهێنا و دەستم دەکرد بە خوێندنەوەی.

لە کتێبەکانی قوتابخانە بەتایبەت حەزم لە سەیرکردنی ئەو وێنە ڕەشوسپییانە بوون کە باسی مێژووی عوسمانییەکانیان دەکرد: ئەم مێژووە، زنجیرەیەك شەڕ، سەرکەوتن و بابەتێکی دیاریکراو بوو و چیرۆکەکانی بە ئاوازێکی نەتەوایەتی و پڕ لە شانازییەوە باس کرابوون، بەڵام لە کتێبی لە (***غازی عوسمانەوە بۆ ئەتاتورك***)،

زنجیرەیەك ڕووداوی سەیر و نائاسایی هەبوون: گەلەریی کۆمەڵێك وێنەی سامناك و مێژووی تێدا بوو، کە توشی دڵەخورپە و ترسیان دەکردی. لەم ڕووەوە، کتێبەکە وەکو یەکێك لە کتێبی بۆنەکانی عوسمانییەکان وایە. لە بۆنەی عوسمانییەکان، دەستەیەك خەڵك بەڕێزەوە دەهاتنە بەردەمی سوڵتان و کۆمەڵێك چالاکی سەیری یەك لەدوای یەکیان نمایش دەکرد. کاتێك سەیری وێنەکان دەکەیت، وەك ئەوەیە بچیتە ناو وێنەکانەوە و لەتەنیشت سوڵتانەوە دانیشی و لە یەکێك لە پەنجەرەی ئەو کۆشکانەی کە ئێستا ناسراوە بە کۆشکی ئیبراهیم پادشا، سەیری گۆڕەپانی سوڵتان ئەحمەد بکەیت، سەیری هەموو سامان، ڕەنگ، دیمەنی ئیمپراتۆرەکە و بازرگانە جیاوازەکان بکەیت کە هەریەکەیان ئەو جلەی پۆشیوە کە خۆی بازرگانیی پێوە دەکرد. حەز دەکەین بە خۆمان بڵێین، لەدوای دروستبوونی دەوڵەتی کۆماری و بوونی تورکیا بە نەتەوەیەکی ڕۆژئاوایی، ڕەگی دەوڵەتی عوسمانیمان دەرهێنا و بووین بە خەڵکێکی بیرتیژ و زانستی. کاتێك لەبەردەم پەنجەرەیەکەوە دانیشتووین و بەبەزەییەوە سەیری باوباپیرانی نامۆ و بێگانەی عوسمانی دەکەین، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی لەدوایانەوە جێ ماوە، ئەوکات هەست بە دڵخۆشی دەکەین.



لە کتێبەکەدا گەیشتمە ئەو شوێنەی باسی تەنافبازەکان دەکات کە لە کاتی ئاهەنگی سونەتکردنی کوڕەکەی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم، شازادە موستەفا، لەسەر

پەتێکی توند و قایم کە لەنێوان دوو کەشتیدا بەستراون، بە کەنداوی زێریندا تێپەڕیون، هاوکات تەماشای وێنەی ڕەشوسپی ئەو نمایشە مەردایەتییەم دەکرد. باوباپیرانمان بیریان کردۆتەوە کە ناشتن و لە گۆڕنانی کەسە بکوژەکان لە هەمان گۆڕستانی خەڵکی ئاسایی، کارێکی نابەجێ و قبوڵنەکراوە، لەبەر ئەوە لە کاریاگدی بایر لە ئەیوب، گۆڕستانێکیان بۆ کەسە بکوژەکان دروست کردووە. هەر لە کتێبەکەدا باس کراوە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیی دووەم، لە ساڵی١٦٢١، زستانێکی زۆر سارد بووە بە جۆرێك بەشێك لە بۆسفۆر و هەموو کەنداوی زێڕین بەستوویەتی. وێنەکان پیشانمانی دەدەن کە چۆن کەشتی و بەلەمەکان وەك گالیسکەی بەفرینیان لێ هاتووە و لەناو سەهۆڵ گیراون. بە تێڕوانینی من، نیگارەکانی ناو کتێبەکە، ڕەنگدانەوەی توانای خەیاڵی هونەرمەندەکە بوون زیاتر لەوەی ڕووداوێکی مێژووی ڕاستەقینە بن، بەڵام هەرگیز لە سەیرکردنی ئەم وێنانە ماندوو نەدەبووم. لە نیگارەکاندا، دوو کەسی شێتی سەردەمی سوڵتان عەبدول حەمیدی دووەم نەخشێنرابوو: یەکەمیان، پیاوێك بووە کە نەریتی وا بووە بەڕووتی لە کۆڵانەکاندا بگەڕێت، هەرچەندە وێنەکێش بە جۆرێك وێنەکەی کێشاوە کە لە شەرمان خۆی داپۆشیوە. دووەمیان، ئافرەتێك بووە بە ناوی خاتوو ئیپۆلا کە هەرچییەکی دۆزیبێتەوە، لەبەری کردووە. بەپێی گێڕانەوەکانی نووسەر، هەر کاتێك ئەم دوو کەسایەتییە شێتە چاویان بەیەك کەوتووە، زۆر بەخراپی بەرەنگاری یەك بوونەتەوە، لەبەر ئەوە لێیان قەدەغە کراوە کە بە پردەکەدا تێبپەڕن (لەو ڕۆژانەدا لە بۆسفۆر هیچ پردێك نەبووە، تەنها لەسەر کەنداوی زێڕین پردی گالەتا هەبووە کە لە ساڵی ١٨٤٥، لەنێوان کەرەکۆی و ئەمینۆن دروست کراوە و لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەیەم سێ جار نۆژەن کراوەتەوە، بەڵام پردە کۆنەکە سەرەتا لە تەختە دروست کراوە و ناو نراوە پردی *گالەتا*). دواتر چاوم کەوتە سەر نیگاری پیاوێك کە سەبەتەیەکی بە کۆڵەوە بوو و بە گوریسك بەسترابوویەوە بە دارێکەوە، دوای ئەوەی بەسەرهاتەکەم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت کە سەدان ساڵ لەمەوبەر نان فرۆشێکی گەڕۆك، ئەسپەکەی بە کەلوپەلەکەیەوە بەستۆتەوە بە دارێکەوە و ڕۆیشتووە لە قاوەخانەیەك یاریی وەرەقی کردووە، کارگێڕێکی شارەکە کە ناوی حوسەین بەگ

بووه بە ڕووداوەکەی زانیوە و نان فرۆشەکەی بەستووە بە دارێکەوە، بۆ ئەوەی سزای بدات بەرامبەر ئازاردانی ئاژەڵێکی بێدەسەڵات.

دەبێت ئەم چیرۆکانە تا چەند ڕاستەقینە بن کە هەندێکیان لە (ڕۆژنامە کاتییەکانەوە) وەرگیراون؟ بۆ نموونە" لە سەدەی پانزدەیەم بۆ کۆتایهێنان بە شۆڕشی یاخیبووەکانK سەری قەرە موحەمەد پادشایان پەڕاندووە، یاخود دەبێت ئەوەش ڕاست بێت کە سەری لێکراوەی پادشا یاخیبووەکانی قایل کردووە، کۆتایی بهێنن بە توڕەییەکەیان، یاخود دەبێت ئەوانەی لە دۆخەکەدا بوون بەرامبەر بە سووکایەتیکردن بە سەری پادشا، تووڕەییان بۆ وەزیر دەربڕیوە. بەڵام ئایا هەر بەڕاستی یاخیبووەکان ئەوەیان کردووە کە لە وێنەکەدا دیارە، ئایا بەڕاستی یاریی دوو گۆڵییان بە سەری پادشا کردووە؟ ناتوانم لەسەر ئەم پرسە بمێنمەوە، لەبەر ئەوە با بڕۆین بۆ لای ئیستەر کیرا، کە لە سەدەی شانزدەیەم باج ئەستێن بووە و دەگوترێت کە بەرتیل وەرگری سوڵتانە سافیە بووە کە لە یەکێك لە شۆڕشی یاخیبووەکاندا کوژراوە و پارچەپارچە کراوە و هەندێك لە پارچەکانی جەستەی، کوتراوە بە دەرگایماڵی ئەو کەسانەی کە بەرتیلیان پێ داوە. بە کەمێك ترسەوە سەیری وێنەی دەستێکیم دەکرد، کە لکێنرابوو بە دەرگایەکەوە.

کۆچو _کە پێشتر وەك یەکێك لە چوار نووسەرە خەمبارەکە باسم کردبوو_ گرنگیی زۆری داوە بە ڕوونکردنەوەی یەکێکی تر لەی بابەتە ترسناك و نامۆیانەی کە تەنانەت هەستی ڕێبوارە ڕۆژئاواییەکانیشی جووڵاندووە: ئەویش شێوازەکانی سزادانی پیاوخراپ، بکوژ و ستەمکارەکان بووە. یەکێك لە سزایانە، ناسراو بووە بە سزای قولاپ. تاوانبارەکە، هەروەك ئەو کاتەی لە دامێنی دایکیەوە دەکەوێتە خوارەوە هیچی لەبەردا نەبووە، ئینجا بە دوو قولاپی تیژ، کون کراوەتە گۆشتی جەستەیەوە، بە دوو خلۆکەی بەرزکەرەوە کە بەستراون بە پەتێکەوە بەرز کراوەتەوە، دواتر پەتەکە شل کراوە و تاوانبارەکە جێ هێڵراوە هەتا بکەوێتە خوارەوە.

ئەنکشاریەك (سەربازی عوسمانی) هەبووە کە کەوتووەتە داوی خۆشەویستیی هاوسەری ئیمامێکەوە، دواتر ئافرەتەکەی ڕفاندووە و قژی کورت کردۆتەوە وەك کوڕ لە

شارەکەدا سووڕاوەتەوە، لەپاش ئەوەی ئاشکرا بووە، هەردوو دەستی و هەردوو قاچی پیاوەکەیان شکاندووە و خستوویانەتە ناو لوولەی تۆپەوە و هەڵیانداوە بۆ ئاسمان.

"شێوازی سزادانەکان، سەرچاوەی ترس و تۆقین بوون!" کۆچو ئەم ڕستەیەی کردۆتە سەردێڕی باسی سزادانە دڵتەزێنەکان کە چەندین سزای وەك سەرزەنشتکردن، ڕووتکردنەوە، ڕووخسار شێواندن و لە خاچدان گرتووەتەوە، یان چەند مۆمێکیان بەداگیرساوی لەسەر شان و سمتیان داناوە هەتا بکوژێنەوە. تاوانبارەکان بە شارەکەدا سووڕێنراونەتەوە، هەتا ببنە وانەیەك بۆ ئەوانی تریش. پێم وایە سزای ڕووتکردنەوە، بەبێ ئازاردانی جنسی نەبووە. لەو دەمەدا، مێژووی ئەستەنبوڵ وەك گەلەریی مردن، ئازاردان و ترس کە بە وێنەی سێبەراویی ڕەشوسپی ڕوون کراوەتەوە، دێتە بەرچاوم.

لە سەرەتادا، ڕەشات ئەکرەم کۆچو نەخشەی نووسینی ئەم کتێبەی دانەناوە. لە ساڵی ١٩٥٤ لە پاشکۆی مێژوویی چوار لاپەڕەیی ڕۆژنامەی (جمهوریەت) بە ناوی (ڕاستییە سەیر و نائاساییەکانی مێژووەکەمان) نووسیوە، دواتر هەموویان لە کۆکراوەیەکدا بەستراون بە یەکەوە. لەپاڵ گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە سەیر و نامۆیانە، ڕووداوە مێژوویی و ڕوونکردنەوەکان، کۆچو چیرۆکی نامۆ و تراژیدیای ژیانی تایبەتی خۆی هەبووە. کارە خۆشەویستەکەی (ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ) بووە، کە لە ساڵی ١٩٤٤ دەستی کردووە بە نووسینی، دە ساڵ پێش ئەوەی لە ڕۆژنامە بابەت بنوسێت، بەڵام هەژاری ناچاری کردووە لە ساڵی ١٩٥١ لە لاپەڕە ١٠٠ی بەرگی چوارەیەم دەستی لێ هەڵبگرێت، لە کاتێکدا هێشتا لە پیتی (ب) بووە.

حەوت ساڵ دواتر، کۆچو دەستی کردووە بە نووسینی دووەم (ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ)، بەشانازییەوە وتوویەتی "دەبێتە باشترین ئەنسکلۆپیدیای جیهان، کە دەربارەی شارێك نووسراوە" سەرلەنوێ لە پیتی **ئەلف** دەستی بە نووسین کردووەتەوە. ئەوکات تەمەنی پەنجا و دوو ساڵ بووە، ئەم جارە ترساوە بە هۆی تەمەنییەوە، کارەکەی بەتەواونەکراوی جێ بهێڵێت، لەبەر ئەوە پێی باش بووە ئەم جارە کارەکەی دابەش بکات بۆ پانزدە بەرگ. ئەمجارە زیاتر متمانەی بە خۆی هەبووە و هیچ هۆکارێك نەبووە ڕێگری لە نووسینی بیروڕاکانی بکات. لە ساڵی ١٩٥٨ یەکەم بەرگی بڵاو کرایەوە، لە ساڵی ١٩٧٣ گەیشتە بەشی یازدەیەم _بەڵام هێشتا لە پیتی ج




بوو_ دواتر ناچار بووە وەك ئەوەی لێی دەترسا، دەست لە ئەركەكەی هەڵبگرێت. بابەتە سەیر و هەمەجۆرەكانی سەدەی بیستەیەمی ئەنسكلۆپیدیای دووەم، ڕێبەرییەكی بێهاوتان بۆ ناسینی ناخی شارەكە و هەڵچنراوی پەخشانەكان، هەڵچنراوی خودی شارەكەن.

كۆچو یەكێكە لەو ڕۆحە نقومبووانەی ناو *موزن*، كە وێنەی ئەستەنبوڵی سەدەی بیستەیەمی وەك شارێكی نیوەتەواوكراو و كارەساتباری بە خەم و ناخۆشی پیشان داوە. *موزن* لە ژیانیدا ڕەنگی داوەتەوە و لۆجیكێكی شاراوەی داوە بە كارەكانی. كۆچو _هەروەك نووسەرەكانی تر كە بە هەمان ڕێڕەودا كاریان كردووە_ *موزنی* بە بنچینەی كارەكانی داناوە و هۆكاری خەمەكەی، دوور لە مێژووی شارەكەی و خێزانەكەی، وەك شتێكی زگماك سەیر كردووە_نووسەر خەمبارییەكەی لە ئەستەنبوڵ بۆ نەماوەتەوە، بەڵكو ئەستەنبوڵ سەبووری و خەمڕەوێنی بووە.

ڕەشات ئەكرەم كۆچو، لە ساڵی ١٩٠٥ لە خێزانێكی مامۆستا و فەرمانبەر لەدایك بووە. دایكی كچی پادشا بووە، باوكیشی ماوەیەكی زۆر ڕۆژنامەنووس بووە. بە درێژایی تەمەنی، منداڵی شایەتحاڵی چەندین شەڕ، بەرەنگاری، تەوژمی كۆچبەرەكان، كۆتایی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی و ئەو هەژارییە سەختەی كە ڕووبەڕووی ئەستەنبوڵ بووەتەوە، بووە. لە كۆتا كتێب و بابەتەكانیدا، ئاماژەی بەم بەسەرهاتانە داوە و باسی ڕووداوی شەڕە گەورەكانی شارەكە، پیاوانی ئاگركوژێنەوە، شەڕەكانی سەر شەقام، ژیانی كۆڵانە دوورەكان و



ئەو مەیخانانەی كردووە كە بەگەنجی سەردانی كردبوون. باسی ئەو ***یالانەی*** بۆسفۆری

کردووە کە بەمنداڵی تێیاندا ژیاوە و دواتر سووتێنراون. کاتێك ڕەشات ئەکرەم کۆچو تەمەنی بیست ساڵ بووە، باوکی ڤێللایەکی کۆنی عوسمانی لە گۆزتەپ بەکرێ گرتووە، لێرە کۆچوی لاو بە شێوە ژیانێکی ڕەسەن، لە کۆشکێکی تەختە لە ئەستەنبوڵ ژیاوە، ماوەیەکی زۆر لێرە ماوەتەوە، دواتر پەرشوبڵاوبوونەوەی خێزانە گەورەکەی، هەر وەکو زۆربەی خێزانەکانی تر، هەژاری و ناکۆکیی خێزانەکەی کۆچویان ناچار کردووە کۆشکەکە بفرۆشن. لەدوای ئەوە، کۆچو هەر لە گۆزتەپ ماوەتەوە، بەڵام بەجیا لە خێزانەکەی و ژیانی لە چەند باڵەخانەیەکی جیاواز بەسەر بردووە. بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی پێشووی _لەو کاتەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ڕووخا و سەرهەڵدانی کۆماری_ کۆچو پێی باش بووە بەشی مێژوو تەواو بکات و ببێتە یاریدەدەری مامۆستا خۆشەویستەکەی ئەحمەد ڕەفیقی مێژوونووس.

ئەحمەد ڕەفیق لە ساڵی ١٨٨٠ لەدایك بووە و بیست و پێنج ساڵ لە کۆچو گەورەتر بووە، نووسەری زنجیرەیەك بڵاوکراوەیە بە ناوی (ژیانی عوسمانییەکان لە سەدەکانی پێشوو): هەر وەکو ئەنسکلۆپیدیاکەی کۆچو، هەر جارە و بەرگێکی بڵاو دەبوویەوە و بەهێواشی ناوی دەرکرد، هەتا لە کۆتاییدا ئەحمەد ڕەفیقی کردە ناودارترین مێژوونووسی سەردەمی نوێ. ئەحمەد ڕەفیق، ئەو کاتانەی لە زانکۆ دەرسی نەدەوتەوە، بەناو تۆز و خۆڵی ئەرشیفە شێواوراوەکانی عوسمانییەکان (کە دواتر بە (خەزێنەی لاپەڕەکان) ناسرابوو) گەڕاوە بۆ ئەوەی تۆماری دەستنووسێك بدۆزێتەوە. لەبەر ئەوەی، وەك کۆچو، بەهرەی نووسینی پەخشانی سەردەمی و زیندووی هەبووە (حەزی لە شیعر بووە و لە کاتی دەستبەتاڵی شیعری نووسیوە) ئەو بابەتانەی کە بۆ ڕۆژنامەی نووسیون، خوێنەرێکی زۆریان هەبووە و دواتر لە دووتوێی کتێبێکدا هەموویان کۆ کراونەتەوە. بەستنەوەی مێژوو و ئەدەب بەیەکەوە، وەرگرتنی بابەتی نامۆ لە ئەرشیفەکان و بڵاوکردنەوەیان لەناو گۆڤار و ڕۆژنامەکان، گەڕانی بەردەوام لە دوکانی کتێب فرۆشێکەوە بۆ یەکێکی تر، خۆش و ئاسانکردنی مێژوو و بەسەربردنی ئێواران بە قسەکردن و خواردنەوە لە مەیخانەیەك لەگەڵ هاوڕێیان _هەموو ئەمانە کۆمەڵێك چالاکی بوون کە کۆچو لە مامۆستاکەیەوە بۆی جێمابوون. بەڵام پەیوەندیی نێوان ئەم دوو نووسەرە ماوەکەی کەم بووە، چونکە لە ساڵی ١٩٩٣ لەو کاتەی زانکۆی ئەستەنبوڵ (دارول فنون) نۆژەن دەکرایەوە، ئەحمەد ڕەفیق لە زانکۆ دوور خرایەوە، چونکە

بیروڕاکانی ناسرابوون بە پشتگیریکردنی ئازادی و ئاشتیی ئەو وڵاتانەی کە دژی ئەتاتورك بوون، بەڵام ئەو بایەخەی دەیدا بە مێژوو و کلتووری عوسمانی، زیاتر هۆکاری لەدەستدانی کارە مەزنەکەی بووە. (باپیرەی منیش، باوکی دایکم، بەهەمان شێوەی ئەم نووسەرە، لە هەمان ماوەدا لە کۆلێژی یاسا دوور خرایەوە). بە هەمان شێوە، دوای ماوەیەك لە دوورخستنەوەی مامۆستاکەی، ڕەشا ئەکرەم کۆچو لە زانکۆ دوور کەوتەوە.

دوورخستنەوەی مامۆستاکەی، بە هۆی پەسەندنەکردنی ئەتاتورك و دەوڵەتەکەی، کۆچوی تووشی خەم و پەژارەیەکی زۆر کرد. گیرفانبەتاڵ و بێ ناو و پشتگوێخراو، ئەحمەد ڕەفیق ناچار بووە بۆ بەدەستهێنانی پارەی دەرمانەکان، یەك لەدوای یەکی کتێبەکانی کتێبخانەکەی بفرۆشێت و لەپاش ململانێیەکی زۆر لەگەڵ ژیان، بۆ ماوەی پێنج ساڵ دواتر بەهەژاری کۆچی دوایی کردووە. لە ماوەی ژیانیدا لەو نەوەد کتێبەی کە نووسیبوونی، زۆربەیان چاپ کراون.

لەپاش مردنی ئەحمەد ڕەفیق، کۆچو خەمی خۆی بۆ ئەو ڕاستییە دەربڕیوە کە چۆن مامۆستاکەی لەو کاتەی لە ژیان بووە، لەبیر کراوە و گەڕاوەتەوە بۆ یەکێك لە کارە سەرەتاییەکانی مامۆستاکەی: "کاتێك منداڵێکی بێ کار بووم، وەکو پارچەی سەر قولاپی ماسیگرەکە بووم، لەکەنار ئاوەکەی بەرامبەر *یالێکی* بۆسفۆر دەچوومە ناو ئاوەکەوە و دەهاتمە دەرەوە وەکو ماسیی پولەکەدار." نووسەر لە تەمەنی پانزە ساڵیدا، پێش ماتەمینیی شارەکە و مێژووی عوسمانییەکان، وەك منداڵێکی شادومان ئەم پارچەیەی نووسیوە. تەنها هەژارییە پرکێشەکەی شارەکە، کۆچوی نەخستۆتە تاریکییەوە، بەڵکو هۆکارێکی تر، ململانێکردنی بووە بۆ بەڕێکردنی ژیان وەك کەسێکی هاوڕەگەزباز لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەیەم.



هەستی هاوڕەگەزبازی لەناو ڕۆمانە وڕووژێنەر و تیژڕۆکانیدا، بەئاشکرا دیارە و تەنانەت لە (*ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ*)دا چاونەترسانە ئەم هەستەی دەربڕیوە. کۆچو زیاتر لە هەر کەسێکی سەردەمی خۆی، لەم ڕووەوە زۆر بوێرانە خۆی دەرخستووە. لە هەر بەرگێکی نوێی ئەنسکلۆپیدیاکەی، لە پیاهەڵکێشانی لاوە جوانەکان، هەرگیز هیچ دەرفەتێکی لەدەست نەداوە. یەکێك لەوانە، میریالم ئەحمەد ئاغا بووە کە یەکێك بووە لەو گەنجانەی کە هاتووەتە لای سولەیمانی گەورە تا فێری دەرس و خوێندن ببێت، بەم جۆرە لەبارەیەوە دواوە: "لاوێکی ڕووخسار ناسك، قۆڵەکانی وەك لقی درەختی سوورەچنار ئەستوورن." باسی جافری سەرتاشی کردووە، کە لەلایەن شاعیری سەدەی شازدەیەم، ئەڤلیا چەلەبی، لە هۆنراوەی (شەهرەنگیز) باسی کردووە، بە "گەنجە خوێنگەرمەکە، بە جوانییەکەی ناوی دەرکردووە" ناوی هێناوە. بابەتێکی تریشی لەبارەی "یەتیم ئەحمەد، ئەو کوڕە قۆزەی کەلوپەلی کۆنەی دەکڕی و دەفرۆشتەوە" نووسیویەتی: "کوڕێکی پێپەتییە، کە پانتۆڵە دەڵبەکانی لە چل لاوە پینە کراوە و لە کونە دڕاوەکانی جلەکانیەوە پێستە جوانەکەی دیارە. بەڵام بۆ باسی ڕووخساری، دڵۆپێك ئاوە، هەر وەکو پایەداری سوڵتان، جوانی لەنێوان ناوچەوانی و برۆکانیدا وەستاوە. قژەکانی بە هۆی لوولییانەوە، هەڵچوون. پێستی ئەسمەری وەك زێڕ بریقەی دەهات، ڕوانینە شەرمنانەکەی، قسەکردنە سەرنجڕاکێشە هەوەسبازەکەی، باڵا بەرزەکەی، لاواز، بەهێز." سەرەڕای هەموو پەخشانە بەهێزەکانی، کۆچو وەکو شاعیرەکانی دیڤان، گرنگییەکی زۆری داوە بەوەی کە نیگارکێشە بەوەفاکانی، وێنەی هەریەکە لە قارەمانە پێپەتییەکانی بە جۆرێك بنەخشێنن، کە بگونجێت لەگەڵ دابونەریتی کۆمەڵگا، بەڵام دەرخستی جیاوازیی نێوان نەریت و ڕاستییەکان، هەروەك یەك بوون. لە بابەتێکدا بە ناوی (پەیوەندیکردنی ئەنکشارییەکان بە سوپاوە) دەریخستووە کە چۆن بەشانازییەوە لاوە بێریشەکان دەردەکەون، کاتێك یەکەم جار دەچنە ناو سوپاوە و دەگێڕێتەوە چۆن (ئەنکشارە بەهێز و خۆهەڵکێشەکان) دەچنە ڕیزەکانەوە. لە نووسینێکی تردا بە ناوی (لاوە جوانەکان)، تێبینیی ئەوەی کردووە کە "ئەو جوانییەی لە هۆنراوەکانی دیڤاندا باسی کراوە، جوانیی نێرینە بووە"، کەرەستەی ڕازاندنەوەی هۆنراوەکان، "هەمیشە گەنجە ڕووخسار جوانەکان بوون" _لە کتێبەکانی

پێشوویدا، زۆر بەوریاییەوە باسی ئەو کوڕە گەنجە جوانانەی کردووە کە لەناو مێژوو و کۆمەڵگادا ئاماژەیان پێ کراوە. بەڵام لە کارەکانی دواتر، پێویستی بە هیچ پاساوهێنانەوەیەك نەبووە بۆ دەربڕینی هەستەکانی بەرامبەر کوڕە جوانەکان، یاخود لەپاڵ جوانیاندا، باسی ئەو کەموکووڕییانەشی کردووە کە لە ڕووخسار و جەستەیاندا هەبووە. لە بەسەرهاتی دەریاوان دۆبریلۆڤیچ لەبارەی (گەنجە قۆزەکە، گرۆت) دواوە، کە لە ١٨ی بەفرانباری ١٨٦٤، لە کۆمپانیای هەیرییە دەریاوان بووە، کاتێك کەشتییەکەی نزیکی کاباتاش بووەتەوە، قاچی لەنێوان کەشتییەکە و شوێنی لەنگەرگرتنەکەی گیراوە و پەڕیوە (ئەو شتەی هەموو کەسێکی شارەکە لە ڕوودانی دەترسا)، لەو کاتەدا گرۆت تەنها گوتوویەتی: "بوتەکەم لەدەست دا."



لاوە جوان و پیاوە پێپەتییە قۆزەکانی سەردەمی عوسمانی، کە کۆچو لە کتێبەکانی سەرەتاییدا ئاماژەی پێ داون، ئەگەر ڕاستەقینەش نەبووبن، بەڵام لانی کەم هەندێکیان بیرۆکەکەیان لە (کتێبەکانی شارەوە) (شەهرینگیز)، وەرگیراوە. زۆربەی ئەوانی تر لەگەڵ گەنجە بێ قاچ و ڕووخسار شێواوەکان لە سەرچاوەی کتێبخانە پشتگوێخراوەکانی شارەوە، وەکو دەستنووس، کۆکراوەی هۆنراوە، کتێبی بەخت و کتێبی نهێنییەکانەوە وەرگیراون. یاخود زۆرتر سوودی لە ڕۆژنامە ئەرشیفکراوەکان وەرگرتووە (لە ڕاستیدا گەنجە دەریاوانە قۆزەکە، گرۆت، بیرۆکەکەی لە یەکێك لەم سەرچاوانەوە وەرگیراوە).

کاتێك کۆچو تەمەنی بەرەو پیری دەڕۆیشت، زیاتر پەست و خەمبار دەبوو، چونکە دەترسا نەتوانێت زانیارینامەکەی بەتەواوەتی دابەش بکات بۆ پازدە بەش و

بەنیوەوناچڵی بمێنێتەوە، لەبەر ئەوە هەستی کردووە ئیتر ناچار نییە خۆی ببەستێتەوە بە باسکردنی ئەو کوڕە گەنجە جوانانەی کە تەنها لە مێژوودا ناویان هاتووە، لەمەودوا باسی ئەو گەنجە جۆراوجۆرانەی کردووە کە هەندێکیان لەسەر شەقام، مەیخانە، قاوەخانە، گازینۆ و پردی شارەکە کە هەریەکەیان بە پاساوی جیاواز، چاوی پێ کەوتوون و بۆ هەریەکەیان سەرنجێکی تایبەتی هەبوو. بۆ نموونە" کۆچو لەساڵی دەیەمی نووسینی ئەنسکلۆپیدیاکەی، لەبەرگی نۆیەم، لاپەڕە ٤٧٦٧، ئەوکات کە تەمەنی شەست و سێ ساڵ بووە، پارچەیەکی نووسیوە لەبارەی کوڕێکی منداڵی پەتباز لەنێوان تەمەنی چواردە بۆ پانزدە ساڵی، کە لەنێوان ساڵی١٩٥٥ بۆ ١٩٥٦ چاوی پێ کەوتووە. کۆچو دەیگێڕێتەوە کە ئێوارەیەکیان لە ئاند کە سینەمایەکی ئێواران بووە لە گۆرتەپ، ئەم کوڕەی بینیوە: "پێڵاوێکی سپی لەپێ دەکات، پانتۆڵێکی سپی و فانیلەیەك لەبەر دەکات کە لەپێشەوەی مانگ و ئەستێرەی پێوەیە. کاتێك دەست دەکات بە پیشاندانی کارامەییەکەی، خۆی ڕووت دەکاتەوە و دەرپێکورتەیەکی بچووك و سپی لەبەر دەکات، پێستە ڕوون و سەرنجڕاکێشەکەی لەگەڵ ڕەفتارە جوامێر و بەڕەوشتەکەی دەردەخات و وەك ڕۆژئاواییەك بەهاوسەنگی لەسەر قاچەکانی دەوەستێت." نووسەر بەردەوامە لە باسکردنی کاتی کۆتایی بەرنامەی کاری کوڕەکە، هەرچەندە خەمبارە کە دەبینێت گەنجەکە لە کۆتاییدا بە سینییەکەوە بۆ کۆکردنەوەی پارە بەناو خەڵکدا دەسووڕێتە، بەڵام لە لایەکی تریشەوە دڵخۆشە کە کوڕەکە زۆر چاوبرسی و مەرایکەر نییە بۆ بەدەستهێنانی پارە. نووسەر باس دەکات کە کوڕەکە کارتی تایبەتی خۆی داوە بە هەندێك لە بینەرەکانی، بەم جۆرە نووسەرە پەنجا ساڵەکە و گەنجەکە ئاشنای یەك بوون. هەرچەندە نووسینی نامە لەنێوانیان هەبووە، بەڵام لەپاش دوازدە ساڵ بەسەر ناسینەکەیان، ئەو کاتەی کۆچو خەریکی نووسینی ئەسکلۆپیدیاکەی بووە، گلەیی ئەوەی کردووە کە وەڵامەی نامەکانی نەدراوەتەوە و هیچ هەواڵێکی کوڕەکە نازانێت.

لە ماوەی ساڵی ١٩٦٠، کاتێك کارەکانی کۆچو بەش بەش بڵاو دەکرانەوە، خوێنەرەکانی (*ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ*)-یان بەتەنها وەك تاکە سەرچاوەی ڕاستییەکانی شارەکە دانەناوە، بەڵکو وەك گۆڤارێك کە شتە سەیر و نامۆکانی ژیانی

ڕۆژانەی شارەکەی تێدا کۆ کراوەتەوە. لەبیرمە، لە زۆر ماڵ کە سەردانم دەکردن، دەمبینی کارەکانی لەپاڵ گۆڤارە هەفتەییەکان دانراون. ئەوکات کۆچو ناوبانگی کەمی هەبووە، چونکە ئەنسکلۆپیدیا خەمگینەکەی کە دەربارەی شارێك بوو، تا ڕادەیەك نامۆ بووە بە خوونەریتی ئەستەنبوڵی ١٩٦٠، خوێنەرێکی کەم هەبوون کە باسە وردووژێنەرەکان قبوڵ بکەن. بەڵام پەنجا ساڵ دواتر، یەکەم (ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ) و یەکەم بەرگی دووەم ئەنسکلۆپیدیاکەی، خوێنەرێکی زۆری هەبوو بەتایبەت لەناو ئەو نووسەر و کەسە ئەکادیمیانەی کە بەپەرۆش بوون دەربارەی خواستی خێرای ڕۆژئاواییبوونی ئەستەنبوڵ و لەبارەی سووتان و لەناوچوونی ڕابردووەکەی بزانن، کە کۆچو لە بەرگەکانی سەرەتادا بە شێوەیەکی (زانستی و ڕاستی) ئاماژەی پێ داون. کاتێك لاپەڕەی بەرگەکانی دواتری هەڵدەدەمەوە، کە لەلایەن گرووپێکی نووسەرەوە بەرهەم هێنراون، مەودایەکی فراوانتر دراوەتە سەرنجی تایبەتی کۆچو، ئەوکات بیرم لەنێوان ئێستا و ڕابردوو دێت و دەچێت.



پێم وایە خەمبارییەکەی کۆچو، کەمتر بە هۆی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و وێرانکاری ئەستەنبوڵەوە بووبێت، بەڵکو زۆرتر بە هۆی ئەو ژیانە قورس و ناسازەی سەردەمی منداڵی بووە کە لە کۆشك و *یاڵەکاندا* بەسەری بردووە. ڕەنگە ببینین زۆربەی ئەو نووسەرانەی کە ئەنسکلۆپیدیایان نووسیوە، وەك نووسەرێکی نموونەیی

کۆکەرەوەی بابەتەکان، لەپاش ئەوەی تووشی کۆستی دەروونی بوون، خۆیان لە جیهان دوور خستۆتەوە و لەناو شتە مادییەکان ژیانیان بەسەر بردووە. بەڵام کۆچو جیاواز لە نووسەرەکانی تری کلاسیك، خواستی ماددیی نەبووە و بایەخ و سەرنجی لەسەر دەستکەوت نەبووە، بەڵکو تەنها سەرنجی لەسەر ڕاستییە نامۆکان بووە. وەك زۆربەی نووسەرەکانی ڕۆژئاوا، گرنگیی نەداوە بەوەی کە کۆکراوەکانی لە مۆزەخانە دادەنرێن یان پەرشوبڵاو دەکرێنەوە، هیچ دانەناوە ئاخۆ سەرکەوتوو دەبێت یان نا، بەڵکو دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی هەر ڕاستییەکی سەرنجڕاکێش کە زانیاریی نوێی لەبارەی شارەکە تێدا بێت.

کاتێك کۆچو بۆی دەرکەوت کارە کۆکراوەکانی هیچ سنوورێکیان نییە و لەسەر یەك بیرۆکە بەردەوام نەبووە، تێکۆشاوە زیاتر گرنگی بە بیرۆکەکانی ناو ئەنسکلۆپیدیاکەی بدات. پرۆفیسۆر سەماوی ئیجە، مێژوناسی بیزەنتین و نووسەری ئەدەبی عوسمانی بووە، کە لە ساڵی (١٩٤٤)ەوە کۆچوی ناسیوە و بابەتی بۆ ئەنسکلۆپیدیاکەی نووسیوە، باسی کۆچو دەکات لەپاش مردنی، هەروەها باسی کتێبخانە گەورەکەی دەکات کە چەندین کەلوپەلی _بابەتی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، نیگاری کێشراو و وێنەی فۆتۆگرافی، دۆسیە و ئەو تێبینییانەی (ئێستا بوونیان نەماوە) کە لە ڕۆژنامەکانی سەدەی نۆزدەیەم نووسیبوونی_ لەسەر یەك تێدا کۆ کرابوونەوە.

لەپاش ئەوەی کۆچو زانیویەتی تەمەن ڕێگەی پێ نادات زانیارینامەکەی تەواو بکات، بە سەماوی ئیجەی گوتووە لەبەر ئەوەی ژیانی بەرەو کۆتایی دەڕوات، ئەنسکلۆپیدیاکەی دەبات و لە باخچەکەیدا دەیسووتێنێت. تەنها نووسەری کۆکراوە ڕاستییەکان ئەم هەڵوێستەیان هەبووە، هەر وەکو ئەم بیرۆکەیەش لەبیری ڕۆماننووس (بروس چەتوین) بووە، کە نیوەی ژیانی لە کارەکەی سۆزبی و پاڵەوانەکەی، ئۆتز، بەسەر بردووە، بەڵام هەموو کۆکراوە نایەبەکانی لە کاتی تووڕەیی لەناو بردووە. کۆچو، لە کۆتاییدا نەیهێشتووە تووڕەیی زاڵ بێت بەسەریدا و وازی نەهێناوە لە بەردەوامیی کارەکەی. بەڵام ئەگەر بەردەوامیش نەبووایە، جیاوازییەکی ئەوەهای نەدەکرد، چونکە بەرهەمهێنانی (ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ) هێدی هێدی کەم دەبوویەوە تا لە ساڵی ١٩٧٣ بەتەواوەتی دوایی هات. دوو ساڵ پێشتر، هاوڕێ زیرەکەکەی ڕەخنەی لێی گرت

که گوایا کارەکەی بەهەڕەمەکی کردووە، هەندێك نووسینی زیاد بووە و پێویست نەبووە بیاننووسێت، بەڵام لەبەر خواستی کەسیی خۆی، زیادی کردوون. دواتر کۆچو لەبەر ئەم ڕەخنەیە، دەمەقاڵێی لەگەڵ هاوڕێکەی دروست کردووە و هەموو بابەتە کۆکراوەکانی _بابەتی گۆڤار و ڕۆژنامەکان، نووسینە چاپکراوەکان و وێنە فۆتۆگرافییەکان_ لە ئۆفیسی هاوڕێکەی لە بابیلی کۆ کردووەتەوە و هەموویانی هێناوەتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی لە گۆزتەپ. لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە هەموو کارەکانی لە مۆزەخانەیەك کۆ بکاتەوە، کۆتا ڕۆژەکانی لەناو چەندین لاپەڕەی کۆکراوە لە نهۆمەکەی خۆی بەسەر بردووە. لەدوای مردنی خوشکەکەی، ئەو کۆشکەی باوکی بۆی جێ هێشتبوون، فرۆشرا، بەڵام کۆچو لەو ناوچەیەی سەردەمی منداڵیی دوور نەکەوتۆتەوە. لە کۆتا ڕۆژەکانیدا، کۆچو هاوڕێیەکی منداڵی بە ناوی موحەمەد ناسیوە، هەروەك زۆربەی ئەو منداڵانەی تر کە چاوی پێیان کەوتووە و لە ئەنسکلۆپیدیاکەی باسی کردوون، بە هەمان شێوەش لەبارەی ئەم منداڵەوە دواوە. موحەمەد کوڕێکی بێلانە و بێکەس بووە، کۆچو وەك کوڕی خۆی بردوویەتیە ژێر باڵی خۆیەوە و لە ماڵی بلاوکراوەکانی کۆچو ماوەتەوە.



لەنێوان ساڵانی ١٩٥٠ بۆ ١٩٧٠، کۆچو حەزی کردووە ئێوارانی بە گفتوگۆکردن لەگەڵ هاوڕێکانی لە نووسینگەی ئەنسکلۆپیدیاکان بەسەر بەرێت، یاخود لە مەیخانەیەك لە سیرکەسی کە بێدەنگ و ئارامتر بووە. هەرگیز لە کۆبوونەوەکانیاندا، هیچ ئافرەتێکیان لەگەڵ نەبووە. ئەو دەستە نووسەرە ناودارە کە لە جیهانی پیاواندا ژیاون،

دەشێت ببنە دوایین نوێنەری ئەدەبی دیڤان و پیاوانی ڕۆشنبیریی عوسمانی. ڕەگەزی مێینەیان بەستۆتەوە بە کۆمەڵێك تایبەتمەندییەوە، وەك تامەزرۆی ئەویندارى، تێوەگلانی گوناهی ئارەزووبازی و چەپەڵی، فێڵ، تەڵەکەبازی، لادانی خراپ، ئابڕووچوون، لاوازی، کارەسات، هەڵە و ترس. لە ماوەی ئەو سی ساڵەی نووسینی ئەنسکلۆپیدیاکان، تەنها یەك یان دوو ئافرەت بابەتیان نووسیووە. کۆبوونەوەی ئێوارانی دەستە پیاوەکە، بووە بە بەشێکی گرنگ لە ئەنجامگەیاندنی نووسینەکان و بڵاوکردنەوە و چاککردنی نووسینەکانیان. کۆچو گوتوویەتی کە لە (شەوەکانی مەیخانە)، دوای نەریتێکی باش کەوتوون و بوونەتە جێگیرەوەی ئەوە شاعیرە عوسمانییانەی کە بە هەمان شێوە نەیانتوانیوە کارەکانیان بەباشی تەواو بکەن، هەتا ئەو کاتەی لە مەیخانەکان کۆ بوونەتەوە. جارێکی تر لە نووسینەکانیدا هەستی بەجۆشی بۆ ئەو گەنجانە دەربڕیوە، کە لە مەیخانەکاندا مەییان بۆ هێناون. لەبارەی جلوبەرگ، بەروانکەکانیان، نەرمونیانی، ڕەوشت و جوانپۆشییان، بابەتی نووسیوە. هەروەها لە باسی شەوانی مەیخانەکان، ئاماژەی بەوە داوە کە گەورەترین نووسەر لەناو ئەو مێژوونووسانەی کە لە مەیخانەکان کۆ بوونەتەوە ئەحمەد ڕاسیم بووە. ئەو خۆشەویستییە گەرمەی هەیبووە بۆ ئەستەنوڵ، لەپاڵ ئارەزووی بۆ زیندووکردنەوەی تابلۆکان، کاریگەریی هەبووە لەسەر کۆچو.

لە هەردوو (ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ) و ئەو زنجیرە بابەتانەی کە لە سەرچاوەی ڕاستەقینەوە وەرگیرابوون، دەینووسین بۆ ڕۆژنامەکان، کۆچو چیرۆکە گاڵتەئامێزەکانی ئەحمەد ڕاسیمی بەکار هێناوە کە لەسەر ئەستەنبوڵی دێرین نووسراون، بە زیادکردنی هەندێك بابەتی وەکو تەڵەکەبازی و ئەڤینداری، کارەکانی نوێ کردوونەتەوە. (باشترین دوو نموونە، بریتی بوون لە بابەتی (لە ئەستەنبوڵ چی ڕووی داوە، ئەو کاتەی خەڵك تامەزرۆی خۆشەویستی بوون)، و (مەیخانە کۆنەکانی ئەستەنبوڵ و سەما سەیرەکەی کوڕان و ئەو پیاوانەی خۆیان وەك ئافرەت لێ کردووە).
بە سوودوەرگرتن لە ئازادیی یاسای تورکی مافی لەبەرگرتنەوە، کۆچو بەئازادی نووسینەکانی لە گەورەکەیەوە وەرگرتووە و لاسایی کردووەتەوە _بە ئازادییەکی تەواو، بەڵام بە بیروڕایەکی بەرزەوە لاسایی کردۆتەوە.

چل ساڵ لەنێوان لەدایکبوونی ڕاسیم (١٨٦٥) و کۆچو (١٩٠٥) هەیە. یەکەم ڕۆژنامەکان بڵاو کرانەوە، زیادبوونی خواستی ڕۆژئاوایی لە هەرێمەکەی عەبدولحەمید و سیاسەتی ستەم و زۆردارانە، کردنەوەی زانکۆکان، ناڕەزایی دەربڕین و بڵاوکراوەی گەنجە تورکەکان، دروستبوونی مەیلی ڕۆژئاوایی لەناو ئەدەب و هونەردا، دەرچوونی یەکەم ڕۆمانە تورکەکان، شەپۆلی کۆچبەرەکان و چەندین جەنگی گەورە _هەموو ئەمانە لەو ماوەیەدا ڕوویان داوە. ئەو شتەی ئەم دوو نووسەرە ئەستەنبوڵییەی لەوانی تر جیا کردۆتەوە، سەرنج و تێڕوانینیان بووە لەسەر خواستی ڕۆژئاوایی. ئەحمەد ڕاسیم لە سەردەمی گەنجیدا، لەژێر کاریگەریی ڕۆژئاواییبوون، چەندین ڕۆمان و هۆنراوەی نووسیوە، بەڵام دواتر هەستی بە شکست کردووە و پێی وا بووە ئەم کاریگەرییەی ڕۆژئاوایە تەنها ڕووکەشە و بە (لاساییکردنەوەی کوێرانە) ناوی بردووە، یاخود پێی وا بووە وەکو فرۆشتنی کرمی لوولپێچە لە کۆڵانی ئیسلامییەکان. لەتەك ئەوەشدا، هەندێك بیرۆکەی بیانی لە باسی ڕەسەنایەتی و نەمریی ئەدەب و پەرستشی، هونەرمەند بەکاری هێناون لە زۆربەی ئەو بابەتانەی کە بۆ ڕۆژنامەکان نووسیبوونی بۆ ئەوەی بژێویی ژیانی بەدەست بێنێت، یاخود لەبەر خواست و ئارەزووی خۆی بووە. چالاکی و گۆڕانی بێکۆتای ئەستەنبوڵ خۆشیی پێ بەخشیوە، هەر لەبەر ئەوە بە پێویستی نەزانیوە ئازار بۆ ئەو هونەرەی کە خەریك بوو کۆتایی پێ بێت، بکێشێت. هەر کاتێك بیرۆکەیەکی بۆ هاتبێت، زۆر بەسادەیی دەستی کردووە بە نووسینی وتارەکانی.

بەپێچەوانەوە، کۆچو نەیدەتوانی بەتەواوەتی خۆی دوور بخاتەوە لە شێوازی ڕۆژئاوایی: سیستمی پۆلێنکردنی ڕۆژئاواییەکان بەتەواوەتی بیری داگیر کردبوو، بە هەمان چاوی ڕۆژئاواییەك سەیری ئەدەب و زانستی دەکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی لە ئەستەنبوڵ دەژیا، نووسینەوەی ئەو بابەتانەی کە خواستی لێیان بوو _بابەتی خولیایی و نامۆ و کەنارخراوەکانی ژیان_ بە شێوازی خۆرئاوایی بۆی قورس بوون بۆی. هەروەها زۆر بەکەمی شارەزایی هەبوو لە لادانی ئەدەبی ڕۆمانتیکی، بەڵام ئەگەر شارەزاییشی هەبووایە، لەگەڵ کلتووری عوسمانی کێشەی هەبوو، چونکە ئەم کلتوورە چاوەڕوانی لە کەسانی ڕۆشنبیر و ئەدەبی نەدەکرد کە کار لەسەر بابەتی ناپەسەند و قبوڵنەکراوەکان بکەن، بەڵکو کارەکانیان بە شێوەیەکی ڕوون بێت و لەگەڵ کلتووری کۆمەڵگا بگونجێت.

خەونی یەکەمی کۆچو بوون بە پرۆفیسۆری بوو لە زانکۆ، بەڵام دوای ئەوی لە زانکۆ دوور خرایەوە، خەونی دووەمی" بڵاوکردنەوە و تەواوکردنی ئەنسکلۆپیدیاکەی، گەورەترین خواستی بوو. لە لایەکی ترەوە، چەسپاندنی ئەندێشە نامۆکانی، ئارەزوویەکی تری بووە.

زۆربەی ئەو نووسەرە عوسمانییانەی بەتەواوی ناسراوبوون، لە شارەکەدا، پێویستیان بە شاردنەوەی هەستەکانیان نەبوو. لە (*شەمرەنگیز*)، کە لە سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەم زۆر باو بوو، ئەم نووسەرانە هەروەك چۆن وەسفی جوانی و نایابیی شارەکەیان دەکرد، بە هەمان شێوە باسی لاوە جوانەکانی شارەکەیان کردووە. لە کتێبە هونەری و بیرییەکانی شارەکە، زۆر بەئازادانە بەراوردیان لەنێوان ئەو شیعرانەی دەربارەی لاوەکان نووسرابوون، لەگەڵ ئەوانەی دەربارەی جوانی و یادەوەرییەکانی شارەکە نووسرابوون، کردووە. هەر خوێندنەوەیەکی هەڕەمەکی بۆ هەریەك لە نووسەرە دیارەکانی عوسمانی _وەك لێکۆڵینەوەکانی سەدەی حەڤدەیەمی ئەڤلیا چەلەبی_ تێدەگەین کە چۆن نەریتە ئەدەبییەکان ڕێگەیان بە شاعیران داوە بە هەمەن ئاواز کە باسی مزگەوت، کەشوهەوا و ڕێگای ئاوی شارەکەیان کردووە، ئەوهاش بە پیاهەڵدانەوە لەبارەی کوڕەکانی شارەوە بدوێن. بەڵام خۆیان لە تێگەشتنێکی ناهەموار دوزیوەتەوە، کە بە هۆی جموجوڵی خۆرئاواییەوە دروست بووبوو. ئەم (دەستە نووسەرە کلاسیکانە)، مەودایەکی کەمیان بۆ دەربڕینی هەستی (ناڕەزایی کۆمەڵایەتی) هەبووە، لەبەر ئەوە کۆچو خۆی بە کاروباری ئەنسکلۆپیدیاکەیەوە خەریك کردووە و کردوویەتی بە پەناگەی خۆی.

سەبارەت بە ئەنسکلۆپیدیا، کۆچو تێگەیشتنێکی جیاوازی هەبووە. لە هەندێك لاپەڕەی لە (غازی عوسمانەوە بۆ ئەتاتورك)، کە لەپاش تەواوکردنی یەکەم ئەنسکلۆپیدیا نووسیویەتی، ناڕاستەوخۆ ناوی (ئەکاییول مەهلوکەت) _ کتێبێکی سەدەی ناوەڕاستە لەلایەن کازڤینلی زەکەریاوە نووسراوە، واتە کتێبی (بوونەوەرە سەیرەکان)_ دەبات و وەك (جۆرێك لە ئەنسکلۆپیدیا) باسی دەکات. ئەم کتێبە دەیسەلمێنێت تەنانەت لەپێش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە، لەژێر کاریگەریی ڕۆژئاوا، کتێبی شێوە ئەنسکلۆپیدیا نووسراون. تێبینییەکەی دەریدەخات کە کۆچو

وەك كۆكراوەيەكی بچووكی ڕاستییەكان، سەيری ئەنسكلۆپيديای كردووە، زياتر لەوەی كۆكراوەيەكی زۆر و نارێكوپێكی لەسەر ڕيزبەنديی ئەلفابێ بێت. گوتوويەتی جياوازييەكی زۆر لەنێوان ڕاستييەكان و چيرۆكەكاندا هەيە و دەبێت لۆژيكێكی جياكەرەوی پلەی باش و خراپی بابەتەكان هەبێت، كە هەندێك بابەت زۆرتر كاريگەرن و لايەنە بنەڕەتی و قۆنەغەكانی شارستانيەت دەردەخەن. كۆچو پێی وا بووە كە خزمەتی مێژووی نەكردووە، بەڵكو مێژوو خزمەتی ئەوی كردووە. لەم لايەنەوە كۆچو لەو مێژوونووسە بێچارەيە دەچێت كە لە كتێبەكەی نيچە (*سوود و زيانەكانی مێژوو*)، باس كراوە _ئامانجی ڕاستەقينەی گۆڕينی مێژووی شارەكە بووە، بۆ ئەو مێژوويەی كە خۆی ويستوويەتی باسی بكات.

مێژوونووسێكی بێچارە بووە چونكە _وەكو زۆربەی نووسەری كۆكەرەوەكان بە بەهای بازاڕ نا، بەڵكو بەپێی تێڕوانينی خۆيان بابەتەكانيان پۆلێن كردوون_ زۆرتر خۆی بەو چيرۆكە مێژووييانە خەريك كردووە كە لە ڕۆژنامە و كتێبخانە و تۆماری عوسمانييەكانەوە بەدەستی كەوتوون. نووسەرێكی كامەرانی كۆكراوەی بابەتەكان (زۆربەی كات خانەدانێكی ڕۆژئاوايی بووە)، دەتوانێت بەئاسانی بابەتەكانەنی پۆلێن بكات و ڕێكيان بخات. بەڵام لە ئەستەنبوڵی سەردەمی كۆچو، هيچ مۆزەخانەيەك نەبووە هەتا بابەتە كۆكراوەكانی تێدا كۆ بكاتەوە. (ئەنسكلۆپيديای ئەستەنبوڵ)ی كۆچو، نەكراوەتە مۆزەخانەيەكی وەكو يەكێك لەو گەنجينە سەيروسەمەرانەی كە لە سەدەی هەژدەيەم و شازدەيەم لەلای شازادە و هونەرمەندانی ئەورووپا زۆر باو بووە. هەڵدانەوەی لاپەڕەكانی (*ئەنسكلۆپيديای ئەستەنبوڵ*)، وەك ئەوە وايە لە يەكێك لە پەنجەرەكانيەوە سەيری يەكێك لە گەنجينانە كە ئەستێرەی دەريايی، ئێسكی ئاژەڵان و كەلوپەلێكی كانزايی تێدايە، بكەيت و دواتر كەمێك زەردەخەنە بكەيت.

خوێنەرانی ئەم سەردەمە، وەك من، هەر كاتێك چاويان دەكەوێتە سەر (*ئەنسكلۆپيديای ئەستەنبوڵ*)، بە هەمان زەردەخەنەی ميهرەبانييەوە سەيری لاپەڕەكانی دەكەن. لەبەر ئەوەی سەدەيەك لەنێوانماندا هەيە، لەبەر ئەوەی زياتر وەك كەسێكی (مۆدێرن) يان (ڕۆژئاوايی) خۆمان دەبينين، بەقورسی دەتوانين وشەی (**ئەنسكلۆپيديا**) دەرببڕين. بەڵام هێشتاش سۆز و تێگەشتنێك هەيە بۆ ئەو پياوەی

گەشبینەی کە وا بیری کردۆتەوە دەتوانێت فۆرمێك دروست بکات کە چەندین سەدە درێژە دەکێشێت، هەتا لە ئەورووپا سەر هەڵبدات و بەو شێوازە هەرەمەکی و بێپلانیەی کە هەیبووە، توانیویەتی لە یەك کاتدا ڕابەرایەتیی هەموو کارەکانی بکات. بەڵام هێشتاش لەپاڵ ئەم بیرکردنەوە خۆبەگەورەزانینەمانەوە، شانازییەکی شاراوە هەیە بۆ ئەو کتێبەی کە لەناو کلتووری نوێگەریی عوسمانییەکانەوە و لەلایەن نووسەرێکی ئەستەنبوڵییەوە نووسراوە، کتێبێك کە هەموو جۆرە سیستمێکی پۆلێنکردن ڕەت دەکاتەوە، کتێبێك کە پێك هاتووە لە دوازدە بەرگی قەبە و هەمووشیان چاپ کراون.

لە کات و ساتی جیادا، چاوم بە کەسانێك کەوتووە کە بە هۆکاری جیاواز ناچار بوون سەرجەم دوازدە بەرگەکە بخوێننەوە. یەکێك لەوانە، ئەو هاورێ مێژوونووسەم بوو کە توێژینەوەی لەبارەی لەناوچوونی تەکیەی دەروێشەکانی ئەستەنبوڵ دەکرد. هاورێیەکی ترم، دەیویست زانیاری لەبارەی گەرماوە گشتییەکانی کۆنی ئەستەنبوڵ کۆ بکاتەوە. لەگەڵ ئەم هاورێیانە دادەدەنیشتین و لەپاش گۆڕینەوەی زەردەخەنەیەك، دەستمان دەکرد بە بەراوردکردنی تێبینییەکانمان. جارێکیان پرسیارم لە یەکێك لەو هاورێیانەم کرد دەربارەی ئەو کەسانەی کەلوپەلی کۆنەیان دەکڕی و دەفرۆشتەوە، کە تێڕوانینی چۆن دەبێت کاتێك دەبینێت ئەم کەسانە لە گەرماوە گشتییەکانی ئەستەنبوڵ لە بەشی پیاوان، خەریکی شوشتنی پێڵاو و جلوبەرگی پینەکراو بوون؟ هاورێکەم لەبەرامبەردا، دەربارەی ئەو بابەتەی کە لە هەمان بەرگدا بە ناونیشانی (هەڵووژەی توربەی ئەیوب سوڵتان) بوو، پرسیاری لێ کردمەوە. دەویست بزانێت کە بۆچی هەندێك جۆری هەڵووژەکانی ئەستەنبوڵ بە توربە ناسراون؟ یان پرسیاری دەکرد دەریاوان فەرهاد کێیە؟ (فەرهاد دەریاوانێکی ئازا بووە، لە ڕۆژێکی هاوینی ساڵی ١٩٥٨ ژیانی لاوێکی حەڤدە ساڵانی ڕزگار کردووە کە لە کەشتییەکی سەرنشین گواستنەوە کەوتۆتە ناو دەریاکەوە). ئینجا دەڕۆشتین بۆ باسی ئارناڤۆد جافر، کە چەتەیەکی بیۆگڵو بووە کە لە ساڵی ١٩٦١ پاسەوانی تایبەتی و بەربەرەکانیکەرە بەدخووەکەی کوشتووە (لە بابەتێکدا بە ناوی (بکوژەکەی دۆلاپدێر)، ئەم بەسەرهاتە باس کراوە)، یاخود دەچووین بۆ باسی (یاریکەرانی دۆمینە لە قاوەخانەکاندا)، زۆربەی ئارەزوومەندانی ئەم یارییە، خەڵکی ناو چینە کەمایەتییەکان بوون، وەکو جوولەکە و ڕۆمانی و ئەرمینییەکان، ئەم

گفتوگویە ئەو ڕۆژانەی بەبیر دەهێنامەوە کە لە نیشانتاش دەژیان، چونکە ئێمەش یاریی دۆمینەمان دەکرد، ئەو دوکانە کۆنانەی بیۆگلۆ و نیشانتاشی بەبیر دەهێنامەوە کە لەپاڵ فرۆشتنی یاریی منداڵان، خواردەمەنیی وشککراوە و تووتن، پوولەکانی دۆمینەیان دەفرۆشتن، ئەوکات لەناو یادگاری و نۆستالجیادا ون دەبووین. یاخود دەگەیشتینە بەسەرهاتی (پیاوە دەرپێکورت لەبەرەکە)، کە باسی ئەو پیاوە دەلاڵە خەتەنەکراوە دەکات کە لەگەڵ پێنج کچەکەی لە شارێکەوە دەچوون بۆ شارێکی تر و کچەکانی زۆرتر لەلایەن ئەو بازرگانانەوە لە ئەنادۆڵەوە هاتوون بۆ ئەستەنبوڵ، یان ڕێبوارە ڕۆژئاواییەکانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، یاخود لەلایەن (هۆتێلی ئیمپراتۆر)، یان لەلایەن ئەو (دوکانانەوە) کە نووسەر لە بەرگێکی کتێبەکەیدا بەدووردرێژی باسیان دەکات، زۆرترین خوازراون.



لەگەڵ هاوڕێکانم هەستمان بە هەمان خەم دەکرد، کە هەموومانی داگیر کردبوو و دەگەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی کە هیچ شتێکی تر جگە لەو خەمە، بوونی نییە. سەرنەکەوتنی کۆچو لەو لایەنەوە بووە کە نیازی بووە لە باسکردنی ئەستەنبوڵ، شێوازی پۆلێنکردنی ڕۆژئاوایی بەکار بهێنێت، چونکە لە ئەستەنبوڵ، جیاوازیی و ئاژەوەگێڕی و سەیروسەمەرەی زیاتر لە هەر شارێکی تری ڕۆژئاوایی تێدا بووە و ئەم جیاوازییە زۆرانەش ڕێگر بوون لەبەردەم کۆچو، بۆ ئەوەی ئەو شێوازە پۆلێنکردنە

بکات. لەپاش ئەوەی ماوەیەك گفتوگۆمان دەکرد، بیرمان دەکەوتەوە کە بۆچی ئێمە ئەم گەنجینەیەی ئەنسکلۆپیدیای کۆچو دەخوێنینەوە: چونکە ڕێگەی بۆ خۆش دەکردین، خۆمان لە جۆرە دەمارگیریەکدا ببینینەوە.

جیا لەوەی خوویەکی نامۆ لە شانازیکردن بە نەریتە نامۆکانی ئەستەنبولّ، دانی پێدا دەنێین کە کۆچومان خۆش دەوێت، لەبەر ئەوەی (شکستی) هێناوە. هۆکاری ئەوەی کە بۆچی (ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبولّ) سەرکەوتوو نەبووە _هەمان شکستی چوار نووسەرە تەنیاکەی تر_ لاوازیی نووسەرەکە بووە بۆ ئەوەی وەك ڕۆژئاواییەك بنووسێت. بۆ ئەوەی بە چاوێکی ترەوە سەیری شارەکە بکەن، ئەم نووسەرانە دەبوو لە بنچینەی ڕەسەنایەتی، خۆیان دوور بگرن و وەك ڕۆژئاواییەك بن و گەشتێکی ناوازەیان بۆ ئەو شوێنانە بکردایە کە لەنێوان نەریتی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلأتدا بوون. هەر وەکو سێ نووسەرە خەمبارەکەی تر، کۆچو لە ڕیزی ئەو کەسانەدا بووە کە لەنێوان هەردوو جیهانەکەدا مابوویەوە. (جارێکی تر وەك نووسەرەکانی تر) ئەو بەهایەی کە دابووی بە ڕەسەنایەتی خۆی، تەنها گۆشەگیری و تەنهایی بووە.

لە سالأنی پاش مردنی کۆچو، لەناوەڕاستی حەفتاکان، هەر کاتێك دەچووم بۆ بازاڕی گەورە، سەردانی فرۆشگای سەهەفلەرم دەکرد کە لەتەنیشت مزگەوتی بەیازیت بوو و کتێبی دوو دەستی دەفرۆشتەوە، لەناو کتێبە زەردباو و کۆن و تۆزاوییە هەرزانەکاندا، بەدوای بەرگە بێکۆتاکانی کۆچودا دەگەڕام کە لە سالأنی کۆتایی تەمەنیدا نووسیبوونی. ئەو بەرگانەی کە لە کتێبخانەکەی داپیرەم بوون، بە نرخی کتێبی بەسەرچوو دەفرۆشرانەوە، بەلأم زۆربەی ئەو کتێب فرۆشانەی کە دەمناسین، دەیانگوت زۆر دەگمەن ئەو کتێبانەیان دەفرۆشرێن.

١٩

# داگیرکردن، یاخود لەناوچوون؟ بەتورککردنی قونستەنتینیە

وەکو زۆربەی منداڵە تورکەکان، زۆر سەرسامی شاری بێزەنتە نەبووم و هەمیشە ئەم ناوەم بە قەشە خێوناسا و ڕیشدرێژ و ڕۆب ڕەشەکانی ئەرسۆدۆکسی ڕۆمانی، بەو ڕێرەوە ئاوییانەی کە هێشتاش بە شارەکەدا تێپەڕ دەبن، بە ئەیاسۆفیا و خشتی سووری دیواری کڵێساکان دەبەستەوە. بۆ من، هەموو ئەمانە پاشماوەی چەرخێکی دوورن، کە دەبێت هەندێك شتیان دەربارە بزانین. تەنانەت ئەو عوسمانییانەی کە بێزەنتەیان داگیر کرد، زۆر دوور دەردەکەون. لەپاش هەموو شتێك، خەڵکانی وەك من، واتە یەکەم نەوەکانی (شارستانیەتی نوێ) جێگەیان گرتنەوە. بەڵام لانی کەم، بە هۆی کەسانی وەکو ڕەشات ئەکرەم، کۆچو کە دەنگی عوسمانییەکان بووە دەیانناسینەوە. بە هەمان شێوە، بێزەنتە لەپاش داگیرکردنی، بەرەو لێواری لەناوچوون چووە. هیچ کەس دواتر پێی نەدەگوتم کە ئەوانە نەوەی نەوەی نەوەکانی ئەوانن کە ڕادەکەنە دوکانی کەنار ئاوەکان و دوکانی پێڵاو و کێکفرۆش و وردەواڵەفرۆشەکانی بیۆگلو.



یەکێك لە خۆشترین شتەکانی منداڵیم، سەردانکردنی دوکانی ڕۆمانییەکان لە بیۆگڵو لەگەڵ دایکم. لەو دوکانانەدا، خاوەنکارەکان بەخێرانی کارەکانیان ئەنجام دەدان. کاتێك لەگەڵ دایکم دەچووین بۆ ئەو دوکانانە و پرسیاری دەربارەی کوتاڵ بۆ پەردەکان و قوماشی قەیفە بۆ بەرگی قەنەفەکان دەکرد، دایك و باوك و کچەکانیان هەموویان بە جارێ بە شێوەزارێکی پەلەی یۆنانی وەڵامیان دەدایەوە. کاتێك دەگەڕاینەوەماڵەوە، لاسایی زمانە سەیرەکەیان و ئاماژە خۆشەکانیانم دەکردەوە کە کچەکانیان لە مێزی ژمێریارییەوە بۆ باوك و دایکیان دەیانکرد. کاتێك لە ماڵەوە لاساییم دەکردنەوە، تێدەگەشتم کە ئەو یۆنانییانەی کە لە کۆڵانە هەژارەکان بە ناسنامەی خۆیانەوە دەژین، زۆر (بەڕێزەوە) ڕەفتارمان لەگەڵ ناکەن. دەبێت ئەم جۆرە مامەڵەکردنەیان، بە هۆی موحەمەدی بەزێنەر بووبێت کە شارەکەیانی لێ سەندوونەتەوە. (٥٠٠)هەیەمین یادکردنەوەی ساڵانەی دەستبەسەراگرتنی ئەستەنبوڵ _هەندێك جار پێی دەگوترا (موعجیزە گەورەکە)_ لە ساڵی ١٩٥٣، ساڵێك لەپاش لەدایکبوونی من ئەنجام دراوە. بەلام بە تێڕوانینی من، هیچ موعجیزەیەك نەبوو جگە لە کۆمەڵێك چالاکی کە لەو ڕۆژەدا ئەنجام دەدران. یەکێك لەو چالاکییانە، هاتن و ڕۆشتنی کەشتییەکان بوون لەناو دەریاکەدا. یەکێکی تر پیشاندای وێنەیەکی موحەمەدی بەزێنەر بوو، کە لەلایەن نیگارکێش (بیلێن) کێشرابوو، سێیەم چالاکی، پیشاندانی قوللەی ڕوملی حیسار بوو. دەتوانرێت بگوترێت هەموو چالاکییەکان، چەند زنجیرەیەکی پیشاندانی هەموو ئەو وێنە پیرۆزانە بوون کە پەیوەندییان بە داگیرکردنەکەوە هەبوو.



تەنها بەپێی ئەو ڕووداوە مێژووییانەی کە خەڵك دەیانگێڕانەوە، دەتوانیت بڕیار بدەیت کە تۆ ئایا لە بەشی ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا وەستاویت. بۆ ڕۆژئاواییەکان، ٢٩ی ئایاری ١٤٥٣، ڕۆژی لەناوچوونی قونستەنتینیەیە، لە کاتێکدا بۆ ڕۆژهەڵاتییەکان ئەو ڕۆژە داگیرکردنی ئەستەنبوڵە. چەند ساڵ دواتر، کاتێك هاوسەرەکەم لە زانکۆی کۆلۆمبیا دەیخوێند، لە یەکێك لە تاقیکردنەوەکاندا وشەی (داگیرکردنی) بەکار هێنابوو، مامۆستا ئەمەریکییەکەی تاوانباری کردبوو بە هۆی ئەو هەستە نەتەوایەتییەوە. لە ڕاستیدا بەکارهێنانی وشەکەی بەو جۆرە، لەبەر ئەوە بوو لە قوتابخانەی دواناوەندی بەو جۆرە فێر کرابوو، چونکە دایکی ڕووسی بووە و زیاتر سۆزی بەلای ئەرسۆدۆکسی کریستیانیدا ڕۆشتووە. یاخود دەبێت لایەنگری هیچکام لە (داگیرکردن یان لەناوچوون) نەبوویێت، بەڵکو وەك بارمتەیەکی بێچارە لەنێوان هەردوو لاکەدا گیری خواردبێت و هیچ هەڵبژاردنێکیان بۆ نەهێشتبێتەوە، جگە لەوەی ببێتە موسڵمان یاخود کریستیان.

ڕۆژئاواییبوون یان هەستی نەتەوایەتیی تورکی، هانی خەڵکی ئەستەنبوڵی دەدا کە ئاهەنگی داگیرکردنەکە بگێڕن. لە سەرەتای سەدەی بیستەیەم، تەنها نیوەی دانیشتووانی شارەکە ئیسلام بوون، زۆربەیان مسوڵمان نەبوون، کە ئەوانیش نەوەکانی خەڵکی شاری بێزەنتەی یۆنانی بوون. کاتێك منداڵ بووم، جۆرە دەمارگیرییەکی ئەوەها لەناو تورکەکاندا بوو کە هەر کەسێك شارەکە بە ناوی قونستەنتینیە بانگ بکات، ئەوا ئەو کەسە بوونەوەرێکی نەویستراوە و خەون بەو ڕۆژەوە دەبینێت کە ئەو کەسانەی ڕۆژێك ڕابەرایەتیی شارەکەیان کردووە، بگەڕێنەوە و تورکەکان ڕاو بنێن لە شارەکە کە ماوەی پێنج سەد ساڵە داگیریان کردووە _یاخود لانی کەم ببنە دانیشتووانی پلە دووی شارەکە. کەسە دەمارگیرە نەتەوەپەرستەکان، سوور بوون لەسەر وشەی *(داگیرکردن)*، بەپێچەوانەوە هەندێك لە عوسمانییەکان، ئاسوودە بوون بە شارەکە بڵێن قونستەنتینیە.

تەنانەت لەم سەردەمەی منیشدا، زۆربەی ئەوانەی لایەنگری بیرۆکەی ڕۆژئاوایی کۆماری بوون، لە باسکردنی داگیرکارییەکە زۆر وریا بوون. لە (٥٠٠)ەیەمین ساڵیادی ڕووداوەکە، نە سەرۆکی وڵاتەکە (جەلال بەیار)، نە عەدنان مەندرەسی سەرۆکوەزیران، بەشداریی ئاهەنگەکەیان نەکرد. هەرچەندە چەندین ساڵ نەخشە دانرابوو کە هەر کارێك

بکرێت ببێتە هۆی دروستبوونی تووڕەیی و ئاژاوە لەنێوان یۆنانییەکان و تورکەکانی ئەندامی هاوپەیمانی ولآتانی ڕۆژئاوا. کاتێك جەنگی سارد دەستی پێ کرد، تورکیا ئەندامی ڕێکخراوی ناتۆ بوو، نەیدەویست داگیرکردنەکە بەبیری جیهان بێنێتەوە. هەرچەندە سێ سال دواتر حکومەتی تورکیا، بە ڕێگەدان بە دروستکردنی شەڕ و توندوتیژی لە شارەکەدا و بە تالآنبردنی سامانی یۆنانییەکان و کەمەنەتەوایەتییەکانی تر، هانی دروستبوونی ئەو ئاژاوەگێڕییەی دا کە دەکرێت پێی بگوترێت (پەتای داگیرکردن). لە ماوەی گێرەشوێنییەکاندا، کۆمەڵێك کڵێسا ڕووخێنران و هەندێك قەشە کوژران. هەندێك لە نووسەرە ڕۆژئاواییەکان، باسی دڕندەییەکانی لەناوچوونی قونستەنتینیە دەکەن. هەردوو حکومەتی تورکی و یۆنانی بەرپرس بوون لە مامەڵەکردنی بە کەمەنەتەوایەتییەکانەوە، وەك بارمتەی جوگرافیایی و ڕامیاریی نێوانیان، لەبەر ئەوە یۆنانییەکان لە پەنجا ساڵی ڕابردووی پێش ساڵی ١٤٥٣، ئەستەنبوڵیان جێ هێشتووە.

لە ساڵی ١٩٥٥، کاتێك بەریتانیا ولآتی قبروسی جێ هێشت، ئەو کاتەی حکومەتی یۆنانی لە ئامادەکاریدا بوو بۆ دەستبەسەراگرتنی دوورگەکە، سیخوڕێکی دەزگای سیخوڕیی تورکیا، بومبێکی خستە ئەو ماڵەی کە ئەتاتورکی تێدا لەدایك بووبوو لە سالۆنیکا کە شارێکی یۆنانی بوو. دواتر ڕۆژنامە تورکییەکان هەواڵەکەیان بە چاپێکی تایبەت و بەزیادەوە بڵاو کردەوە، ئاژاوەگێڕە نەیارەکان لە گۆڕەپانی تاقسیم کۆ بوونەوە، دواتر هەموو ئەو دوکانانەی بیۆگلۆیان سووتاند، کاول کرد و تالآن برد کە من و دایکم سەردانمان دەکردن.

باندی ئاژاوەگێڕییەکان، زۆر توندوتیژ بوون و هۆکاری دروستبوونی گەورەترین تیرۆر بوون لە ناوچەکانی وەکو ئۆرتاکۆی، بالیکی، سەماتیە، فەنەر و ئەو کۆلآنانەی زۆرترین خەڵکی یۆنانیی تێدا کۆ بووبوونەوە. باندەکان تەنها بە سووتاندن و کاولکردنی دوکانی سەوزە و میوەفرۆش و دوکانی شیرینییەکانی یۆنانی نەدەوەستان، بەڵکو دەچوونە ناو ماڵەکانیان و دەستدرێژییان دەکردە سەر ژنانی یۆنانی و ئەرمەنییەکان. کەواتە دەتوانین بڵێین ئاژاوەگێڕەکان، وەك ئەو سەربازانە دڵڕەق و بێبەزەیی بوون کە لەدوای ئەوەی موحەمەد دەستی گرت بەسەر شارەکەدا، پەلاماری خەڵکەکەیان دەدا.

دواتر ئاشکرا بوو کە ڕێکخەری ئاژاوەگێڕییەکان _ئەو کەسانەی کە لە ماوەی دوو ڕۆژ تیرۆر و تووڕەییان شارەکەیان خستبوویە دۆخێکی دۆزەخیی خراپەوە _پارمەتیی دەوڵەتیان لەپشتەوەیە.

بە درێژای شەو، هەر کەسێك کە مسوڵمان نەبووایە و بە شارەکەدا بگەڕایە، دوور لە یاسا لەسێدارە دەدرا. کە ڕۆژ دەبوویەوە، دوکانەکانی بیۆگڵو وێران کرابوون، شووشەی پەنجەرەکانیان وردوخاش کرابوون، دەرگاکانیان بە لەقە شکێنرابوون و شتومەکەکانیان دزرابوون یان پژێنرابوون. جلوبەرگ، مافوور، بەفرگری هەڵگەڕاو، ڕادیۆ و ئامێری جلشۆر بە هەموو لایەکدا پەرشوبڵاو بووبوونەوە. شەقامەکان پڕ بوون لە شووشەواتی وردکراو، گەمەی منداڵان (باشترین دوکانەکانی گەمەی منداڵان لە بیۆگڵو بوون)، کەلوپەلی مەتبەخ، پارچە شووشەی وردکراوەی ئەکواریۆمی ماسی و سورەیای مۆم کە لەو کاتەدا زۆر باو بوون. لێرە و لەوێ پاسکیلی شکاو، ئۆتۆمبێلی هەڵگەڕاو و پیانۆی شکێنراو دەبینران و بووکەڵەی جلوبەرگ نواندن بەشکاوی لە ئاسمانەوە سەیری شەقامە بە جل داپۆشراوەکانیان دەکرد. تانکەرەکانی دەوڵەت بۆ دامرکاندنەوەی ئاژاوەکان، زۆر درەنگ دەگەیشتن.



لە ساڵانی دواتردا، خێزانەکەم ئەوەندە بەگڕوتینەوە باسی ڕووداوەکانیان بۆ دەگێڕامەوە، وەك ئەوەی بە چاوی خۆم بینیبێتم. بۆیان باس دەکردم کاتێك دوکانی

کریستیانەکان چۆڵ کرابوون، چۆن مامم و داپیرەم لەم پەنجەرەوە ڕایانکردووە بۆ پەنجەرەیەکی تر بۆ ئەوەی بەترسەوە سەیری ئەو چەتانە بکەن کە لە شەقامەکەی نزیك ئێمە هاتوچۆیان کردووە، پەنجەرەی دوکانەکانیان شکاندووە و جنێویان بە یۆنانی و کریستیان و دەوڵەمەندەکان داوە. جاروبار لەبەردەم باڵەخانەکەی ئێمە، ئەو باندانە کۆ دەبوونەوە. براکەم زۆر حەزی لە ئاڵای تورکیا بوو، لەو کاتەدا لە دوکانی عەلادین ئاڵایەکی کڕیبوو، بەهیوای پیشاندانی هەستی نەتەوایەتی و گەڕان بە شارەکەدا بەئاسوودەیی، ئاڵاکەی بە ئۆتۆمبێلەکەی مامەوە هەڵواسرابوو. دەشێت لەبەر ئەم هۆیە بووبێت کە چەتەکان بەلای ئۆتۆمبێلەکەی مامدا ڕەت دەبوون، بەبێ ئەوەی وەریگێڕن یان زیان بگەیەنن بە پەنجەرەکانی.



## ٢٠

# ئایین

هەتا تەمەنی دەساڵی، وێنەیەکی خودام لە مێشکی خۆمدا دروست کردبوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، وێنەکە بوونی نەما. وێنەی خودا، لە شێوەی ئافرەتێکی بەڕێزی ڕووخسار نادیادا بوو. هەرچەندە لە مرۆڤ دەچوو، بەڵام زۆرتر لێکچوونی لەگەڵ ئەو تارماییانەدا هەبوو، کە خەیاڵەکانمیان قەرەباڵغ کردبوو. کاتێك وێنەکە ل بەرچاوم دەردەکەوت، سەرەوخوار دەبوو و لار دەبوویەوە بۆ یەك لا. تارماییەکانی دونیا خەیاڵییەکەم کاتێك ون دەبوون، هێدی هێدی کاڵ دەبوونەوە، وێنەی خوداش هەروەك ئەوان دیار نەدەما، بەڵام بە جۆرە لوولبوونێکی جوان و خێرا بەدەوری جیهاندا دەخولایەوە، هەروەك لە هەندێ فیلم و کەناڵی بازگانیدا چاوم پێی کەوتبوو. وێنەکەی بە جۆرێکی خێرا و تیژ بەرز دەبوویەوە، کاڵ دەبوویەوە و بەرەو شوێنە ڕاستییەکەی خۆی لەناو هەورەکان دەچوو. پێچانەوەکانی سەرپۆشە سپییەکەی هێندە تیژ و گەورە بوو، هەر وەکو پەیکەرەکان، یان وەك وێنەی ناو کتێبە مێژووییەکان، شۆڕ بووبوونەوە و هەموو جەستەیان داپۆشیبوو و تەنانەت دەستی و قاچی دیار نەبوون. هەر کات ئەم تارماییە لەبەردەمدا دەردەکەوت، بە کەمێك ترسەوە هەستم بە هێز و مەزنی و تواناکەی دەکرد. لەبیرم نییە هیچ کات داوای یارمەتی، یان ڕێنماییم لێ کردبێت. دەمزانی خەڵکی وەك من گرنگی پێ نادەن، بەڵکو تەنها لە ژیانی هەژارەکاندا بوونی هەیە.

دەمزانی لەناو ئەو خەڵکانەی لە باڵەخانەکەی ئێمە دەژیان، تەنها خزمەتکار و چێشلێنەرەکان بایەخیان بە تارماییەکە دەدا و خۆشەویستیی خودا بە هۆی ئەوانەوە،

هەموو ئەو کەسانەشی دەگرێتەوە کە لەژێر هەمان سەقفدا دەژیان، بەڵام پێم وا بوو ئێمە ئەوەندە بەبەختین، پێویستمان بە خۆشەویستیی ئەو نییە. خودا لێرەیە بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانەی لە ئازاردان، بۆ سەبووریی ئەو هەژارانەی ناتوانن منداڵەکانیان فێری خوێندن بکەن، بۆ بایەخدان بەو سواڵکەرانەی کە هەمیشە لەسەر شەقامەکان دەکڕووزێنەوە و بۆ یارمەتیی کەسە بێتاوان و دڵپاکەکان لە کاتی سەختەکانی ژیانیان، چونکە کاتێك دایکم گوێی لێ دەبوو کە بەفر و سەرما ڕێگای گوندە دوورەکانی داخستووە، یاخود زەمینلەرزەیەك چەندین کەسی بێ ماڵ و ژیان کردووە، دەیگوت: "خودایە گیان، یارمەتییان بدە!"، دەبێت ئەم داواکارییە لە خودا بە هۆی هەستکردن بە گوناه نەبێت کە لەو کاتانەدا هەستی پێ دەکەین، بەڵکو بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی بێدەسەڵاتیمانە کە دەزانین ناتوانین هیچ بکەین بۆ بارودۆخەکە.

وەکو هەر بوونەوەرێکی ئاسایی، بەمتمانەوە دڵنیاین کە ئەو دەرکەوتنە نەرمونیانە کە جوانی و نوورەکەی لەپشت داپۆشەرە سپییەکانەوە شاردۆتەوە، لەوانەیە ئامادە نەبێت هەموو کات گوێ بۆ داواکارییەکانمان بگرێت. ڕەنگە هۆی ئەوەش، لەبەر ئەوە بێت کە هیچ شتێکمان لەبەرامبەردا بۆ نەکردووە. لە کاتێکدا هەموو چێشتلێنەر و خزمەتکارەکانی باڵەخانەکەی ئێمە، لەگەڵ هەموو ئەو کەسە هەژارانەی تر کە لەدەورمان بوون و پێویست بوو بەقورسی کار بکەن، بەدوای هەر دەرفەتێکدا دەگەڕان بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ خودا ببەستن و تەنانەت هەموو ساڵێك مانگێکی تەواو بەڕۆژوو دەبوون. ئەسما خاتوون هەر کات کارەکانی تەواو کردایە، بەپەلە دەچوویە ژوورە بچووکەکەی و بەرماڵەکەی دەردەهێنا، دەستی دەکرد بە نوێژکردن. لە کاتی خۆشی و ناخۆشی و ترس و تووڕەیی، ئەو هەموو کات خودای لەیاد بوو. کاتێك دەرگای بکردایەتەوە یان دابخستایە، یاخود یەکەم جار یان کۆتا جار کارێکی بکردایە، بە ناوی خودا دەستی پێ دەکرد و دواتر هەندێ شتی تری بەچرپەچرپ دەگوت.

بە بیرکردنەوە لە خودا، تووشی نیگەرانی نابین، تەنها لەو ساتانەدا نەبێت کە بیر لە پەیوەندیی نادیاری دەکەینەوە لەگەڵ خەڵکی هەژار. دەتوانین بڵێین، هێشتاش هەست بە ئارامی دەکەین کاتێك دەزانین ئەو کەسە لێقەوماوانە دەتوانن پشت بە

کەسێك ببەستن بۆ ئەوەی لە ناهەمواری ڕزگاریان بکات، هێزێکی تر هەیە کە بارگرانیی سەرشانیان کەم بکاتەوە. بەڵام زۆر جار ئەم جۆرە بیرکردنەوە ئاسوودەییە بە هۆی ترسەوە لەناو دەچێت، چونکە دەترسین ڕۆژێك کەسە هەژارەکان پەیوەندیی تایبەتیان لەگەڵ خودا لە دژی ئێمە بەکار بێنن.

لەبیرمە کاتێك دەمبینی خزمەتکارە پیرەکەمان نوێژ دەکات، هەستم بە بێزاری دەکرد. لە دەرگا نیوە کراوەکەیەوە سەیری ئەسما خاتوونم دەکرد، کە لە کاتی نوێژەکەیدا کەمێك لە خودای ناو خەیاڵەکانم دەچوو. پێش ئەوەی لەسەر بەرماڵی نوێژەکەی سەری بە هەردوو لاکەدا بسووڕێنێت، بەهێواشی دەچەمییەوە بۆ ئەوەی سەری بدات لە زەوییەکە، ئینجا هەڵدەسایەوە و جارێکی تر دەچەمییەوە، لە کاتی کڕنووشبردندا وەك کەسێك دەردەکەوت کە دەروەزە بکات و ڕازی بێت بەو جێگە و پلە نزمەی لە دونیادا هەیەتی. بەبێ ئەوەی بەتەواوەتی بزانم کە بۆچی وا بیر دەکاتەوە، هەستم بە نیگەرانی و تووڕەیی دەکرد. ئەسما خاتوون کاتێك کاری نەبووایە یاخود کەس لە ماڵ نەبووایە، نوێژی دەکرد، لەبەر ئەوە بێدەنگیی ماڵەکە بە چرپەچرپەکەی دەشکا، ئەمەش منی پەست دەکرد. لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە سەیری ئەو مێشەم دەکرد کە لەسەر شووشەی پەنجەرەکە دەهات و دەچوو، دواتر کاتێك مێشەکە دەکەوتە سەرپشت و ململانێی دەکرد بۆ ئەوەی ڕێك بێتەوە، ڤیزەڤیزی باڵە نیمچەڕوونەکانی لەگەڵ چرپەچرپەکەی ئەسما خاتوون تێکەڵ دەبوون، لەناکاو ئارامیم لێ دەبڕا و دەستم دەکرد بە ڕاکێشانی سەرپۆشی ژنە داماوەکە.

کاتێك خۆم هەڵدەقورتاندە ناو نوێژەکەیەوە، تووڕەیی پێوە دیار بوو. کاتێك ئافرەتە بەتەمەنەکە هەموو ئیرادەیەکی خۆی بەکار دەهێنا بۆ پشتگوێخستنی من و تەواوکردنی نوێژەکەی، وا دەردەکەوت ئەو شتەی ئەو دەیکات، بەتەواوەتی هەڵەیە. هیچ شتێك نەبوو جگە لە گەمەیەك (چونکە لەو کاتەدا، تەنها وا خۆی دەردەخست کە نوێژ دەکات)، بەڵام ئەوەی کاری لە من دەکرد، ئەو سووربوونەی بوو بۆ بەردەوامیدان بە نوێژەکەی، وەك ئەوەی کێبڕکێ بکات، بەرگریی دەکرد. کاتێك خودا دەکەوتە نێوان من و ئەم ئافرەتەوە _ئەو ئافرەتەی منی زۆر خۆش دەویست، هەمیشە لەباوەشی دەگرتم و بەو کەسانەی لەدەرەوە سڵاوی لێ دەکردن، دەیگوت "ئەم منداڵە،

کوڕەزامە!"_ وەك هەر کەسێکی تری خێزانەکەم هەستم بە نائارامی دەکرد بەرامبەر باوەڕی کەسە توندڕەوەکان. وەك هەر تورکێکی بۆرجوازی عیلمانی، ترسی من لە خودا نەبوو، بەڵکو لە توندڕەویی ئەو کەسانە بوو کە بە ڕادەیەکی زۆر باوەڕیان بە خودا هەبوو.



هەندێك جار کە ئەسما خاتوون لە نیوەی نوێژەکەیدا بوو، زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدەدا، یاخود دایکم کارێکی هەبوو بانگی دەکرد، بیرم دەکردەوە بەخێرایی ڕابکەم بۆ لای دایکم و بڵێم نوێژ دەکات. هەندێك جار وام دەکرد، هەندێك جاریش کاتێك بێزار دەبووم، حەزم دەکرد کێشە دروست کەم و بزانم چی ڕوو دەدات. خواستێکی زۆرم هەبوو بۆ ئەوەی بزانم کامەیان بەهێزترە: دڵسۆزیی خزمەتکارەکە بۆ ئێمە، یاخود دڵسۆزیی بۆ خودا. پەرۆشییەکی زۆرم هەبوو بۆ دروستکردنی جەنگ لەو دونیایەی تر کە خزمەتکارە هەڵهاتبوو و ڕۆشتبوو بۆ ئەوێ، لەو دونیایەی کە هەندێك جار بە تووڕەیی و هەڕەشەوە دەگەڕایەوە و جێی دەهێشت.

خزمەتکارەکە پێی دەگوتم: "ئەگەر ئەم جارە لە کاتی نوێژدا سەرپۆشەکەم ڕاکێشی، دەستەکانت دەبن بە بەرد!"

بەڵام بەردەوام بووم لەسەر کارەکەی خۆم و هیچ شتێکیش ڕووی نەدەدا. هەر وەکو ئەو کەسانەی کە گەورەتر بوون لە خۆم، کاتێك دەیانگوت کە باوەڕیان بەو جۆرە قسانە نییە، بەڵام هەر بەوریاییەوە ئەو کارەیان دەکرد، منیش دەمزانی شتێك لەپشت قسەکەیەوە هەیە، لەبەر ئەوە نەمدەوێرا گاڵتەی پێ بکەم. لە کاتێکدا هەروەك خۆم

بووم و نەببووم بە بەرد، بەڵام وەك هەر ئەندامێکی تری خێزانەکەم فێر بووبووم، ئەگەر ویستم گاڵتە بە ئایین بکەم یان بێبایەخیی خۆمی بۆ دەرببڕم، لەو کاتەدا ڕاسترین شت ئەوەیە بابەتەکە بگۆڕم. ئێمە ئایین و هەژاریمان یەکسان کردبوو بە یەك.

بە تێڕوانینی من، ئەو جۆرە کەسانە بە هۆی هەژارییانەوە، هەمیشە ناوی خودا لەسەر لێویانە. هۆکاری گەیشتنم بەو ئەنجامە هەڵەیە، بە هۆی خێزانەکەم بووە کە بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕانە و بێباوەڕانە سەیری هەر کەسێکی باوەڕداریان دەکرد، کە لە ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ دەکات.

ئەگەر خودا هێدی هێدی لە پیشاندای خۆی لە داپۆشراوێکی سپی و بەنرخدا وەستابێت، ئەگەر پەیمانی من لەگەڵ خودا گۆڕابێت بۆ بابەتی ترس و هۆشیارکردنەوە، بەشێکی بە هۆی بیروباوەڕیی خێزانەکەمەوە بوو کە هیچ کامیان هەرگیز هیچ ڕێنماییەکی ئایینییان فێر نەدەکردم. لەوانەشە هیچ شتێکیان لەو بوارەدا نەزانیبێت، هەتا فێرم بکەن: هەرگیز هیچ ئەندامێکی خێزانەکەم نەدیوە بچەمێتەوە بۆ نوێژکردن، یاخود بەڕۆژوو بێت، یان بەچرپەچرپ بپاڕێتەوە. لەم ڕووەوە، خێزانەکانی وەك ئەوەی من وەك ئەو خێزانە بۆرجوازە بێباوەڕانەی ئەورووپا بوون، کە هیچ ئیرادەیەکیان تێدا نییە بۆ ئەو کردارانە.

ڕەنگە ئەمە گاڵتەجاڕییەکی دوور لە نەریت بێت، بەڵام بەپێی بیروباوەڕی عیلمانیەتی توندڕەوی ئەتاتورك، ئەگەر لە ئایین دوور بکەویتەوە، ئەوا زۆرتر مۆدێرنتر و ڕۆژئاوایی دەردەکەویت. بەڵام بوارێکی گشتی دەگرێتە خۆی، چونکە لە ژیانی تایبەتدا هیچ شتێك بۆشاییە ڕۆحییەکان پڕ ناکاتەوە. ماڵ بەبێ ئایین، وەك ***یاڵە*** چۆڵ و کاولەکانی شارەکەیە، کە ئەوەندە تاریکە وەك باخچە تاریك و بێ گوڵەکانی دەوری ئەم کۆشکانەیە.

کەواتە لە ماڵی ئێمە، پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییانە بۆ خزمەتکارەکان جێ هێڵرابوو (هەروەها گومانەکانی منیشیان دەڕەواندەوە_ئەگەر خودا ئەوەندە گرنگ نییە، ئەی ئەم هەموو مزگەوتانە بۆچی دروست کراون؟). بینینی گەمژەیی ئەو بیروباوەڕە ئەفسانەییانە، کارێکی قورس نەبوو. خزمەتکارەکەمان دەیگوت: "ئەگەر دەستکاریی ئەو شتە بکەیت، دەستەکانت دەبن بە بەرد." یان دەگوترا: "زمانی بەستراوە."،

"فریشتەیەك دێت و دەبیات بۆ بەهەشت."، "هەرگیز قاچی چەپت پێشتر مەخە."
هەموو ئەو پارچە قوماشانەی کە بەسترابوون بە گۆڕی شێخەکانەوە، هەموو ئەو مۆمانەی لە جیهانگێر بۆ سۆفی بابا داگیرسابوون، دەرمان و چارەسەری ژنە پیرەکان کە تەنها خزمەتکارەکان وەریاندەگرتن، چونکە هیچ کەس نەیدەناردن بۆ لای پزیشك، قسەی چەندین سەدەی دەروێشەکان کە تەنانەت لە ماڵە کۆماری و ئەورووپییەکانی تورکیا لە شێوەی بەند، وتە، هەڕەشە و پێشنیار دەوترێنەوە. لاوانەیە هەموو قسە خورافییانە بێمانا بن، بەڵام لە ژیانی ڕۆژانە بەکار دەهێنرێن. تەنانەت ئێستاش کاتێك لە مەیدانێکی گەورە، یاخود لە ڕێڕەوێك یان شۆستەیەك بە ڕێگادا دەڕۆم، لەپڕ بیرم دەکەوێتەوە بەسەر درزی ڕێگاکەدا هەنگاو نەنێم. لە کاتی ڕۆشتنەکەم، لەناو ئەو خەیاڵانەدا ون دەبم.

هەندێك لەم ڕاسپاردە ئایینیانە لەگەڵ ڕێنماییەکانی دایکم (وەکو "ئاماژە مەکە") تێکەڵ دەبوون، یاخود کاتێك پێی دەگوتم کە دەرگا و پەنجەرەکە نەکەمەوە، چونکە هەوای سارد دێتە ژوورەوە، لە خەیاڵمدا هەوای سارد بەتەواوەتی وەك ئەیاسۆفیا پیرۆز دەهاتە پێش چاوم و بیرم دەکردەوە نابێت ڕۆحی هیچکامیان تووڕە بکرێت.

زۆر جار وەك سیستمێك سەیری ئایین دەکەین، کە خودا لە ڕێگەی پێغەمبەر و کتێبە ئایینییەکانەوە پێی گەیاندووین، یاخود ئایین بۆ چەند یاسایەکی سەیر و سەرنجڕاکێش بچووك دەکەینەوە کە چینە نزمەکانی کۆمەڵگا پشتی پێ دەبەستن. کاتێك ئایین لە هێزەکەی جیا بکەینەوە، ئەوکات دەتوانین وەك جۆرە باگراوەندێکی نامۆی موزیك لە ماڵەکانمادا قبوڵی بکەین و هاودەمی دوودڵیمان بکات لەنێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات. هیچ کام لە داپیرەم، دایکم، باوکم. مام و ئامۆژنەکانم بۆ تەنها ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەبوون، بەڵام بە مانگی ڕەمەزاناندا وەکو هەر کەسێکی برسیی بەڕۆژوو، چاوەڕێی بەربانگیان دەکرد. لە شەوانی ڕەمەزانیش، ئەگەر زستان بووایە و شەو درێژ بووایە، داپیرەم لەگەڵ هاوڕێکانی کۆ دەبوویەوە و گەمەی وەرەق و پۆکەریان دەکرد. هەندێك گۆڕانکاری هەبوون لە مانگی ڕەمەزاندا. لە مانگەکانی تردا ئەم ئافرەتە بەتەمەن و شۆخانە بەدەم گەمەکەیانەوە، خواردن و خواردنەوەیان نۆش دەکرد، بەڵام لە مانگی ڕەمەزاندا کاتێك کاتی ئیفتار نزیك دەبوویەوە، لە گەمەکەیان دەوەستان و بۆ

ئەوەی نان بخۆن. دەوری مێزەکەیان دەدا و بەپەرۆشەوە سەیری سەر مێزەکەیان دەکرد کە بە مرەبای هەموو جۆرە میوەیەك، هەموو جۆرە پەنیرێك، زەیتوون، بۆرەکی چین چین لەسەر یەك و گۆشتی سەوسەجی بە سیر ئامادەکراوی ڕازێنرابوویەوە. کاتێك لە ڕادیۆ گوێبیستی دەنگی فلووت دەبوون ( واتای نزیکبوونەوەی وادەی ڕۆژووشکانی دەگەیاند)، بە چاوێکی برسییەوە سەیری سەر مێزەکەیان دەکرد. هەر وەکو مسوڵمانە ئاساییەکانی تر کە لە سەددا ٩٥ی شارەکەیان پێك هێنابوو، هەتا کاتی ئێوارە بەبێ خواردن دەمانەوە. ئافرەتەکان پرسیاریان لە یەك دەکرد: "چەندی ماوە؟"، کاتێك گوێبیستی دەنگی تەقینی تۆپەکە دەبوون، چاوەڕێیان دەکرد هەتا بەکر لە چێشتاخەنەکە شتێك ئامادە بکات. هەتا ئەمڕۆش کاتێك گوێبیستی دەنگی فلووت دەبم، دەمم ئاو دەکات.

یەکەم سەردانکردنم بۆ مزگەوت، یارمەتیی دام بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو بیرۆکەیەی هەمبوو دەربارەی ئایین بەگشتی و ئیسلام بەتایبەتی. گەشتەکەم بەڕێکەوت ڕووی دا: نیوەڕۆیەکیان کەس لە ماڵ نەبوو، ئەسما خاتوون بەبێ ئەوەی مۆڵەت لە کەس وەربگرێت، دەستی گرتم و بردمی بۆ مزگەوت، چونکە لە ماڵەوە بە هۆی هیلاکییەوە نەیدەتوانی بەتەواوەتی پەرستش بکات. لە مزگەوتی تەشویقیە، نزیکەی بیست هەتا سی کەسی لێ بوو _ئەوانیش زۆربەیان خاوەن دوکانەکانی کۆڵانەکانی نزیك مزگەوتەکە بوون، یان ئەو خزمەتکار، چێشتلێنەر و پاسەوانانە بوون کە بۆ خێزانە دەوڵەمەندەکانی نیشانتاش کاریان دەکرد_ کاتێك لەسەر فەرشەکان کۆ دەبوونەوە، لە دەستە هاوڕێیەك دەچوون کە قسەیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، زیاتر لەوەی دەستەیەکی خواپەرستی بن. لەو دەمەی چاوەڕێی بانگیان دەکرد، بەچرپەچرپ مشتومڕیان لەگەڵ یەکدی دەکرد. کاتێك بەناو ڕیزەکانیاندا بەرەو سووچەکانی مزگەوتەکە ڕامدەکرد، هیچ کامیان سەرزەنشتیان نەدەکردم، بەڵکو بزەیەکی بۆ دەکردم هەر بەو جۆرە شیرینەی کە کوڕە لاوەکان بۆیان دەکردم. ئایین لەوانەیە تایبەت بێت بە خەڵکی هەژار، بەڵام لێرە بۆم دەرکەوت بەپێچەوانەی کاریکاتێری ڕۆژنامەکان و کۆمارییەکانی وەکو ماڵی ئێمە، کەسانی دیندار، خەڵکی بێزیانن.

لەگەڵ ئەوەشدا لە کەسە دەوڵەمەندەکانی دەوروپشتمەوە، لە باڵەخانەی پاموك تێگەیشتم کە دڵە پاك و چاکەکەی ئەو کەسانە، بەهایەکی زۆری هەیە. بەڵام ئایین خەونی بەدەستهێنانی نوێگەری، دەوڵەمەندی و ڕۆژئاواییبوونی تورکیای گران کردبوو. خێزانی ئێمە وەك لاساییکەرەوەیەکی ڕۆژئاوایی و دەوڵەمەند، بە مافی خۆیان دەزانی فەرمانڕەوایی چینی ڕۆشنبیر بکەن و ڕێگری لە بەکارهێنانی ئەو قسە خورافییانە بکەن، نەك لەبەر ئەوەی ئایین بۆ ئێمە شیاو نیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی پەیوەندیی بە داهاتووی شارەکەمانەوە هەبوو. ئەگەر داپیرەم بیزانیایە کارەباچییەکان کاری چاککردنەوەکانیان جێ هێشتووە و چوون بۆ نوێژکردن، ئەوا تووڕە دەبوو، بەڵام دەتوانم بڵێم تووڕەبوونەکانی داپیرەم کەمتر بە هۆی جێهێشتنی کارەکەیان بەنیوەوناچڵی نەبوو، زیاتر بە هۆی ئەوە شتە تەقلیدی و کردارییانە بوو کە بووبوونە هۆی پەککەوتنی گەشەسەندنی وڵاتەکەمان.

لایەنگرە بەوەفاکانی ئەتاتورك، ئەوانەی دەستیان گرتبوو بەسەر ڕاگەیاندندا و بە پیشاندانی کاریکاتێری ئافرەتە عەبا ڕەشەکان و پیاوە تەزبیح لە دەستەکان، گەمەیان بە دین دەکرد، لەگەڵ ئەوانەی دەستگرتنیان بەسەر هەموو بۆنە و یادەکانی قوتابخانەکان، بە دەربڕینی ڕێز بۆ شەهیدەکانی شۆڕشی کۆماری _هەموو ئەمانە بیریان دەخستینەوە کە حکومەتی وڵاتەکە لە ئێمەیە و لایەنگری ئێمەیە زیاتر لە هەژارە دیندارەکان و ئەو کەسانەی بە پەرستشەکەیان بێزاریان کردبووین. بەڵام بە هۆی ئەو هەستە دەمارگیرییە ئەندازیاری و بیرکارییە کە لە ماڵی ئێمە هەبوو، دەتوانم بڵێم پسپۆڕیی خێزانەکەم پشتی بە سامانەکەمان نەبەستبوو، بەڵکو پشتی بە ئاستی تێڕوانینی ڕۆژئاوایی و نوێگەریی ئێمە بەستبوو. لەبەر ئەوە بە چاوێکی کەمترەوە دەمانڕوانییە ئەو خێزانانەی کە دەوڵەمەند بوون و وەك ئێمە ڕۆژئاوایی نەبوون. ئەم جۆرە جیاوازیکردنە کاتێك سەری هەڵدا، کە دیموکراسیەتی تورکیا گەشەی سەند، دەوڵەمەندەکانی گوند و هەرێمەکانی تر کە هیچ ئەزموونێکی نوێگەری و کلتووریی ڕۆژئاواییان نەبوو، بەلێشاو هاتنە ئەستەنبوڵ بۆ ئەوەی خۆیان تێکەڵی کۆمەڵگای ئێرە بکەن، کە دواتر کاریگەریی خراپیان هەبوو لەسەر شکستهێنانەکەی باوکم و مامم و دەوڵەمەندەکانی تر و تووشی چەندین ڕیسوابوونی دارایی هاتن. کەواتە ئەگەر ئەم

جۆره فراوانبوونه پێناسەی ئێمەی وەك دەوڵەمەندی شكۆدار بكردایە، دەبێت چۆن پێناسەی ئەم دەوڵەمەندە نوێیە ئایینییانەمان بكردایە؟ (لەو ڕۆژانەدا هیچ شتێكم دەربارەی سۆفیگەری و مەولانا و پاشماوە گەورەكانی فارسی نەدەزانی) هەموو ئەوەی دەمزانی كە دەوڵەمەندە نوێیەكان لەلایەن سیاسییە چەپەكانەوە بە (جووتیارە دەوڵەمەندەكان) ناسرابوون، بە تێڕوانینی ئەوان، هیچ جیاوازییەكیان لەگەڵ شوفێرە تایبەتییەكانیان و چێشتلێنەرەكانیان نییە. ئەگەر لە چل ساڵی ڕابردوو بۆرجوازەكانی ئەستەنبوڵ خۆیان تێوە گلاندبێت بە سیاسەتی سەربازیی توركیاوە، لەبەر یاخیبوونی سیاسییە چەپەكان نەبووە (چەپەكانی توركیا هەرگیز بوێرییەكی ئەوەهایان نەبووە و ئەوەندە بەهێز نەبوون، كە ئەو جۆرە مەردایەتییە بكەن)، بەڵكو دەترسان ڕۆژێك چینە نزمەكانی كۆمەڵگا لەگەڵ دەوڵەمەندە نوێیەكان، ئەوانەی لە هەرێمەكانی ترەوە هاتبوون، هێز كۆ بكەنەوە و لەژێر ئاڵای ئیسلامدا كۆتایی بە دەسەڵاتی بۆرجوازە ڕۆژئاواییەكانی توركیا بهێنن. ئەگەر زیاتر باسی شۆڕشی سەربازی و سیاسەتی ئیسلامی بكەم، ئەوا هاوسەنگییە شاراوەكانی ناو كتێبەكەم لەناو دەبەم.

گەیشتمە ئەو ئاكامەی كە كرۆكی ئایین، دووركەوتنەوەیە لە گوناه. كاتێك منداڵ بووم، هەستم بە گوناه دەكرد، چونكە بەتەواوەتی هەستم بە ترس نەدەكرد بەرامبەر ئافرەتە ڕێزدار و جل سپییەكە كە هەندێك جار دەهاتە ناو خەیاڵەكانمەوە، چونكە بەتەواوەتی باوەڕم پێی نەبوو. بە هۆی خۆجیاكردنەوەم لەو كەسانەی كە باوەڕیان پێی هەبوو، هەستم بە گوناه دەكرد. بەڵام هەر كات دەچوومە دونیا خەیاڵییەكەمەوە، ئەو دنیایەی ڕۆحمی قووڵتر دەكرد، ژیریم بەهێزتر و ژیانی ڕەنگاوڕەنگ دەكردم، بە هەموو هێزێكی منداڵیمەوە ڕووبەڕووی هەستكردن بە گوناه دەبوومەوە. لە خەیاڵەكانم، ئایین ئۆرهانە دڵخۆشەكەی تری كە لە ماڵێكی تر دەژیا لە ئەستەنبوڵ، تووشی نیگەرانی نەدەكرد. هەر كاتێك لە هەستكردن بە گوناه ماندوو دەبووم، بەدوای ئەم ئۆرهانەدا دەگەڕام، دەمزانی كە ئەم سەرقاڵم ناكات بەو جۆرە خەیاڵانەوە و دەبێتە سەرەتای درامایەكی نوێ.

منداڵیم بەبێ بیستنی فەرمانەكانی ئایین تێنەدەپەڕاند. لە ساڵانی كۆتایی قوتابخانەی سەرەتایی، مامۆستایەكم هەبوو ئێستا بیرم دەكەوێتەوە كە باوەڕی بە

بەزۆر سەپاندن نەبوو. هەرچەندە کاتێك پێدەکەنی، تەواو دڵخۆش دەبووم، کاتێك برۆکانی بەرز دەکردەوە، تەواو بێورە دەبووم. ئەو مامۆستا پرچزەرد و بەتەمەنە، لە لایەنە فکری و ژیرییەکەوە باسی ئایینی بۆ دەکردین و زۆر گرنگیی بە پرسیارە بێزارکەرەکانی دەربارەی باوەڕ و ترس نەدەدا. ئەو مامۆستایە باوەڕی وا بوو کە موحەمەدی پێغەمبەر، چەسپاندنی ڕۆژووی تەنها بۆ بەهێزکردنی ئایینی مرۆڤەکان نەبووە، بەڵکو بۆ گرنگیدان بووە بە تەندروستی. چەندین سەدە دواتر، ئەو ژنە ڕۆژئاواییانەی کە دژی فەرمانەکانی ئاین بوون، چێژیان لە تەندروستیی ڕۆژووگرتن وەردەگرت. پێی وا بوو نوێژکردن، وەك وەرزشکردن، ترپەکانی دڵت زیاد دەکات و چالاکت دەکات. لەم سەردەمەدا لە ئۆفیس و کارگە بێکۆتاکانی ژاپۆن زەنگێك لێ دەدرێت، کە بە واتای دەستهەڵگرتن لە کار دێت، بۆ ئەوەی پێنج خولەك وەرزش بکەن، بەڵام مسوڵمانەکان پێنج خولەك پشوو وەردەگرن بۆ ئەوەی نوێژەکانیان بکەن.

ئەم جۆرە ئیسلامە بیرییەی مامۆستاکەم، سۆزی نهێنی و نکوڵیکردنی منیان بۆ ئایین دووپات کردەوە. هانی دام کە بیرۆکەکەم گەشە پێ بدەم و ڕۆژێکی ڕەمەزان ڕۆژوو بگرم. هەرچەندە لەژێر کاریگەریی مامۆستاکەم ڕۆژووم گرت، بەڵام ئاگادارم نەکردەوە کە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بووم. کاتێك بە دایکم گوت، سەرسام بوو، بەڵام دڵخۆش بوو و کەمێکیش نیگەران بوو. دایکم باوەڕی بە خودا هەبوو، بەڵام پێی وا بوو خەڵکانی سەدەکانی پێشوو ڕۆژوویان گرتووە. باسی بابەتەکەم لەگەڵ باوکم و براکەم نەکرد، چونکە تەنانەت پێش ئەوەی ڕۆژووش بگرم، هەستم دەکرد ئاشکراکردنی پەرۆشیم بۆ باوەڕ، تووشی شەرمەزاریم دەکات، لەبەر ئەوە پێم باش بوو بەنهێنی بیهێڵمەوە. بەباشی شارەزای هەڵوێستی تووڕەیی، گومان و گاڵتەجاڕیی چینایەتیی خێزانەکەم بووم، دەمزانی هەڵوێستیان چۆن دەبێت ئەگەر خۆم ئاشکرا بکەم. لەبەر ئەوەی بەبێ ئەوەی کەس بزانێت یاخود دەست بێنن بە پشتما و پێم بڵێن: "ئافەرین!"، ڕۆژووەکەم گرت. پێشبینیم دەکرد کە دایکم ئاگادارم بکاتەوە لە خوار یازدەساڵیەوە ڕۆژووگرتن گونجاو نییە، بەڵام بەپێچەوانەوە، کاتێك ڕۆژووەکەم شکاند، هەموو ئەو خواردنانەی بۆ ئامادە کردبووم کە حەزم لێیان بوو، وەکو کێکی ڕەنگاوڕەنگ و ماسیی برژاو. لە لایەکەوە دڵخۆش بوو کە دەیبینی ترسی خودام لە دڵدایە، بەڵام نیگەرانی لە چاویدا

دیار بوو و ترسی ئەوەی هەبوو ئەو ڕۆژووە دواتر تووشی سزای ژیانێکی ئایینی و دەروونیم بکات.

دوو هەستی و دوودڵیی خێزانەکەم بەرامبەر ئایین، لە جەژنی قورباندا دەردەکەوت. وەکو هەموو خێزانە دەوڵەمەندە مسوڵمانەکانی تورکیا، بەرانێکمان دەکڕی و لە باخچەکەی پشتەوە دامانددەنا هەتا ڕۆژی جەژنی قوربان، ئەوکات گۆشتفرۆشەکەی دراوسێمان دەهات و سەری دەبڕی. بەپێچەوانەی قارەمانە دڵچاکەکانی کتێبە کارتۆنییەکانم کە خوازیار بوون بەرانەکە ئازاد بکرێت، من زۆر مەڕم خۆش نەدەویست، تەنانەت کە دەمبینی لە باخچەکەدا یاری دەکات، دڵم بۆی نەدەسووتا و دڵخۆش بووم کە دەمزانی بەزوویی ئەو گیاندارە گەمژە و بۆگەنەمان لەکۆڵ دەبێتەوە. هەرچۆنێك بێت، دەمزانی بەو شێوازەی کە خێزانەکەم جەژنەکەیان دەکرد، زۆر دروست نەبوو. لەپاش ئەوەی گۆشتەکە دابەش دەکرا بەسەر خەڵکی هەژاردا، وەکو خێزانێکی گەورە کۆ دەبووینەوە و ئاهەنگی جەژنمان دەگێڕا و بیرەمان دەخواردەوە کە لە ئایینەکەی ئێمە قەدەغە کرابوو، یان بە بیانووی ئەوەی گۆشتەکەی خۆمان تازەیە و هێشتا بۆنی دێت، ئەو گۆشتەمان دەخوارد کە لای گۆشتفرۆشەکە کڕیبوومان. پەیڕەویکردنی ئەم نەریتە ئایینییە بۆ سەلماندنی پەیمانەکەمان بوو لەگەڵ خودا، ئەویش بە سەربڕین و قوربانیکردنی ئاژەڵێك لەباتی منداڵێك، بەم جۆرە لە گوناه ڕزگارمان دەبێت، بەڵام ئەو کەسانەی وەك ئێمە گۆشتی دوکانی گۆشتفرۆشەکە دەخۆن لەبری گۆشتی ئەو ئاژەڵەی دەکرایە قوربانی، ئەوکات زیاتر هەست بە گوناه دەکەن.

لەناو خێزانی ئێمە، دوودڵی ناخۆشتر و بەئازارتر بوو زیاتر لەوەی لە بێدەنگیدا ئازار بکێشیت. ئەو بۆشاییە ڕۆحییەی لەناو زۆربەی خێزانە دەوڵەمەند و دونیاگەرییەکانی ئەستەنبوڵ بینیبووم، بەڵگە بوون بۆ ئەم بێدەنگییە. هەمووان بەکراوەیی دەربارەی بیرکاری، سەرکەوتنی قوتابخانە، یاریی تۆپی پێ و بەسەربردنی کەیف و سەفا قسەیان دەکرد، بەڵام بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانەی پەیوەندییان بە بوونەوە هەیە _خۆشەویستی و سۆزی ئایین، واتای ژیان، ئیرەیی و ڕق_ ئەوا جگەرەیەك دادەگیرسێنن، سەرنج دەخەنە سەر موزیکی ڕادیۆکە و بەبێ وەڵام دەگەڕێنەوە بۆ جیهانە تایبەتییەکەی خۆیان. ئەو ڕۆژووەی کە گرتم، بۆ دەربڕینی

هەستی خۆشەویستیی شاراوەی ناخم بوو بەرامبەر خودا. ئەو دەمە زستان بوو و ڕۆژ کورت بوو، لەبەر ئەوەی زۆر ئازاری برسێتیم نەچەشت، تەنانەت لە کاتی ئەو خواردنانەی کە دایکم بۆی ئامادە کردبوون _گۆشتی ماسی و مایۆنیز و زەڵاتەی ماسی، کە زۆرتر لەسەر سفرەی جەژنی ڕەمەزان دەچوو_ هەستم بە خۆشی و ئارامی دەکرد. لەپاش ئەوەی تێر نانم خوارد، ڕۆیشتم بۆ سینەمای کۆناك بۆ سەیرکردنی فیلمەکانی هۆلیوود و هەموو شتێکم لە بیری خۆم دەردەهێنا. ئیتر هەرگیز بۆ جارێکی تر، خواستی ڕۆژووگرتن لەلام دروست نەبوویەوە.

تەنانەت ئەگەر ئەوەندە باوەڕم بە خودا نەبوو‌بێت بەو جۆرەی کە خۆم دەمویست، بەڵام لە لایەکی ترەوە هیوام دەخواست، وەك خەڵك دەیانگوت کە خودا ئاگای لە هەموو شتێکە، ئەوەندە زیرەك بێت کە تێبگات بۆچی من ناتوانم بەتەواوەتی ببمە کەسێکی باوەڕدار و لێم خۆش بێت. لەبەر ئەوە زۆر دانم بە بێباوەڕیی خۆم نەدەنا و وا بیرم دەکردەوە خودا خۆی لە من تێدەگات کە بە هۆی گوناهەوە ئازار دەکێشم و لێم خۆش دەبێت، یاخود لانی کەم خودا خۆی سەرقاڵ ناکات بە گوناهەکانی منداڵێکی وەك منەوە.

لە ڕاستیدا ئەوەی زۆرتر لێی دەترسام، خودا نەبوو، بەڵکو ئەو کەسانە بوون کە لەڕادەبەدەر باوەڕیان بە خودا هەبوو، ئەوانەی کە دادپەروەرییان وەك خودا نەبوو. شتێکی دیکە کە ترسم لێی هەبوو، ئەوە بوو کە ئەوان لە ناخی دڵیانەوە پەرستشیان دەکرد و پێم وا بوو بە هۆی ئەوەی وەك ئەوان نیم، ڕۆژێك سزا دەدرێم. ترسەکەم زۆرترین کاریگەریی هەبوو لەسەرم، تەنانەت زیاتر لەو بیردۆزە سیاسییانەی کە لە سەردەمی لاوێتی و چەپێتیدا دەمخوێندنەوە. ئەو شتەی دواتر سەرسامی کردم، زانینی ئەوە بوو کە زۆربەی هاوڕێ دونیاپەرستە نیوە باوەڕدار و نیوە لاساییکەرەوەکانی ڕۆژئاوا، وەك من هەمان هەستکردن بە گوناهیان لە ناخیاندا شاردبوویەوە، بەڵام ئەوەی دڵخۆشی دەکردم، زانینی ئەو ڕاستییە بوو کە کەسانێك هەن، هەرگیز ئەرکە ئایینییەکانیان جێبەجێ نەکردووە و هەمیشە بە چاوێکی کەمەوە سەیری لە خواترسەکان دەکەن، بەڵام هەمان ئەو کەسانە لەپاش ئەوەی تووشی ڕووداوێکی

هاتوچۆ دەبن و لە نەخۆشخانە دەکەون، دەچنە ناو هەمان دونیای نهێنیی تێگەیشتنی ناسینی خودا.

لە قوتابخانەی ناوەندی هاوپۆلێکم هەبوو، لە بیرکردنەوە نهێنییەکەم تێدەگەشت. کوڕێکی لاسار و لە خێزانێکی زەنگین بوو، سامانەکەیان بەمیراتی بۆ مابوویەوە، هەمیشە یاریی ئەسپسواریی لە باخچە گەورەکەی خانووە نایابەکەیان دەکرد، کە لەسەر بەرزاییەکانی بۆسفۆر بوو، تەنانەت نوێنەری نێودەوڵەتیی تورکیا بوو بۆ چالاکیی پێشبڕکێی ئەسپسواری. ڕۆژێکیان لە وچانی نێوان وانەکان لەگەڵ ئەم هاوڕێیەم بە شێوازێکی منداڵانە، گفتوگۆیەکی میتافیزیکیمان دەکرد. لە کاتی چەلەحانێکەمان، کاتێك هاوڕێکەم زانیی من لە ترسا دەلەرزم و موچوڕکە بە هەموو جەستەمدا دێت، سەیرێکی ئاسمانی کرد و گوتی: "ئەگەر خودا بوونی هەیە، با ئێستا من بمرێنێت!" باوەڕبەخۆبوونەکەی سەرسامی کردبووم، ئنیجا گوتی: "دەبینی هێشتا هەناسە دەدەم!" کاتێك بیرم دەکردەوە من ئەو جۆرە ئازایەتییەم نییە، هەستم بە گوناه دەکرد، لە لایەکی دیکەوە هەستکردنم بە گوناه بە هۆی ئەوە بوو کە بەنهێنی وا گومانم دەبرد، قسەکانی ئەو کوڕە ڕاستن. سەرباری هەموو شتێك، لەناو ئەو هەموو ئاڵۆزییەدا، هەستم بە شادییەك دەکرد کە خۆیشم هۆکارەکەیم نەدەزانی.

لە تەمەنی دوازدە ساڵی بەرەو سەر، سەرنج و هەستکردنم بە گوناه لەسەر خەیاڵە وورووژێنەرەکانم بوو، نەك ئاینی. کەمتر خۆم نیگەران دەکرد کە لە کام ئاڕاستەیەدا بمێنمەوە، ببمە کەسێکی باوەڕدار یان وەك ئەوانی تر بم. ئەو ئازارەی لەمەودوا هەمبوو، بە هۆی دووریم لە خودا نەبوو، بەڵکو بە هۆی هەموو ئەو کەسانەوە بوو کە لە دەورووبەرم بوون، بە هۆی ڕۆحی شارەکەوە بوو. ئەگەر لەناو جەنجاڵیی خەڵکدا بوویێتم، لە هەر شوێنێك، لەناو کەشتی یان لەسەر پرد، هەر کات ڕووبەڕووی ئەو ئافرەتە پیرە سەرپۆش سپییە بوویێتمەوە، ئەوا موچوڕکە هاتووە بە هەموو جەستەمدا.

## ٢١

# دەوڵەمەندی

لە ساڵانی شەستەکان، هەموو بەیانییەکی یەکشەممان دایکم دەچوو لە دوکانی ڕۆژنامەفرۆشەکە ڕۆژنامەی (ئێواران)ی دەکڕی. بەپێچەوانەی ڕۆژنامە ڕۆژانەکانی تر، ئەم ڕۆژنامەیە ڕەوانەی ماڵەوەمان نەدەکرا. ڕەنگە زانیبێتیان کە دایکم چەندە پەرۆشی بیستنی قسەوقسەلۆکەکانی ناو خەڵکە کە بە سەردێڕێکی گەورە لەناو دوو کەوانەدا دەنووسرا: "ئایا بیستووتە؟"، ناوی نووسەرەکە ناوێکی خوازراو بوو و لەژێر ناوی گوڵپەری بابەتەکان بڵاو دەکرانەوەوە. باوکم هەر هەلێکی دەقۆستەوە بۆ ئەوەی گاڵتە بە دایکم بکات، بە هۆی گرنگیدانی بەم بابەتانە. گاڵتەپێکردنەکانی باوکم بۆیان سەلماندم کە گرنگیدان بە قسەوقسەلۆکەکانی ناو کۆمەڵگا، نیشانەی لاوازیی کەسایەتییە. بە دروستکردنی چیرۆکی درۆ، ئەگەر درۆش نەبوونایە، کەسانی دەوڵەمەند ئەوەندە گەمژەن کە سەرنجی وتارنووسە کۆمەڵایەتییەکان ڕابکێشن، ئەو جۆرە ڕۆژنامانە لەژێر ناوی خوازراودا تووڕەیی خۆیان بەرامبەر (دەوڵەمەندەکان) (ئەو خێزانانەی دەگرتەوە کە هاوشانی ئێمە بوون، یاخود ئەوانەی تێدەکۆشان هەتا وەك ئێمە بن) دەردەبڕی. هەرچەندە هەموو ئەم شتانە باوکم و دایکمیان نەدەوەستاند لە خوێندنەوەی ئەم وتارانە و باوەڕپێکردنیان:

- فەیزییە مادێنسی داماو! ماڵەکەی لە بەبەك تالآن کرا، بەلآم هیچ کەس نازانێت چیی لێ دزراوە. با سەیر بکەین، بزانین پۆلیس چۆن ئەم مەتەڵە چارەسەر دەکات.

- ئایسێل مادرا هاوینی ڕابردوو نەچوو بۆ دەریا بۆ مەلەکردن، لەبەر ئەوەی نەشتەرگەریی لابردنی ئالوویی کردبوو. ئەم هاوینە، کاتێکی خۆش لە دوورگەی کروچەشم بەسەر دەبات. هەرچەندە بیستوومانە ئێستا کەمێك تووڕەیە، لێگەڕێن با نە پرسین بۆچی.

- موازیز ئیپار چووە بۆ ڕۆما! هەرگیز نەمانبینی ئەم دەوڵەمەندە بەناوبانگە بەتەواوەتی دڵخۆش دیار بێت، دەبێت چی شتێك خۆشحاڵی بکات؟ خۆزگە دەمانزانی، تۆ بڵێی پیاوێکی قۆز لە ژیانیدا هەبێت؟

- سەمیرامیس ساریای ڕاهاتبوو هاوینانی لە بیوکەدا بەسەر بەرێت، بەلآم ئێستا پشتی تێ کردووین و گەڕاوەتەوە بۆ ڤێللاکەی لە کاپری. لە پاریسەوە زۆر نزیکە. بیستوومانە ئامادەکاری بۆ پێشانگا هونەرییەکەی دەکات، کەواتە دەبێت کەی پەیکەرەکانینمان پیشان بدات؟

- ئەستەنبوڵ چاوی پیس کاری تێ کردووە و تێ کدراوە! کۆمەڵێك لەو کەسایەتییە بەناوبانگانەی کە بەردەوام لەم بەشەدا دەردەکەون، نەخۆش کەوتوون، بەخێرایی ڕەوانەی نەخۆشخانە کراون و نەشتەرگەرییان بۆ ئەنجام دراوە. کۆتا هەواڵی ناخۆشمان لە چامیلکا، ماڵی ڕەوشەن ئەشرەفەوە پێ گەیشتووە، کە هاریکا گورسۆی لەوێ کاتی ڕابواردن و ئاهەنگی شەوانەی بەسەر دەبرد...

دایکم گوتی: "کەواتە هاریکا گورسۆی نەشتەرگەریی دەرهێنانی ئالوویی بۆ کراوە؟"

باوکم بە ڕقێك و بێبایەخی وەلآمی دایەوە: "باشترە سامانەکەی یەکەم جار لە ڕووخساریدا بەکار بهێنێت."

هەندێك لە کەسە دەوڵەمەندە ناسراوەکان، بەردەوام ناویان لەسەر زار بوو، بەپێچەوانەوە هەندێکی دیکەیان زۆر باس نەدەکران. لەم سەروبەرەدا بۆم دەرکەوت کە دایکم ئەو کەسانەی دەیانناسێت و گرنگییان پێ دەدات، لە ئێمە دەوڵەمەندتر بوون و هەمیشە چاوی لەسەریان بوو _هەرچەندە ناڕەزایی دەردەبڕی بەرامبەر بە سامان و هەڵسوکەوتیان. کاتێك باسی دەکردن، دەیگوت: "بوونەتە باسی ڕۆژنامە و

گۆڤارەکان." ئەمە تەنها بۆچوونی دایکم نەبوو، بەڵکو زۆربەی ئەستەنبوڵییەکان پێیان وا بوو نابێت کەسایەتییە دەوڵەمەندەکان ئەوەندە پلەوپایە و سامانیان بکەنە جێگەی سەرنجی خەڵك.

هەندێك جار ئەم هەڵوێستەیان بە دەنگی بەرز و بەئاشکرا دەردەبڕی. هەرچەندە ئەوە هاواری بێفیزی و سادەیی ئەو خەڵکە نەبوو، یاخود هەوڵێك بووبێت بۆ دوورخستەوەیان لە شانازی و دەسەڵاتەکەیان، بەڵکو بە هۆی ترسیانەوە بوو لە دەوڵەت. بۆ چەندین سەدە، پادشاکانی عوسمانی چاویان لەسەر کەسە زەنگینەکان بوو _ئەوانیش زۆر جار هەر پادشاکان خۆیان بوون_ بۆ نموونە" هەڕەشەیان لێ دەکردن یان بە هەر بیانوویەکی تر بووبێت بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر سامانەکەیاندا. دەربارەی جوولەکەکانیش، ئەوانەی لە ماوەی سەدەکانی کۆتایی دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرەکە کاریان قەرزکردنی پارە بوو بۆ دەوڵەت، هەروەك یۆنانی و ئەرمەنییەکان، وەك بازرگان و خاوەنکار ناویان دەرکردبوو کە دواتر شایەتحاڵی بیرەوەریی ئەو باجە قورسە بوون کە لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەم سەپێنرا بەسەریاندا و دەست گیرا بەسەر زەوی و کارگەکانیاندا و لە ماوە ئاژاوەگێڕییەکەی ٥ی ئەیلوولی ١٩٥٥ زۆربەی دوکان و کۆگاکانیان تالان کران و سووتێنران.

خاوەن زەوییە گەورەکانی ئەنادۆڵ و نەوەی نوێی خاوەن کارگەکان، ئێستا ڕوویان کردووەتە ئەستەنبوڵ و زۆر بوێرانە شانازی بە سامانەکەیانەوە دەکەن. ئەو دەوڵەمەندانەی تا ئێستاش لە دەوڵەت دەترسن، یاخود خەڵکانی تری وەك ئێمە کە بە هۆی بیرۆکە گەوجەکەیانەوە بۆ درێژەدان بە سامانەکەیان بۆ نەوەی داهاتوو شکستیان هێناوە، وەك کارێکی بێزراو و ناشرین سەیری ئەم ئەم جۆرە بوێرییە دەکەن. یەکێك لە نەوە نوێیەکانی خاوەن کارگەکان" سەکیپ سەبانجیە بوو، کە ئێستا سەرۆکی دووەم دەوڵەمەنتریتی خێزانی تورکیایە. ئەم پیاوە بە هۆی بیروڕا و ڕەفتارەکانیەوە گاڵتەی پێ دەکرا و دەگوترا کە لەگەڵ نەریتی باوی کۆمەڵگا ناگونجێن (هیچ کام لە لاپەرەکان باسیان نەدەکرد، چونکە دەترسان بە هۆی هەواڵی ئەو جۆرە کەسانەوە، لەداهاتوودا بڵاوکراوەکەیان بکەوێتە مەترسییەوە)، لە ساڵی ١٩٩٠ دوای بیرۆکەکەی هێنری کلای فریك کەوت و ماڵی گواستەوە بۆ یەکێك لە مۆزەخانە تایبەتییەکانی ئەستەنبوڵ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دڵەڕاوکێیەی باڵی گرتبوو بەسەر دەوڵەمەندەکانی سەردەمی منداڵیم، بێبنەما بوو و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ژیرانەیان نەبوو. ڕژێمی کاروباری میری لە دەستبەسەراگرتنی هەموو کەرتەکانی بواری بەرهەمهێنان هەروەك خۆی چاوچڵێس بوو، یان لەبەر ئەوەی نەدەکرا ببیتە خاوەنی سەرمایەیەکی زۆر، بەبێ چوونە ناو سیاسەت و دەسەلاٚتەوە. هەموو کەس بۆی دەرکەوتبوو، تەناتەت دەوڵەمەندە باشەکانیش ڕابردوویەکی بۆگەنیان هەیە. لەپاش ئەوەی پارەوپووڵەکەی باپیرم دوایی هات، باوکم ناچار بوو کار بۆ وەهبی کۆچ بکات، کە سەرۆکی یەکێك لە خاوەن کارگەکان بوو، هەرگیز گاڵتەی بە شێوەزاری لادێیی سەرۆکەکەی و کوڕە ناشارەزاکەی نەدەکرد. لە کاتی تووڕەییدا، باوکم دەیگوت کە ئەو خێزانە لە ماوەی جەنگی جیهانیی دووەم سامانەکەیان پێك هێناوە و تووشی قاتوقڕیی و گرانی نەهاتن لەو کاتەی هەموو شارەکە بەدەست برسێتی و هەژارییەوە دەینالاٚند.

بە درێژایی ڕۆژانی منداڵیم و لاوێتیم، هیچ دەوڵەمەندێکم لە ئەستەنبوڵ نەدی سودبەری بلیمەتی و پسپۆریی خۆی بووبێت، بەڵکو هەر هەڵێکیان قۆستۆتەوە بۆ بەرتیلدان بە دەوڵەت و بەو جۆرە سامانەکەیان پێکەوە ناوە. لە ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە، لەو کاتەوەی ترسی دەستتێوەردانی دەوڵەت کەمتر بوویەوە، زۆربەی ئەو کەسانە لە کۆکردنەوەی سەرمایەکەیان دەستوبردیان کرد و بە شاردنەوەی، توانییان پاشماوەی ژیانیان خۆشگوزەران بکەن و لە هەمان کاتدا دەیانویست لە کۆمەڵگادا پلەوپایەیەکیان هەبێت و پیشانی خەڵکی بدەن. لەبەر ئەوەی بەدەستهێنانی سەرمایەکەیان هیچ ڕابردوویەکی ڕۆشنبیری نەبوو، هیچ گرنگییەکیان بە خوێندنەوەی کتێب و تەنانەت بە یاریی شەترەنج نەدەدا. ئەم نەریتە لە بەگزادەیی عوسمانییەکانەوە جێ مابوو، کە بەدەگمەن کەسێکی خوێندەوار دەیتوانی ئاوات بخوازێت پلەکەی بەرز بێتەوە و دەوڵەمەند بێت یان ببێتە پادشا. لەگەڵ داخستنی خانەقای سۆفییەکان لە سەرەتای دروستبوونی دەسەلاٚتی کۆماری، دەستبەرداربوون لە ئەدەبی ئایین، شۆڕشی گۆڕینی ئەلفوبێ و گۆڕینی مەیل بەرەو کلتووری ڕۆژئاوا، خۆگونجاندن لەگەڵ کلتوور و ڕۆشنبیریی کۆمەڵگا، کۆتایی پێ هات.

لەو کاتەوەی دەوڵەمەندە نوێیەکان دەرکەوتن، خێزانە دەوڵەمەندە کۆنەکان تەنها یەك ڕێگەیان هەبوو بۆ بەرەوپێشچوونی خۆیان زیاتر لە ئەوان، ئەویش دەرخستنی خۆیان بوو بە شێوەی ئەورووپی. لەبەر ئەوە بە گەشتکردن بۆ ئەورووپا، کڕینی جلوبەرگ و کڕینی کۆتا مۆدێلی ئامێرەکانی ناوماڵ (هەموو شتێکی دەگرتەوە، لە ئامێری دروستکردنی شەربەتی میوەکان هەتا مەکینەی ڕیش تاشین) دڵی خۆیان خۆش دەکرد و بەو جۆرە فرتوفێڵە شانازییەکی زۆریان بەخۆیانەوە دەکرد. زۆر جار خێزانە دێرینەکانی ئەستەنبوڵ، دەستیان دەکرد بە بازرگانی و دەوڵەمەند دەبوونەوە (هەروەك وتارنووسە ناودار و خاوەن ڕۆژنامەکەی هاوڕێی پوورم بوو). بەڵام پێشتر وانەیان وەرگرتبوو، تەناتەت ئەگەر هیچ یاسایەکیان نەشکاندبێت، هیچ کەسێکی کارگێڕیی تووڕە نەکردبێت و هیچ ترسێکیان نەبووبێت لە دەوڵەت، زۆر ئاسایی بوو بەلایانەوە لە هەر کاتێکدا هەموو شتێك بفرۆشن و کۆچ بکەن بۆ یەکێك لە ئەپارتمانەکانی لەندەن کە لەوێوە تەنها دەیانتوانی سەیری دیواری دراوسێکەیان یاخود سەیری کەناڵێکی ئینگلیزی بکەن، کە هەرگیز بەتەواوەتی لێیان تێنەدەگەشتن، بەڵام هەموو ئەمە بۆ زاڵبوون بەسەر مەیلیان بوو بۆ یەکێك لە ئەپارتمانەکانی ئەستەنبوڵ کە دیمەنی بۆسفۆری لێوە دیار بوو. زۆر جار ئەو خێزانانە بە هۆی خواستی ڕۆژئاواییبوونەوە، تووشی چەندین بەسەرهات دەهاتن، وەکو بەسەرهاتەکەی ئانا کارنینا: خێزانێکی دەوڵەمەند، دایەنێکی بیانیان بەکرێ گرتووە بۆ ئەوەی منداڵەکەیان فێری زمانی خۆی بکات، بەڵام پیاوی خێزانەکە لەگەڵ دایەنەکە ڕایکردووە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان، میراتبەری چینی دەوڵەمەندەکان زۆر دەگمەن بوو، بەڵام لەگەڵ دروستبوونی دەسەڵاتی کۆماری، زۆربەی دەوڵەمەندەکان هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی خۆیان بکەن بە مافڕەوای میراتگری ئەو سامانەی لە عوسمانییەکانەوە جێ مابوو. لەبەر ئەوە لە ساڵی ١٩٨٠، کاتێك لەناکاو پاشماوەی عوسمانییەکان بوونە جێگەی بایەخیان، ململانێیان لەگەڵ یەك دەکرد بۆ کۆکردنەوەی ئەو پاشماوە دێرینانە کە لە کاتی سووتانی کۆشکە کۆنەکان ڕزگاریان بووبوو. لەو کاتەوەی دەوڵەمەند بووین، ئێستاش هەر بەو جۆرە، حەز دەکەین بزانین خەڵکانی تری خاوەن سەرمایە چۆن سامانەکەیان پێك هێناوە و بەسەرهاتەکەیان بزانین (ئەو

چیرۆکەی سەرنجڕاکێش بوو بەلامەوە، دەربارەی پیاوێك بوو کە لە ماوەی ناوەڕاستی جەنگی جیهانی یەکەم بە بەلەمێکی پڕ لە شەکرەوە هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ و لە ماوەی یەك شەودا دەوڵەمەند بووە و خۆشی لە ئەنجامی ئەم کارە بینیوە، هەتا ئەو ڕۆژەی مردووە). ڕەنگە بە هۆی چێژی بیستنی ئەو چیرۆکانەوە بێت، یاخود لەوانەیە بە هۆی دۆخە ناخۆشەکەوە بووبێت، یان بە هۆی ترس و گومانیانەوە بووبێت کە چی بکەن لە سەرمایە کتوپڕییەکان و چۆن بەکاری بێنن، یاخود چۆن بیپارێزن لە لەناوچوونی کتوپڕی هەر بەو جۆرەی بەدەستیان هێنا. هۆکارەکە هەرچییەك بووبێت، بەلآم هەر کات چاوم بە کەسێکی خانەدان کەوتبێت _خزمی دوور، هاوڕێی خێزانەکەم، هاوڕێی منداڵیی یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەم، دراوسێیەکی نیشانتاش، یان کەسێك لەو دەوڵەمەندە بێکلتوور و بێهەستانە بووایە، کە لە بابەتی "ئایا بیستووتە؟" باسیان دەکرا_ خواستێکی زۆرم هەبوو بۆ زانین و تێگەیشتنی شێوازی ژیانیان.

هاوڕێیەکی منداڵیی باوکم هەبوو، پێم دەگوت (پیاوە کەشخەکە)، کە لە باوکیەوە سامانێکی زۆری بەمیراتی بۆ جێ مابوو (لە ساڵانی کۆتایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، باوکی وەزیر بووە)، ئەو داهاتەی لە میراتییەکەیەوە دەستی دەکەوت، ئەوەندە زۆر بوو _من ناڵیم خەڵك وەسفی بکەن یان نەفرەتی لێ بکەن_ هەرگیز پێویستی بەوە نەبوو بۆ یەك ڕۆژیش لە ژیانیدا کار بکات. ئەم پیاوە کاری نەدەکرد، تەنها لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی دەخوێندەوە و لە ئەپارتمانەکەیەوە لە نیشانتاش سەیری شەقامەکەی دەکرد. دوانیوەڕوان کاتێکی زۆر خۆی بە بە چاککردن و شانەکردنی سمێڵەکانی خەریك دەکرد، دواتر جلوبەرگێکی کەشخەی کە لە پاریس یان لە میلان دروست کرابوو، دەپۆشی و هەمان شتی ڕۆژانەی دووبارە دەکردەوە: ماوەی دوو کاتژمێر لە هۆڵ یان شیرینیخانەی ناو هوتێل هیلتۆن دادەنیشت و قومی لە چای دەدا. جارێکیان باسی ڕۆتینی، ئەم پیاوەم بۆ باوکم کرد، باوکم برۆکانی بە جۆرێك بەرز کردەوە، وەك ئەوەی باسی نهێنییەکی گەورە بکات و ڕووخساری خەمێکی پێوە دیار بوو، وتی: "لەبەر ئەوەی ئەوە تاکە شوێنە لە شارەکەدا وەك ئەورووپا بێت." لە هەمان نەوەی ئەو سەردەمە، هاوڕێیەکی دایکم هەبوو، ئەویش زۆر دەوڵەمەند بوو، ئافرەتێکی قەڵەو بوو، ڕووخسارێکی ناشرینی وەك مەیموونی هەبوو (لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە بووبێت)، کاتێك

سلاّوی لە کەسێك دەکرد، دەیگوت: "چۆنی، مەیموون؟" _من و براکەم هەمیشە لاساییمان دەکردەوە. ئەم ئافرەتە لە تەمەنیدا چەندین داخوازیکاری بە بیانووی ئەوەی جوانپۆش نین یاخود وەك ئەورووپییەك نین، ڕەت کردبوویەوە. کاتێك گەشتە تەمەنی پەنجا ساڵی، ئیتر نائومێد لەوەی کەسێکی دەوڵەمەند و کەشخە بێتە داخوازی، لەبەر ئەوە هاوسەرگیریی لەگەڵ پۆلیسێکی سی ساڵە (کەسێکی جیاواز و ڕەوشتبەرز بوو) کرد، دوای ماوەیەك هاوسەرگیرییەکەیان کۆتایی پێ هات. لەوەودوا ئەو ئافرەتە بەتەنیا ژیانی بەسەر دەبرد و ئامۆژگاریی کچانی خێزانە خانەدانەکانی وەك خۆی دەکرد، کە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسی دەوڵەمەندی هاوشانی خۆیان بکەن.

دەوڵەمەندە لاساییکەرەوەکانی ڕۆژئاوا کە لە کۆتا نەوەکانی عوسمانی بوون، شکستێکی گەورەیان هێنا لە بەگەڕخستنی سامانە میراتییەکەیان لەو بازرگانی و پیشەسازییانەی لە ئەستەنبوڵ سەریان هەڵدا. نەوەکانی ئەم خێزانانە، نەك تەنها ڕەتیان دەکردەوە لەبەردەم هەمان مێز دابنشین لەگەڵ (بازرگانە ئاست نزمەکان) ئەوانەی کە بە دەروونێکی کۆمەڵایەتی و هێزێکی هاوڕێیەتییەوە ڕووبەڕووی فێڵ و تەڵەکەی ئەم کەسە خۆبەگەورەزانانە دەبوونەوە، تەنانەت قایل نەدەبوون چایەکیشیان لەگەڵ بخۆنەوە. ئەم خێزانە کۆنانەی عوسمانی (بەبێ ئەوەی درکی پێ بکەن)، لەلایەن پارێزەرەکانیانەوە کە یارمەتیان دەدان بۆ کۆکردنەوەی نرخی سوو و کۆکردنەوەی کرێکان فێڵیان لێ دەکرا. هەر کاتێك سەردانی ئەم خێزانانەمان دەکرد لە کۆشکەکانیان یان لە ***یالەکانیان*** لە بۆسفۆر، دەمانبینی کە پشیلە و سەگەکانیان زیاتر لا پەسەندتر بوو لە خەڵکانی تر، لەبەر ئەوە هەمیشە بەهای ئەو سۆزەم دەزانی کە بۆیان دەردەبڕیم. پێنج یان دە ساڵ دواتر، کاتێك ڕافی پۆرتەکالی کۆنەفرۆش، لە دوکانی کۆنەفرۆشییەکەی هەمان ئەو کەلوپەلانەی دەفرۆشتەوە، کە لەدەوری ئەم جۆرە خێزانانەدا بوون _تەختەی کتێب خوێندنەوە، قەنەفەی کلاسیکی، مێز کە گەوهەرڕێژ کرابوو، ئەو وێنانەی بە بۆیەی چەور کێشرابوون، ئەو چوارچێوانەی بە دەستنووسی جوان نەخشێنرابوون، تفەنگی کۆن، شمشێری مێژوویی کە لە باوباپیرانیانەوە بۆیان جێ مابوو، بەردی هەڵکۆڵراو و کاتژمێری گەورە_ بەخۆشحاڵییەوە ئەو ژیانە لەناوچووەی پێشوویانم بیر دەکەوتەوە. ئەم خەڵکە جۆرە کاروبارێکی سەیری ڕۆژانەیان

هەبوو کە سەرقاڵی دەکردن و دووردەکەوتنەوە لەو پەیوەندییە خراپەیان کە بە جیهانی دەرەوە هەیانبوو. لەبیرمە جارێکیان پیاوێکی لاواز، کۆکراوەیەکی کاتژمێر و چەکی پیشانی باوکم دا، بە شێوەیەکی ئەوەندە شاراوەیی پیشانی دەدا وەك ئەوەی کەسێك حەشارگەیەکی وێنەی ورووژێنەر ئاشکرا بکات. پوورە گەورەکەم هەمیشە ئاگاداری دەکردینەوە، کە بەدەوری ئەو دیوارە بچووك و رووخاوەدا گەمە نەکەین کە لەسەر رێگەکەمان بوو لەنزیك مەیدانی لەنگەرگرتنی بەلەمەکان. دوای چەند ساڵ کە سەردانمان دەکردەوە، هەمان قسەی دەکرد. پوورێکی ترم هەمیشە بەچرپەچرپ قسەی دەکرد بۆ ئەوەی خزمەتکارەکان گوێیان لە قسەکانی نەبێت، سێیەم دانەشیان هەمیشە بە پرسیارە رەقەکانی دایکمی بێزار دەکرد و دەیپرسی کە داپیرەم (دایکی باوکم) لەکوێوە هاتووە و خەڵکی کوێیە. یەکێك لە خاڵە قەڵەوەکانم نەریتی وا بوو هەیشە میوان بهێنێتە ماڵەوە، وەك ئەوەی ماڵەوەیان مۆزەخانەیەك بێت، باسی کارەساتی سەردەمی حەوت ساڵی خۆی بۆ دەگێڕانەوە وەکو ئەوەی هەر ئەو بەیانییە هەواڵەکانی رۆژنامەی (حوریەت)یان هەواڵیان پێ گەشتبێت و شارەکەیان جێ هێشتبێت. کاتێك لەگەڵ دایکم گفتوگۆکانمان دەکرد، هەوڵم دەدا بە جۆرێك لە چاوەکانی دایکم تێبگەم کە ئێمە هەنگاوی هەڵەمان نەناوە، بەڵام بەهێواشی بۆم دەردەکەوت کە ئێمە ئەوەندە گرنگ نین لەچاو ئەوە خێزانانەی کە هەوڵی زۆریان داوە بۆ ئەوەی لە ئێمە زیاتر بن و کاریگەرییان هەبێت لەسەرمان. لەپڕ لە کاتی ئەو گفتوگۆیانە، حەزم دەکرد *یالەکەی* داپیرەم جێ بهێڵم و بگەڕێمەوە ماڵەوە. کاتێك کەسێك بەهەڵە ناوی باوکمی دەهێنا یاخود ناوی باپیرەمی وەك جووتیارێکی گوندی دەهێنا، یاخود _زۆر جار لە دەوڵەمەندە دوورەپەرێزەکان بینیبووم_ هەندێك شتی بچووکیان زۆر گەورە دەکرد، بۆ نموونە" خزمەتکارەکە کەللەی شەکری هێناوە لەباتی شەکری هاڕاو کە داوا کرابوو، کچەخزمەتکارەکە گۆرەوییەکی نەشازی لەپێ کردووە، بەلەمە خێراکە زۆر نزیك بووتەوە لە ماڵەکە، هەستم بە جیاوازیی چینایەتیی ناو کۆمەڵگا دەکرد. سەبارەت بە نەوە و کوڕەزا لەخۆباییەکانی ئەم خێزانانە _کوڕە هاوتەمەنەکانی خۆم_ تا رادەیەك یەککگرتوویی لەنێوانیان قورس بوو، کاتەکانیان بە گفتۆکردن لەگەڵ ماسیگرەکانی قاوەخانەکان بەسەر دەبرد، لە قوتابخانەی دواناوەندییە فەرەنسییەکان، سەرزەنشتی

قەشەکانیان دەکرد و یاخود (ئەگەر لە پەناگەکانی سویسرا پارێزاو نەبوونایە) خۆیان دەکوشت.

ئەم خێزانانە هەر وەکو خێزانەکەی من، لەناو خۆیاندا جۆرێك لە مشتومڕی بێمانا و سەرکێشییان تێدا هەبوو کە زۆر جار ڕووبەڕووی دادگای دەکردنەوە. هەندێکیان بە ماوەی چەندین ساڵ لە کۆشکێکی گەورە، پێکەوە دەژیان، هەندێك جار سکاڵای یاساییان دژی یەك تۆمار دەکرد، بەڵام هێشتاش بۆ خوانەکانیان لەدەوری یەك مێز دەبوون (هەروەك باوکم و پوورم و مامەکانم). ئەوانەیان بەتوندی سکاڵایان دژی یەك تۆمار دەکرد، ماوەیەکی زۆر پێکەوە قسەیان نەدەکرد، لە هەمان کاتدا پێکەوە لە یەك ماڵ دەژیان. هەندێك تاقەتی بینینی ئەو خزمەی نەبوو کە زۆر ڕقی لێ بوو، لەبەر ئەوە هەریەکە دەستی دەکرد بە جیاکردنەوەی بەشە خانووی خۆی و شاردنەوەی دیمەنی جوانی بۆسفۆر بە دروستکردنی دیوارێکی پلاستیك لەنێوانیاندا، بەڵام بە هۆی تەنکیی دیوارەکەوە، هێشتاش گوێبیستیی دەنگی کۆکە و دەنگەپێی خزمە دوژمنەکەیان دەبوون. ئەگەر بینازانیایە بە دابەشکردنی *باڵەکە* شادومانی دەکرد و شادیەکەشی دەبوویە ئازاردانی خزمە نەیارەکەی، ئەوا هەر زوو دابەشکردنەکەیان ئەنجام دەدا. بیستوومە هەندێکیان پیلانی یاساییان بەکار هێناوە بۆ ئەوەی باخچەی کۆشکەکە لە خزمەکەی تری، کە لە هەمان کۆشك بوو، قەدەغە بکات.

کاتێك هەمان مشتومڕ و ناکۆکیم لەنێوان خێزانی نەوە نوێکاندا چاو پێ دەکەوت، سەرسام دەبووم کە دەمبینی ئەم جۆرە بلیمەتییەی شەڕکردن لە خوێنی هەموو دەوڵەمەندەکانی ئەستەنبوڵدایە. لە ڕۆژانی سەرەتای دەوڵەتی کۆماری، ئەو کاتەی باپیرەم خەریکی کۆکردنەوەی سامانەکەی بووە، خێزانە دەوڵەمەندەکەم گواستوویانەتەوە بۆ نیشانتاش کە زۆر دوور نەبووە لەو شوێنەی پێشووتر خێزانەکەم لێی دەژیان لە شەقامی تەشویقیە. منداڵانی خێزانەکە لە باڵەخانەیەك ماونەتەوە کە لە باوکیانەوی بۆیان جێ مابوو کە ئەویش لە یەکێك لە نەوەکانی عەبدل حەمید پاشا کڕیویەتی، کە پێشتر کۆشك بووە و کراوە بە دوو بەشەوە. یەکێك لە براکانی ئەم نەوەیە، باڵەخانەیەکی بۆ خۆی دروست کردووە کە بەپێی سیستمی ڕێگاوبانی شارەکە کەمێك لەسەر شۆستەکە برابوویە دواوە. چەند ساڵێکی کەم دواتر، برای دووەم لەسەر

نیوە زەوییەکەی خۆی، باڵەخانەیەکی دروست کردووە، بەڵام بەئەنقەست دە هەنگاوی لە شۆستەکە گرتبوو، تەنها بۆ ئەوەی بەرچاوی ماڵی براکەی تری بگرێت و دیمەنی دەرەوەی لێ دیار نەبێت. لەپاش ئەوە، براکەی پێشووی دیوارێکی دروست کردووە کە ئەوەندەی پێنج نهۆم بەرز بووە، هەموو کەس لە نیشانتاش دەیزانی ئەم دیوارە هیچ سوودێکی نەبووە، تەنها بۆ ئەوە بووە بەردەم پەنجەرەی خانووی براکەی تاریك بکات.

زۆر بەدەگمەن گوێبیستی ئەم جۆرە کێشانە دەبووین لەناو ئەو خێزانە زەنگینانەی ڕوو بدات کە لە هەرێمەکانی دیکە و گوندەکانەوە ڕوویان کردبوویەوە ئەستەنبوڵ، چونکە بناغەی ئەم خێزانانە، هاوکاریکردنی یەکتر بوو، بەتایبەت ئەگەر دەوڵەمەندتر بوونایە. لەپاش ساڵی ١٩٦٠، ژمارەی دانیشتووانی شارەکە زۆر بەخێرایی لە زیادبووندا بوو. هەر کەسێك باوباپیرانی خێزانەکەی بۆ ماوەی چەندین سەدە لەم شارە ژیابێت، ئەوا توانیویەتی سامانێکی زۆر و چاوەڕواننەکراو بەدەست بێنێت و ببێتە خاوەنی زەویوزار. بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئەوان خاوەنی (پارەی کۆنی ئەستەنبوڵن)، بەدڵنیاییەوە یەکەم شت ڕووبەڕووی ئەم مشتومڕ و کێشە خێزانییانە دەبوونەوە. لەو ڕۆژگارەدا، دوو برا هەبوون کە خاوەنی ڕووبەرێکی گەورەی زەوی بوون لەسەر گردە بەتاڵ و بێبەرەکانی پشتی بەکرکۆی. لەپاش ئەوەی شارەکە بەو ئاراستەیەدا ڕۆشت، لەسەر دابەشکردنی زەوییەکە ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە و لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠، برا بچووکەکە تەقەی لە برا گەورەکە کردووە و کوشتوویەتی. بۆ چەندین ڕۆژ ڕووداوەکە بووبووە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان. لە یادمە، وتوواتی ئەوەیان بڵاو دەکردەوە کە گوایا برا گەورەکە پەیوەندیی سۆزداری لەگەڵ هاوسەری برا بچووکەکەی هەبووە. لەو ماوەیەدا، هاوپۆلێکی چاوسەوزم هەبوو کە کوڕی پیاوکوژەکە بوو. لەو کاتەی هەموو شارەکە سەرقاڵی زانینی هەموو وردەکارییەکانی چیرۆکی چاوچنۆکی و خۆشەویستییەکە بوو، کوڕە قژزەرد و پێست زەردی پیاوکوژەکە بە نیوە پانتۆڵ و شەیالەکانیەوە دەهاتەوە بۆ قوتابخانە و دەستەسڕێکی دەگرت بە دەستیەوە، هەموو ڕۆژەکەی بەماتی و بە هەنسکدان بەسەر دەبرد. هەتا تەمەنی چل ساڵییش، هەر کات بەو زەوییانەی شارەکەدا تێدەپەڕیم _کە ئێستا بووەتە ماڵی ٢٥٠،٠٠٠ خەڵك_ کە کۆتا ناوی هاوپۆلە چاوسەوزەکەمی هەڵگرتبوو، یاخود کاتێك خێزانەکەم دەیانگوت کە

ئەستەنبولٚ گوندێکی گەورەیە، دەستبەجێ ئەو هاوپۆلە قژسوورە دێتەوە یادم، کە چۆن چاوەکانی سوور دەبوونەوە و چۆن بەبێدەنگی فرمێسکی دەڕشت.

ئەو خێزانانەی خاوەنی کارخانەی کەشتییەکان بوون (هەموویان لەکەناری دەریای ڕەش بوون)، کەمتر کێشەکانیان دەبردە دادگا، بەڵکو چەکیان بەکار دەهێنا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان. ناکۆکیی نێوانیان لە بەلەمە بچووکە بە تەختە دروستکراوەکانەوە دەستی پێ کرد، هەریەکەیان لە پێشبڕکێدا بوون بۆ بەستنی بەڵێننامە لەگەڵ دەوڵەت. کاتێك هیلاك بوون لە کوشتنی یەکتری، وەك شازادەکانی سەدەی ناوەڕاستیان کردووە و دەستیان کردووە بە ژن و ژنخوازی لەنێوانیاندا. بەڵام ماوەی ئاشتییان زۆری نەخایاندووە، هەر زوو هێرشیان کردوەتەوە سەر یەکتری و نیگەرانیی زیاتریان بۆ ئەو کچانە دروست کردووە کە لەنێوان هەردوو خێزانەکەدا بوون و هاوسەرگیرییان بە نیازی ئاشتیخوازیی نێوانیان پێ کرابوو. لەپاش ئەوەی ئەم خێزانانە هەموو بەلەمەکانی گواستنەوەیان دەکڕی و کەشتییە بارهەڵگرە بچووکەکانیان دروست دەکرد، یاخود یەکێك لە کچەکانیان هاوسەرگیریی لەگەڵ یەکێك لە کوڕەکانی خێزانەکەی تر دەکرد، دەبوونە مانشێتی بەردەوامی "ئایا بیستووتە؟" _کە دایکم هەمیشە ئەم بابەتانەی گوڵپەری دەخوێندەوە، کە لەبارەی ئاهەنگ و بەزموڕەزم و خواردنەوەی شەمپانیا و کاڤیار ئەو خێزانانە دەنووسران.

لە بۆنە خێزانییەکان، ئاهەنگی هاوسەرگیری و بۆنەکانەکانی دیکە کە خێزانەکەم زۆر جار بەشدارییان دەکرد، چەندین وێنە دەگیران. ئەو کەسانەی لە وێنەکاندا دەرکەوتبوون، دەیانبردنەماڵەوە و دیسان لەسەر مێزی خوانەکانی ئاهەنگەگان پیشانی یەکتریان دەدان. لەو وێنانەدا، هەندێك لەو خەڵکانەم دەناسییەوە کە سەردانیان کردبووین، یاخود کەسە ناودارەکانیان تێدا بوو کە لە لاپەڕەکاندا دەرکەوتبوون، یاخود هەندێك لە کەسە سیاسییەکان کە یارمەتیی ئەم خێزانانەیان دەدان. کاتێك دایکم بە تەلەفۆن لەگەڵ ئەو خوشکەی قسەی دەکرد کە بەردەوام دەچوویە ئەم جۆرە ئاهەنگانە و بۆ دایکمی دەگێڕانەوە، هەوڵم دەدا دیمەنی بۆنەکان بهێنمە پێشچاوم، هەتا بزانم چۆن بوون. لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە ئاهەنگە کۆمەڵایەتییەکان وەك بۆنەیەکی گەورە وا بوون کە نمایشکارانی جلوبەرگ، دەستەی تەلەڤزیۆن و ڕاگەیاندکاران بەشدارییان دەکرد و

وێنەکانیان لەسەر لاپەڕەکان پیشان دەدران و هەموو شارەکە دەیانبینین. بەڵام ئاهەنگی نەوەکانی پێشوو جیاوازتر بوون، تەنها بۆ خۆدەرخستن نەبوون، بەڵکو هەموو خێزانە دەوڵەمەندەکانی پێکەوە کۆ دەکردەوە و خوازیار بوون بە هۆی ئەو ئاهەنگەوە ئەگەر بۆ یەك ئێوارەش بێت، ترس و نیگەرانییان لە دەسەڵاتی مشەخۆر لەبیر بکەن.

کاتێك وەك گەنجێك دەچوومە ئەم ئاهەنگانەوە، سەرەڕای شڵەژاوییەکەم، هەستم بە خۆشی دەکرد کاتێك خۆم دەبینییەوە هاوشانی ئەو کەسە پلە بەرزانەم. هەمان هەستم لە چاوەکانی دایکمدا دەبینی، کاتێك لە ماڵەوە دەچوویە دەرەوە بۆ ئەو ئاهەنگانە، تەنها خۆشیی لە بەسەربردنی هەموو ڕۆژەکە بە جلی ئاهەنگەوە و کاتی ڕابواردن نەدەبینی، بەڵکو خۆشحاڵییەکەی بە هۆی بەسەربردنی کاتی ئێوارەکەی لەگەڵ دەوڵەمەندەکان، هەروەها هەستکردن بەوەی لەبەر هەر هۆکارێك بێت، تۆش لە ڕیزی ئەوانی.



لەگەڵ ڕۆیشتنە ژوورەوەی هۆڵە گەورە و ڕازاوەکان، یاخود باخچە گرانبەهاکان (زۆر جار هاوینان ئاهەنگەکان لە لە باخچەکان دەکران)، کاتێك لەنێوان مێزە جوان و ڕێکخراوەکان، چەتر، گوڵدان، مەیگێڕ و خزمەتکارەکاندا تێدەپەڕیم، سەرنجی خانەدانەکانم دەدا کە خۆشحاڵییان بۆ یەکتر دەردەبڕی، بەتایبەت لەو کاتانەی ناودارەکان ئامادە دەبوون. هەروەك دایکم، هەمووان سەیری قەرەباڵغییەکەیان دەکرد،

بۆ ئەوەی بزانن کێی تر لەوێ ئامادەیە و شادومان دەبوون بە بینینی کەسی شیاو. زۆربەی ئەوانەی لەو ئاهەنگانە ئامادە بوون، سەرمایەکەیان لە ڕێگەی کار و ماندووبوونەوە دەست نەکەوتبوو، بەڵکو بە هۆی ئەو فێڵ و درۆیانەوە بوون کە خوازیار بوون لەبیریان بکەن، بەڵام ویژدانیان بەوە ئاسوودە دەبوو کە ئەوەندە سامانیان هەیە، هەر کات بیانەوێت، دەتوانن خەرجیی بکەن. بە جۆرێکی تر، ئەو کەسانە تەنها کاتێك دەحەسانەوە، تەنها کاتێك هەستیان بە باشی دەکرد، ئەگەر لە هەمان شوێن لەگەڵ هەمان ئەو کەسانە بن کە وەك خۆیانن.

جارێکیان بەناو خەڵکەکەدا پیاسەم دەکرد، لەناکاو ڕەشەبایەك لە شوێنێکی نادیارەوە هەڵیکرد، یەکسەر شوێنەکەم جێ هێشت. لەو شوێنانە چاوم دەکەوت بە هەندێ کەلوپەلی سەیر و گرانبەها، کە بۆ کاتبەسەربردن بوون (وەکو چەقۆی هەڵکۆڵەری کارەبایی)، خێزانەکەی من لە توانایدا نەبوو بیانکڕێت. کاتێك پەیوەندیی توندی خێزانەکەم دەبینی لەگەڵ کەسانێکی لەخۆبایی، ئازارم دەکێشا کە سامانەکەیان لە ڕێگەی فێڵ و تەڵەکەوە بەدەست هێنابوو. دواتر بۆم دەرکەوت دایکم کە دڵخۆشیی پیشان دەدا بە هاوڕێیەتییان، هەروەها باوکم کە لەگەڵ یەکێك لە خاتوونەکان سەرقاڵی گفتوگۆ دەبوو، هیچ کامیان قسە ناخۆشەکانیماڵیان لەبیر نەچووە، بەڵکو هەڵیانگرتبوون و تەنها بۆ شەوێکیش بێت، خستبوونیانە لاوە. سەرەڕای هەموو شتێك، ئایا دەوڵەمەندەکان هەموویان وەك یەك نین؟ پێم وا بوو دەوڵەمەندەکان هەموویان یەك نواندن دەکەن. زۆر جار خانەدانەکان کاتەکانیان لە ئاهەنگەکان بە گازندەکردن تێدەپەڕاند، لەبارەی ئەو خواردنانەی لە فڕۆکە پێشکەشیان کرابوو، وەك ئەوەی کێشەیەکی گەورە و گرنگ بێت، یان وەك ئەوەی زۆربەی ئەو خواردنانەی خواردبوویان، جۆریەتەکیان نزم بووە و لە ئاست ئەواندا نەبووە. بە پاشەکەوتکردنی پارەکانیان لە بانکەکانی وڵاتی سویسرا، ئاسوودەبوونیان کە سەرمایەکانیان دوورە و بەئاسانی دەستی پێ ناگات، ئیرەییم پێ دەبردن.

بە هۆی قسەیەکی باوکمەوە، بۆم دەرکەوت ئەو جیاوازییەی لەنێوان ئێمە و خێزانە لەخۆباییەکاندا هەبوو، ئەوەندەش زۆر نەبوو کە من بیرم لێ دەکردەوە. کاتێك تەمەنم بیست ساڵان بوو، لەگەڵ باوکم گفتوگۆم دەکرد و لەبارەی گەمژەیی دەوڵەمەندە

بێهەست و کەللەپووتە و ئەوانەی کە وا خۆیان پیشان دەدا چەندە رۆژئاواییین، ئەو کەسانەی، لەبری ئەوەی کۆکراوە هونەرییەکانیان پیشان بدەن و بیانخەنە مۆزەخانەوە، یاخود دوای هەستوسۆزیان بکەون _بەترسنۆکی ژیان بەسەر دەبەن، دەدوام و نموونەی چەند خێزانێکم لە ناسیاو، هاورێی منداڵیی خێزانەکەم، یان خێزانی هەندێك لە هاورێکانم. باوکم قسەکانی پێ بڕیم _لەوانەیە ترسابێت ژیانێکی ناخۆش بەرێ بکەم، یاخود ویستبێتی ئاگادارم بکاتەوە_ ئینجا گوتی کە ئەو خاتوونەی ئێستا ناوم هێنا (ئافرەتێکی جوان بوو)، کچێکی دڵپاك و ڕەوشتجوانە، ئەگەر ڕۆژێك هەلم بۆ رێك بکەوێت بۆ ئەوەی بیناسم، ئەوا خۆم تووشی کێشە ناکەم.

۲۲

# ئەو کەشتییانەی بە بۆسفۆردا تێپەڕیون، ئاگرکەوتنەوە دیارەکان، گواستنەوەی ماڵەکان و کارەساتەکانی تر

کۆسپەکانی وەکو شکستە داراییە یەك لەدوای یەکەکانی باوکم و مام، شەڕەکانی نێوان دایکم و باوکم و کێشە و ناکۆکییانەی نێوان لقەکانی ئەو خێزانە گەورە کە داپیرەم سەرۆکایەتی دەکرد، گەیاندمیان بەو ڕاستییەی کە سەرباری هەموو شتێك، جیهان پێویستە وێنەکێشان و هاوڕێیەتی و سێکس و خەوتن و خواردن و یاریکردن و سەیرکردنی دیمەنەکانی تێدا بێت. هەرچەندە هەلی کامەرانی زۆر سنووردار بوو و زۆر بەقورسی ڕۆژێك تێدەپەڕی بەبێ ئەوەی ئاشنای خۆشییەکی نوێ بین، ژیان پڕ بوو لە ناکۆکییە لەناکاو و هەمەجۆرەکان. هەڕەمەکی و بێئامانجیی ئەم ناکۆکییانە، ئاگادارییە دەریاییەکانی ڕادیۆی بیر دەخستینەوە کە هەموو کەشتییەکان (هەروەها ئێمەش)، لەبارەی شوێن گۆڕینی (مینە ژێر دەریاییەکان) لەسەر ڕێگای چوونە ژوورەوەی بۆسفۆر، ئاگاداری دەکردنەوە و ناونیشانی شوێنی دروستی پێ دەدان.

لە هەر ساتێکدا بووایە مشتومڕی دایك و باوکم لەسەر هەر شتێك کە بەتەواوەتی چاوەڕواننەکراو بوو، دەستی پێ دەکرد. یان ئەوەش نا، ناکۆکییان لەگەڵ خزمەکانی نهۆمی سەرەوە لەسەر موڵك و سامان دروست دەکرد، یان براکەم ئارامیی خۆی لەدەست دەدا و بڕیاری دەدا وانەیەکم فێر بکات کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە. جارێکیان

باوکم دەگەڕایەوە ماڵەوە و هەر لەسەرپێ گوتی ماڵەکەم فرۆشتووە و ئەوانی تر بەڵگەمامەیەکی یاساییان پێ پڕ دەکردەوەتەوە بۆ ئەوەی زوو ماڵەکە چۆڵ بکەین.

لەو ڕۆژانەدا، چەندین ناکۆکیی جیاوازمان بەرپێ کرد. هەموو جارێك شڵەژاوییەك لە ماڵەوە ڕووی دەدا، بەڵام لەبەر ئەوەی دایکم وەك نەریتێك بە ڕۆژنامە کۆنەکان، قاپ و کەلوپەلەکانی دەپێچایەوە و سەرقاڵ بوو، کاتی کەمتری هەبوو بۆ ئەوەی چاودێریی ئێمە بکات. ئەمەش واتای وا بوو من و براکەم دەمانتوانی بەئازادی لە ماڵەوە ڕابکەینە دەرەوە. کاتێك سەیری ئەو کرێکارانەمان دەکرد دۆڵاب و کەنتۆر و مێزەکانیان هەڵدەگرت و دەیانگواستنەوە بۆ خانووە نوێیەکە و کاتێك سەیری گواستنەوەی شتە نەگۆڕەکانی ژیانمان دەکرد و ئامادەکاری بۆ جێهێشتنی ئەو باڵەخانەیەی کە پێشتر ماڵمان بوو، هەستم بە خەم دەکرد. تەنها شتی دڵخۆشکەرم ئەوە بوو کە لەو ڕێگەیەوە، لەوانەیە بتوانم ئەو قەڵەم و هەڵمات و یارییە بەنرخەکانی ترم بدۆزمەوە کە دیار نەمابوون. ڕەنگە بە جێهێشتنی باڵەخانەکانی پاموك، زۆر ئاسوودە نەبووبێتم، بەڵام ئەو خانووانەی جیهانگیر و بە شیکتاش، دیمەنی جوانی بۆسفۆری لێوە دیار بوو، لەبەر ئەوە هەستم بە دڵتەنگی نەدەکرد و بە تێپەڕبوونی کات، نیگەرانیم بۆ لەدەستدانی سامانەکەمان کەمتر دەبوویەوە.

لەو ڕۆژانەدا بەنیازی دوورکەوتنەوە لەو کارەساتانە، چەندین ستراتیژیم بەکار دەهێنا. چەند ڕژێم و شێوازێکی قسە ئەفسانییەکانم بۆ خۆم دروست کردبوو (وەك پێنەنان بەسەر درزەکانی سەر زەوی، یان دانەخستنی تەواوی هەندێك دەرگا)، یاخود خۆم بە چەند سەرکێشییەکەی ترەوە وەکو چاوپێکەوتنی ئۆرهانەکەی تر، هەڵهاتن بۆ دونیای خەیاڵەکانم، وێنەکێشان و شەڕکردن لەگەڵ براکەم خەریك دەکرد، یان ئەو کەشتییانەم دەژمارد کە بە بۆسفۆردا تێدەپەڕین.

لە ڕاستیدا، هەندێك جار سەیری کەشتییەکانی بۆسفۆرم دەکرد، لەپاڵ ئەوانیشدا سەیری چەندین بەلەم و کەشتیی تری وەکو کەشتیی نەوتهەڵگری ڕۆمانییەکان، کەشتیی جەنگی سۆڤیەت، بەلەمی ڕاوەماسییەکان کە لە ترابزۆنەوە دەهاتن، کەشتیی سەرنشینهەڵگری بولغارییەکان، کەشتیی گەشتیاریی دەریایی تورکی کە دەچوونە دەریای ڕەشەوە، کەشتیی کەشناسیی سۆڤیەت، پاپۆڕە زەریایی و جوانەکانی ئیتالیا،

بەلەمی خەڵوزین، فەرگەتەکان (کەشتیی جەنگی بچووك)، کەشتییە بارهەڵگرە ژەنگاوی و پشتگوێخراوەکانی ڤارنا و ئەو کەشتییانەی ئاڵا و ڕەسەنایەتیی وڵاتەکەیان لەژێر ڕووپۆشێکی تاریك و دووکەڵاوی هەڵگرتبوو، دەکرد. ئەمەش بە واتای ئەوە نایەت سەیری هەموو شتێکم کردبێت، وەکو باوکم سەیری خۆم نەدەئێشاند بەو ماتۆڕە دەریاییانەی کە بەناو بۆسفۆردا چەپ و ڕاستیان دەکرد و پیاوە ئیشکەرەکانیان دەگەیاندە شوێنی کارەکانیان و ئەو ئافرەتانەیان دەگواستەوە کە پەنجا کیسەی ئەو کەلوپەلانەیان پێ بوو، کە لە بازاڕ کڕیبوویانن. یان زۆر سەرنجی ئەو کەشتییانەم نەدەدا کە لە کەنارێکەوە دەچوون بۆ کەنارێکی تری لایەکی تری ئەستەنبوڵ، کە ئەو سەرنشینانەیان دەگواستەوە کە گەشتەکەیان بەدەم چای خواردنەوە و جگەرەکێشان و نقومبوون لەناو خەیاڵەکانیان بەسەر دەبرد. هەر وەکو کەلوپەلەکانی ماڵەوە، ئەم شتانە بووبوونە بەشێکی ژیانی ڕۆژانەم.



وەکو منداڵێك، بە سەیرکردنی ئەم کەشتییانە بێزاری و ترسم لەبیر دەچوویەوە. بە ژماردنیان، هەستم دەکرد دەستم گرتووە بەسەر ژیانمدا. ئەو کاتانەی بێزار دەبووم، کاتێك لە خۆم و قوتابخانە و ژیانم هەڵدەهاتم و پیاسەم دەکرد، لە شەقامەکانی شاردا ڕادەوستام بۆ ئەوەی دەست بکەمەوە بە سەیرکردنی کەشتییەکان، دواتر بەپەرۆشییەوە بیرم لە کارەساتەکان، ئاگرکەوتنەوەکان، ژیانەکەی تر و ئۆرهانەکەی تر دەکردەوە.

ئەگەر خودی ژماردنی کەشتییەکان باس بکەم، ئەوا لانی کەم زیاتر لە بابەتێك هەڵدەگرێت. ئەو ڕۆژانە _باسی سەرەتای شەستەکان دەکەم_ من و باوکم و دایکم و براکەم، لە نهۆمێکی بچووکی باڵەخانەیەکی باپیرم ڕوو لە بۆسفۆر لە جیهانگیر دەژیاین. ئەو دەمەی تەمەنم یازدە ساڵان بوو و کۆتا ساڵی خوێندنی سەرەتاییم بوو، بۆ نزیکەی مانگێك زەنگی ئاگادارکەرەوەی کاتژمێرەکەم بۆ کاتژمێرێك پێش بەرەبەیان دادەنا و لە کۆتا کاتەکانی شەودا لە خەو هەڵدەستام. ژوورەکە لەنزیکی جێگەی خەوەکەمەوە بوو، بەڵام نەمدەتوانی دایگرسێنم، لەبەر ئەوە لە شەوە ساردەکانی زستاندا دەچوومە جێگای خەوی ژووری بەتاڵی خزمەتکار، کە زۆر بەدەگمەن کاریان بەم ژوورە دەبوو، ئینجا کتێبی قوتابخانەم دەردەهێنا و دەستم دەکرد بە وتنەوەی ئەو شیعرە کە دەبوو بۆ ڕۆژی دواتر ئامادەی بکەم بۆ مامۆستا:

*"ئەی ئاڵاکەم، ئەی ئاڵا سەربەرزەکەم*
*لە ئاسماندا بشەکێوە!"*

ئەگەر بتەوێت نوێژ یان هۆنراوەیەك فێر بیت، ئەگەر بتەوێت وشەکان لەناو هزرتدا بچەسپێنێت، ئەوا نابێت سەرنج بدەیتە ئەو شتانەی کە لە پێشچاوتن. کاتێك وشەکان لە بیرەوەریدا چاپ دەبن، ئیتر مێشکت ئازاد دەبێت لە گەڕان بەدوای وێنەکاندا، چاوەکانت بەتەواوەتی لە خەیاڵەکانت جیا دەبنەوە و تەنها بۆ خۆشیی خۆیان سەیری دونیا دەکەن. بەرەبەیانێکی ساردی زستان، کاتێك لەژێر بەتانییەکدا هەڵدەلەرزیم و هۆنراوەکەم دەخوێندەوە، لە پەنجەرەکەوە سەیری بۆسفۆرم کرد کە هەروەك خەونێك لە تاریکییەکەدا دەدرەوشایەوە.

دەمتوانی لە کەلێنی نێوان بینا چوار و پێنج نهۆمییەکان، لەخوارەوەی باڵەخانەکەی خۆمان، لە سەریان و لەنێوان دووکەڵکێشی نیوە شکاوی ئەو خانووە دارینانەی کە دە ساڵ دواتر سووتێنران، لەنێوان منارەی مزگەوتەکانی جیهانگیر، سەیری بۆسفۆر بکەم. لەو بەرەبەیانییەدا هیچ کەشتییەك لە ئاوەکەدا نەبوو، دەریاکە زۆر تاریك بوو و هیچ تیشکی گڵۆپ و ڕوناکییەکی پشکنەرێك دیار نەبوو . لە بەشی ئاسیا، کەشتییە

کۆنەکانی حەیدەر پادشا و ڕووناکیی ئەو کەشتییە بارهەڵگرانەم دەبینی کە بەهێمنی ڕێیان دەکرد. لەگەڵ یارمەتیی ڕووناکیی مانگەشەو و گڵۆپی بەلەمە ماتۆڕییە تەنیاکان، هەندێك جار دەمتوانی بەلەمە گەورە و بە سەدەف داپۆشراوەکان و ئەو ماسیگرانەی لەناو بەلەمەکانیاندا دانیشتبوون، لەگەڵ کەنارە سپی و تارماوییەکانی کیزکولسی ببینم، بەڵام بەزۆری دەریاکە لەناو تاریکیدا نقوم بووبوو. تەنانەت کاتێك _کەمێك پێش خۆرهەڵهاتن_ بینای باڵەخانەکان و درەختە سەوز و چڕوپڕەکانی ناو گۆڕستانەکان ڕووناك دەبوونەوە، بەڵام بۆسفۆر هەر بەتاریکی دەمایەوە و بە جۆرێك دەردەکەوت، وەك بڵێی هەمیشە هەر بە جۆرە تاریکییە دەمێنێتەوە.



لەو کاتانەی لە تاریکییەکەدا خەریکی ئەبەرکردنی شیعرەکە بووم و مێشکم سەرقاڵ بوو بە خوێندنەوە، چاوم خستبوویە سەر ئەو شتانەی کە زۆر بەهێواشی بەناو تەوژمەکانی بۆسفۆردا دەجووڵان _کەشتییەکی شکڵ نامۆ، بەلەمێکی ڕاوەماسی کە لە بەیانی زوودا جێگیر کرابوون. هەرچەندە زۆر ئاوەزم لای ئەو شتانە نەبوو، بەڵام چاوەکانم هەر لە نەریتی جارانی خۆیان بەردەوام بوون: چەند خولەکێك خوێندنەوەیان دەکرد بۆ ئەو شتانەی کە بەبەردەمیاندا تێپەڕ دەبوون، هەتا بەتەواوەتی بزانن چی بووە. بە خۆم دەگوت، بەڵێ ئەوە کەشتییە بارهەڵگرەکەیە، بەڵێ ئەوە بەلەمی ڕاوەماسییەکەیە کە لە تاریکییەکەدا تەنها ڕووناکیی گڵۆپەکانی ئەو دیار بوون، بەڵێ

ئەوە ئەو ماتۆڕی گواستنەوەیە کە ڕۆژ بوویەوە، سەرنشینەکان لە بەشی ئاسیاوە دەگوازێتەوە بۆ بەشی ئەورووپا، بەڵێ ئەوە کەشییە کۆنەکەیە کە لە بەندەری سۆڤیەتی دوورەوە هاتووە.

لە یەکێك لەو جۆرە بەرەبەیانانەدا، وەك هەموو جارێك لەژێر بەتانییەکەم دەلەرزیم و هۆنراوەکەم دەخوێندەوە، لەناکاو چاوم کەوتە سەر شتێکی نامۆ کە تا ئەوکات شتی وام نەدیبوو. زۆر باش بیرمە کە چۆن لە شوێنی خۆم وشك بووم و ئاگام لە کتێبەکەی دەستم نەما. کەشتییەکی زەبەلاح هەتا زیاتر لە تاریکیی دەریاکەوە دەردەکەوت، گەورەتر و گەورەتر دەبوو و نزیکتر دەبوویەوە. ئەو تارماییە دێوەزمە و زەبەلاحە، کەشتیی جەنگیی سۆڤیەت بوو! بە جۆرێك لەناو تاریکییە تەمومژاوییەکەدا دەردەکەوت، وەك ئەوەی قەڵایەکی گەورەی سەرئاوکەوتووی ناو چیرۆکە ئەفسانەییەکان بێت. کەشتییەکە بەسستی تێپەڕ دەبوو و بزوێنەرەکانی بەهێواشی دەجوولاَن، بەڵام ئەوەندە بەهێز بوو کە شووشەی پەنجەرەکان و کەلوپەلەکانی ماڵەوەی دەلەراندەوە. ئەو مقاشەی لەتەنیشت ئاگردانەکەوە هەڵواسرابوو، مەنجەڵ و قاپە ڕیزکراوەکانی مەتبەخ، پەنجەرەی ئەو ژوورانەی باوکم و دایکم و براکەم تێیاندا نووستبوون، تەنانەت ئەو کۆڵانە چەوریژکراوانەی بەرەو دەریاکە درێژ بووبوونەوە، هەموویان دەلەرزین. زبڵدانی بەردەم ماڵەکان بە جۆرێك تەقەتەقیان دەکرد، وەك ئەوەی زەمینلەرزە ڕووی دابێت. کەواتە ئەو شتەی ئەستەنبوڵییەکان لەدوای جەنگی ساردەوە بەچرپەچرپ باسیان دەکرد، ڕاست دەرچوو: گەورەترین کەشتییە جەنگییەکانی ڕووسیا لە کاتی شەبەقدا بە بۆسفۆردا تێدەپەڕن.

چەند خولەکێك زۆر ترسام و بیرم دەکردەوە دەبێت شتێك ئەنجام بدەم. هەموو شارەکە خەوتبوون، تاکە کەس بەخەبەر بوو، من بووم کە ئەو کەشتییە گەورە جەنگییەم دەبینی نزیك دەبێتەوە و کەس نەیدەزانی چی کارەساتێك دەقەومێنێت. پێویست بوو شتێك بکەم بۆ ئەوەی خەڵکی ئەستەنبوڵ و هەموو جیهان ئاگادار بکەمەوە، دەبوو هەمان ئەو شتە بکەم کە منداڵە ئازا و پاڵەوانەکانی ناو پەرتوکەکان دەیانکرد _شارەکەیان بەخەبەر دەکردەوە بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکەن لە مەترسیی لافاو و

ئاگرکەوتنەوە و سوپای داگیرکەران. بەڵام هیچ تاقەتی هەستانەوەم لە جێگا گەرمەکەم نەبوو.

لە کاتێکدا نیگەرانی باڵی کێشابوو بەسەرمدا، لەناکاو بیرم لە هەمان شتی شێتانە کردەوە، کە خووم پێوە گرتبوو: هەروەك ئەوەی پارچە نووسینێکم ئەبەر دەکرد، هەموو بیروهۆشم خستە سەر کەشتییەکەی سۆڤیەت. دەمەوێت بڵێم هەروەك سیخورەکانی ئەمەریکا کە لەسەر لوتکەی بەرزاییەکان دانرابوون بۆ ئەوەی بەنهێنی چاودێریی بۆسفۆر بکەن و وێنەی کەشتیی کۆمۆنیستەکان بگرن کە بە دەریاکەدا تێدەپەڕین (ئەمەش داستانێکی تری ئەستەنبوڵییەکان بوو لەدوای جەنگی ساردەوە باس دەکرا): لە هزرمدا، نەخشەم بۆ هەموو لایەنە دیارەکانی کەشتییەکەم خستە ژێر پرسیارەوە. داتای زانیارییە نوێیەکانم لەبارەی کەشتییەکانی تر و تەوژمەکانی بۆسفۆر و ئەو خاڵەی کە ڕەنگە جیهان تێیدا پێیدا بسوورێت، کۆ کردەوە. لەپاش ئەوەی لێکۆڵینەوەکەم تەواو بوو، کەشتییە زەبەلاحەکە لەبەر زەینم گۆڕا بۆ شتێکی ئاسایی. نەك تەنها بە کەشتییەکەی سۆڤیەت، بەڵکو بە سەیرکردنی هەموو کەشتییەکانی تر، دەمتوانی وێنەی جیهان لە خەیاڵمدا گەورەتر بکەم، لەگەڵ ئەو شوێنەی تێیدا دەژیام. ئەوەی لە قوتابخانە فێریان کردین، ڕاست بوو: بۆسفۆر کلیل و دڵی جوگرافیی هەموو جیهانە، هەر بۆیە هەموو سوپاکانی جیهان بەتایبەت ڕووسیا، دەیانەوێت دەست بگرن بەسەر بۆسفۆرە جوانەکەی ئێمەدا.

هەموو تەمەنم لەسەر ئەو بەرزاییانە بەسەر بردووە، کە ڕوانیویانە بەسەر بۆسفۆردا، ئەگەر لەدوورەوەش بووبێت یان لەنێوان باڵەخەکان و منارەی مزگەوتەمان و سەر گردەکانەوە، تەنها ئەوەندە توانیبێتم بۆسفۆر ببینم. خواستی ئەستەنبوڵییەکان، هەمیشە ئەوە بووە هەموو پەنجەرەکانیان ڕوویان لە بۆسفۆر بێت، چونکە دەریاکە بۆ ئەوان دەریاییەکی ڕۆحییە وەك میحرابی مزگەوتەکان و پێشنوێژی کڵێسای کریستیان و جوولەکەکان وایە. هەموو کورسی و قەنەفە و مێزی نانخواردنەکان بە جۆرێك دانراون، کە ڕوویان لە بۆسفۆرە. ئەگەر لەناو کەشتییەك بیت کە لە مەڕمەڕەوە دێت، ئەوا ملیۆنەها ئەستەنبوڵی دەبینی کە لە پەنجەرەکانیانەوە و یان لەدەرەوەی

پەنجەرەکانیانەوە وەستاون بۆ ئەوەی باشتر سەیری کەشتییەکە و ئاوەکە بکەن کە کەشتییەکە دەیجوولێنێت.

سەرنجدانی ئەو کەشتییانەی بە بۆسفۆردا دەچوون، دەبێت خوویەکی نامۆ بێت، بەلام کاتێك باسی ئەم خووەم بۆ کەسێکی تر دەکرد، بۆم دەردەکەوت سەیرکردنی کەشتییەکان لەناو هەموو ئەستەنبوڵییەکان بە هەموو تەمەنەکانیەوە، شتێکی باوە. لە ڕۆژە ئاساییەکاندا، زۆربەمان ڕوو دەکەینە لای پەنجەرەکان یان دەچینە بالکۆنەکانمان هەتا بە سەیرکردنی دیمەنی ناو دەریاکە، هەرچی بێزاری و خەمە لەبیرمان بچێتەوە. لە بەشیکتاش، ئەوکات من لە تەمەنی هەرزەکاری بووم کە ماڵمان گواستەوە بۆ ئێرە، لە خانوویەك دەژیان لە سرینسبی لەسەر گردێك کە دەیڕوانییە بۆسفۆر، خزمە دوورەکانم لێرە بە جۆرێکی ئەوەندە ورد سەرنجی هەموو کەشتییەکانیان دەدا، وەك ئەوەی کار و پیشەیان بێت. هاوپۆلێکی دواناوەندیم هەبوو کە دڵنیا بوو هەموو کەشتییەکی شێوە گوماناوی _ئەوانەی کۆن و ژەنگاوی بووبوون، یان چاك کرابوونەوە، یاخود نەناسراو بوون_ ئەوا بۆ گواستنەوەی



چەکی قاچاخی سۆڤیەتن بۆ یاخیبووەکان لە فلان و فلان شار یان نەوت دەگوازنەوە بۆ چەند شارێك بۆ ئەوەی کێشە و زیان لە بازاڕەکانی جیهان دروست بکەن.

لەو ڕۆژانەدا دانیشتن لەبەردەم تەلەفزیۆن، هۆیەکی باش بوو بۆ بەسەربردنی کات، بەلام سەرنجدانی کەشتییەکان نەریتی زۆربەمان بوو، ئەمەش منی تووشی ترس دەکردەوە، ترسێك کە ڕووبەڕووی ئەوانی تریش دەبوویەوە. لەپاش بینینی سامانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە لە شارەکانیانەوە دزەی دەکرد، لەپاش بینینی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەر دەستی ڕووسیا و ولاتانی ڕۆژئاوا و دواهاتنی هەژاری و ماتەمینی و وێرانکاری، ئەستەنبوڵییەکان بوونە نەتەوەیەکی خۆپەرست. لەبەر ئەوە لە ماوەی ١٥٠ ساڵی پێشووەوە، گومانمان لە هەر شتێکی نوێ هەیە،

بەتایبەت ئەگەر هەر شتێك بۆنی بێگانەی لێ بێت (تەنانەت ئەگەر ئارەزووومان لەو شتە بێت). لە ترسی چاوەڕوانیی کارەساتێك ژیاوین، کە لەوانەیە نەهامەتیمان بۆ بهێنێت. تا ئێستاش گرنگە شتێك بکەین، هەتاوەکو لەگەڵ ئەو ترس و خەمە بجەنگین، لەبەر ئەوە دانیشتن بەتەمبەڵی و سەیرکردنی بۆسفۆر، دەتوانرێت وەك ئەرکێك سەیر بکرێت.

هەندێك کارەسات هەن کە لە بیرەوەریی ناخۆشی شارەکەدا ماونەتەوە و بەترسەوە بیریان دەکەوێتەوە. کەشتییەکانی بۆسفۆر، کە هەموو شارەکەیان پێکەوە بەستۆتەوە، وەکو گوندێکی گەورەیان لێ کردووە، بەشێکن لەو کارەساتانە. ئەو کارەساتانە کاریان لە ژیانی ڕۆژانەمان کردووە و خەڵکانی وەك ئێمەیان هێناوەتە بوون کە کاتێك بیر لە کارەساتەکانیان دەکەینەوە بەنهێنی و ئەگەر هەست بە گوناهیش بکەین، چێژیان لێ دەبینین.

تەمەنم هەشت ساڵان بوو، شەوێکیان بە هۆی ژاوەژاو و ئاگرەکەوە کە مانگەشەوەکەیان شڵەژاندبوو، زانیم دوو کەشتیی نەوتهەڵگر لەناوەڕاستی بۆسفۆردا بەیەکیان داوە و لەدوای تەقینەوەیەکی گەورە، بڵێسەی ئاگرەکەیان کڵپەکڵپی دەکرد. بەڵام ڕووداوەکە هەستبزوێن بوو لەلام، زیاتر لەوەی بمترسێنێت. تەنها کاتێکی کەم لەدوای ڕووداوەکە، لە ڕادیۆوە گوێمان لێ بوو کە بە هۆی ئاگری کەشتییە سووتاوەکانەوە، کۆگا نزیکەکانی نەوت لەو شوێنانە گڕیان گرتووە و ترسێك هەیە ئاگرەکە بە هەموو شارەکەدا تەشەنە بکات. بڵاوبوونەوەی هەموو دیمەنە سەرنجڕاکێشەکانی ئاگرەگە کە پەیوەندییان بە چارەنووسی شارەکەوە هەبوو، بە یەك جۆر بوو: سەرەتا لە دوورەوە کەمێك بڵێسەی ئاگر و دووکەڵ دیار بوو، دواتر قسەگەلێکی زۆر دەکران کە زۆربەشیان ڕاست نەبوون. وەك منداڵێك لەباتی ئەوەی لە دایکمان یان پوورمان بپاڕێینەوە بەرزمان بکەنەوە و لەباوەشمان بگرن، ئارەزووییەکی زۆرمان هەبوو کە بە چاوی خۆمان دیمەنی کارەساتەکە و ئاگرەکە ببینین.

ئەو شەوە مامم بەخەبەری کردینەوە، هەموومانی لە ئۆتۆمبێلەکەیدا کۆ کردەوە و بردینی بۆ تەرەبیە بۆ ئەوەی دیمەنی ئاگرکەوتنەوەکە لەنزیکەوە ببینین، ڕێك لەبەردەم هوتێلێکی گەورە (کە ئێستا لەژێر نۆژەنکردنەوەدایە)، ڕێگاکە گیرابوو، هەروەك بینینی دیمەنی ئاگرکەوتنەوەکە، هەم خەمبار و هەم دڵخۆش بووین. دواتر زۆر ئیرەییم بە

هاوڕێ پۆزلێدەرەکەی قوتابخانەم دەبرد، کە دەیگوت ئەو لەگەڵ خێزانەکەی توانیویانە بەلای سەربازەکاندا تێپەڕن، پاش ئەوەی باوکی کارتێکی بەرز کردووەتەوە و بە دەنگی بەرز گوتوویەتی: "پەیامنێری ڕاگەیاندن!" یان لە ساڵی ١٩٦٠، کاتی بەرەبەیانێکی پاییز، چوومە ناو جێگاخەوەکەم و کۆتاییم بە سەیرکردنی سەیر و تەنانەت دڵخۆشکەری ئاگرکەوتنەوەیەکی ناو بۆسفۆر و جەنجاڵی خەڵکەکە هێنا کە هەندێك بە بیجامەوە، هەندێك پانتۆڵەکەیان توند دەکرد و هەندێك بە نەعلەوە منداڵەکانیان لە باوەش و جانتاکانیان لە دەست بوو. زۆر جار لە کاتی ئاگرکەوتنەوە گەورەکانی ناو بۆسفۆر، کە زۆر جار بە هۆی سووتانی کەشتی یان *یالەکانەوە* ڕووی دەدا، چەند فرۆشیارێکی نەناسراو دەردەکەوتن کە بەناو جەنجاڵیی خەڵکەکەدا هاتوچۆیان دەکرد کە سمیت، بوتڵی ئاو، تۆی گوڵەبەڕۆژە، کفتە و شەربەتیان دەفرۆشت.

بەپێی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکان، (*پیتەر زۆرانچ*)، ئەو کەشتییە تانکەرییەی کە زیاتر لە دە تەن ڕۆنی سووتەمەنیی لە بەندەری تڤاپسی سۆڤیەت دەگواستەوە بۆ یوگسلاڤیا، بە ڕێگای هەڵەدا ڕۆشتەوە و لەگەڵ کەشتیی (*ئاوازی جیهان*)، کە کەشتیی نەوتهەڵگری یۆنانی بووە، کە لەسەر ڕێگای ڕاستی خۆی بەرەو سنوورەکانی یەکێتیی سۆڤیەت ڕۆیشتووە بۆ هێنانی سووتەمەنی، بەیەکیان داوە. خولەکێك یان دووان پاش بەیەکدادانەکە، ئەو سووتەمەنییەی کە لە کەشتییە یوگسلاڤیەکەوە ڕژابوو، بە جۆرێکی ئەوها ترسناك تەقییەوە کە هەموو ئەستەنبوڵ گوێبیستی تەقینەوەکە بوو، ڕەنگە کاپتن و دەستەی دەریاوانەکە دەستبەجێ کەشتییەکەیان جێ هێشتبێت، لەوانەشە مردبن. نەتوانرا دەست بگیرێت بەسەر هیچ کام لە کەشتییەکاندا، هەردووکیان بەلای ڕاست و چەپدا لار دەبوونە و وەك هەورەتریشقەیان لێ هات، بە جۆرێك کە کانلیکا، *یالەکانی* ئەمیرجان، یەنیکۆی، کۆگاکانی گاز و پترۆلی چوبوکلو و ئەو خانووە تەختییانەی بە درێژایی کەناری بەیکۆز بوون، هەموویان لەژێر ترس و هەڕەشەدا بوون. ئەو کەنار دەریایەی کە ڕۆژێك مێلین بە بەهەشتی زەمین ناوی دەبرد، ئەو شارستانیەتەی کە (ع.ش.حیسار) ناوی لێ نابوو، لەژێر بڵێسەی ئاگر و دووکەڵی ڕەش نقوم بووبوو.

هەر کاتێك کەشتییەکان زۆر نزیکی کەناری دەریاکە دەبوونەوە، خەڵك بەپەلە لە *یال* و خانووە لە تەختە دروستکراوەکانیان کە لێفە و جێگاکەیان لە ژێر باڵێکیان بوو و منداڵەکانیشیان لەژێر باڵەکەی تریان بوو، هەڵدەهاتن و ئەوەندەی دەیانتوانی لە دەریاکە دوور دەکەوتنەوە. ئەو کاتەی کەشتییەکی نەوتی یوگسلاڤی ڕێگەکەی هەڵە کرد و لە ئاسیاوە بەرەو بەشی ئەورووپا ڕۆیشت، لەگەڵ کەشتییەکی سەرنشینهەڵگری تورکیا، کە لە ئیستەنیە لەنگەری پێ گیرابوو، بەیەکیان دادا، دوای ماوەیەك گڕیان گرت. کاتێك یەکێك لە کەشتییە گڕگرتووەکان کەوتە لای بەیکۆز، خەڵکێکی زۆر کە لێفەکەنیان بە دەستەوە بوو و چاکەتێکی زستانەیان کردبوو بەسەر جلی خەوتنەکەیان، بەپەلە بەرەو بەرزاییەکان ڕایاندەکرد. دەریاکە بە هۆی ئاگرێکی زەردی درەوشاوە، ڕووناك بووبوویەوە. کەشتییەکان بووبوونە ئاسنێکی سووتاوی کەڵەکەبوو، ستوونی هەڵگرتنی چارۆکەکان و دووکەڵکێشەکان، لە کاتی سووتانەکە لار دەبوونەوە و دەکەوتنە ناو ئاوەکەوە. ئاسمان بە ڕووناکییەکی سەیر دەدرەوشایەوە و جاروبار تیشکی لێ دەردەچوو. ناوبەناو تەقینەوەیەك ڕووی دەدا و پارچە ئاسنینی سووتاو دەکەوتە ناو دەریاکەوە، لەکەناری دەریاکەوە دەنگی هاواری خەڵك و گریانی منداڵ دەبیسترا.

چەند دڵتەزێنە ببینی ئەم بەهەشتی درەختە سەوز، بێستانە چڕوپڕەکان، ئەو باخچانەی کە بە دارتوو، گوڵە هەنگوین و گوڵە ئەرخەوان داپۆشرابوون، شەوانی مانگەشەوی شارەکە کە سەر لە ئێواران دەریاکەی وەك ئاوریشم دەدرەوشێتەوە و شنەباکەی وەك موزیك وایە، یان ئەو پیاوە



گەنجانەی بەهێواشی لەناو بەلەمەکانیان سەوڵ لێ دەدەن و لە کۆتایی سەوڵەکانیان چەند دڵۆپێك ئاوی زیوی هەیە، هەموویان لەناو دووکەڵدا نقوم بوون، هەموو خەڵکیش دەستی یەکیان گرتووە و لە کۆشکە گەورەکانی کەنار ئاوەکەوە هەڵدێن.

دواتر کاتێك سەیری کەشتییەکانم دەکرد، بیرم دەکردەوە دەشێت ڕێگە لە ڕوودانی ئەم کارەساتانە بگیرێت. وەك خۆم هەستم بە بەرسیارێتی دەکرد و هەرگیز ئارەزووم نەدەکرد ڕابکەم و دوور بکەومەوە لێیان. لە ڕاستیدا پێم باش بوو ئەوەندەی بتوانم نزیك ببمەوە و بە چاوی خۆم ڕووداوەکان ببینم. بەڵام وەك ئەستەنبوڵییەك، ئاواتم دەخواست کارەساتێك ڕوو بدات، بەڵام کاتێك کارەساتەکە ڕووی دەدا، بە هۆی ئەم خواستەوە زیاتر هەستم بە تاوان دەکرد.

تەنانەت تانپنار _ئەو نووسەرەی کتێبەکانی شرۆڤەیەکی قووڵیان بۆ گۆڕینی شێوازی ژیانی شارەکە لەناو وێرانکاری و پاشماوەی عوسمانی بەرەو ڕۆژئاوا کردووە و دەیسەلمێنن کە چۆن خەڵکی لە ئاکامدا لەناو نائومێدی و ناخۆشیدا، پەیوەندییان بە ڕابردووەوە دەپچڕێنن_ دانی پێدا ناوە کە چێژی لە سەیرکردنی کۆشکێکی تەختە بینیوە، کاتێك ئاگری گرتووە و بەتەواوەتی سووتاوە. لە بڕگەی ئەستەنبوڵ لە کتێبی (*پێنج شارەکە*)، وەکو جوتیەر خۆی بەراورد کردووە بە نیرۆ. لە لاپەڕەکانی دواتردا بەخەمبارییەوە نووسیویەتی: "یەك لەدوای یەك، هەموو کۆشکە نایابەکان، لەبەرچاوی خۆم ئەوەندە بەخێرایی دەتوانەوە، وەکو توانەوەی خوێ لە ئاودا، هەتا لە کۆتاییدا ئەوەی جێ ما، گردبوونەوەیەکی خاك و خۆڵەمێش بوو."

تانپنار ئەم دێڕانەی لە ساڵی ١٩٥٠ نووسیوە. ئەو کاتە لە کۆڵانێکی تەسك ژیاوە _لەو کۆڵانەی کە ئێمە لەوێ دەژیاین و لەوێوە سەیری کەشتییە جەنگییەی سۆڤیەتم دەکرد_ هەر لەوێوە سەیری ئەو ئاگرەی کردووە کە کۆشکە ڕوو لە ئاوەکەی شازادە سەبیحە خاتوونی وێران کردووە، یان سەیری سووتانی ئەو باڵەخانە تەختەیەی کردووە کە ڕۆژێك خانەی کۆبوونەوەی عوسمانییەکان بووە و دواتر بووە بە شوێنی ئەکادیمیی هونەرەجوانەکان کە تانپنار لەوێ وانەبێژ بووە. ئاگرەکە بۆ ماوەی کاتژمێرێك بەردەوام بووە، لەگەڵ هەر تەقینەوەیەکی نوێدا، پریشکی ئاگر وەك لێزمەی باران بڵاو بووەتەوە. "لەگەڵ بەرزبوونەوەی بڵێسەی ئاگرەکە و دووکەڵەکە، شتێك لە دۆخەکەدا هەبوو کە

پێی دەگوتین ڕۆژی حەشر نزیك بۆتەوە."، بشارێتەوە. کاتێك باسی یەکێك لە کۆشکەکانی هەرێمی مەحمودی دووەم دەکات کە وێران بووە و هەموو کۆکراوە ئەرشیفکراوەکانی لەگەڵ خۆی لەناو بردووە (لە کاتێکدا کارە ئەرشیفکراوەکانی تەلارساز سەداد حەکی تێدا بووە)، ڕەنگە بەو جۆرە نیازی بووبێت ئەو چێژەی لە بینینی دیمەنەکە وەریگرتووە، بە هۆی نائومێدییەکەیەوە بشارێتەوە. درێژە بە باسەکەی دەدات کە چۆن پادشاکانی عوسمانی هەمان هەستی خۆشیان هەبووە، کاتێك سەیری ئاگرکەوتنەوەکانیان کردووە. کاتێك گوێبیستی هاواری کەسێك بوون، گوتوویەتی: "ئاگرررر"، بەپەلە بازیان داوەتە ناو گالیسکەکانیان و بەرەو لای دیمەنەکان ڕۆیشتوون. بە هەمان شێوە، نووسەر باسی ئەو کەلوپەلانە دەکات کە پادشاکان لەگەڵ خۆیان بردوویانە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە سەرما بکەن، وەکو بەتانی و مافور، ئەگەر زانیبێتیان دیمەنی ئاگرکەوتنەوەکە درێژە دەخایەنێت، ئەوا زۆپا، قاپ و مەنجەڵی خواردنیان لەگەڵ خۆیان بۆ دروستکردنی خواردن و قاوە بردووە.



تەنها پادشا، شرەخۆر، دز و منداڵ ڕاپاننەکردووە بۆ سەیری ئاگرکەوتنەوەکانی سەردەمی زووی ئەستەنبوڵ، بەڵکو ڕێبوارە ڕۆژئاواییەکانیش بەناچاری چوون، بۆ ئەوەی دواتر باسی دیمەنەکان بکەنەوە. یەکێك لەو ڕۆژئاواییانە" نووسەر تۆفل جوتیەر بووە، کە لە ساڵی ١٨٥٢ سەردانی ئەستەنبوڵی کردووە. لە ماوەی ئەو دوو مانگەی

ماوەتەوە، شایەتحاڵی پێنج ئاگرکەوتنەوە بووە و بە وردەکارییەکی پڕ لە شەیدابیەوە باسی هەموویانی کردووە. (کاتێك هەواڵی یەکەم ئاگرکەوتنەوەی پێ گەشتووە، لە گۆڕستانی بیۆگڵو دانیشتووە و شیعری نووسیووە). ئەگەر نووسەر پێی باش بووە دیمەنی ئاگرکەوتنەوەکان لە شەودا ڕوو بدەن لەبەر ئەوە بووە دیمەنەکان باشتر ببینێت. باسی دیمەنە سەرسوڕهێنەر و ڕەنگە هەمەجۆرەکانی ئەو ئاگرە دەکات کە بە هۆی سووتانی کارخانەیەکی بۆیەوە لە کەنداوی زێڕین ڕووی داوە و بەوردی باسی ڕووداوەکە دەکات: "ئەو سێبەرانەی لەسەر کەشتیی ناو ئاوەکە یارییان دەکرد، ڕووناکییە شکاوەکان، شەپۆلی جەنجاڵی سەیرکەرەکان و خانووە تەختەکان لەناو ئاگردا بوون." دواتر چووە بۆ شوێنە سووتاو و دووکەڵاوییەکە، بۆ بینینی ئەو خێزانانە کە لە پەناگەکانیان کە ماوەی دوو ڕۆژ دروستیان کردبوون، لەگەڵ هەر شتێك توانیبێتیان ڕزگاری بکەن وەکو مافور، پشتی، دۆشەك، قاپ و مەنجەڵ، ململانێی ژیانیان کردووە، یاخود کاتێك بینیویەتی ئەو خەڵکە چارەنووسی خراپی خۆیان وەك قەدەرێك قبوڵ کردووە، دانی پێ داناوە کە شارەزای نەریتێکی تری تورکە موسڵمانەکان بووە.

بەتایبەت لە سەدەی نۆزدەیەم و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانی، ئاگرکەوتنەوەکان زۆرزتر ڕوویان داوە. ئەو دانیشتووانانەی ئەستەنبوڵ کە لەو سەردەمەدا لە خانووە تەختەکانی کۆڵانە تەسکەکان ژیانیان بەسەر بردووە، وەك کارەساتێك سەیری ئاگرەکەیان نەکردووە کە بتوانی خۆتی لێ بپارێزیت، بەڵکو وەك ڕووداوێکی حەتمی کە هیچ هەڵبژاردنێکیان بۆ نەهێڵێتەوە جگە لە ڕووبەڕووبونەوەی. ئەگەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نەڕووخایە، ئەو ئاگرکەوتنانەوەی کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەیەم زۆر بەخێرایی لە شارەکەدا تەشەنەیان دەکرد _هەزاران ماڵ و زەویوزاری وێرانکرد و هەزاران خەڵکیان بێ ماڵ و هەژار کرد_ ئەوا بەشێکی کەم پاشماوەیان جێ دەهێشت، بۆ ئەوەی ڕابردووی شکۆدارمان بیر بکەوێتەوە.

بەڵام دەربارەی ئەوانەمان کە لەنێوان ساڵانی ١٩٥٠-١٩٦٠ سەیری سووتانی *یالەکان*، کۆشك و خانووە داڕووخاوەکانمان دەکرد، ئەو خۆشییەی هەستمان پێ دەکرد، ئازارێکی دەروونی و تەواو جیاواز بوو لە هەستی خۆشی پادشاکانی عوسمانی، کە لە ساتی سەیرکردنی دیمەنەکان هەیانبوو. بەڵام ئێمە بە بینینی وێرانکاری لەناکاوی

کۆتا هەنگاوەکانی کلتوور و شارستانیەتێکی گەورە کە ئێمە نەشیاو بووین یاخود ئامادەییمان تێدا نەبووە، تا وەك میرات بۆمان بمێنێتەوە، یان بەرامبەر گۆڕانی ئەستەنبوڵ بۆ شارێکی لاواز و پلە دووی لاساییکەرەوەی شارەکانی ڕۆژئاوا، هەستمان بە تاوان و دۆڕان و ئیرەیی کردووە.



لە ڕۆژانی منداڵیم یان لاوێتیم، هەر کاتێك یەکێك لە *یالەکانی* بۆسفۆر ئاگری دەگرت، یەکسەر مرۆگەلێك بەدەوریدا کۆ دەبوونەوە، ئەوانەش کە حەزیان دەکرد لەنزیکەوە تەماشای ڕووداوەکە بکەن، بە بەلەم یان بە ماتۆڕی دەریایی نزیك دەبوونەوە. من و هاوڕێکانم دەستبەجێ بە تەلەفۆن یەکترمان ئاگادار دەکردەوە، دواتر بەخێرایی خۆمان دەخستە ئۆتۆمبێلێکەوە و دەڕۆشتین بۆ ئەمیرجان، ئینجا ئۆتۆمبێلەکەمان لەسەر شۆستەکە ڕادەگرت و دەچووینە چایخانەیەکی نزیك ڕووداوەکە. کاتێك سەیری ئاگرەکەمان دەکرد لەکەناری بەشی ئاسیاوە بەرز دەبوویەوە، شریتی تۆمارکەرەکەمان دەداگیرساند (ئەو کاتە باوترین بوو)، گوێمان بۆ گۆرانییەکانی گرووپی کرێندس کلیەۆتەر ریڤایڤل دەگرت و داوای چای و بیرە و نانی بە پەنیرمان دەکرد.

لە چایخانەکە لەبارەی ڕۆژانی زوو، بەسەرهاتمان دەگێڕایەوە. باسمان دەکرد کە چۆن لە کاتی ئاگرەکەدا، بزماری خانووە تەختە دروستکراوەکانی بەشی ئاسیا دەرپەڕیون و بەبریقەداری بەرز بوونەتەوە بۆ ئاسمان، ئینجا بە بۆسفۆردا فڕیون بۆ ئەوەی خانووە دارینەکانی تری بەشی کەناری ئەورووپا دابگرسێنێت. یان باسی کۆتا پەیوەندیی سۆزداریمان دەکرد، وتوواتی سیاسی و هەواڵی یاریی دووگۆڵیمان ئاڵوگۆڕ دەکرد و گلەییمان لە هەموو ئەو شتە گەمژانە دەکرد، کە خێزانەکانمان خۆیان پێوە

خەریك كردبوو. لە هەمووی گرنگتر، تەنانەت كاتێك كەشتییە تاریكە سووتاوەكە بەبەردەم خانووە سووتاوەكەدا تێدەپەڕی، هیچ كەس سەرنجی نەدەدا، بە جۆرێكی تر ڕوونی بكەمەوە: هیچ پێویست بە سەرنجدان ناكات، چونكە ڕووداوەكە پێشتر بینراوە. كاتێك ئاگرەكان دەگەیشتنە لوتكە و زیانەكانیان دەستی پێ دەكرد، هەریەكەمان بیرمان لە كارەساتێكی تایبەت بە خۆمان دەكردەوە كە لە مێشكماندا شاردبوومانەوە.

ترسی كارەساتێكی تر، كارەساتێك كە هەر كەسێك لە ئەستەنبوڵ ژیابێت، دەزانێت لە بۆسفۆرەوە دروست دەبێت، زۆر جار لەناو جێگەی خەوەكەم بیر لە ڕوودانی دەكەمەوە. لە بەیانیان زوودا، بە دەنگی هۆڕنی كەشتییەكان لە خەو ڕادەچڵەكێم. كاتێك گوێبیستی دووەمین دەنگی بەرز دەبم _ئەوەندە بەرز و قووڵە لە گردەكانی دەوروپشتەوە دەنگ دەداتەوە_ دەزانم ئەوە كەشوهەوا لە بەندەرەكە تەمومژاوییە. لە شەوە تەمومژاوییەكاندا گوێبیستی هۆڕنە بێزاركەرەكان دەبووم، كە لە تاوەری ئاهیركاپی لێدەدران (بۆ ئاگاداركردنەوەی كەشتییەكان لە كەشوهەوای خراپ)، لەو شوێنەی كە بۆسفۆر بە ڕووی دەریای مەرمەڕدا دەكرایەوە. كاتێك لە بۆسفۆر مەلەم دەكرد یاخود لە خەو ڕادەچڵەكیم، وێنەی كەشتییەك دەهاتە بەرچاوم، كە لەناو تەمومژەكەدا ململانێی بۆ دۆزینەوەی ڕێگا ڕاستەكەی دەكرد.

ئەوە كەشتیی كامە وڵاتە؟ چەندە گەورەیە و چی بار دەكات؟ چەند خەڵك لەگەڵ كاپتنی كەشتییەكە لەسەر تەختی كەشتییەكە وەستاون؟ یان بۆچی زۆر نیگەرانن؟ ئایا لە تەمومژدا گیریان خواردووە، یاخود سەیری سەرابی دیمەنێك دەكەن كە لە تاریكییەكەدا و لەناو تەمەكەدا ڕووبەڕوویان دێت؟ ئایا لەسەر ڕێڕەوی كەشتییەكە ون بوون و دواتر دەركەوتوونەتەوە، ئەگەر وایە، ئایا هۆڕنیان بۆ ئەو كەشتییانەی دیكە كە نزیكن لێیانەوە لێداوە، هەتا ئاگاداریان بكەنەوە؟ كاتێك ئەستەنبوڵییەكان گوێبیستی هۆڕنی كەشتییەك دەبن و لە خەو ڕادەچڵەكێن و بەخەبەر دەبنەوە، ئەو بەزەییەی هەیانە بۆ ئەو كەسانەی كە لە كەشتییەكەدا هەیە، لەگەڵ ترس لە ڕوودانی كارەسات تێكەڵ بەیەك دەبن و خەوێكی ترسناك دروست دەكەن دەربارەی هەر شتێك بە ڕێگای هەڵەدا بڕوات لە بۆسفۆر. لە ڕۆژانی باوباراندا، دایكم دەیگوت: "خودایە، لەم كەشوهەوایەدا یارمەتیی هەموو ئەوانە بدە كە لە دەریاكەدان!" لە لایەكی ترەوە،

باشترین دەرمان بۆ ئەوانەی بە شەودا بەخەبەر دەبنەوە، ڕوودانی کارەساتێکە لەدوورەوە، چونکە ئەو کەسانەی بە شەودا لە ئەستەنبوڵ ڕادەچڵەکێن، زۆربەیان بە گوێگرتن لە هۆڕێنە دەنگبەرزەکان خەویان لێدەکەوێتەوە، ڕەنگە لە خەوەکەدا خۆیان ببینن لە کەشتییەکن کە بەناو تەمومژدا بەرەو کەناری هەڵە دەڕوات.

خەونەکەیان هەرچییەك بێت، زۆربەیان کاتێك بەیانی بەخەبەر دەبنەوە، هیچ شتێکیان بیر نامێنێت دەربارەی ئەو کەشتییەی شەوی ڕابردوو گوێیان لە دەنگی بوو، هەموو ئەوەی ڕووی دابوو، دەبێتە خەوێکی ناخۆش، دەڕوات و لەبیر دەکرێت. تەنها منداڵان و هەرزەکارە منداڵەکان، ئەو جۆرە شتانەیان لەبیر دەمێنێت. دواتر لە ڕۆژێکی ئاساییدا، لە کاتێکدا لە نۆرەی دوکانی سەموون وەستاون یاخود نانی نیوەڕۆ دەخۆن، یەکێك لەو کەسانە بیری دەکەوتەوە و دەیگوت: "شەوی ڕابردوو، دەنگی ئەو هۆڕنەی لەناو تەمەکەدا دەهات، خەبەری کردمەوە."

لەو کاتەدا بۆم دەردەکەوێت کە ملیۆنەها خەڵك لەسەر بەرزاییەکانی بۆسفۆرووس دەژین، لە شەوە تەمومژاوییەکاندا، هەمان خەوی ترسناك دەبینن.

شتێکی تر هەبوو کە زۆربەی ئەوانەمانی دەترساند کە لەقەراغ ئاوەکەوە دەژیاین، کارەساتێکی تر بوو وەك ئاگری کەشتییە نەوتییەکان، هەرگیز ناتوانرێت لەبیر بکرێت. شەوێکیان تەم زۆر چڕوپڕ بوو کە نەتدەتوانی دە یارد زیاتر بەردەمی خۆت ببینی _لە کاتژمێر چواری بەیانی، لە ٤ی ئەیلوولی ١٩٦٣_ کەشتییەکی بارهەڵگری سۆڤیەت، ٥٠٠،٥ تەنی دەگواستەوە بۆ کوبا، بە درێژایی سی هەنگاو کەوتبووە تاریکییەوە لە بالتیمان و خۆی کێشابوو بە دوو *یالی* تەختەدا و سێ کەسی کوشتبوو.

"بە هۆی دەنگێکی ترسناکەوە خەبەرمان بوویەوە، وامان دەزانی هەورەبرووسکە داویەتی لە *یالەکە*. ماڵەکەمان بووبوو بە دوو لەتەوە، تەنها بەخت ئێمەی ڕزگار کرد. کاتێك یەکترمان ڕادەکێشا و بەرەو نهۆمی سێیەم دەڕۆیشتین، خۆمان بەرامبەر کەشتییەکی گەورە بینییەوە."

لە ماڵەکەدا ئەو لاپەڕانەی لە ڕووداوەکەدا ڕزگاریان بووبوو لەگەڵ وێنەکانی ناو کەشتییەکە، لە ژووری دانیشتنەکە تێکەڵ بە یەك بووبوون: لەسەر دیوارەکە، وێنەیەکی باپیرە پادشاکەیان هەڵواسرابوو، لەسەر کەوانتەرەکە قاپێك ترێ دانرابوو، لەبەر ئەوەی

نیوەی ژوورەکە ڕووخابوو، فەرشەکە وەك پەردە بۆ خوارەوە شۆڕ بوویەوە و لە هەوادا دەشەکایەوە و قەنەفە هەڵگەڕاوەکان لکابوون بە بەشی پێشەوەی کەشتییە وێرانبووەکەوە. ئەو شتەی وای دەکرد ئەم دیمەنە سەرنجڕاکێش و ترسناك بێت، هەموو کەلوپەلەکانی ئەو ژوورە بوون کە کەشتییەکە وێرانی کردبوو _قەنەفە، کورسی، کەوانتەر، مێز و تەلەفزیۆنەکان_ هەموویان وەك ئەوانە بوون کە لە ژووری دانیشتنەکەی ئێمە هەبوون. کاتێك هەواڵێکی چل ساڵ لەوەوبەرم دەخوێندەوە دەربارەی ئەو کچە جوان و تازە دەزگیرانە کە لە قوتابخانەی دواناوەندی قوتابی بووە و لە ڕووداوەکەدا گیانی لەدەست داوە _لە هەواڵەکەدا قسەی کچەکەی تێدا بوو کە شەوێك پێش ڕووداوەکە لەگەڵ ئەو کەسانە کردبوونی کە ڕزگاریان بووبوو، هەروەها قسەکانی ئەو کوڕە خەمبارەی دراوسێیان کە جەستەی کچەکەی لەژێر پارچەی بەرد و خۆڵدا دۆزیبوویەوە_ بیرم دەکەوێتە کە خەڵکی ئەستەنبوڵ لەو کاتەدا بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ، جگە لەو کارەساتە، لەبارەی هیچی دیکەوە نەدەدوان.

لەو سەردەمەدا، ژمارەی دانیشتووانی شارەکە تەنها یەك ملیۆن کەس بوون، هەر بەسەرهاتێك باس دەکرا، دەبوویە داستان و لەناو خەڵکدا بڵاو دەبوویەوە. کاتێك بە خەڵکم دەگوت خەریکی نووسینی کتێبێکم دەربارەی ئەستەنبوڵ و کاتێك گفتوگۆکان دەگۆڕان بۆ باسی کارەساتەکانی بۆسفۆر، ئەو پەرۆشییەی لە دەنگیاندا هەبوو، سەرسامی دەکردم. تەنانەت چاوەکانیان پڕ دەبوون لە فرمێسك، وەك ئەوەی خۆشترین یادگارییەکانیان بیر کەوتبێتەوە. هەندێکیان سوور بوون لەسەر ئەوەی کە لە کتێبەکەدا باسی خواست و داواکارییەکانیان بکەم.

تەنها بۆ قایلبوونی یەکێك لەو کەسانە، ناچارم ئاماژەی بە داخوازییەکەی بدەم: لە مانگی تەممووزی ١٩٦٦، بەختێك کە ژمارەیەك ئەندامی ڕێکخراوی دۆستایەتیی کۆمەڵایەتیی تورکیا-ئەڵمانیای تێدا بووە، خۆی بە کەشتییەکدا کێشاوە کە تەختەی خاوی لەنێوان یەنیکۆی و بەیکۆز گواستۆتەوە. لە بەیەکدانەکەدا، سێ کەس کەوتوونەتە ناو ئاوەکەوە و گیانیان لەدەست داوە.

هەروەها داوام لێ کراوە کە ئەو ڕووداوەش باس بکەم: جارێکیان ناسیاوێکم لە بالکۆنی *یاڵێکەوە* دانیشتووە و وەك نەریتی جارانی، سەیری کەشتییەکانی کردووە، ڕێك

لەو کاتەدا بینویەتی کە بەلەمێکی ڕاوەماسی خۆی کێشاوە بە کەشتییەکی نەوتهەڵگری ڕۆمانیا و بووە بە دوو لەتەوە.

یەکێکی تر لەو کارەساتانەی لە ساڵانی پێشووتر ڕووی دابوو، پێداکێشانی کەشتییەکی نەوتی ڕۆمانیا بووە (بە ناوی سەربەخۆیی) بە کەشتییەکی بارهەڵگری یۆنانی (بە ناوی ئۆریالی)، لەبەردەم حەیدەر پادشا (وێستگەی سەرەکیی قیتار بوو لە بەشی ئاسیا)، کاتێك سووتەمەنییە ڕژاوەکە ئاگری گرتووە، ئەو کەشتییەی کە باری گواستووەتەوە، بە جۆرێك تەقیوەتەوە، هەموومان بە دەنگەکەی خەبەرمان بوویەوە. ئێمە چەند میلێك دوور بووین لە شوێنی ڕووداوەکەوە، زۆربەی شووشەی پەنجەرەکان شکان و ڕێگاوبانەکان پڕ بوون لە پارچە شووشەی وردبوو.

لە ١٢ی تشرینی دووەمی ١٩٩١، کەشتییەکی لوبنانی، ڕابونیون، مەڕوماڵاتی دەگواستەوە، زیاتر لە بیست هەزار مەڕی لە ڕۆمانیاوە هەڵگرتبوو، خۆی کێشاوە بە *مادۆنا لیلی*، کە کەشتییەکی بارهەڵگری فلیپینی بوو لە بەندەری ئۆرلێنسی نوێوە گەنمی گواستەوەتەوە بۆ ڕووسیا، دواتر نقوم بووە و زۆربەی مەڕەکانیشی لەگەڵ خۆی بردووەتە قووڵایی ئاوەکە. ڕاپۆرت درابوو کە هەندێك لە مەڕەکان بازیان داوەتە ناو بەلەمەکانەوە، گەیشتوونەتە کەنار ئاوەکە و لەلایەن چەند پیاوێکەوە ڕزگار کراون کە لە چایخانەکانی ئەو نزیکانە دانیشتوون و ڕۆژنامەیان خوێندووەتەوە یان قاوەیان خواردووەتەوە. بەڵام مەڕەکانی تر کە بەرەو قووڵایی ئاوەکە چوون، چاوەڕێی کەسێك بوون تا لە قووڵایی ئاوەکە دەریانبێنن.

ئەم پێکدادانە لە ژێر پردی فاتیح، دووەم پردی بۆسفۆر، ڕووی داوە. بەڵام یەکەم پرد بووە کاتێك ئەستەنبوڵییەکان لێرەوە خۆیان خستۆتە خوارەوە و خۆیان کوشتووە.

لە کاتێکدا خەریکی نووسینی ئەم کتێبە بووم، ماوەیەکی زۆرم بۆ خوێندنەوەی ڕۆژنامە ئەرشیفکراوەکان تەرخان کرد، کە لەپێش لەدایکبوونمەوە دەرچووبوون و هەر لە منداڵییەوە لای خۆم هەڵمگرتبوون. چەندین بابەتم دەربارەی جۆرێکی تری خۆکوشتن دۆزییەوە کە ئەو کاتە لە ئەستەنبوڵ زۆر باو بوو، زیاتر لە خۆخستنە خوارەوە لە پردەکەی بۆسفۆرەوە. بۆ نموونە:

ئۆتۆمبێلێك لە ڕوملی حیسارەوە دەڕۆیشت، کەوتە ناو دەریاکەوە. هیچ کام لە پشکنینەکانی دوێنێ (٢٤ی ئاياری ١٩٥٢)، سەرکەوتوو نەبوون لە دۆزینەوەی ئۆتۆمبێلەکە و سەرنشینەکانی. کاتێك ئۆتۆمبێلەکە بەرەو دەریاکە ڕۆیشتووە، وەك

ڕاپۆرت درابوو، شۆفێرەکە هاواری کردووە: "یارمەتی!"، بەڵام دواتر، هۆکارەکەی دیار نییە کە بۆچی وای کردووە، دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی داخستووە و کەوتۆتە ناو ئاوەکەوە. بیروڕایەك هەبوو کە تەوژمی ئاوەکە پاڵی بە ئۆتۆمبێلەکەوە بەرەو قووڵایی ئاوەکە ناوە.

بابەتێکی تر هەیە لەپاش چل و پێنج ساڵ لە بابەتی پێشوو نووسراوە، لە ٣ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧:

لەپاش تەواوبوونی ئاهەنگەکە، لەسەر ڕێگاکەی بۆ ماڵەوە وەستاوە بۆ ئەوەی داوای شتێك بکات لە تەلی بابا، دواتر شوفێرە سەرخۆشەکە کە نۆ کەسی دەگواستەوە، کۆنترۆڵی لەدەست داوە و کەوتۆتە ناو دەریاکە. لە ڕووداوەکەدا، دایکێك و دوو منداڵەکەی گیانیان لەدەست داوە.

هەرچەندە ماوەی چەندین ساڵە بەردەوام ئۆتۆمبێل دەکەونە ناو ئاوەکەی بۆسفۆرەوە، بەڵام چیرۆکی ڕووداوەکان هەموویان وەکو یەکن: هەموو سەرنشینەکان کەوتنە ناو قووڵایی ئاوەکەوە و کەس نەگەڕایەوە. نەك تەنها ئەم بەسەرهاتانەم بیستبێتن یان خوێندبنمەوە، بەڵکو کەمێکیانم بە چاوی خۆم بینیوە! گرنگ نییە سەرنشینەکان کێن و بە هۆی چیسەوە ڕووی داوە _هاواری منداڵەکان، شەڕ و دەمەقاڵێی نێوان کۆمەڵێك هاوڕێی بێزارکەری سەرخۆش" هاوسەرێك پەلەیەتی بگەڕێتەوە ماڵەوە، پیرەپیاوێك کە ناتوانێت لە تاریکیدا باش ببینێت، شوفێرێکی خەواڵوو لەسەر شۆستەی دەریاکە دەوەستێت بۆ ئەوەی چای لەگەڵ هاوڕێکانی بخواتەوە، دواتر کاتی گەڕانەوە لەجیاتی ئەوەی دەست بە گێڕی گەڕانەوەدا بنێت، پێچەوانەی دەکات و دەکەوێتەوە ناو ئاوەکەوە، خەزنەداری کۆن، شەفیق، لەگەڵ سکرتێرە شۆخەکەی، ئەو پۆلیسانەی چاودێریی کەشتییەکان دەکەن کە بە بۆسفۆرو تێدەپەڕن، شوفێرێکی نەشارەزا کە بە ئۆتۆمبێلی کارگە، بەبێ ئەوەی مۆڵەتی بردنی ئۆتۆمبێلەکەی وەرگرتبێت، خێزانەکەی دەباتە دەرەوە، کرێکارێکی کارگەی نایلۆن کە بە خزمی دوور دەرچوو، باوك و کوڕێك کە یەك جۆر چاکەتی زستانەیان لەبەردایە، چەتە ناودارەکەی بیۆگلۆ لەگەڵ خۆشەویستەکەی، خێزانێکی کۆنیا کە بۆ یەکەم جارە پردی بۆسفۆر ببینن_ کاتێك ئۆتۆمبێلەکە دەکەوێتە ناو ئاوەکەوە، هەرگیز هیچ کامیان وەك بەرد لەناو ئاوەکەدا نقوم نەبوون، بەڵکو بۆ چەند خولەکێك پەلەقاژێیان کردووە.

ڕەنگە کارەساتەکە کاتی ڕۆژ ڕووی دابێت، یاخود ئەو کاتەی تەنها ڕووناکی لە مەیخانە نزیکەکانەوە دیاربووبێت، بەڵام کاتێك ئەو کەسانەی لە لایەکەی تری بۆسفۆرەوە وەستاون، سەیری ئەو دەموچاوانە دەکەن کە خەریکە نقوم دەبن و سەیری تیرۆرێکی ئاشنا دەکەن، چەند خولەکێك دواتر ئۆتۆمبێلەکە دەکەوێتە ناو دەریا قووڵ و تاریکەکەوە.

پێویستە بە بیری خوێنەرانی بهێنمەوە، کاتێك ئۆتۆمبێلێك نقوم دەبێت، بە هۆی پەستانی ئاوەکەوە، هەرگیز ناتوانرێت دەرگاکانی بکرێنەوە. ئەو کاتەی ماوەیەکی زۆر ئۆتۆمبێل دەکەوتنە ناو بۆسفۆرەوە، ڕۆژنامەنووسێکی دڵسۆز هیوای خواستووە ئەم ڕاستییە بە بیری خوێنەران بهێنێتەوە و کارێکی ژیرانەی کردووە: لەپێناو مانەوە لە ژیان، کۆمەڵێك ڕێنمایی بڵاو کردووەتەوە و ڕێنماییەکانی بە وێنە ڕوون کردووەتەوە:

چۆن بتوانیت لەو ئۆتۆمبێلە هەڵبێیت، کە دەکەوێتە ناو بۆسفۆرەوە:

١. هیچ مەترسە. پەنجەرەکان دابخە و چاوەڕێ بکە تا ئۆتۆمبێلەکە دەکەوێتە ناو ئاوەکەوە. دڵنیای بکەرەوە، کە دەرگاکان قوفڵ نەدراون. هەروەها دڵنیای بکەرەوە کە هەموو سەرنشینەکان بەئارامی و بەبێ جووڵە لە شوێنی خۆیان دانیشتوون.

٢. ئەگەر ئۆتۆمبێلەکە بەردەوام بوو لە نقومبوون و بەرەو قووڵایی دەڕۆیشت، دەست بخەرە سەر برێکی ڕەوەستان.

٣. هەر ئەوکات ئۆتۆمبێلەکە پڕ دەبێت لە ئاو، لەو چینە هەوایەی کە لەنێوان سەقفی ئۆتۆمبێلەکە و ئاوەکەدا ماوە، هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژە، ئینجا بەهێواشی دەرگای ئۆتۆمبێلەکە بکەرەوە و بەبێ شڵەژان لە ئۆتۆمبێلەکە وەرە دەرەوە.

ئارەزوو دەکەم من چوارەم ڕێنمایی زیاد بکەم: بە یارمەتیی خودا، چاکەتە زستانییەکەت ناگیرێتە برێکی ئۆتۆمبێلەکە. ئەگەر توانیت مەلە بکەیت و بگەڕێیتەوە ڕووی ئاوەکە، ئەوا بۆت دەردەکەوێت بۆسفۆر بە هەموو خەمەکانییەوە، زۆر جوان دەردەکەوێت، تەنانەت لە ژیان جوانترە.

## ٢٣

# نیرڤاڵ له ئه‌سته‌نبوڵ: گه‌ڕان به‌ بیۆگلۆدا

میڵین له‌ نیگاره‌کانیدا ئه‌و به‌رزاییانه‌ی به‌سه‌ر کردووه‌ته‌وه‌، که‌ من هه‌موو ژیانم تێدا به‌سه‌ر بردوون، به‌ڵام ته‌نها چه‌ند بینایه‌کی که‌میان له‌سه‌ر هه‌یه‌. کاتێك میڵین وێنه‌ی یلدز، ماچکا و ته‌شویقیه‌ی به‌و جۆره‌ کێشاوه‌ و سه‌یری به‌رزاییه‌ خاڵییه‌کانی ده‌که‌یت که‌ له‌بری باڵه‌خانه‌کان، پڕن له‌ دره‌ختی چنار و باخچه‌ی سه‌وزایی و میوه‌جاتن، بیر ده‌که‌یته‌وه‌ که‌ ئه‌گه‌ر ئه‌سته‌نبوڵییه‌کان ببینن به‌هه‌شته‌که‌ی ئه‌و کاته‌یان چیی لێ هاتووه‌، ده‌بێت چی هه‌ستێکیان هه‌بێت! کاتێك سه‌رنجی دیمه‌نی بێستان و دیواره‌ ڕووخاو و خه‌ڵووزی پاشماوه‌ی کۆشکه‌ سووتاوه‌کان ده‌ده‌م، هه‌ست به‌ هه‌مان ئازاری ئه‌وان ده‌که‌م. کاتێك بۆت ده‌رده‌که‌وێت ئه‌و شوێنه‌ی تێیدا گه‌وره‌ بووی _چه‌ق و خاڵی ده‌ستپێکی ژیانت_ هه‌ر ئه‌و شاره‌ی سه‌دان ساڵ له‌وه‌وپێش و پێش له‌دایکبوونت نییه‌، ئه‌وکات وه‌ك تارماییه‌ك که‌ ئاوڕ ده‌داته‌وه‌ بۆ دواوه‌، له‌ ڕووبه‌ڕووبه‌نه‌وه‌ی کات ده‌ترسی.



هەمان هەستم بۆ دروست دەبێت، کاتێك دەگەمە برگەی ئەستەنبوڵ لە کتێبی (*گەشتێك بە ڕۆژهەڵاتدا*)، کە جیرارد دی نێرڤاڵ نووسیویەتی. ئەم شاعیرە فەرەنسییە، نیوسەدە لەپاش گەشتەکەی مێلین، لە ساڵی ١٨٤٣ هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ. لە کتێبەکەیدا باسی گەشتەکەی دەکات کە لە خانەقای دەروێش مەولانا لە گالەتا (کە لە ساڵی پەنجاکاندا ناوی تونێلی لێ نراوە)، دەستی پێ کردووە و بەرەو ئەو شوێنەی کە ئێستا پێی دەڵێن تاقسیم _لەپاش سەدان ساڵ دوای ئەو، منیش هەمان گەشتم کرد، کاتێك دەستی دایکمم گرتبوو. ئەو شوێنەی ئێستا پێی دەڵێن بیۆگڵو، ئەوکات شەقامە سەرەکییەکەی (لەدوای دروستبوونی کۆمارییەوە، ناوی نرا ئیستیقلال)، ئەوکات پێی دەگوترا گراند ڕو دی پێرا، کە شێوەکەی هەروەك ئەمڕۆ وایە و زۆر نەگۆڕاوە. نێرڤاڵ بە جۆرێك باسی ئەو شەقامانە دەکات کە لە خانەقاکەوە درێژ دەبنەوە، کە گوایا لەوانەی پاریس دەچن: جلوبەرگی مۆدێرن، جلشۆرگەکان، زێڕنگەرەکان، پەنجەرە درەوشاوەکان، دوکانی شیرینی، هۆتێلە ئینگلیزی و فەرەنسییەکان، قاوەخانە و باڵوێزخانەکان. بەڵام لەپاڵ ئەو شوێنەی کە نێرڤاڵ وەك نەخۆشخانەی فەرەنسی ناوی بردووە ( ئێستا ناوەندی کلتووریی فەرەنسییە)، باسی لە شتێکی شارەکە کردووە کە نووسەری تووشی سەرسوڕمان کردووە و منیشی تووشی ترس کرد. لەبەر ئەوەی نێرڤاڵ مەیدانی تاقسیمی ئەمڕۆی، کە گەورەترین ناوەندی ژیانی من بووە، وەك شوێنێکی تەختی گەورە باس کردووە کە لەوێ گالیسکەی ئەسپەکان تێکەڵی فرۆشیارانی کفتە و شووتی و ماسی بوون. هەروەها باسی گۆڕستانەکان بە جۆرێك دەکات، کە بە کێڵگەکان دەورە دراون _دوای سەدان ساڵ، هیچ کام لە شتانە بوونیان نەماوە. بەڵام دەستەواژەیەك هەیە لە باسەکانی نێرڤاڵدا، کە هەرگیز لە بیروهۆشم دەرناچێت، کاتێك باسی شوێنەکە دەکات وەك (شوێنێکی تەخت)، بەڵام من لە هەموو ژیانمدا ئەم شوێنە بە بینا گەورە و کۆنەکانەوە بینیوە، وەك "لەوەڕگایەکی گەورە و بێسنوور کە بە درەختی سنەوبەر و گوێز داپۆشراوە"، باسی دەکات.



ئەو کاتەی نێرڤاڵ لە تەمەنی سی و پێنج ساڵی هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ. دوو ساڵ پێش گەشتەکەی، بەدەست نەخۆشییەکەوە ناڵاندوویەتی، تا لە کۆتاییدا زۆری بۆ هێناوە و لەپاش دوازدە ساڵ لە بەرگەگرتن، خۆی هەڵواسیوە و خۆی کوشتووە. لەپێش شەش مانگ لە گەشتەکەی، خانمە ئەکتەر جێنی کۆلۆن کە گرنگییەکی زۆری هەبوو لە ژیانی نێرڤاڵ، بەڵام هەرگیز خۆشەویستیی نەگەڕاندەوە بۆ ژیانی نێرڤاڵ، کۆچی دوایی کردووە. لە (*گەشتێك بە ڕۆژهەڵاتدا*)، کە لە ئەلکساندەریە و قاهیرەوە بەرەو قبروس، ڕۆدێس، ئیزمیر و ئەستەنبوڵ دەستی پێ کردووە، لەپاڵ خەمەکانی، باسی ئەو خەونە نامۆ ڕۆژهەڵاتییانەی کردووە کە شاتوبریاند، لامارتین و هیوگۆ بەخێرایی گواستوویانەتەوە بۆ کلتووری فەرەنسی. وەکو نووسەرەکانی پێش خۆی، نێرڤاڵ ئارەزووی بووە باسی ڕۆژهەڵات بکات. هەروەها لەناو کلتووری فەرەنسی باسی خەمێك دەکات، کە ڕەنگە ئەو خەمەی لە ئەستەنبوڵ دۆزیبێتەوە.

بەڵام کاتێك نێرڤاڵ لە ساڵی ١٨٤٣ هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ، هیچ بایەخێکی بە خەم و دڵتەنگی نەداوە، بەڵکو بایەخی بەو شتانە داوە کە یارمەتییان داوە بۆ لەبیرکردنی خەمەکەی. لە نامەیەکدا بۆ باوکی نووسیوە، سوێندی خواردووە کە ئەو سەرشێتییەی دوو ساڵی پێشووی، هەرگیز دووبارە نەبووەتەوە، وتوویەتی: "ئەمەش یارمەتی دام بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی بسەلمێنم کە من تاکە قوربانیی گۆشەگیریم." هەروەها ئاماژەی پێ داوە، کە ئێستا تەندروستیی زۆر باشترە. لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەستەنبوڵ، شارێکە

هەژاری و دۆڕان و شەرمەزاری بە هۆی هەستکردن بە لاوازی بەرامبەر بە ڕۆژئاوا، هەرگیز چۆکی پێ نەداوە و دڵتەنگییەکەی پیشانی شاعیر نەداوە. لە یادیشمان نەچێت کە شارەکە لەدوای شکستەکانی مێژوو، تووشی ناخۆشی بووە. نیرڤاڵ لە کتێبەکەیدا ئاماژەی پێ داوە کە لە ڕۆژهەڵات شتێکی بینیوە، ئەو شتەش لە هۆنراوە بەناوبانگەکەیدا ناوی ناوە (خۆری ڕەشی ماتەمینی) _بۆ نموونە" لەکەنار ڕووباری نیل. بەڵام لە ئەستەنبوڵی دەوڵەمەند و نامۆی ١٨٤٣، نیرڤاڵ ڕۆژنامەنووسێکی چاوبرسی بووە لە گەڕان بەدوای شتە باشەکاندا.

نیرڤاڵ لە ماوەی مانگی ڕەمەزاندا هاتووە بە ئەستەنبوڵ، لە چاوی ئەودا وەکو گەشتکردن بووە بۆ ڤینیسیا لە کاتی کەرنەڤاڵەکەیان. (لە ڕاستیدا ڕەمەزانی وەکو مانگی ڕۆژووگرتن و وەکو کەرنەڤاڵ باس کردووە). نیرڤاڵ ئێوارانی ڕەمەزانی بە سەیرکردنی شانۆگەری بووکەشووشەیی قەرەگوێز بەسەر بردووە، دواتری بە فانۆسێکەوە سەیری شاری کردووە، یان ڕۆیشتووە بۆ قاوەخانەیەك، گوێی بۆ چیرۆکبێژەکان گرتووە. ئەو دیمەنەی باسی کردووە، ڕێپیشاندەر بووە بۆ زۆربەی گەشتیارەکانی تری ڕۆژئاوا کە شوێن هەنگاوەکانی ئەو بکەون. لە هەمان کاتدا کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر نووسەرەکانی ئەستەنبوڵ، کە لەبارەی (شەوانی جارانی ڕەمەزان) نووسیویانە، کە زیاتر لە باسی هەژاری، بیروهۆشی ڕۆژئاوایی و مۆدێرنی شارەکە، لەبارەیەوە دواوە. بناغەی ئەم ئەدەبە کە هەستی نوستالجیم بۆ ڕۆژانی منداڵی بۆ دروست دەکات، وێنەی ئەستەنبوڵە کە ئەویش زۆرتر بیانییەکان ئەم وێنەیەیان خستۆتە ڕوو و نیرڤاڵ پێشەنگی ئەو کەسانەیە. ئەم دیمەنە بەردەوام لەلایەن ئەو نووسەرانەی دیکە درێژەی پێ دراوە، کە نیرڤاڵ کاریگەریی هەبووە لەسەریان. نیرڤاڵ گاڵتەی بەو نووسەرە ئینگلیزانە کردووە کە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە شارەکە ماونەتەوە، تەنها سەردانی شوێنە گەشتیارەکانیان کردووە و دواتر کتێبێکیان لەبارەی شارەکە نووسیوە. نیرڤاڵ تەنانەت دەروێشەکانی لەیاد نەکردووە، لەدوورەوە سەیری کۆشکی سوڵتانی کردووە (دەگێڕێتەوە کە ڕووبەڕوو لەگەڵ عەبدولمەجید یەکیان بینیوە)، ماوەیەکی زۆر لە گۆڕستانەکان گەڕاوە و باسی جلوبەرگ و نەریتی ئەستەنبوڵییەکانی کردووە.

لە کتێبی (*تۆرێلیا*)، یان (*ژیان و خەونەکان*)، کە کەمێك لە کتێبەکەی دانت دەچێت بە ناوی (*ژیانی نوێی*)، هەروەها لەلایەن نووسەرە سیریالیستەکانی وەکو ئەندری بیرتۆن، پاول ئێلوارد و ئەنتۆنین ئەرتواد پەسەند کراوە. نێرڤالّ ئاشکرای دەکات کە لەپاش ڕەتکردنەوەی لەلایەن ئەو ئافرەتەی کە خۆشی ویستووە، ژیانی بووەتە (وێرانبوویەکی هیچوپووچ)، لەبەر ئەوە بڕیاری داوە بۆ کۆتاییهێنان بەو جۆرە، ژیانە بە جیهاندا گەشت بکات و سەیری نەریت و جلوبەرگی شارە جیاوازەکان بکات. نێرڤالّ زانیویەتی کە سەرنجەکانی لەسەر نەریت، دیمەنەکان، ئافرەتی ڕۆژهەلاّت و ڕاپۆرتەکانی سەرلەئێوارانی ڕەمەزان تەنها بەس نییە، لەبەر ئەوە لە (*گەشتێك بۆ ڕۆژهەلاّت*) _وەکو زۆربەی ئەو نووسەرانەی کاتێك هەستیان کردووە کاریگەریی چیرۆکەکەیان کەمە_ چیرۆکی تری کە دەستکردی خۆی بوون، زیاد کردووە بۆ ئەوەی هەنگاوێك بچێتە پێشەوە. (لە کتێبی (*ئەستەنبولّ*)، کە نووسەرانی شوێنکەوتووی خۆی، ئەوانیش یەحیا کەمال، تانپنار و ع.ش.حیسار، نووسیویانە، دەقێکی دوورودرێژی نێرڤالّی دەربارەی ئەو چیرۆکانە کە خۆی دایهێناون و ئەوانەش چیرۆکی ڕاستەقینەی عوسمانییەکانن، تێدایە). داهێنانی چیرۆکەکان، کە زیاتر توانای بیرقوولّی نێرڤالّ دەردەخەن لە دروستکردنی ئەو شتەی کە خۆی ویستوویەتی، شێوازێکیان دروست کردووە بۆ کارەکانی کە زیاتر لە شەهرەزادەوە نزیکەوە. نێرڤالّ بیری خوێندکارەکانی هێناوەتەوە کە شارەکە وەك (چیرۆکی هەزار و یەك شەوە) وایە و ڕوونی کردووەتەوە کە بۆچی بە پێویستی نەزانیوە باسی هەمان ئەو کۆشك، مزگەوت و گەرماوە گشتییانە بکات کە پێشتر لەلایەن نووسەرەکانی ترەوە باس کراوە. بە جۆرێك باسی شارەکەی کردووە کە دواتر نوسەرەکانی وەکو یەحیا کەمال و تانپنار سەدەیەك دواتر دووبارەیان کردووەتەوە. دواتر گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانیش گەیشتوون بەم ئەنجامەی نێرڤالّ: "ئەستەنبولّ خاوەنی هەندێك لە جوانترین دیمەنە جوانەکانی جیهانە." شارەکەی

هەروەك شانۆگەرییەك باس کردووە، هەموو باشییەکانی لە هۆڵەکەوە دەبینرێن و هەژاری و چڵکنیی کۆڵانە هەژارنشینەکانی "لەپشت پەردەوە شاردۆتەوە."



هەشتا ساڵ دواتر، کاتێك یەحیا کەمال و تانپنار وێنەیەکی شارەکەیان کێشاوە _شتێك بووە لە تێکەڵکردنی دیمەنە جوانەکانی شارەکە لەگەڵ هەژاریی (پشت پەردە)_ پێویست بووە نیرڤاڵیان لەبیر بێت. بەڵام بۆ تێگەیشتن لەو شتەی ئەم دوو نووسەرە گەورەیە (هەردووکیان سەرسامی نیرڤاڵ بوون) باسیان کردووە، ئەوەی دایانهێناوە و پیشانیان داوە، بۆ بینینی ئەوەی کە چۆن نووسەرەکانی نەوەکانی دواتری ئەستەنبوڵ شوێن کەوتەی ئەم داهێنانە بوون کە لەلای خەڵك ئاسان و خۆشەویست بوون، بۆ تێگەیشتن لە چەمکی ئەم نووسەرانە کە چۆن باسی جوانیی شارەکەیان کردووە، جیاواز لەو خەمەی کە هەیانبووە بەرامبەر وێرانکارییەکانی شارەکە، پێویستە سەیری کارەکانی ئەو نووسەرانە بکەین کە لەپاش نیرڤاڵ هاتوونەتە ئەستەنبوڵ.

## ٢٤

# گەڕانە خەماوییەکەی جوتیەر بە شارەکەدا

نووسەر، ڕۆژنامەنووس، شاعیر، وەرگێڕ و ڕۆماننووس، تۆفل جوتیەر هاوڕێی قوتابخانەی دواناوەندیی نیرڤال بووە. تەمەنی گەنجییان پێکەوە بەسەر بردووە، هەردووکیان سەرسامی قوتابخانەی ڕۆمانتیکیی ڤیکتۆر هۆگۆ بوون و بۆ ماوەیەك لە پاریس دوو کەسی زۆ نزیك بوون لە یەکتر. نیرڤال چەند ڕۆژێك پێش خۆکوشتنەکەی سەردانی جوتیەری کردووە. لەپاش ئەوەی نیرڤال بە ستوونی یەکێك لە گڵۆپەکانی سەر شەقامدا خۆی هەڵواسیوە، جوتیەر یادنامەیەکی لەبارەی هاوڕێ ونبووەکەی نووسیوە.

دوو ساڵ پێش سەردانەکەی جوتیەر، لە ساڵی ١٨٥٢ (نۆ ساڵ لەپاش گەشتەکەی نیرڤال. بەتەواوەتی سەد ساڵ لەپێش لەدایکبوونی منەوە)، ڕووداوەکان ڕووسیایان کردبووبە دوژمنی ئینگلاند و فەرەنسایان لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی نزیك کردبوویەوە. جەنگی قرم (یان جەنگی ڕۆژهەلات)، ڕێگەی خۆش کرد بۆ ئەو گەشتیارانەی کە سەرسامی ڕۆژهەلات بوون، نزیك ببنەوە لە خوێنەرانی ئەدەبی فەرەنسی لە ڕۆژهەلات و دەست بکەنەوە بە گەشتەکەیان. لە کاتێکدا نیرڤال خەونی دەبینی دووەم گەشت بکات بۆ ڕۆژهەلات، جوتیەر گەیشتە ئەستەنبوڵ. (بەیارمەتیی کەشتییە هەڵمییە خێراکان کە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دەهاتن و دەچوون، جوتیەر توانیی بە ماوەی یازدە ڕۆژ لە پاریسەوە بگاتە ئەستەنبوڵ).

جوتیەر ماوەی حەفتا ڕۆژ لە ئەستەنبوڵ ماوەتەوە، سەرەتا باسی گەشتەکەی لە ڕۆژنامەیەکدا بڵاو کردووەتەوە، چونکە ئەوکات سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیە بووە، دواتر لە کتێبێکدا بە ناوی (قونستەنتینیە) وردەکاریی گەشتەکەی بڵاو کردووەتەوە.

کتێبەکەی ناوبانگێکی زۆری هەبووە، وەرگێڕدراوەتە سەر چەندین زمانی تر و پلەیەکی بەرزی هەبووە لەناو ئەو کتێبانەی کە لە ماوەی سەدەی نۆزدەیەم دەربارەی ئەستەنبوڵ نووسراون (سی ساڵ پاش ئەم نووسەرە، ئیدمۆندۆ دو ئەمیسی کتێبێکی بە ناوی (قونستەنتینە) لە میلان بڵاو کردەوە).

جوتیەر، بە بەراورد لەگەڵ نیرڤاڵ، کارامەتر، دامەزراوتر و زمانپاراوتر بووە. سەرنووسەر، ڕەخنەگر، ڕۆژنامەنووسی هونەری و ڕۆژانە زنجیرە چیرۆکی ئەندێشەیی نووسیوە _هەموو ئەمانە چستوچالاکیی جوتیەر دەردەخەن کە توانیویەتی هەموو ڕۆژێك نووسین بۆ ڕۆژنامە ئامادە بکات. (بە هۆی هەمەجۆریی کارەکانی، فلاوبێر ڕەخنەی لێ گرتووە). ئەگەر سەرنج بدەیتە هەموو ئەو کلێشە و دەستەواژە دووپاتکراوەکانی لەبارەی سوڵتان و حەریمسەرا و گۆڕستانەکان، ئەوکات کتێبەکەی وەك پارچەیەك ڕیپۆرتاژ دێتە بەرچاوت. ئەگەر کتێبەکەی بۆ یەحیا کەمال و تانپنار زۆر گرنگ بووبێت و لە بەرجەستەکردنی وێنەی شارەکە، هاوکاریی کردبێتن، لەبەر ئەوە بووە کە جوتیەر بایەخی زۆری بەو بابەتە داوە کە هاوڕێکەی ناوی ناوە (پشت پەردە).



بۆ ئەوەی پیشانی خوێنەرە ڕۆئاواییەکانی بدات کە ناوچە هەژارنشینەکان هەروەك دیمەنە جوانەکانی شارەکە گرنگ بوون بەلایەوە، باسی هەژاریی شارەکەی کردووە و بە کۆڵانە چڵکن و تاریکەکاندا گەڕاوە.

کاتێك جوتیەر بە

دوورگەی (سایسریا)دا تێپەڕیوە، قسەکانی نێرڤاڵی بیر کەوتۆتەوە، کاتێك باسی کەسێکی بۆ کردووە کە بە جلی چەور و ڕۆناوییەوە بە پەتی سێدارەوە بەمردووی ماوەتەوە (ئەم دیمەنە لەلایەن هەردوو هاوڕێکەوە باس کراوە، لەوانەیە پێشبینییان بۆ یەك کردبێت کە باسی بکەن، دواتر هەمان وێنە لەلایەن بۆدلایر بەکار هاتووە لە شیعری (گەشتێك بۆ سایسریا).) کاتێك جوتیەر گەشتۆتە ئەستەنبوڵ، هەروەك نێرڤاڵ، زۆر بەئاسوودەیی بە (جلوبەرگی ئیسلامی) بە شارەکەدا گەڕاوە. وەك هاوڕێکەی، لە مانگی ڕەمەزان گەشتۆتە ئەستەنبوڵ و هەروەك ئەو لە باسکردنی شەوە خۆشەکانی ڕەمەزان زیادەڕۆیی کردووە. بە هەمان شێوە بۆ بینینی کۆڕی زیکری دەروێشەکانی ڕوفایی، ڕۆیشتووە بە ئۆسکودار. بە گۆڕستانەکاندا پیاسەی کردووە (چەندین منداڵی بینیوە لەنێوان گۆڕەکاندا یارییان کردووە)، سەیری شانۆگەریی بووکەشووشەی قەرەگۆێزی کردووە و سەردانی بازاڕ و دوکانەکانی کردووە و زۆر بەسەرنجەوە تەماشای جەنجاڵیی شارەکەی کردووە. جارێکی تر لاسایی نێرڤاڵی کردووەتەوە: زۆر تێکۆشاوە هەتا سوڵتان عەبدولمەجید لەسەر ڕێگاکەی، لە کاتی ڕۆشتنی بۆ نوێژی هەینی لەنزیکەوە ببینێت. وەکو زۆربەی ڕێبوارە ڕۆژئاواییەکان، سەرنجی خۆی هەبووە لەسەر ئافرەتی مسوڵمان، لەبارەی گۆشەگیری و ژیانی ئاڵۆز و داخراوییان بابەتی نووسیوە (ئامۆژگاریی خوێنەرەکانی دەکات، کە هەرگیز هەواڵی تەندروستیی هاوسەری کەسێکی تر نەپرسن!)، بەڵام لە هەمان کاتدا باس دەکات کە شەقامەکانی شار پڕن لە ئافرەتەکان، کە تەنانەت هەندێکیان بەتەنیان. بەدوورودرێژی باسی تۆپکاپی پالاس، مزگەوتەکان و گۆڕەپانی ئەسپسواریی کردووە، لەگەڵ هەموو ئەو شوێنانەی تر کە نێرڤاڵ ئاماژەی پێ نەداوون. (ئەم دیمەن و بابەتانە بۆ گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان نوێ بوون.) سەرباری خۆبەزلزانییە کاتییەکەی، خواستی دوورکەوتنەوە لەگشتگیری کردن و بایەخدانی بە شتە نامۆکان، بە چاوی نیگارکێشێك سەیری دیمەنەکانی کردووە.

لەو کاتەی لە تەمەنی نۆزدە ساڵییەوە شیعرەکەی هیگۆی بە ناوی (*خۆرهەڵاتناسی*) خوێندبوویەوە، تۆفڵ جوتیەر ئاواتی دەخواست ببێتە نیگارکێش. لە سەردەمی خۆیدا، وەك ڕەخنەگرێکی دیاری ئەدەبی ناوی دەرکردووە. لە ڕوویەکی ڕەخنەییەوە، باسی هەندێك لە دیمەنەکانی ئەستەنبوڵی کردووە کە پێشتر هەرگیز کاری لەو جۆرە

نەبینرابوو. لە خانەقای دەروێش مەولاناوە کە لەسەر لوتکەی گردەکە (ئەو شوێنەی کە نۆ ساڵ پێش ئەو، نێرڤاڵ باسی کردووە: کۆتا خاڵی بازاڕکردنی من و دایکم لە بیۆگڵۆ، ڕێی ترامی نێوان ماچکا-تونێل، ئەمڕۆ بە گۆڕەپانی تونێل ناسراوە) سەیری هەموو ئەستەنبوڵ و کەنداوی زێڕینی کردووە، دواتر تێبینیی کردووە کە "دیمەنەکان بە جۆرێکی سەیر جوانن، کە لە دیمەنی ڕاستەقینە ناچن." بەردەوام بووە لە باسکردنی منارە و گومەزیی ئەیاسۆفیا، بەیازیت، سولەیمانیە، سولتان ئەحمەد، هەورەکان، ئاوی کەنداوی زێڕین، باخچە هەمیشە سەوزەکانی سەرایبورنو و لەپشت ئەمانەوە، ئاسمانی ڕەنگ شین دیار بووە _هەموو ئەمانە، خۆشی و چێژی نیگارکێشێکن کە شانازی دەکات بە بەرەوپێشچوونی هونەرەکەی و باوەڕبەخۆبوونی نووسەرێکی بەئەزموون پیشان دەدەن. لە بابەتێکدا کە لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەم نووسراوە، تانپنار ڕەخنە لە ڕۆماننووسەکانی سەردەمی خۆی دەگرێت، بە هۆی ئامادەنەبوونیان بۆ بینینی یاخود باسکردنی دیمەنەکانی دەوروبەری، لە کاتێکدا شێوازی نووسینەکانی ستیندال، بالزاك، زۆلا، هەروەها جوتیەری لا پەسەند بووە، چونکە وەك شێوەکارێك سەیری دیمەنەکانیان کردووە.

جوتیەر زۆر باش زانیویەتی دیمەنەکان بکات بە وشە، چۆن هەستەکان بە هۆی هێڵەکانەوە و درێژکردنەوەی ڕووناکییەکانەوە بگوازێتەوە و لە بەرزترین پلەی توانایدا بووە کاتێك بەناو کۆڵانە هەژارنشینەکانی شارەکەدا پیاسەی کردووە. پێش ئەوەی دەست بکات بە گەشتەکەی بەناو دیوارەکانی شاردا، سەرنجی بەشی دەرەوەیانی داوە، سەیری ڕوانینەکانی ئەو هاوڕێیانەی کردووە کە لەپێش ئەمەوە هاتوون. وتوویەتی کە دەبێت لەدوورەوە تەماشای دیمەنەکان بکرێن، چونکە پێی وا بووە لەنزیکەوە سەیرکردنی دیمەنەکان سەرنجڕاکێشییان لەدەست دەدەن. لەدوورەوە سەرنجدان، جوانی و نایابی دەبەخشێتە دیمەنەکان، چونکە بەو جۆرە کۆڵانە تاریك، تەسك، پیس و لێژەکان، خانووە ناڕێکوپێك و درەختەکان بە هۆی ڕەنگە هەمەجۆرەکانی هەتاوەوە دادەپۆشرێن و ڕەنگ دەکرێن.

بەڵام جوتیەر توانیویەتی ماتەمینییەکی جوان لەناو ئەو کۆڵانە پیس و ناڕێکوپێکانەدا بدۆزێتەوە. لە باسکردنی کاولکاریی یۆنانی و ڕۆمانییەکان و پاشماوەی

شارستانییەتەکان، هەمان جۆشی ئەدەبی ڕۆمانتیکیی بەکار هێناوە. لە ڕۆژانی لاوێتیدا، لەو کاتەی هێشتا خەونی بوون بە نیگارکێشی هەبووە، جوتیەر کاتێک سەرنجی خانووە چۆڵەکانی شەقامی دۆین کول-دی-ساك و کەنیسەی قەشە تۆماس دو لوڤەری (لەنزیکی شەقامی لوڤەر، لەتەنیشت ئەو شوێنەی نێرڤاڵ تێیدا دەژیا) داوە، پێی وا بووە لە کاتی مانگەشەودا زۆر سەرنجڕاکێشتر دەردەکەون.



تۆفل جوتیەر ڕۆژانە هوتێلەکەی جێ هێشتووە (لە بێۆگلۆ بووە)، بەناو گالەتا بەرەو کەنار ئاوی کەنداوی زێڕین چووە، دواتر لەسەر پردی گالەتا (لە ساڵی ١٨٥٣ دروست کرابوو، جوتیەر بە (پردی بەلەمەکان) ناوی بردووە) تێپەڕیوە. لەگەڵ ڕێبەرییە فەرەنسییەکەی لە ئەنکاپانی و باکووری خۆرئاوا نزیك بوونەتەوە، دواتر خۆیان لەناو کۆڵانە پێچاوپێچ و نادیارەکانی تورکیا بینیوەتەوە. هەتا زیاتر چوون، زیاتر شوێنە دوورەپەرێزەکان و پشتگوێخراوەکانیان بینیوە و تووشی سەگە هارەکان بوون و ڕاویان

ناون. هەر کاتێك دەربارەی خانووە تەختە تاریك و بێڕەنگ و ڕووخاوەکان، کانییە تێکشکاوەکان و گۆڕە پشتگوێخراو و شکاوانە و ئەو شتانەی تر لە کاتی پیاسەکەیاندا چاویان پێ کەوتووە، دەخوێنمەوە، سەرم سوڕدەمێنێ، چونکە ئەو شوێنانە جگە لە کۆڵانە چەوڕێژکراوەکان، دوای سەدان ساڵ لەگەڵ باوکم بە ئۆتۆمبێلەکەی پێیاندا گەڕاین، هەروەك خۆیان بوون و نەگۆڕابوون، چونکە باوکیشم پێی وا بوو ئەو خانووە تەختە ڕەشبووانە، دیوارە بەردین و شەقامە چۆڵ و ئەو درەختە سەوزانەی کە گۆڕستانەکان بەبێ ئەوان نابن، هەموو ئەمانە دیمەنێکی جوانن. کاتێك بە کۆڵانە هەژارەکاندا دەگەڕام، ئەوانەی هێشتا خواستی خۆرئاواییبوون نەگەیشتبووە لایان (بەداخەوە ئاگرکەوتنەوە و کۆنکریت، زۆربەیانی سڕییەوە)، هەستم دەکرد سەیرکردنی دیمەنەکان هیلاکم دەکەن، لە کاتێکدا هێشتا وەك جوتیەر، دەمویست "لە کووچەیەکەوە بۆ کووچەیەکی تر" و لە "مەیدانێکەوە بۆ مەیدامێکی تر" بڕۆم. بە تێڕوانینی جوتیەر، کە منیش دواتر وەك ئەو بیرم دەکردەوە، بانگی نوێژکردن لەم کۆڵانانە بۆ ئەو ماڵانەیە "کوێر و کەڕولاڵن، کە لەم شوێنە بێدەنگ و گۆشەگیرەدان." جوتیەر کاتێك سەیری ئەو خەڵك و بوونەوەرانەی کردووە، بە جۆرێك بیری لە ڕێڕەوی کات کردووەتەوە: وەك پیرەژنێك، ونبوونی مارمێلکەیەك لەناو گژوگیادا، یان وەك سێ کوڕی منداڵ، کاتێك بەرد فڕێ دەدەنە ناو حەوزی شکاوی کانیاوێك (ئەمەش نیگارێکی ڕەنگ ئاوی ماکسیم دو کامپی بیر دەخاتەوە کە دوو ساڵ پێش جوتیەر، لەگەڵ فلاوبێر سەردانی شارەکەیان کردووە). کاتێك برسیی بووە، نەچووە بۆ چێشتخانەکانی ئەو ناوچانە، چونکە زانیویەتی تەنها خواردنێکی کەمی پێشکەش دەکەن، لەبەر ئەوە هەر لەسەر پێ دەستی کردووە بە خواردنی توو لەو دار توانەی کە ڕەنگیان دابوو بە شەقامەکە. سەردانی ئەو ناوچە یۆنانییانەی کردووە کە وەك لادێیەك وا بوون، ئەوانیش سەماتیا و بالەت بوون کە لەناو ئەستەنبوڵ زیاتر بە جەتۆ ناسراون. ڕووکاری خانووەکانی بالەت پڕ بوون لە درز و شکان و شەقامەکانی پیس و چڵکن بوون، بەڵام

ناوچەی فەنەری یۆنانی زۆرتر گرنگیی پێ درابوو، هەر کاتێك سەیری پاشماوەی دیوارەکانی بیزەنتە یاخود ڕێڕەوە گەورەکانی ناو گواستنەوەی کردووە، ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشاوە، جێگریی بەردەکان و پاشماوەی تەختەکان بوون.



لەم گەڕانەماندووکەرەدا، ئەوەی زۆرتر کاریگەریی لەسەر جوتیەر بووە، پاشماوەکانی بیزەنتە بوون و لەبارەی جێگیری، ئەستووری، بەرزی و درزی دیوارەکانیەوە دواوە. لەپاڵ باسکردنی تاریکی و بێدەنگیی ئەم ناوچانە و داڕووخاویی خانووەکان، باسی ئەو درزانەی کە بە درێژایی بەرزی قوڵلەی دیوارەکە چوون (وەك منداڵێك ئەم دیمەنانە زۆر ترسێنەر بوون بەلامەوە)، پەرشوبڵاو بوونەوە، پارچەی

دیوارەکان (لە سەردەمی جوتیەر لەساڵی ١٨٩٤، زەمینلەرزەیەکی گەورە ڕووی دا، زیانی گەیاند بەم دیوارانە)، گژوگیای نێوان درزەکان و ئەو دار هەنجیرانەی کردووە کە گەڵا سەوز و گەورەکانیان سەرەوەی قوللەکانیان خاوێن کردووە: "زۆر قورسە باوەڕ بکەی لەپشت ئەم دیوار و قەڵا داڕووخاو و مردووانەدا، شارێکی زیندوو هەیە!" هەروەها نووسیویەتی: "باوەڕ ناکەم لەم جیهانە، شوێنێکی تر هەبێت لەم ڕێگایە خەمگینتر و وشکتر بێت، کە زیاتر لە سێ میل دەکەوێتە نێوان وێرانکاری و گۆڕستانەکانەوە."





لە دووپاتکردنەوە هوزنی ئەستەنبوڵ، چی خۆشییەکم دەست دەکەوێت؟ بۆچی وزەیەکم زۆر بەکار دەهێنم، هەتا ماتەمینیی ئەو شارەی کە هەموو ژیانم لەوێ بەسەر بردووە، بگوازمەوە بۆ خوێنەران؟



لە ١٥٠ ساڵی پێشوو (١٨٥٠–٢٠٠٠)، گومانم نییە کە تەنها هوزن دەستی نەگرتووە بەسەر ئەستەنبوڵدا، بەڵکو لە دەورووپشتیشدا بڵاو بووەتەوە. ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە، کە ڕەگی هوزن ئێمە لە ئەورووپاوەیە. چەمکەکە یەکەم جار لەوێ تەشەنەی کردووە و لەلایەن هونەرمەندەکانی فەرەنساوە بەکار هاتووە (لەلایەن جوتیەر، ئەویش لەژێر کاریگەریی هاوڕێکەی نیرڤاڵ). کەواتە من بۆچی هێندە گرنگی دەدەم _هەر وەکو چوار نووسەرە خەمبارەکە_ بەو تێڕوانینی جوتیەر و نووسەرە ڕۆژئاواییەکان لەسەر ئەستەنبوڵ؟



# ٢٥

# لە چاوی ڕۆژئاواییەکانەوە

تا ڕادەیەك هەموومان مەراق دەکەین بزانین کە چۆن کەسە نەناسراوەکان بیر لە ئێمە دەکەنەوە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە، ڕەنگە ئەم مەراق و نیگەرانییە، تووشی ئازارمان بکات، یان پەیوەندیمان لەگەڵ ڕاستییەکان کەم بکاتەوە. بایەخدانی من کە بزانم شارەکەم لە چاوی ڕۆژئاواییەکانەوە چۆنە _هەروەك بۆ ئەستەنبوڵییەکانیش_ تووشی نیگەرانیم دەکات. وەکو زۆربەی نووسەرەکانی تری ئەستەنبوڵ کە چاوێکیان لەسەر ڕۆژئاوایە، هەندێك جار بە هۆی ئەم سەلێشێواوییەوە ئازار دەکێشم.

کاتێك ئەحمەد حەمدی تانپنار و یەحیا کەمال بەدوای وێنەیەکی شارەکە گەڕاون کە ئەستەنبوڵییەکان خۆیانی تێدا ببینن، خوێندنەوەی وردیان بۆ تێبینییەکانی نێرڤاڵ و جوتیەر کردووە کە لە ماوەی گەشتەکەیان نووسیویانن. لە بەشی ئەستەنبوڵ لە کتێبەکەی تانپنار، (پێنج شارەکە)، بە گرنگترین کتێب دادەنرێت کە لەلایەن نووسەرێکی خۆماڵییەوە نووسرابێت دەربارەی سەدەی بیستەیەمی شارەکە، یاخود دەتوانرێت بگوترێت کتێبەکەی وەك گفتوگۆیەکە لەگەڵ نێرڤاڵ کە هەندێك جار گۆڕاوە بۆ مشتومڕ و دەمەقاڵێ، لە یەك خاڵدا تانپنار باسی لامارتین دەکات، کە کەسێکی سیاسی و نووسەرێکی فەرەنسییە، سەردانی ئەستەنبوڵی کردووە و کتێبەکەی بە ناوی (*مێژووی تورکیا*) (هەشت بەرگی گەورەی لە کتێبخانەکەی باپیرم دانرابوو)، لەلایەن سوڵتان عەبدولمەجیدەوە هاوکاری کراوە. یان تێبینیی کردووە کە نووسینەکانی نێرڤاڵ و جوتیەر وەك پێویست دەربارەی سوڵتان عەبدولمەجید نەبوون، لەبەر ئەوەی ئەوان

ڕۆژنامەنووس بوون و خوێنەرەکانیان بڕیار دەدەن لەسەر بابەتەکانیان، بەم جۆرە هیچ هەڵبژاردەیەکی بۆ گەشتیارەکان نەهێشتووەتەوە، تەنها ئەوەندە ویستوویەتی بۆچوونی ئەوان بزانێت. کاتێك نێرڤاڵ بەشانازییەوە باسی سەرسامیی سوڵتانی کردووە دەربارەی ئەو ئافرەتە ڕۆژئاواییانەی لەگەڵ گەشتیارەکان هاتوون بۆ حەریمی سوڵتان، تانپنار _هەروەك بۆ زۆربەی گەشتیارە لەدوای یەکەکان_ ئەم هەڵوێستەی بە جۆرێك لە (ڕەوشتێکی گومانلێکراو) باس کردووە. هەرچەندە ڕێگەی نەداوە زۆر گلەیی لە نێرڤاڵ بکرێت، بەڵکو زۆرتر نارازیبوونەکانی خستۆتە ئەستۆی خودی حەریمەکە.

ئەم دوو هەستییەی ئەستەنبوڵییەکان بەرامبەر سەرنجی ڕۆژئاواییەکان، دۆخێکی ئاسان نییە. لەبەر ئەوەی شارەکە لە هەوڵی لاساییکردنەوەی ڕۆژئاواییە، هەرچی کە ڕۆژئاواییەکان بیڵێن، جێگەی بایەخە بۆیان. بەڵام کاتێك نووسەرێکی ڕۆژئاوایی لە باسکردنی شارەکە زیادەڕۆیی زۆر دەکات، ئەوکات خوێنەرانی ئەم جۆرە نووسەرانە کە هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ ئەوەی ئاشنای نووسەرەکە و کلتوورەکەی ببن، نائومێد و دڵشکاو دەبن. لەسەرروو هەموو ئەم شتانەشەوە، کەس ناتوانێت بپرسێت کە لەسەر چی بنەمایەك زیادەڕۆیی دەکەن. ڕەنگە بگوترێت شارەکە جۆرە کارەکتەرێکی هەیە، کە دەتوانرێت زیادەڕۆیی لە باسکردنیدا بکرێت. لە هەمان کاتدا نووسەرێکی بیانی کاتێك لەڕادەبەدەر بایەخ بە بابەتێك دەدات، ئەو بابەتە دەبێتە پێناسە و سروشتی شارەکە. بۆ نموونە" کاتێك گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان بە جۆرێك باسی گۆڕستانەکانیان کردووە، وەك ئەوەی بە شێکی گرنگ بن لە ژیانی ڕۆژانەی شارەکە، بەڵام وەك فلاوبێر تێبینیی کردووە ئەو گرنگییەیان هێدی هێدی کەم بووەتەوە. ئەمڕۆ تەنها بە خوێندنەوەی سەرنجی ڕۆژئاواییەکان، دەتوانین تێبگەین کە شارەکە لە ڕووانگەی ئەوانەوە چۆن بووە.

لەگەڵ سەرهەڵدانی مەیلی ڕۆژئاوایی و دەرکەوتنی هەستی نەتەوایەتیی تورکی، خۆشەویستی و ڕقلێبوونەوە بەرامبەر سەرنجی ڕۆژئاواییەکان تێکەڵ بە یەك بوون. زۆرترین ئەو بابەتانەی کە جێگەی سەرنجی ئەو گەشتیارە ڕۆژئاواییانە بوون کە لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم و بە درێژایی سەدەی نۆزدەیەم هاتوونەتە ئەستەنبوڵ، برتی بوون لە :حەریمی سوڵتان، بازاڕی کۆیلەکان (مارك تواین لە کتێبەکەیدا

(تاوانەکانی هەندەران)، خەیاڵی کردووە کە ڕەنگە ڕۆژێك لاپەڕە ئابوورییەکانی ئەمەریکا ڕاپۆرت لەسەر نرخ و زانیاریی ژیانی کۆتایین دەستەی گەیشتووی کچانی شیرکاشی و جۆرجییەکان دروست بکەن)، سوالکەری سەر شەقامەکان، ئەو بارە قورس و زۆرە کە حەماڵەکان دەیانگواستەوە (لە سەردەمی منداڵیم، هەموومان ناڕاسوودە دەبووین کاتێك دەمانبینی گەشتیارێکی ڕۆژئاوایی وێنەی حەماڵێکی دەگرت، کە بەسەر پردی گالەتەوە تێدەپەڕی و بارێکی قورسی بەکۆڵەوە بوو، بەڵام کاتێك وێنەگرێکی تورکی وەك حیلمی شاهینك وێنەی دەگرتن، دۆخەکە زۆر ئاسایی دەبوو بەلامانەوە)، خانەقای دەروێشەکان (جارێکیان پادشا بە هاوڕێکەی و میوانەکەی (نیرڤاڵ)، گوتبووی کە ئەو دەروێشانەی ڕوفانی بەدەوری خۆیاندا دەسووڕێن و شیش دەکەن بە خۆیاندا ئەوا (شێتن)) ئامۆژگاریی کردبوو بە سەیرکردنی دەروێشەکان کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدات، بابەتێکی تر" گۆشەگیریی ئافرەتان بوو. دانیشتووانی ئەستەنبوڵ، ئەوانەی لاسایی خۆرئاوایان دەکردەوە، بە هۆی دووبارەکردنەوەی ئەم بابەتانە، ڕەخنەیان لە نووسەرە ڕۆژئاواییەکان دەگرت، بەڵام بەردەوامبوونی نووسەرە بیانییەکان، دڵیان دەشکاندن و هەستی نەتەوایەتییان بریندار دەکرد.



بازنەی ئەم کێشانە لەلایەن ئەو ڕۆشنبیرانەوە کە لاسایی خۆرئاوایان دەکردەوە و ئارەزوویان دەکرد لەلایەن نووسەر و بڵاوکراوە خۆرئاواییەکانەوە باس بکرێن،

بەردەوامیی پێ دەدرا. نووسەرێکی وەك پایر لۆتی، بەپێچەوانەوە، هیچ نەیدەشاردەوە کە بە هۆی دوو هۆکاری تەواو دژبەیەك ئەستەنبوڵ و تورکەکانی خۆش دەویست: پارێزگاریکردنیان لە تایبەتمەندیی ڕۆژهەڵاتییان، هەوڵەکانیان بۆ بوون بە خۆرئاوایی. بەڵام ئەو سەردەمەی کە پایر لۆتی ڕەخنەی لە ئەستەنبوڵییەکان دەگرت بە هۆی دەستبەردار بوون لە ڕەسەنایەتیی خۆیان، ئەو جۆرە کەسانە بەدەگمەن تورك بوون، زۆربەیان کەمەنەتەوایەتییەکان بوون کە لاسایی خۆرئاوایان دەکردەوە. هەر کاتێك وڵاتەکە تووشی کێشەی هەستی نەتەوایەتی دەبوویەوە، دەستەی ئەدەبیی لاساییکەرەوەی ڕۆژئاوا، هەستێکی پڕ لە کینەیان بەرامبەر نووسینەکانی پایر لۆتی دەبوو، کە لەبارەی (تورکویستی) نووسیبوونی.

ئەندری جید لەمیانەی گەشتەکانیدا بۆ تورکیا، لە ماوەی ساڵی ١٩١٤، هیچ لایەنگرییەکی بۆ چەمکی (تورکویستی) دەرنەبڕیوە. بەتەواوەتی پێچەوانە بوو. کاتێك ڕەخنەی لە چەمکەکە و لەو دۆخەی تورکیا تێی دابوو کە دەویست بەرەو مۆدێرن هەنگاو بنێت، دەگرت _وەك ئاماژەی پێ دابوو ئەو جلوبەرگەی تورکەکان دەیپۆشن زۆر ناشرینن، بەڵام شایەنی ئەوەن بەو جۆرە بن، بەشانازییەوە وتوویەتی کە گەشتەکەی فێری کردووە شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەگشتی و فەرەنسا بەتایبەتی، باڵاترینن لە هەموو جیهاندا. کاتێك کتێبەکەی، (گەشتێك بۆ تورکیا) بڵاو بوویەوە، یەحیا کەمال، یەکێك بوو لە شاعیرە ناودارەکانی ئەو کاتەی تورکیا، زۆر بەخراپی تووڕە بووە، بەڵام لەبری ئەوەی وەك زۆربەی نووسەرەکانی ئەمڕۆی تورکیا بە بڵاوکراوەیەکی دوورودرێژ وەڵامی بداتەوە، لەگەڵ ڕۆشنبیرەکانی تر، تووڕەیی و برینداریيەکەیان شاردووەتەوە و خەمەکەیان بەنهێنی هێشتووەتەوە، چونکە دەترسان سەرزەنشت و ڕەخنەکانی ئەندری جید ڕاست بن و بوونیان هەبێت. ساڵێك لەپاش دەرچوونی کتێبەکەی جید، ئەتاتورك، گەورەترین لاساییکەرەوەی ڕۆژئاوا، شۆڕشی گۆڕینی جلوبەرگی دەست پێ کرد و هەموو ئەو جلانەی قەدەغە کرد کە ڕۆژئاوایی نەبوون.

زۆر جام هاوڕام لەگەڵ ئەو نووسەرە بیانییانە کە بەناتەندروستانە ڕەخنە لە شارەکە دەگرن، خۆشحاڵ دەبم کە ئەوەها بە ڕاشکاوییەکی ساردوسڕ بیروبۆچوونیان دەردەبڕن، لەبری ئەوەی وەك پایر لۆتی بکەن کە پیاهەڵدانێکی گاڵتەجاڕانەی بۆ شتە

نامۆ و سەیرکانی ئەستەنبولّ کردووە. زۆربەی بیانییەکان باسی شارەکەیان بە هۆی جوانی و دلّڕفێنیی دیمەنەکانی و خەلّکەکەی کردووە، بەلاّم ئەمە تەنها بەس نییە، ئەوەی ئێمە نیگەران دەکرد ئەوە بوو کە ئەو بیانییانە تەنها خوێندنەوەیان بۆ ئەو شتە کردووە کە بینیویانە. لە ناوەندی سەدەی نۆزدەیەم، ئەدەبی فەرەنسی و ئینگلیزی، باشترین وێنەی شارەکەیان پیشانداوە. خانەقای دەروێشەکان، ئاگرکەوتنەوەکان، جوانیی گۆڕستانەکان، کۆشك و حەریمەکەی، سوالّکەرەکان، سووڕانەوی سەگە بێسەرپەرشتەکان، قەدەغەکردنی مەی خواردنەوە، گۆشەگیریی ئافرەتان، بارودۆخی ئالّۆزی شارەکە، گەشتوگوزاری بۆسفۆر و جوانیی بیناکان _هەموو ئەم شتانە، سەرنجراکێشترینی شارەکە بوون بەلای گەشتیارەکانەوە، چونکە زۆربەی ئەو نووسەرانە کە هاتوون، لە یەك شوێندا ماونەتەوە و لە هەمان ئاڕاستەوە شارەکەیان بینیوە. گەشتیارانی ئەوەی نویّ دەیانزانی کە ئیتر ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی لەناو چووە، زۆر بەدەگمەن دەگەڕان بەدوای سەرکەوتنە نهێنییەکانی سوپاکەی و کارە شاراوەکانی دەسەلاّتەکەی. لەبری ئەوەی وەك شارێکی ترسێنەر سەیری ئەستەنبولّ بکەن، وەك شارێکی دلّڕفێن سەیریان کردووە کە جێگەی سەرنجی گەشتیارەکانە و بۆ ئەوان تەنها گەشتکردن بۆ شارەکە بەس بووە. زۆر جار باسی هەمان بابەتیان کردووەتەوە کە نووسەرانی پێش خۆیان ئاماژەیان پیّ داوە، یاخود باسی شتێکی نوێیان کردووە کە لە ماوەی گەشتەکە بینیویانە و زۆر گرنگیان بە قووڵکردنەوەی بابەتەکان نەداوە.

لەو کاتەوەی شەمەندەفەر و کەشتییە هەڵمییەکان ئەستەنبولّیان نزی کردووەتەوە لە ڕۆژئاوا، گەشتیارانی بیانی زۆرتر دەبینرێن لەسەر شەقامەکان، لەبەر ئەوە زۆر گرنگیم بە هۆکاری هاتنەکەیان نەداوە. نەزانین لە جوان پیشاندانی نواندنەکەیان و زۆر باوەڕبەخۆبوونیان، وای لیّ کردوون ئەو شتە باس بکەن کە خۆیان ویستوویانە، تەنانەت نووسەرێکی زیرەکی وەك ئەندری جید پێی وا بووە کە هیچ پێویست ناکات خۆت خەریك بکەیت بە جیاوازیی کلتووری و واتای ڕەسەنایەتی، یاخود بناغەکانی کۆمەڵگا کە زۆر گرنگن، بەڵکو گەشتیار مافی خۆیەتی لە ئەستەنبولّ خۆشحالّ و دلّخۆش بێت. جوید و پێنووسەکەی، لەپاش ئەوەی هیچ شتێکی سەرنجراکێشیان نەدۆزیوەتەوە باسی بکەن،

بە باوەڕبەخۆبوونەوە گلەییان لە بابەتە بێزارکەر و بێڕواڵەتەکان کردووە، بە تێڕوانینی ئەو شارەکە هەوڵێکی کەمی داوە بۆ شاردنەوە دەمارگیریی ئابووری و سەربازی لە چاوی ڕەخنەگرەکانی ڕۆژئاوا. بە زەینی ئەو، ڕۆژئاوا ستانداردێکی بۆ هەموو مرۆڤایەتی داناوە.

ئەم نووسەرانە لە سەردەمێکدا هاتوون بۆ شارەکە کە لە ڕەسەنایەتیی خۆی وەستاوە و لاسایی بیانییەکانی کردووەتەوە. ئەوەش بە هۆی خۆرئاواییبوون و قەدەغەکردنەکانی ئەتاتورک بووە _وەك لابردنی دەسەڵاتی سوڵتان، داخستنی حەریمسەرا و خانەفای دەروێشەکان، ڕووخاندنی خانووە تەختەکان و هەموو ئەو شتانەی تر کە جێگەی سەرنجی گەشتیاران بوو و شوێنگرتنەوە عوسمانییەکان لەلایەن فەرمانڕەوایی کۆماری تورکیای لاساییکەرەوەی خۆرئاوا. لەپاش ئەو ماوەیەی کە گەشتیارە بیانییەکان کەمتر دەهاتن بۆ ئەستەنبوڵ، ڕۆژنامەنووسە ناوخۆییەکان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەو گەشتیارانە ساز دەکرد کە لە هیلتۆن هۆتێل دەمانەوە، شاعیرێکی ئەمەریکی، جۆزێف برۆدسکی، بابەتێکی دوورودرێژی بە ناوی (گەشتێك بۆ بێزەنتە) لە ڕۆژنامەی (نیویۆرك) بلاّو کردەوە.

برۆدسکی ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەی هێشتا تووڕە بووبێت لە پێداچوونەوە بێبەزەییەکەی ئەودن بە کتێبەکەیدا کە لەبارەی سەردانەکەیەوە بوو بۆ ئایسلاند، بابەتێکی دوورودرێژی لەبارەی هۆیەکانی گەشتەکەی (بە فرۆکە) بۆ ئەستەنبوڵ بلاّو کردبێتەوە. ئەو کاتانەی دوور لە شارەکە ژیانم بووم، دەمویست تەنها شتە باشەکان لەبارەی شارەکەمەوە بخوێنمەوە، لەبەر ئەوە هەر گاڵتەپێکردنێك ئازاربەخش بووە بەلامەوە، بەلاّم زۆر دڵخۆش بووم کاتێك برۆدسکی نووسیبووی: "لێرە هەموو شتێك کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە! هیچ شتێك کۆن نابێت یان بەسەر بچێت، بەڵکو کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە!"، بەتەواوەتی قسەکانی ڕاستن بەلامەوە. کاتێك ئیمپراتۆرەکە ڕووخا، کۆماری نوێ دڵنیا نەبوو لە جێگریی ناسنامەی خۆی، پێی وا بوو تاکە ڕێگا بۆ بەرەوپێشچوون و گۆڕان، دۆزینەوەی چەمکێکی نوێیە بۆ بەتورکبوون، ئەمەش بە واتای کێشانی بازنەیەك و داخستنی بە ڕووی جیهاندا بوو. بەو جۆرە کۆتایی بە فرەزمانی و فرەکلتووریی سەردەمی ئیمپراتۆریەت هێنا، شارەکە لە بەرەوپێشچوون وەستا و خۆی

بەتاڵ کردەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە هەیبوون، لە کۆتاییدا بووە شارۆچکەیەکی یەک زمانی بێزارکەر لە ڕەنگی ڕەش و سپیدا.



ئەو جیهانپەرستییەی ئەستەنبوڵ، کە لە منداڵییەوە دەمناسی، بەرەو لەناچوون دەچوو هەتا گەیشتمە تەمەنی هەرزەکاری. لە ساڵی ١٨٥٢، جوتیەر، وەک زۆربەی گەشتیارانی تر، تێبینیی کردووە کە لەسەر شەقامەکانی ئەستەنبوڵ گوێبیستی زمانی تورکی، یۆنانی، ئەرمەنی، ئیتالی، فەرەنسی و ئینگلیزی بووە (هەروەها ئەو کاتە زمانی لادینۆ هەبووە، زمانی سەدەی ناوەڕاستی ئیسپانیایە، ئەو جوولەکانە قسەیان پێ کردووە کە لەدوای دروستبوونی ڕێکخراوی لێپرسینەوە (بۆ سزادانی ئەو کەسانەی ئایینێکی تریان هەبووە جگە لە کاسۆلیکی، هەڵهاتبوون بۆ ئەستەنبوڵ). بە هۆی بوونی چەندین زمانی جیاوازەوە لەم (تاوەرەی بابل)، جوتیەر هەستی بە شەرمەزاری کردووە و لەبەر ئەوە هیچ زمانێکی تری نەزانیوە جگە لە زمانی دایک.

لەپاش سەرهەڵدانی کۆماری و گەشەسەندنی توندوتیژیی بەتورککردن، لەپاش ئەوەی دەوڵەت سزای سەپاند بەسەر کەمەنەتەوەکانی تورکیادا _کە هەندێک بە قۆناغی داگیرکردن ناوی دێنن و هەندێکی تریش ناوی دەنێن سڕینەوەی کەمەنەتەوایەتییەکان_ زۆربەی زمانەکان بوونیان نەما. وەک منداڵێک گەواهیدەری ئەم سڕینەوەی کلتوورییە بووم. هەر کاتێک گوێبیستی ئەرمەنییەک یان یۆنانییەک دەبووی کە بە دەنگی بەرز بە زمانەکەی خۆی قسەی بکردایە لە شوێنە گشتییەکان، کەسێک هاواری دەکرد: "تکایە

هاولآتییان بەتورکی قسە بکەن!" (زۆر بەدەگمەن گوێبیستی کوردەکان دەبووی لەو ماوەیەدا لە شوێنە گشتییەکاندا خۆیان ئاشکرا بکەن).

سەرنجی من تەنانەت لەسەر گەشتیارە ڕۆژئاواییە باوەڕپێنەکراوەکان هیچ پەیوەندییەکی بە خۆشەویستی و ڕقەوە نییە. جگە لە چەند دۆکیومێنتێکی ڕەسمی و جیاواز و وتارەکانی وتارنووسەکانی شار نەبێت، ئەوانەی سەرزەنشتی ڕەوشتی خەڵکی شارەکەیان کردووە بە هۆی ڕەفتاریان لەسەر شەقامەکان، ئەستەنبوڵییەکان تەنها چەند نووسینێکی کەمیان لەبارەی شارەکەیان شك دەبرد هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم. ژیان و مانەوەی شارەکە _شەقامەکانی، کەشوهەوا، بۆنی و هەموو لایەنەکانی تری شارەکە_ تەنها لە ڕێگەی ئەدەبەوە دەتوانرێت بگوازرێتەوە، بەڵام بۆ چەندین سەدەیە ئەدەبی شارەکەمان پشتی بە ڕۆژئاواییەکان بەستووە. پێویستە وێنە گیراوەکانی دو کامپ و نیگارەکانی شێوەکارە ڕۆژئاواییەکان بەکار بێنین بۆ ئەوەی بزانین شەقامەکانی شارەکە لە ساڵی ١٨٥٠ چۆن بوون و خەڵکەکەی چی جۆرە جلوبەرگێکیان پۆشیوە. ئەگەر حەز بکەم بزانم سەد ساڵ یان دوو سەد ساڵ پێش لەدایکبوونی من لەو شەقام و گۆڕەپانەی کە من هەموو ژیانم تێدا بەسەر بردووە چی ڕووی داوە، ئەگەر بمەوێت بزانم پێشتر کامە مەیدان کێڵگەیەکی چۆڵ بووە یاخود کامە کێڵگە پێشتر مەیدانێکی گەورە بووە، پێویستە چەندین ساڵ بەسەر بەرم بەناو ئەرشیفە ئاڵۆزەکانی عوسمانی، هەرچەندە لە کۆتاییدا تەنها لەناو نووسراوی ڕۆژئاواییەکان وەڵامەکەم دەدۆزمەوە.

واڵتەر بینجامین لە بابەتێکدا بە ناوی (گەڕانەوەی فلاونێر)، پێداچوونەوەی کردووە بۆ کتێبەکەی فرانز هەسێل، (پیاسەکانی بەرلین)، بەم جۆرە تێبینیی خۆی نووسیوە: "ئەگەر ئێمە باسکردنی شارەکە، بەپێی شوێن و لەدایکبوونی نووسەرەکە بکەین بە دوو بەشەوە، بەدڵنیاییەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەوەی لەلایەن نووسەرێکی ڕەسەنی شارەکەوە نووسراوە، زیاتر شتە گرنگ و بنچینەییەکانی تێدا باس کراوە." بە تێڕوانینی بینجامین، سەیرکردنی شارەکە لە چاوی بیانییەکانەوە زۆرتر نامۆ دەردەکەوێت و گرنگی بە شتە بینراو و سەرنجڕاکێشەکان دەدرێت، بەڵام بۆ نووسەرێکی ڕەسەن، زیاتر گرنگی بە یادەوەرییەکان دەدرێت.

ئەوەی من باسی دەکەم، دەشێت تەنها تایبەت نەبێت بە ئەستەنبوڵ، بەڵکو لەپاش سەهەڵدانی خواستی ڕۆژئاواییبوونەوە، لەوانەیە لە هەموو جیهاندا بوونی هەبێت. لەوانەشە هەر لەبەر هەمان هۆکار بێت کاتێك نووسراوێکی ڕۆژئاواییەکان دەخوێنمەوە دەربارەی شارەکەم وەك ئەوەیە کە یادگارییەکانی خۆم دەخوێنمەوە. کاتێك چاو دەخشێنم بە بابەتێکدا، هەمیشە حەز دەکەم تێبینیی ئەو خاڵە نەکەم کە نووسەرەکە لە کام دووانەیە، ناوخۆییە یان بێگانەیە. حەزم لە باسکردنی پردی گالەتایە بەو جۆرەی کە بەمنداڵی بینیومە کە لەلایەن کنوت هامسون باس کراوە _ئەوکات پردەکە لار بووبوویەوە و بە هۆی چەند ڕاگرێکی گەورەوە وەستێنرابوو_ بە هەمان شێوەش حەزم لە باسکردنی تاریکیی گۆڕستانەکانە، بە هۆی درەختە چڕوپڕەکانیەوە کە لەلایەن هانس کریستیان ئەندرێسن باس کراوە. هەمیشە چێژ لە سەیرکردنی ئەستەنبوڵ دەبینم لە چاوی بێگانەیەکەوە، چونکە بەو جۆرە دوور دەکەومەوە لە بیرتەسکیی هەستی نەتەوایەتی. هەندێك جار بە جۆرێك باسی حەرەمسەرا، جلوبەرگ و نەریتی عوسمانییەکانیان کردووە کە زۆر دوورن لەو ئەزموونانەی کە من بینیومن، وا هەست دەکەم باسی شارێکی تر دەکەن نەك شارەکەی من. ڕۆژئاواییبوون وای کردووە کە من و ملیۆنەها کەسی وەك من چێژ ببینین لە سەیرکردنی ڕابردووی شارەکەمان، وەك ئەوەی باسێکی بێگانە و وێنەی شاری کەسێکی تر بێت.



بۆ بینینی شارەکە لە چەندین سەرنجی جیاوازەوە و هێشتنەوەی پەیوەندییە گەرموگوڕەکەم پێیەوە، زۆر جار خۆم فریو دەدەم. هەندێك کات هەیە _لەپاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر دەڕۆم بەبێ ئەوەی تەنانەت دەرەوە ببینم، یاخود بێزار دەبم لە گەڕان بەدوای ئۆرهانەکەی تردا کە لە ماڵێکی تر بەبێدەنگی چاوەڕێ دەکات_ نیگەران دەبم. هۆگربوونم بەم شوێنەوە، لەوانەیە مێشکم هیلاك بکات، لەبەر ئەوە پەنا بۆ گۆشەگیری دەبەم. دواتر کاتێك بیرم دەکەوێتەوە، دەربارەی شارەکەم، هەندێك شتی بێگانە هەیە لەسەر رێگاکەم، هەست بە ئارامی دەکەم و کاتێکی زۆر بە خوێندنەوەی سەرنجی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان بەسەر دەبەم. هەندێك کات لەبارەی شتە نەگۆڕەکانی شارەکە دەخوێنمەوە _ وەکو شەقامە سەرەکییەکان، کۆڵانەکانی کەنار شار، هەندێك لە خانووە بە تەختە دروستکراوەکان، فرۆشیاری شەقامەکان، ڕووبەرە چۆڵەکان و *موزن*، جگە لەو بابەتانەی پەیوەندیی بە زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانەوە هەیە_ ئارامی بە خۆم دەبەخشم بە باوەڕهێنان بەوەی کە باس و سەرنجی ڕۆژئاواییەکان لەسەر شارەکەم، یادگارییەکانی خودی منن.

٤. ئەگەر گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان وێنەی شارەکەیان تێکەڵ بە وەهمەکانی خۆیان لەبارەی ڕۆژهەڵات کردبێت، بەڵام هەر لە کۆتاییدا ناتوانن بمانکەنە ژێر دەستەی بیروڕاکانی خۆیان. ئەگەر جوتیەر دەڵێت کە ڕۆژئاواییەکان لە کاتی ئاگرکەوتنەوەکان ناگرین _بەپێچەوانەوەی فەرەنسییەکان، تورکەکان گریانیان هەڵنەبژاردووە، بەڵکو بەشکۆدارییەوە ڕووبەڕووی کارەساتەکان دەبنەوە و وەك بەشێك لە چارەنووسی خۆیان قبوڵی دەکەن._ بەتەواوەتی هاوڕا نیم لەگەڵ ئەو شتەی کە باسی کردووە، بەڵام پێشم وایە زۆریش هەڵە نییە. هەر خوێنەرێکی فەرەنسی کاتێك ڕووبەڕووی جوتیەر دەبێتەوە، دەزانێت بۆچی ئەستەنبوڵییەکان ناتوانن *موزن* لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە.

لەسەروو هەموو شتێکەوە، کاتێك بابەتی نووسەرە ڕۆژئاواییەکان لەبارەی ئەستەنبوڵ دەخوێنمەوە، هەندێك شت بێزارم دەکات: هەندێك لە شتە ناوخۆییەکان کە لەدوای ماوەیەك لەناو چوون، لەلایەن ئەو نووسەرانەوە، تەنانەت هەندێك لە نووسەرە زیرەکەکانیش، زۆر زیادەڕۆییان تێدا کراوە. یان ئەو بێبەزەییەی بەرامبەر باسکردنی ژیانی شارەکەدا کراوە: نووسەرە ڕۆژئاواییەکان باسیان لە شتێك کردووە و لایان گرنگ

بووە، لە کاتێکدا نوسەرە ئەستەنبوڵییەکان، ئەوانەی لاسایی ڕۆژئاوایان کردووەتەوە، هەمان ئەو شتانەیان وەك بەربەستێك باسیان کردوون، کە هەتا زووتر بتوانرێت لە شارەکەدا بسڕێنەوە.

لێرە کورتەیەك لەو بابەتانە باس دەکەم:

ئەنکشارییەکان، ئەو سەربازە عوسمانییانە بوون کە تا سەدەی نۆزدەیەم جێگەی سەرنجی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان بوون، لەتەك بازاڕی کۆیلەفرۆشان، خاڵێکی تری جێگەی بایەخی ڕۆژئاواییەکان بوون کە لەپاش ئەوەی دەستیان کردووە بە باسکردنیان، هەر زوو بوونیان نەماوە. دەروێشەکانی ڕوفایی و شیشەکانی دەستیان و دەروێشەکان مەولەوی، لەدوای سەرهەڵدانی کۆمارییەوە، خانەقاکانیان داخران. جلوبەرگی عوسمانییەکان، کە زۆربەی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان وێنەیان دەکێشان، لەپاش ئەوەی ئەندری جید ڕەخنەی لێ گرتن، سەرنج و گرنگییان نەما. حەریمی سوڵتان، ئەویش بوونی نەما. لەپاش حەفتا و پێنج ساڵ، کاتێك فلاوبێر بە هاوڕێ خۆشەویستەکەی گوتووە لە بازاڕ ناوەکەی بە خەتێکی جوان نووسیوە، بە هەمان شێوە نووسینی تورکی لە عەرەبییەوە گۆڕا بۆ لاتینی. لەسەروو هەموو ئەم ونبووانەوە، پێم وایە قورسترینیان بۆ ئەستەنبوڵییەکان، گواستنەوەی گۆڕستان و گۆڕەکان بوون لە باخچە و گۆڕەپانەکانی ژیانی ڕۆژانەوە بۆ نێوان دیوارە بەرز و ترسناکەکان. حەماڵەکان و باری قورسی سەرشانیان، جێگەی سەرنجی زۆربەی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان بوون _وەکو زۆربەی ئۆتۆمبێلە ئەمەریکییەکان کە برۆدیسکی سەرنجی دابوون_ لەپاش ئەوەی باس کران لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە، بوونیان نەما.



یەکێك لەو شتە نامۆیانەی شارەکە، کە هێشتا لەبەرچاوی ڕۆژئاواییەکان بوونی ماوە: سووڕانەی سەگە بێسەرپەرشتەکانی کووچە و کۆڵانەکانە. لەپاش ئەوەی سوڵتان مەحمودی دووەم ناوی ئەنکشاری گۆڕی، بۆ ئەوەی ئیتر لەلایەن ڕژێمی سەربازیی ڕۆژئاواوە گلەیی نەکرێت، سەرنجی خستە سەر ئەم سەگانە، بەڵام لە سڕینەوەیان، سەرکەوتوو نەبوو. لەپاش ڕژێمی پادشایەتی، لەلایەن قەرەچەکانەوە هەوڵێکی تر درا بۆ دوورخستنەوەی سەگەکان، بەڵام ئەو سەگانەی یەك لەدوای یەك گواسترانەوە بۆ سیڤریادا، جارێکی تر گەڕانەوە بۆ نیشتیمان. نووسەرێکی فەرەنسی پێی وایە ئەو سەگانە سەرنجڕاکێش و نامۆن، بەڵام کۆکردنەوەی بەزۆری ئەو سەگانە لە سیڤریادا، زیاتر سەرنجڕاکێش و نامۆترە. سارتەر ساڵێك دواتر، لە ڕۆمانەکەیدا بەگاڵتەوە ئەم بابەتە دەگێڕێتەوە.




ماکس فروچتێرمان، شێوەکاری پۆست کارد، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەیەم زنجیرەیەك بابەتی دەربارەی ئەستەنبوڵ نووسیوە، لەو زنجیرە بابەتانەدا زۆر بەوریاییەوە باسی سەگی کۆڵانەکانی کردووە، هەر بەو جۆرەی باسی دەرویش و گۆڕستان و مزگەوتەکانی کردووە.

## ٢٦

# ماتەمینیی وێرانبووەکان:

# یەحیا کەمال و تانپنار لە گەڕەکە هەژارەکانی شارەکە

یەحیا کەمال و تانپنار، پێکەوە پیاسەیەکی دووروودرێژیان بە هەژارترین بەشی شارەکەدا کردووە. تانپنار جارێکی تر لە ماوەی جەنگی جیهانیی دووەم، سەردانی ئەم شوێنانەی کردووەتەوە و بیری کەوتووەتەوە چەندە شت فێر بووە، کاتێك یەکەم جار بەناو (کۆلانە هەژارەکانی نێوان کۆجاموستەفا و دیوارەکای شاردا) تێپەڕیوە. لەدوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٥٣ تووشی وێرانکاری بوون، جوتیەر وەك شوێنێکی تاریك و کارەساتبار سەیری کردوون. یەحیا کەمال و تانپنار، گەشتەکەیان لە ماوەی ئەو ساڵانە بووە کە ئاگربەستی شەڕی چەندین ساڵە ڕاگەیەنرابوو.

کاتێك یەحیا کەمال و تانپنار دەستیان کرد بە گەشتەکەیان، حەفتا ساڵ تێپەڕیبوو بەسەر گەشتەکەی نیرڤاڵ و جوتیەر، ئەو دوو هاوڕێ فەرەنسییەی کە یەحیا کەمال و تانپنار پێیان سەرسام بوون. هەر لەو ماوەیەی کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە باڵکانس و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەسەڵاتی لە هێزی کەم دەبوویەوە، تا لە کۆتاییدا بەیەکجاری بوونی نەما، سەرچاوەی داهاتی ئەستەنبوڵ کۆتایی پێ هات، هاتنی شەپۆلی یەك لەدوای یەکی پەنابەرە مسوڵمانەکان کە لە باڵکانی کۆماری نوێوە هەڵدەهاتن، لەو کاتەی کە قوربانییانی جەنگی جیهانیی یەکەم بەرز دەبوویەوە بۆ سەدان و هەزاران کەس و ژمارەی دانیشتووان و سامانی شارەکە نزمبونەوەی بەخۆوە بینی. لەو ماوەیەدا بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە، وڵاتانی ئەورووپا دەوڵەمەندتر دەبوون، لەو کاتەی ئەستەنبوڵ هەژارتر دەبوو، گرنگییەکەی لە چاو جیهاندا لەدەست دەدا و بووبووە

شوێنێکی دوورەپەرێز کە چەندین کەسی بێکاری لەخۆ گرتبوو. ئەوکات وەک منداڵێك، هیچ هەستم نەدەکرد کە لە یەکێك لە گەورەترین پایتەختەکانی جیهان دەژیم، بەڵکو زیاتر وەک شارێکی هەژار بیرم لێ دەکردەوە.

کاتێك تانپنار نووسیبووی: "گەشتێك بەنێو گەڕەکە هەژارەکانی شاردا"، تەنها مەبەستی گەشتەکەی یەکەم جاری نەبووە. ئامانجی نووسەر، بەتەنها شارەزابوونی ئەم ناوچانە نەبووە، بەڵکو تێکۆشاوە خۆی ڕابهێنێت بەو ڕاستییەی کە ژیان لەم شوێنانەدا هەیە، لە شارێکدا کە چیتر هیچ بایەخێکی نییە لەبەرچاوی جیهان. مەبەستی پیشاندانی ئەو گەڕەکانە بووە وەک دیمەنێکی سروشتی جوان و گوتنی ئەو ڕاستییەی کە تورکیا و ئەستەنبوڵ خودی خۆیان هەرێمێکی هەژارن.

تانپنار بە دووروودرێژی لەبارەی ئەو شەقامە سووتاو، کاولکاری و دیوارە ڕووخاوانە دواوە، کە بەمنداڵی زۆر ئاشنا بوون لەلام. تانپنار لە ماوەی گەشتەکەیدا، گوێبیستی دەنگی ئافرەتان بووە (کە بە (جریوەجریوی حەریمسەرا ناوی بردووە))، ئەو دەنگە لە کۆشکێکی گەورەوە هاتووە کە لە سەردەمی عەبدولمەجیدەوە ماوەتەوە. بەڵام بە ڕەچاوکردنی باروودۆخی کلتووری و سیاسی، تانپنار ناچار بووە بڵێت کە ئەوە دەنگی خاتوونە عوسمانییەکان نەبووە، بەڵکو دەنگی ئەو ئافرەتە هەژارانە بوون کە لەو کۆشکانە کاریان کردووە، کاتێك تازە کرابوونە کارخانەی دروستکردنی گۆرەوی و چنین بوون. "هەروەک هەموومان لە منداڵییەوە دەزانین"، تانپنار لە هەموو لاپەڕەیەکدا ئەم ڕستەیەی دووبارە کردووەتەوە.



باسی ناوچەیەکی کردووە کە ڕاسیم جارێکیان لە وتارێکدا بەم جۆرە ئاماژەی پێ داوە: "کانییەکە بە کەپری دارمێو، جلە هەڵواسراوەکان هەتا وشك ببنەوە، پشیلە و سەگ، مزگەوت و گۆڕستانەکان سێبەری بۆ کرابوو." ئەو ماتەمینییەی تانپنار لە باسەکانی نێرڤاڵ و جوتیەر دەربارەی کاولکارییەکان و بارودۆخی خراپی کۆڵانە هەژارەکان دۆزیویەتیەوە، گۆڕیویەتی بۆ مۆزنێکی ڕەسەن کە لە ڕێگەیەوە هەموو دیمەنە ناوخۆییەکان بناسرێنەوە، بەتایبەت ژیانی ئەو ئافرەتانەی لە کارگەکانی سەردەمی مۆدێرن کاریان کردووە.



ئێمە نازانین کە تانپنار بەتەواوەتی ئەو خەمەی گواستووەتەوە، بەڵام دەزانین ئاگادار بووە کە ڕووبەرە سووتاوەکان، کارخانە، کۆگاکان و کۆشکە تەختە داڕووخاوەکان، هەموویان لە شەقامێکی خاڵی و لەبیرکراوی ئەو ناوچە دوورەپەرێزانە بوون کە جوانییەکی تایبەت و پڕ لە مانایان هەبووە. لە بابەتێکدا، بەم جۆرە لەبارەیانەوە دواوە:

"وەك سیمبولێك سەیری کاولکاریی ئەم گەڕەکانە دەکەم. تەنها کات و مێژوویەکی ترسناك ئەم جۆرە ڕووخسارە دروست دەکات. دەبێت چەندە داگیرکاری، چەندە کارەسات و چەندە شکست ئەنجام درابن، خەڵکەکەیان چەندە ئازاریان کێشابێت، هەتا ئەم دیمەنانە دروست بوون؟"



دەتوانین وەڵامێکمان هەبێت بۆی، کە پێشتر لە بیری خوێنەردا هەبووە: ئەگەر بیروهۆشی خەڵك بە هۆی لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و پووکانەوەی ئەستەنبوڵ لە لایەك و لە لاکەی ترەوەی بە هۆی ئەو خەمەی بە هۆی چەندین لەدەستدانی گەورەوە دروست بووە، دەستی بەسەردا گیراوە، کەواتە بۆچی ئازارەکانیان بە شێوەی نیرڤاڵ ناو نانێن (هۆنراوەی ڕەسەن) و ئایا ئەمەیان گونجاوتر نییە؟ نیرڤاڵ لە *ئەوریلی* ا، کاتێك باسی لەدەستدانی خۆشەویستەکەی و خەمەکەی دەکات، پیشانی دەدات کە ژیان هیچ شتێك نییە جگە (لە بێزارییەکی تاڵ). نیرڤاڵ هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ، بۆ ئەوەی خەمەکەی لەبیر بچێتەوە (بەبێ ئەوەی بزانێت خەم و پەژارە تێکەڵ بە سە رنجەکانی هاوڕێکەی جوتیەر بوون، کاتێك ئەم وێرانبووانەی بینیوە). کاتێك تانپنار، گەورەترین ڕۆماننووسی سەدەی بیستەیەمی تورکیا، لەگەڵ یەحیا کەمال، گەورەترین شاعیری سەدەی بیستەیەمی تورکیا، بەم کۆڵانە هەژارانەدا گەڕاون، زیاتر هەستیان بە خەم و دڵتەنگی کردووە. بۆچی دەبێت بەو شێوەیە بووبێت؟



هـــەردووکیان بەرنامەیـــەکی سیاسییان بووە، ڕێگای خۆیـان هەڵبـــژاردووە و بـــەناو وێرانبووەکانـــدا بـــەدوای نیشانەیەکدا گەڕاون، کە تایبەت بێت بە دەوڵەتی نوێی تورکیا و هەسـتی نەتەوایـەتیی نـوێی تـــورکی: ئیمپراتۆریـــەتی عوسمـانی ڕەنگـە کۆتـایی پـێ هاتبێـت، بـەڵام خـەڵکی تورکیا ئـەنجامی گـەورەتریان دەسـت کـەوت (هـەر وەکـو دەوڵـەت، هـەردوو نووسـەرەکە خۆشـحاڵ بـوون بـە لـەبیرکردنی یۆنـانی، ئەرمـەنی، جوولەکـە، کـورد و کەمەنەتەوایەتییـەکانی تـر)، ویسـتوویانە بیسـەلمێنن کـە ئەوان توانیویانە لەپاش ئـەو هـەموو ناخۆشـییانە، هێشـتا هـەر بەسـەربەرزی بوەسـتن. بەپێچەوانەی هەر کەسێکی ڕۆشنبیری تورکی، کـە زۆربـەیان بـە ڕەوانبێژییـەکی تونـد و نادروست هەستی نەتەوایەتیی خۆیان دەربڕیوە، ئەم دوو نووسەرە هەستی نەتەوایەتیی خۆیان بە زمانێکی شاعیرانە دەبڕیـوە کـە دوور بـووە لـە هـەر داخوازییـەکی ڕەسمـی و زۆرلێکـردن. یـەحیا کـەمال دە سـاڵی تەمـەنی لـە پـاریس بەسـەر بـردووە، شـارەزای هـۆنراوەی فەرەنسـی بـووە، وەك کەسـێکی ڕۆژئـاوایی بـیری کردووەتـەوە و وێنەیـەکی شێوە ڕۆژئـاوایی دروسـت کـردووە، کـە هەسـتی نەتەوایـەتی بـە شـێوازێکی زۆر جـوانتر دەردەخات.



کاتێك سوپای عوسمانی لە جەنگی جیهانیی یەکەم بەزێنرا، وڵاتانی هاوپەیمان دەستیان گرت بەسەر ئەستەنبوڵدا. لەبەردەم کۆشکی دۆڵماباخچە، لە بۆسفۆر، کەشتییە جەنگییەکانی فەرەنسا و ئینگلیز جێگیر کرابوون و چەندین پڕۆژەی سیاسی هەبوون کە هیچ بایەخێکیان بە ناسنامەی تورکی نەدابوو. ئەو دەمەی کە گەرمەی جەنگەکە لە ئەنادۆڵ بووە لەگەڵ سوپای یۆنانی، یەحیا کەمال کە زۆر ئارەزووی لە شەڕ و سیاسەت نەبووە و بە دوورەپەرێزی لە ئەنقەرە ماوەتەوە. دواتر لە شوێنێکی داخراوی ئەستەنبوڵ ماوەتەوە و خۆی خەریك کردووە بە هۆنینەوەی شیعر بەسەر سەرکەوتنەکانی ڕابردووی تورکیا و دروستکردنی وێنەیەکی (ئەستەنبوڵی تورك). هۆکاری سەرکەوتنی بەرنامەی سیاسی لە لایەنە ئەدەبییەکەوە، بە هۆی بەکارهێنانی ئەو شێوازی هۆنراوەی ڕەسەن و یاسایی پێوانەیی هۆنراوە بووە، کە لەگەڵ شێوازی قسەکردنی ژیانی ڕۆژانەی تورکیا بگونجێت، لە هەمان کاتدا بە جۆرێك باسی تورکەکانی کردووە کە سەرکەوتنی بەرزیان بەدەست هێناوە و کاری گەورەیان کردووە. دوو ئامانجی هەبووە لە پیشاندانی خەڵکی ئەستەنبوڵ بەم جۆرە: لەپاش پەیمانبەستنی دوای جەنگی جیهانیی یەکەم، ئەستەنبوڵ دەبووایە ببێتە ژێردەستی ڕۆژئاوا، لەبەر ئەوە زۆر لای گرنگ بوو لە ڕێگەی نووسینەکانیەوە بۆ داگیرکەرانی ڕوون بکاتەوە کە

ئەستەنبولّ شوێنێك نییە تەنها بە هۆی ئەیاسۆفیا و کڵێساکانیەوە بناسرێتەوە، بەڵکو دەبێت ئاگاداری (ناسنامەی تورکیا) بن. دووەم ئامانج، لەپاش جەنگ و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و فەرمانڕەوایی کۆماری تورکیا، یەحیا کەمال زۆر جەخت لەسەر تورکبوونی ئەستەنبوڵییەکان دەکاتەوە بۆ دروستکردنی (هەرێمێکی نوێ و سەربەخۆ). هەردوو نووسەرەکە چەندین بابەتی دووروودرێژیان نووسیوە، کە فرەزمانی و فرەئاییینی ئەستەنبولّیان فەرامۆش کردووە-=، تەنها بۆ ئەوەی هاوڕا و یارمەتیدەری چەمکی (بەتورك کردن)بن.



چەند سالّ دواتر، تانپنار پارچە نووسینێکی بڵاو کردەوە بە ناونیشانی (چۆن توانیمان لەدوای سالآنی پڕ لە ئازاری جەنگ، چەندین ئەنجامی گەورەی سالآنی ڕابردوو بەدەست بهێنین!) یان لە وتارێکدا لەژێر ناوی (لەسەر دیوارەکانی ئەستەنبولّ)، یەحیا کەمال باسی گەشتەکەی خۆی و خوێندکارەکانی دەگێڕێتەوە کە چۆن لە تۆپکاپی پالآس، سواری شەمەندەفەر بوون و لە مەڕمەڕەوە بەرەو کەنداوی زێڕین چوون، بەتەنیشت ئەو دیوارانەدا تێپەڕیون کە لە کاتی جەنگدا وەك سەنگەر بەکار هاتوون و هەموویان وێرانە بووبوون و ئەوەندەی چاو بیبینیایە، پەرشوبڵاو بووبوون. بۆ ئەوەی بیسەلمێنن شارێکی تورکی هەیە، دوو نووسەرەکە هەستیان کردووە تەنها باسکردنی بینا بەرزەکان کە جێگەی سەرنجی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانن، یان ئەو سیبەرەی بە

هۆی مزگەوت و کڵێساکانەوە دروست بووبوون، بەس نییە. ئەیاسۆفیا و هەموو بینا بەرزەکانی تری ئەستەنبوڵ کە جێگەی سەرنجی ڕۆژئاواییەکان بوون، لە لامارتینەوە هەتا لی کۆربیوسەر، وەك (سیمبولێکی نەتەوەیی) خزمەتی تورکەکانی ئەستەنبوڵیان نەکردووە، چونکە ئەم سەرچاوەی جوانییانە زۆرتر جیهانین و لە زۆر شوێنی تر بوونیان هەیە. ئەستەنبوڵییە نەتەوەپەرستەکانی وەك یەحیا کەمال و تانپنار، پێیان باش بووە بە سەیرکردنی دانیشتووانە هەژار و مسوڵمانە بێبەشەکان، بیسەلمێنن کە ئەوان یەکتۆرزقاڵ لە ناسنامەی خۆیان لەدەست نەداوە، یاخود بۆ ئەوەی ئارامی ببەخشنە ئەو هەستە ناخۆش و خەمەی کە بە هۆی کاولکارییەکانەوە هەیانبووە. هەر لەبەر ئەوەی لە کۆڵانە هەژارەکاندا گەڕاون بۆ ئەوەی جوانی لەناو ئەو دیمەنانەدا بدۆزنەوە کە خەمی وێرانکاریی ڕابردوویان بەخشیوەتە دانیشتووانەکەیان، بەشوێن هەنگاوەکانی جوتیەردا توانیویانە ئەوەی ویستویانە، بیدۆزنەوە. سەرباری پەرۆشبوونەکەیان، تانپنار زۆر جار ئەم دیمەنانەی بە (جوان و ڕەسەن ناو بردووە) کە لە دیمەنی ڕاستەقینە ناچن و هەتا ئێستا خواستی ڕۆژئاوایان پێ نەگەشتۆتە و ڕەسەنایەتیی خۆیان لەدەست نەداوە، لە نووسنێکدا گوتوویەتی: "هەرچەندە ئەم کۆڵانانە تەواو هەژار و بەدبەخت بوون، بەڵام شێوازی خۆیان و شێوازی ژیانیان لەدەست نەداوە."



کەواتە بەو جۆرە ئەو دوو هاوڕێیەی کە لە ئەستەنبوڵ ژیاون، یەکێکیان شاعیر و ئەوی تریان پەخشاننووس _بە پشتبەستن بە دوو هاوڕێی تر کە لە فەرەنسا ژیاون، یەکێکیان شاعیر و ئەویتریان پەخشاننووس_ توانیویانە پێکەوە، لەپاش ڕووخانی دەسەلاتی ئیمپراتۆرەوە، چیرۆکێك بهۆننەوە کە تێکەڵە لە هەستی نەتەوایەتیی شارەکە لە سالأنی سەرەتای فەرمانڕەوایی کۆماری لەگەڵ ویرانکارییەکانی، پرۆژە ڕۆژئاواییەکانی، هۆنراوەکانی و دیمەنە جوانەکانی. ئەنجامی ئەم چیرۆکە ئالۆزە، دروستکردنی وێنەیەك بووە کە ئەستەنبوڵییەکان توانیویانە خۆیانی تێدا ببینن و خەونێك بووە کە هەموو هیوا و خواستەکانی تێدا بووە. دەتوانین ئەم خەونە _کە لە گەڕەکە دوورەپەرێز و هەژارەکانی پشت دیوارەکانەوە سەری هەڵداوە_ ناو بنێین (ماتەمینیی وێرانبووەکان)، ئەگەر کەسێك بە چاوی کەسێکی بێگانەوە سەیری دیمەنی ئەو گەڕەکانە بکات (وەك ئەوەی تانپنار کردی)، سەرەتا وەك دیمەنێکی جوان و سەرنجڕاکێش دەیانبینێت. سەرەتا وەك دیمەنێکی جوان و سەرنجڕاکێش دەیانبینین، دواتر بە هۆی ئەو جەنگ و هەژارییەوە کە ئەو دۆخەی بۆ خەڵکی ئەستەنبوڵ ڕەخساندووە، خەمێك تێکەڵی سەرنجەکانمان دەبێت.



## ٢٧

# دیمەنی جوانی لە وێنەچووی کۆڵانە دوورەپەرێزەکانی شار

لە کتێبی (تەلاری حەوت چراکە)، جۆن ڕاسکین لە بەندێکدا بە ناوی (یادەوەری)، بەشێکی زۆری تەرخان کردووە بە باسکردنی جوانیی ئەو تەلارانە (بەپێچەوانەی شێوەی کلاسیکی)، کە (بەرێکەوت) ئەو جۆرە شێوەیان وەرگرتووە. نووسەر وشەی (لەوێنەچووی) بەکار هێناوە، باسی ئەو تەلارانە کە بە تێپەڕبوونی کات دیمەنێکی جوانیان وەرگرتووە و دروستکەرەکانیان هەرگیز پێشبینییان نەکردووە ڕۆژێك بەو جۆرە دەربکەون. بە تێڕوانینی ڕاسکین، دیمەنی جوانیی لەوێنەچوو، تەنها لەو



بینایانەوە دروست دەبێت کە سەدان ساڵە ماونەتەوە و بە گوڵە لاولاو و گژوگیا داپۆشراون و بە تاوێرە دوورەکان، هەورەکانی ئاسمان، شەپۆلی دەریاکان دەورە دراون. بە زەینی نووسەر، بینا نوێیەکان هیچ جوانییەکیان تێدا نییە، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە مێژوو جوانییەکی بەرێکەوتیان پێ دەبەخشێت و سەرلەنوێ بە جۆرێکی تر دەردەکەونەوە.

جوانیی هێڵەکان، بۆشاییە شیکەکانی ژێر گومەزەکانی، لە لاکراوەکانی گومەزەکانی

تەنیشت، هاوسەنگیی شێوەی وەستانی دیوارەکانی، ڕەنگە سپییەکەی و پاکی و پیرۆزیی گومەزەکانی مزگەوتی سولەیمانیە، هیچ کامیان پێیان ناگوترێت دیمەنی لەوێنەچوو. تەنانەت لەپاش بنیاتنانی، چوار سەد ساڵ پێش ئێستا، ئەم مزگەوتە هەروەك یەکەم جارە و نەگۆڕاوە. نەك تەنها مزگەوتی سولەیمانیە، بەڵکو ئەیاسۆفیا، بەیازیت، یاوز سوڵتان سەلیم و هەموو مزگەوتە گەورەکانی تر کە لە ناوەندی شارەکەدان، لەگەڵ هەندێك مزگەوتی تری بچووك کە لەلایەن منداڵ و هاوسەرانی سوڵتانەکانەوە دروست کراون، هەموویان هەروەك خۆیانن و لە ڕووی تەلارسازییەوە جوانییەکی نموونەی پیشان دەدەن. تەنها کاتێك لە کەلێنی گەڕکێکەوە یان لە کۆڵانێکی پڕ لە درەختی هەنجیر، سەرنجی ئەو بینایانە دەدەین، یاخود کاتێك دەبینین ڕووناکیی دەریاکە دەدات لەو بینایانە، ئەو کاتە چێژ لە بینیی دیمەنە لەوێنەچووەکەیان دەبینین.

جوانیی گەڕەکە هەژارەکانی ئەستەنبوڵ، لەو گژوگیا و گوڵە لاولاو و درەختانەوە دەردەکەوێت کە لە سەردەمی منداڵیمەوە لەسەر دیوار و تاوەرەکانی ڕوملیحیسار و ئەنادۆڵحیسار سەوز بووبوون. دیوار و کۆشکە وێرانبووەکان، کانیاوە شکاوەکان، کارگە سەد ساڵییەکانی گاز، دیوارە ڕووخاوەکانی مزگەوتە کۆنەکان، دارمێو و سوورەچنار کە ئاڵاون بەسەر دیواری کۆن و ڕەشبووی خانووە تەختەکان _هەموو ئەم دیمەنانە بەڕێکەوت خولقاون. بەڵام کاتێك بەمنداڵی سەردانی کۆڵانە هەژارەکانم دەکرد ئەم دیمەنانە بە جۆرێکی ئەوەندە زۆر بوون (ئێستا بوونیان نەماوە)، وەك ئەوەی ڕۆحیان بە شارەکە بەخشیبێت. بەڵام بۆ دۆزینەوەی ڕۆحی شارەکە لەناو ئەم وێرانەیەدا، بۆ بینینیان وەك ئەوەی کرۆکی شارەکە بن، پێویستە سەردانێك بکەی بەناو ڕێگە



پێچاوپێچەکانیاند ا کە بە هۆی تێپەڕبوونی ڕووداوە مێژووییەکانەوە، پاشماوەی

ڕووخاوەکانیان تێدا پەرش و بڵاوبوەتەوە.

بۆ ئەوەی چێژ لە کۆڵانەکانی دواوەی ئەستەنبوڵ ببینی، بۆ ئەوەی جوانیی ئەو دارمێو و درەختەکانی تر ببینی کە جوانییان بەخشیوە بە دیمەنەکان، پێویستە یەکەم جار وەك کەسێکی نامۆ سەیریان بکەیت. دیوارە ڕووخاوەکان، تەکیەکان کە ئێستا دەستیان لێ هەڵگیراوە و چۆڵ کراون، ئەو کانیاوانەی کە وشك بوون، ئەو کارخانانەی کە بۆ ماوەی هەشتا ساڵە هیچ شتێکیان بەرهەم نەهێناوە، بینا ڕووخاوەکان، ئەو خانوانەی لەلایەن کەمەنەتەوەکانی وەك یۆنانی، ئەرمەنی و جوولەکەوە چۆڵ کرابوون، ئەو خانووەی لار بووبوویەوە، ئەو دوو خانووەی بەرامبەر بە یەك لار بووبوونەوە بەو جۆرەی کە فیلمکارتۆنە دروستکەرەکان بەکاری دەهێنن بۆ کارتۆنەکانیان، لاربوونەوەی گومەز، سەربانەکان و ئاسنی پەنجەرەی خانووەکان _هەموو ئەم دیمەنانە هەرگیز بۆ ئەو کەسانە جوان دەرناکەون کە لەنێوانیاندا دەژین، بەڵکو بۆ ئەوان تەنها شوێنێکی بێ یارمەتی، هیوابڕاو و پشتگوێ خراون. ئەو کەسانەی خۆشی دەبینن لەو جوانییەی کە بەڕێکەوت و بە هۆی تێپەڕبوونی مێژووەوە دروست بووە، بەدڵنیاییەوە کەسانێکن لەدەرەوەی ئەم دیمەنە وێرانبووانەوە ژیان بەسەر دەبەن. (بە هەمان شێوە ئەورووپییەکانی باکوور بەخۆشەویستییەوە سەیری کاولکارییەکانی ڕۆمانیان کردووە، لەکاتێدا لەلایەن ڕۆمانییەکان خۆیانەوە پشتگوێ خراون.) یەحیا کەمال و تانپینار وەك شوێنێکی (پاکیزە و دوورەپەرێز)، سەیری کۆڵانە هەژارەکانی ئەستەنبوڵیان کردووە و وەك شوێنێك کە هێشتا نەریتە کۆنەکانیان تێدا ماوە، لە لایەکی دیکەوە نیگەران بوون کە ڕەنگە خواستی ڕۆژئاواییبوون بگاتە لایان و پاکیزەیی خۆیان لەدەست بدەن. لە کاتێکدا ئەم دوو نووسەرە ویستوویانە چیرۆکی سەرنجراکێشی ئەو شوێنانە بگێڕنەوە کە هەموو دابونەریت، هەرەوەزی و ڕەوشتبەرزییان لە باوباپیرانی مەرد و ئیشکەریانەوە بۆیان جێ ماوە، یەحیا کەمال لە پێرا ژیانی بەسەر بردووە، ئەو شوێنەی کە جارێکیان وەك (ناوچەیەك کە هەرگیز دەنگی بانگی نوێژکردنی تێدا نەبیستراوە)، ناوی بردووە لە

کاتێکدا تانپنار لە شوێنێکی ئارامتر، لە بێگڵو ژیاوە، کە هەندێك جار بە کەمێك ڕقوکینەوە گاڵتەی بەم شوێنە کردووە.



با بە بیری خۆمانی بهێنینەوە کە واڵتەر بینجامین گوتوویەتی: "خەڵکی دەرەوەی شار، زیاتر سەرسامی دیمەنە جوان و نامۆکانی ئەم شارەن." ئەم دوو نووسەرە نیشتیمانپەروەرە (یەحیا کەمال و تانپنار)، جوانیی شارەکەیان تەنها لەو شوێنانەدا بینیوە کە خۆیان تێیدا نەبوون. ئەمەش ئەو بەسەرهاتەمان بیر دەخاتەوە کە دەربارەی ڕۆماننووسی گەورەی ژاپۆنی (تانیزەکی) گوتراوە، کە دوای ماوەیەکی زۆر خانووە کۆنەکانی ژاپۆنی لا پەسەندتر بووە و بەدوورودرێژی باسی شێوەی تەلارسازییەکەی کردوون، لە کاتێکدا بە هاوسەرەکەی گوتووە کە ئەو هەرگیز لەو جۆرە خانووانەدا نەژیاوە، چونکە کەلوپەلی خۆشگوزەرانی و ئاسودەیی ڕۆژئاوایان تێدا نەبووە.

گەورەترین بەهای ئەستەنبوڵ، توانای خەڵکەکەیەتی لە سەیرکردنی شارەکەیان بە چاوی هەردوو ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتەوە. ئەوانەی سەرەتا باسی مێژووی ناوخۆی شارەکەیان کردووە، زیادەڕەوّیی زۆریان لە باسەکاندا کردووە، باشترین نموونەش (ڕیچارد بێرتن)، وەرگێڕی چیرۆکی (*هەزار و یەك شەوە*)، یان نێرڤاڵ. کۆچو، بەژیرانە و بە شێوازە تایبەتییەکەی خۆی، توانیویەتی مێژووی شارەکە بە جۆرێك بگوازێتەوە، کە خەڵکەکەی وا هەست بکەن دەربارەی شارستانیەتێکی دوور و نامۆ دەخوێننەوە.

تەنانەت ئەو کاتانەی کە منداڵ بوو، شارەکە زۆر کارەساتی بەخۆوە دەبینی، هەندێك دانیشتووانی شارەکە وەك بێگانەیەك سەیری کارەساتەکانیان دەکرد. بە پشتبەستن بەوەی ئایا وەك ڕۆژهەڵاتییەك یان وەك ڕۆژئاواییەك بن، سەیری ڕووداوەکان دەکەن، بەڵام ئەم ئاکامە تووشی ترسێکیان دەکات کە هەست بکەن بەتەواوەتی خەڵکی ئەم شارە نەبن.



لە کاتێکدا یەحیا کەمال و تانپنار لە لایەکی تری شارەکە ژیاون (لە پێرای شێوە ڕۆژئاوایی)، وێنەیەکی جوان و خەمباری بەشەکە تری شارەکەیان (کۆڵانە هەژارنشینەکانی شارە دێرینەکانیان) کێشاوە، هەتا وێنەی ئەستەنبوڵی دێرین پیشانی نەوەی نوێی شارەکە بدەن. خەونی پیشاندانی دیمەنی ئەو ناوچانە یەکەم جار لەنێوان ساڵانی ١٩٣٩ بۆ ١٩٤٠ لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان سەری هەڵدا بە یارمەتیی لەبەرگیراوەی ئەو وێنانەی کە لەلایەن شێوەکارە ڕۆژئاواییەکانەوە کێشرابوون. بە یارمەتیی ئەو تابلۆیانە _کە کەس نازانێت کێ یەکەم جار کێشاونی، یان کەی و لە کوێ کێشراون_ هونەرمەندە ناوخۆییەکان توانیویانە لەسەر ئەوان سکێچی ڕەشوسپی گەڕەکە هەژارەکان بکێشن. زیاتر حەزم لە سکێچە لەبەرگیراوەکانی هۆجا عەلی ڕەزایە، کە زیاتر پاکیزەن و کەمتر نامۆییان پێوە دیارە، لە ڕاستیشدا بەتەواوەتی ناوبانگیان هەیە.



لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەیەم، کاتێك گەشتیارەکان دەگەیشتنە ئەستەنبوڵ، سەرسامی بینا بەرزەکان، دەریاکان و مزگەوتەکان دەبوون، هۆجا عەلی خەریکی کێشانەوە، سکێچی ئەو ناوچانە بوو کە خواستی ڕۆژئاوایی و مۆدێرنگەری لە نیوەی ڕێگاکە دەستی لێ هەڵگیرابوو. هەروەها ئەم دیمەنانە لە وێنە گیراوەکانی ئارا گولەر دەرکەوتن. ئەستەنبوڵ لە وێنەکانی ئارا گولەر شوێنێکە، کە ژیانی نەریتی و ڕەسەنی خۆی تێدا بەڕێ دەکرێت. شوێنێکە کە کۆن و نوێ یەکیان گرتووە بۆ ئەوەی موزیکێکی سادە دروست بکەن، کە ئاوازی کاولکاری و هەژاری و سادەیی دەردەخات لەو شوێنەی کە ڕووخساری خەڵکەکەی وەك

دیمەنەکانی خەموپەژارەیان پێوە دیارە. بەتایبەت لە ساڵانی ١٩٥٠ بۆ ١٩٦٠، کاتێك کە کۆتا شوێنەکانی ئیمپراتۆریەت _بانق، مەیخانە، تەلارەکانی فەرمانڕەوا عوسمانییەکان_ لە شارەکەدا دەڕووخێنران، ئەم وێنەگرە دەستی کرد بە وێنەگرتنی دیمەنی داڕوخاوییەکەیان، لە کتێبەکەیدا (ئەستەنبوڵی ونبوو)، لەگەڵ کۆمەڵێك وێنەی گیراوی بێۆگڵۆی تێدایە بەو جۆرەی کە بەمنداڵی بینیبووم_ ڕێگای ئاسنی ترۆلییەکان، ڕێگا چەوڕێژکراوەکان، پۆستەری سەر دوکانەکان و ڕەنگە ڕەش و سپییە هیلاك و خەمداگرتووەکانی_ چەند وێنەیەکی جوانی ناوچە هەژارەکانی پیشان داوە.



دیمەنی ڕەشوسپی گەڕەکە دوورەپەرێزەکان "لەو شوێنانەی کە هەموو کەس هەژار بوو، بەڵام بەسەربەرزی وەك خودی خۆیان دەژیان"، بەتایبەت لە ڕەمەزاناندا زۆرتر پیشان دەدران. وتاری مێژوویی لاپەڕە ئەستەنبوڵییەکان بە پیشاندانی ئەو وێنە و سکێچانە دەڕازێنرانەوە، کە هەموو ساڵێك بە شێوازێکی نوێوە پیشان دەدران. ڕەشات ئەکرەم کۆچو لە بەشی پێشەوەی ئەم هونەرە بوو، لە (*ئەنسکلۆپیدیای ئەستەنبوڵ*) و وتارە مێژووییە بەناوبانگەکانی ڕۆژنامەکان، ئەم وێنانەی بەکار نەدەهێنانەوە، بەڵکو بە شێوەی سکێچ وێنەی دەکێشانەوە. (ئەمەش کارێکی گران

بوو، چونکە جیاکردنەوەی یەك یان دوو کلێشەی نیگارێکی ویستراو، وردەکاریی زۆری دەوێت، بەتایبەت لە ڕووی تەکنیکییەوە کارێکی قورسە.) زۆربەی وێنەکان لەسەر ئەو نیگارانە کێشراونەتەوە کە بە ڕەنگی ئاوی لەلایەن هونەرمەندە ڕۆژئاواییەکانەوە کێشراون. کاتێك ئەو هونەرمەندە ناودارانە ئەو وێنە ڕەشوسپییانە وەك بنچینەیەك بۆ نیگارەکانی خۆیان (بەبێ دەستکاری لەسەر لاپەڕەی هەرزان و ڕەنگ زەردباو چاپیان کردوون) بەکار دێنن، هەرگیز لەخوارەوەی وێنەکە ناوی نیگارکێشە ڕاستییەکە نابینین، یاخود ناوی ئەو کەسەی یەکەم جار وێنە ڕاستییەکەی لەبەر گرتووەتەوە، تەنها ئەوەندە بە تێبینی نووسراوە کە وێنەکە وەرگیراوە. لە ئەندێشەکانی ئەستەنبوڵی دێرین، هەژاری وەك سیمبولێك بۆ هێشتنەوەی ناسنامەی کۆن و ڕەسەنایەتی ڕێزی لێ گیراوە، لەبەر ئەوە زۆر سەرنجڕاکێش بوون بەلای ئەو کەسانەی کە نیوە خواستی ڕۆژئاواییان هەبووە، لەتەك نەتەوەپەرستە بەتینەکان و ڕۆشنبیرە بۆرجوازەکان ئەوانەی گرنگییان بە ڕاستییە تاڵەکانی ژیانی شارستانیەت نەداوە. لەو کاتەی خەونی پیشاندانی ئەستەنبوڵی دێرین سەری هەڵدا، نەك تەنها گەڕەکە هەژارەکان، بەڵکو هەموو لایەکی شارەکەی جگە لە بینا بەرزەکان گرتبوویەوە، ئەدەبێك بۆ پیشاندانی هەموو تایبەتمەندییەکان دروست بووبوو.

کاتێك نووسەرە کۆنەپەرستەکان، ئەوانەی ئارەزووی گۆڕانی نەریتەکانیان نەدەکرد، دەیانویست زۆر جەخت لە لایەنی تورکبوون و مسوڵمانێتیی ئەو ناوچە هەژارانە بکەنەوە کە بەهێواشی بەرەو ڕۆژئاواییبوون دەچوون، بەهەشتی عوسمانییەکانیان پیشان دەدا، ئەو بەهەشتەی کەس پرسیاری دەربارەی دەسەڵات و مافی یاسایی پادشا نەدەکرد، لەو شوێنەی کە خێزانەکان لە ڕێگەی نەریتەوە پلە و دەسەڵاتیان دەگواستەوە بۆ یەکتر (ئەوەش بەدڵنیاییەوە بێفیزی، گوێڕایەڵی و قایلبوون بە دەسەڵاتی یەکتر پیشان دەدات). هەندێك لایەنی کلتووری عوسمانی _دۆستی پادشا و خانەدانەکان، حەریم، فرەژنی، مافی ڕەوایی پادشا بۆ لێدان و سزادانی هەر کەسێك_ کە چینی ناوەندی کۆمەڵگا، ئەوانەی مۆرکی خۆرئاواییان پێوە دیار بوو، تووڕە دەکرد، بەڵام ئەم تایبەتمەندییانەی ئیمپراتۆریەت لەلایەن نووسەرە لایەنگرەکانیانەوە لەبەرچاوی خەڵك زۆر ئاسان دەکران، بۆ نموونە" یەکێك لەو نووسەرانە، (سەمیعە

ئەیوەردی) بوو کە پادشاکان و نەوەکانیانی زۆر مۆدێرن پیشان دەدا زیاتر لەوەی لە ڕاستیدا هەبوون.

کاتێك شانۆگەرییە خۆشەویستەکەی ئەحمەد کودسو لە یەکێك لە قاوەخانەکانی گەڕەکە هەژارەکانی دەوروبەری شار (لەسەر شێوازی سەردەمی ڕۆستەم پادشا) پیشان دەدرا، یان کاتێك شانۆگەری بووکەشووشەیی قەرەگوێز نمایش دەکرا، هەموو کارەکتەرە مەزنەکانی شارەکە پێکەوە لەم شانۆگەرییانە خۆشحاڵیان دەکردین و بیروهۆشیان لە ڕاستییە تاڵەکان دوور دەخستینەوە. بەڵام ڕۆماننووس و نووسەری کورتەچیرۆك، ئۆرهان کەمال، جیاوازتر بیری کردووەتەوە. ئەم نووسەرە کە پێشتر لە یەکێك لە کۆڵانە هەژارەکانی جیبالی ژیاوە (خێزانەکەی لە یەکێك لە کارگەکانی توتن کاری کردووە)، وێنەی هەمان ئەو گەڕەکانەی بە جۆرێك دەرخستووە کە بۆ بەدەستهێنانی ژیان ململانێیان تێدا دەکرێ، بە جۆرێك تەنانەت هاوڕێکانی سەرسام بوون و بێزارییان دەردەبڕی بەرامبەر ئەو جۆرە ژیانە. بە زەینی من، خەونی پیشاندانی وێنەی ئەم کۆڵانە هەژارانە وەك سەرکەشییەکانی (خێزانی ئوگورلوگل) وایە، کە بە منداڵی هەموو ئێوارەیەك بەدڵخۆشییەوە لە ڕادیۆ گوێم بۆ دەگرت. ئەم خێزانە کە وەك خێزانەکەی من گەورە و قەرەباڵغ و مۆدێرن بوون (بەڵام پێچەوانەی خێزانەکەی من ئەوان دڵخۆش بوون)، لە کۆتاییدا توانیویانە، سەرەڕای بارودۆخی خراپیان، ژوورێك بۆ دایکە ڕەشەکەیان بدۆزنەوە.

حەکایەتخوانەکانی ئەستەنبوڵی دێرین، هەرچەندە چوونەتە ناو قووڵایی دیمەنی جوان و ماتەمینیی ئەو گەڕەکانەوە، بەڵام خۆیان دوور گرتووە لەو لایەنە خراپانەی کە لەپشت ئەو وێرانبووانەوە خۆی حەشار داوە. سەرەڕای هەموو شتێك، نووسەرە نەتەوەپەرستەکان ڕووی پاکیزەیی ئەو نەریتانە پیشان دەدەن کە گونجاون بۆ خۆشگوزەرانیی خێزانەکان. لەبەر ئەوە لە دڵی زیرینی کەمال ئۆرهان، کە لە تەمەنی منداڵی زۆر حەزم لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی بوو، پەیامی ئەوە بوو ئەگەر کەسێکی هەژار لە یەکێك لەو کۆڵانە هەژارانە بژیت، بە کارکردنێکی قورس و گران (لەبیرتان بێت، ئەم ناوچانە وەك سەرچاوەی بەرزترین هەستی نەتەوایەتی و بەها ڕەوشتییەکان

دانرابوون)، ڕۆژێك دەگەن بە خۆشبەختی. لە ماوەی حەفتاکاندا، لە کاتێکدا شارەکە ڕۆژبەڕۆژ ڕووبەڕووی هەژاری دەبوویەوە، ئەم پەیامەی ڕاگەیاند.

ڕوسکین پێی وا بووە لەبەر ئەوەی ئەو دیمەنی کاولکارییانە بەرێکەوت بەو جۆرەیان لێ هاتووە، ناتوانرێت پارێزگاری لە مانەوەیان و نەگۆڕانیان بکرێت. ئەوەی وای کردووە ئەم دیمەنانە جوان دەربکەون، نەخشەی تەلارسازییەکانیان نەبووە، بەڵکو وێرانکارییەکەیان بووە. ئەمەش دەریدەخات کە بۆچی ئەستەنبوڵییەکان زۆر حەز بە سەیرکردن دیمەنی ئەو کۆشکە تەختانە ناکەن کە نۆژەن کراونەتەوە: چونکە کاتێك ڕەنگی ڕەشبوو و بۆنکردووەکانیان لەژێر بۆیەیەکی ڕووناك دەشارێتەوە، وایان لێ دێت بگەڕێنەوە بۆ شێوەی یەکەم جاریان و بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی شکۆداری شارەکە لە سەدەی نۆزدەیەم. ئەو وێنەیەی شارەکە کە ئەستەنبوڵییەکان لە سەدەی ڕابردووەوە هەڵیانگرتبوو وەك منداڵێکی دەستی هەژاری، لەناوچوون و کاولکاری بووە. کاتێك پانزدە ساڵان بووم، خووم بە وێنەکێشانەوە گرتبوو. کاتێك وێنەی ئەو گەڕەکە هەژارانەم دەکێشا، نیگەرانی دەبووم، چونکە خەمی ئێمە لەو شوێنانەوە دەستی پێ دەکرد.



## ٢٨

# کێشانی وێنەی ئەستەنبوڵ

کاتێك تەمەنم پانزدە ساڵان بوو، دەستم کرد بە کێشانی ئەو دیمەنانەی کە تەواو لەبەرچاوم بوون، ئەمەش زیاتر بە هۆی خۆشەویستییەکی تایبەتم بوو بۆ شارەکە. ئەوکات زۆر شتم دەربارەی ژیان و تەکنیکەکانی هونەری نیگارکێشان نەدەزانی و هیچ ئارەزوویەکم نەبوو فێری هیچ کات لەو تەکنیکانە ببم. وێنەی ئەستەنبوڵم بەو جۆرە دەکێشا، کە لە پەنجەرەیەکەوە لێمەوە دیار بوو، یاخود بەو جۆرەی لەسەر شەقامێك دەمبینی.

نیگاری شارەکەم بە دوو شێواز کێشاوە: لە سەرەتاوە دیمەنەکانی بۆسفۆر، ئەو دەریایەی کە بەناوەڕاستی شارەکەدا تێدەپەڕی و وێنەی شێوە ئاسۆییەکانی شارە دەکێشا. بە گشتی بیرۆکەی کێشانی ئەم وێنانەم لەو نیگارانەی دیمەنەکانی شارەوە وەرگرتبوو، کە سەدان ساڵ لەوەوبەر لەلایەن گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانەوە کێشرابوون.



وێنەی بۆسفۆرم بەو جۆرە دەکێشا، کە لە کەلێنی نێوان باڵەخانەکان، لە ماڵەکەمانەوە لە جیهانگیر دیار بوو، لەگەڵ دەرکەوتنی دیمەنی کیزکولیسی، فیندکلی و ئۆسکودەر، دواتر دیمەنی

بۆسفۆرم بەو جۆرە دەكێشا كە لە خانووەكەی ترمان لە بەرزاییەكانی بەشیكتاش سیرنسبی دیار بوو _دیمەنی كرانەوەی بۆسفۆر، سەرایبورنو، تۆپكاپی پالاس، وێنەی سێبەراویی شارە دێرینەكەم دەكێشا. هەر لە ماڵەوە ئەم وێنانەم تەواو دەكرد، بەبێ ئەوەی بڕۆمە دەرەوە. ئەو دیمەنە ئەفسوناوییانەی ئەستەنبوڵ كە وێنەم كێشابوون، لە هزرمدا دەمانەوە. هەمووان دانیان دەنا بە جوانیی دیمەنەكانم، چونكە هەڵچنراوی دیمەنەكان، ڕاستەقینە بوون. هەر نیگارێكم بەكۆتا هێنابێت، هەمان پرسیارم لە خۆم دەكرد كە هەزاران جار لە كەسانی دەوروبەرم پرسیبووم _نیگارەكەم جوانە؟ ئایا ئەم جارە وام لێ كردووە جوانتر دەركەوێت؟_ ئەو دیمەنەی هەڵمدەبژارد، دڵنیام دەكردەوە كە گرەنتیە بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەكەم "بەڵێ" بێت.

نیگارەكانم وا دەردەكەوتن، وەك ئەوەی نوێ بن و هەستم نەدەكرد كە وەكو ئەو نیگاركێشە ڕۆژئاواییانەم كردبێت كە لەپێش منەوە نیگاری دیمەنەكەیان خولقاندبێت. لاسایی هیچ كام لە شێوەكارە ڕۆژئاواییەكانم نەدەكردەوە، بەڵام ئەوەی لێیانەوە فێر بووبووم، هەندێك جار لە نیگارەكانمدا بەكارم دەهێنا. دیمەنی شەپۆلەكانی بۆسفۆرم بە جۆرێك دەكێشا، وەك ئەوەی منداڵێك كێشابێتی، لەسەر شێوازی شێوەكار، دەفی و هەورەكانم لەسەر شێوازی شێوەكار ماتیسی دەكێشا. هەر دیمەنێك نەمزانیایە وێنەی بكێشم، بە خاڵ شوێنەكەیم پڕ دەكردەوە، وەك ئەوەی نیگاركێشێك یەكێك لە هونەرەكانی نیگاركێشان بەكار بهێنێت. هەندێك جار دیمەنی سەر كارت و پۆستەری ڕۆژژمێرەكانم بەكار دەهێنا. نیگارەكانم جیاوازییەكی ئەوەهایان لەگەڵ ئەوانەی ئەو شێوەكارە توركانە نەبوو، چل یان پەنجا ساڵ لەپاش ئەو شێوەكارە فەرەنسییانەوە دەستیان پێ كرد، كە پێشڕەوییان كردن لەم هونەرەدا و هەموو تەكنیكەكانی وێنەكێشانیان بەكار دەهێنا بۆ ئەوەی بە جوانترین شێوە وێنەی دیمەنەكانی ئەستەنبوڵ بكێشن.

وێنەی هەر شتێكم دەكێشا، هەمووان پێی ڕازی بوون و لایان (جوان) بوو. لەبەر ئەوە پیاهەڵدانەكانیان، وایان لێ دەكردم كە ناچار نەبم خۆم بەرەوپێش بەرم، هەر بۆیە نیگاركێشان ئارامیی پێ دەبەخشیم. هەر كاتێك ئەم هاندانەم بیر كەوتایەتەوە، بەوپەڕی خێراییەوە هەموو كەلوپەلی وێنەكێشانەكەم ئامادە دەكرد. بەڵام بەبێ ئەوەی

بزانم وێنەی چی دەکێشم، ڕەنگ و فڵچەکەم دەگرت بە دەستمەوە و دەچوومە دنیای خەیاڵەکانمەوە، کێشەم بۆ دروست نەدەبوو و نەدەوەستام. هەر وێنەیەك لەسەر پۆستەرەکان یان پەنجەرەی ماڵەکەمان بمبینیایە، بەخۆشییەوە دەستم دەکرد بە وێنەکێشانی. هەرگیز بێزار نەدەبووم لە کێشانەوەی هەمان دیمەن، کە هەزاران جار بە هەمان شێوە وێنەم کێشابوو. لەو کاتەدا گرنگترین شت بەلامەوە، دەستکردن بوو وێنەکێشان و هەڵهاتن لەم جیهانە: بۆ نموونە" دانانی کەشتییەك لەناو بۆسفۆر کە لەگەڵ دیمەنەکە بگونجێت (لە سەردەمی مێلینەوە، بۆسفۆر خاڵی سەرەکە وێنەکێشان بووە). بۆ ئەوەی وێنەی سێبەری ئەو مزگەوتەی لەپشت کەشتییەکەوە دیار بوو _وێنەی درەختە سەوزەکان، بەلەمەکان، گومەزەکان، ڕووناکی نیشاندەری کەشتییەکان لە سەرایبورنو، یان وێنەی ئەو پیاوەی لە-کەنار دەریاکەوە ڕاوەماسی دەکرد_ بکێشم، دەبووایە بچمە ناو قووڵایی دیمەنەکانەوە، وەك ئەوەی بەناویاندا بگەڕێم.

لە کاتی نیگارکێشان، بیروهۆشم بەتەواوەتی دەچوویە ناو ئەو دیمەنەوە کە وێنەم دەکێشا، ئەمەش ڕێگایەکی نوێ بوو بۆ هەڵهاتن بو دونیاکەی تری خەیاڵەکانم. کاتێك بەتەواوەتی دەچوومە ناو قووڵایی جوانترین بەشی ئەم جیهانەوە، یان کاتێك وێنەکەم تەواو دەبوو، شەیداییەکی سەیر دایدەگرتم. ئەو دیمەنەی کێشابووم، لەبەردەمدا دەدرەوشایەوە، بەتەواوەتی لە ڕاستەقینە دەچوو. لەبیرم دەچوویەوە کە وێنەی ئەو بۆسفۆرەم کێشاوە، کە هەموو کەس دەیناسێت و خۆشی دەوێت. ئەو خۆشییەی لە کاتی تەواوکردنی هەر وێنەیەکدا هەمبوو، ئەوەندە گەورە بوو بە جۆرێك دەمویست وێنەکە لەباوەش بگرم و تەنانەت بیخەمە دەممەوە بیخۆم. ئەگەر بەو جۆرە لەناو وێنەکێشاندا خۆم ون نەکردایە (کە چەندین و چەندین جار دووبارەم کردبوونەوە)، ئەوا ئەم جیهانە خەیاڵە منداڵانەکەمی دەشێواند و خواستی دەستەپەرکردنم بۆ دەهات.

یەکەم شێوازی وێنەکێشان لەلای من بەو جۆرە بوو، کە شاعیر سچیلەر پێی دەگوت (هۆنراوەی ساویلکە). هەڵبژاردنی دیمەنەکان گرنگتر بووم بەلامەوە، زیاتر لە بەکارهێنانی تەکنیکەکانی وێنەکێشان و سەرەڕای هەموو شتێك، دەمویست باوەڕ بە خۆم بێنم کە هونەرەکەم دەربڕینێکی سەربەخۆی ناو ناخمە.

بە تێپەڕبوونی کات، وێنەکێشانی بۆسفۆر، بە شێوازی منداڵانە و بەبێ گوێدانە ڕێساکانی نیگارکێشان، زۆر ئاسایی دەبوو بەلامەوە و خۆشحاڵیم بە وێنەکێشان کەمتر دەبوویەوە. وەکو زۆربەی کەلوپەلەکانی گەمەی سەردەمی منداڵیم _ئۆتۆمبێلەکانم کە لەسەر فەرشەکانی داپیرەم گەمەم پێ دەکردن، دەمانچەکانم کە باوکم لە فەرەنساوە بۆی هێنابووم_ چیتر لە بێزاری و نیگەرانییەکانی ژیانی ڕۆژانەم ڕزگاریان نەدەکردم. لەبەر ئەوە ڕووم وەرگێڕا و دەستم کرد بە دووەم شێوازیان، ئەویش کێشانی دیمەنە دیارەکانی تری شارەکە بوو: وێنەی شەقامە بێدەنگەکانی کەناری شار، گۆڕەپانەکان، کۆڵانە چەوڕێژکراوەکان (لە بەرزاییەکانەوە بەرەو بۆسفۆر درێژ دەبوونەوە، لەگەڵ دەرکەوتنی دەریاکە، کیزکولسی و کەناری ئاسیای ئاوەکە)، خانووە لە تەختە دروستکراوەکان. ئەم نیگارانەم هەندێکی بە ڕەنگی ڕەش و سپی یان بە ڕەنگی ڕۆنی دەمکێشان، بەڵام زۆر بەکەمی ڕەنگەکانم بەکار دەهێنا، زۆربەی لاپەڕەکەم بە سپی دەهێشتەوە. دوو هۆکار، زۆرترین کاریگەرییان هەبوو لەسەرم.

وێنەی ڕەشوسپیی گەڕەکە هەژارەکان، کە لە وتاری (مێژوویی) لاپەڕەکاندا دەردەکەوتن و ماتەمینییە بێدەنگەکەیان زۆرترین کاریگەرییان هەبوو لەسەرم. وێنەی مزگەوتە بچووکەکان، دیوارە ڕووخاوەکان و خانووە تەختەکانی ئەو گەڕەکە هەژارانەم دەکێشا، یاسای چەمانەوەی دیمەنەکانم بەو جۆرە بوو کە داهێنانی خۆم بوو و خانووە سادەکان دیمەنەکەیان هەتا درێژتر بووایەتەوە لە وێنەکەمدا، ئەوا دوورتر و کەمتر دەردەکەوتن.



ئۆتریلۆ کاریگەرییەکی تر بوو لەسەرم. کارەکانیم لە ڕێگای چاپی وێنەکانیەوە لەو ڕۆمانە هەستبزوێنە میلۆدرامایانەوە بینیبوو، کە پەیوەندییان بە ژیانی خۆیەوە هەبوو. کاتێك مەیلم بووایە لەسەر شێوازی ئۆتریلۆ وێنە بکێشم، ئەوا کۆڵانە هەژارەکانی بیۆگلۆ، تەرلاباشی و جیهانگیرم هەڵدەبژارد. لەم کۆڵانانە، مزگەوت و منارەی کەمتری لێ بوو. کاتێك ئارەزووی وێنەکێشانم دەکرد، هەندێك لە لەبەرگیراوەی ئەو وێنانەم دەردەهێنا کە لە کاتی گەڕان بە شەقامەکانی شاردا گرتبووم. لەپاش ئەوەی بەوردی تەماشام دەکردن، دەستم دەکرد بە کێشانی دیمەنێکی بیۆگلۆ و هەرچەندە لە ئەستەنبوڵ زۆر دەگمەن بوو، بەڵام وەك ئۆتریلۆ دەروازەی ئاسنینم بۆ پەنجەرەی هەموو خانووەکان دروست دەکرد _هەر وەکو ڕۆژانی منداڵیم. وا هەستم دەکرد ئەو دیمەنەی وێنم کێشاوە، داهێنانی خۆمە، بەڵام دیمەنەکە ڕاستەقینە بوو، بۆ گەشتن بە ئامانجی کۆتایی_ دەربڕینی هەستی خۆم بەرامبەر وێنەکە _ئیتر وەك جاران تەنها سەیرکردنێکی ساویلکەیی بەس نەبوو، ئەم جارە گەمەیەکی دەروونیم دەکرد کە وەك جۆرێك لە فریودان وا بوو: خۆم دەکردە کەسێکی تر بە ناوی ئۆتریلۆ، کە خەڵکی پاریسە و ڕۆژێك وەك ئەم وێنەیەی کێشاوە. بەدڵنیاییەوە زۆر باوەڕم بەم بیرۆکەیەم نەبوو، هەروەك جاران کە وێنەی بۆسفۆرم دەکێشا، بەتەواوەتی باوەڕم نەبوو کە چوومەتە ناو دونیای وێنەکەوە، ئێستاش هەر بە هەمان شێوە بوو. بەڵام هەرچۆنێك



بووبێت، گەمە نوێکەم سوودی خۆی هەبوو، بەتایبەت لەو کاتانەی کە نیگەران دەبووم و لە نیگارەکەم تێنەدەگەشتم، یان گومانم لە بەهای وێنەکەم بووایە کە ببێتە نیگارێکی (جوان) یان (مانابەخش) بۆ کەسانی تر. بەپێچەوانەوە کاتێك وێنەکە

ڕاستەقینەتر دەردەکەوت، هەستم بە بەرپرسیارێتیی کەمتر دەکرد. لەم بارودۆخەدا، هەمان ئەو ڕۆتینەم دەکردەوە کە لەپاش ئەوەی مەیلی هەوەسبازی هاتە ناو ژیانمەوە، فێری بووم: لەپاش ئەوەی نیگارەکەم تەواو دەکرد، بەڕادەیەکی زۆر دڵخۆش دەبووم، بە جۆرێك خۆم لەدەست دەدا، تووشی پەشۆکان دەبووم، خۆشییەکەم کەم دەبوویەوە و لە کۆتاییدا وچانێکم دەدا.



نیگارە تازە وشکبووەکەم بەخێرایی لەپاڵ یەکێك لە وێنەگیراوەکاندا کە لەسەر دیوارەکە بوو، هەڵدەواسی. تێدەکۆشام ئەوەها لێی بڕوانم، وەك ئەوەی کەسێکی تر کێشابێتی. ئەگەر بەدڵم بووایە، دڵخۆش دەبووم و بەسەربەرزییەوە هەستم بە سەرکەوتنی خۆم دەکرد لە کێشانی دیمەنی کۆڵانە هەژارەکان. بەڵام ئەگەر _کە زۆر جار ڕووی دەدا_ هەستم بە کەموکورتی بکردایە، لە لایەکی ترەوە دەوەستام سەیری وێنەکەم دەکرد، یان لەدوورەوە سەیرم دەکرد و بەهێواشی لێی نزیك دەبوومەوە، یاخود هەندێك جار بە فڵچەکەم هەندێك شتی ترم زیاد دەکرد. لە کۆتاییدا ململانێکەم بۆ ئەوە بوو کە ئەو شتەی دروستم کردووە، بەدڵی خۆم بێت. بەڵام پاش ماوەیەك، ئیتر باوەڕم بە خۆم نەدەهێنا کە ئۆتریلۆ بم، یان هەندێك تایبەتمەندیی ئەو لە نیگارەکانمدا

هەبن. لە ساڵانی دواتر، لەپاش ئارەزووە هەوەسبازییەکانم، تووشی نائومێدی دەبووم، بە هەمان شێوە لە کۆتایی نیگارەکەمدا نائومێد دەبووم، نەك لەبەر ئەوەی ئەو دیمەنەی هەڵمبژاربوو بە ویستی خۆم نەبوو. ئیتر نەمدەتوانی ببمە ئۆتریلۆ، بەڵکو وەك کەسێك بووم کە هەوڵی دەدا وەك ئۆتریلۆ نیگار بکێشێت.



نەمدەتوانی لەو ماتمینییە خۆم ڕزگار بکەم، کە وەك بۆیەی ڕەنگ پەرشوبڵاو دەبوویەوە. ڕاستییەکە ئەوە بوو کە من تەنها کاتێك دەمتوانی وێنە بکێشم، کە ببمە کەسێکی تر. (بەبێ ئەوەی دانی پێدا بنێم) هەوڵم دەدا لاسایی شێواز و بینینی بێهاوتای شێوەکارەکان بکەمەوە، لەبەر ئەوەی بیرم دەکردەوە ئەگەر ببمە کەسێکی تر، ئەوا منیش وەك ئەوان شێواز و ناسنامەی تایبەت بە خۆم دەبێت. لە ساڵانی دواتر، ئەم دژبەخۆبوونەوەم _کە ڕۆژئاواییەکان لە ڕەوانبێژیدا پێی دەڵێن پارادۆکس_ بێزاری دەکردم، چونکە تەنها لە ڕێگەی لاساییکردنەوەی کەسانی ترەوە، دەتوانین کەسایەتیی تایبەت بە خۆمان دروست بکەین، هۆکاری ئەم نیگەرانیەشم، بۆ ئەوەی لەژێر کاریگەریی شێوەکارێکی تردا بم، ڕوون بوو. چونکە ئەو کاتە من هێشتا منداڵ بووم، ئامانجم لە نیگارکێشان تەنها بۆ دڵخۆشکردنی خۆم بوو. هۆکارێکی تر کە کاریگەریی هەبوو لەسەرم، خودی ئەستەنبوڵ، ئەو وێنانەی شارەکە کە کێشابوونم لەگەڵ ئەوانەش کە گرتبوونم، هەموویان زیاتر لە هەر شێوەکارێك، کاریگەرییان هەبوو لەسەرم.

لە ماوەی ئەو ڕۆژانەی کە وێنەکێشان تەنیا ڕێگایەك بوو بۆ ئەوەی لە بێزاری و ناخۆشی هەڵبێم، زۆر جار دەرگای ژوورەکەم دەکرایەوە و باوکم دەهاتە ژوورەوە،

ئەگەر بیزانیایە خەریکی داهێنانەکەمم، هەر بە جۆرێك ڕێزەوە سەیری دەکردم، هەروەك ئەو کاتانەی کە دەهاتە ژوورەکەم و دەیبینی وەك منداڵێك یاری بە چووکم دەکەم، بەبێ ئەوەی هیچ مەبەستی کەمکردنەوەی من بوو‌بێت، پرسیاری دەکرد: "ئۆتریلو، ئەمڕۆ چی دەکەیت؟" قسە گاڵتەجاڕییەکەی، بیری دەخستمەوە کە من هێشتا زۆر منداڵم، هەتاوەکو لاسایی کەسێکی تر بکەمەوە. ئەو کاتەی تەمەنم شازدە ساڵان بوو، دایکم دەیزانی چەندە دڵگەرمم بۆ وێنەکێشان، پێشنیاری بۆ کردم بڕۆم و باڵەخانە کۆنەکەمان لە جیهانگیر وەك شوێنێك بە کۆکردنەوەی وێنەکانم بەکار بهێنم، لەو باڵەخانەیەی کە ڕۆژێك لەوێ ژیابووم، لەو شوێنەی دایکم و داپیرەم وەك (ستۆدیۆیەك)، هەموو کەلوپەلە کۆنەکانیان تێدا دانابوو. ئەو کاتەی لە قوتابخانەی ئامادەیی ڕۆبێرتی ئەکادیمی بووم، دوانیوەڕوان لەپاش قوتابخانە دەڕۆیشتم بۆ ئەم باڵەخانە سارد و بێدەنگە، هەر کە دەگەیشتم، ئاگردانەکەم دادەگیرساند و خۆم گەرم دەکردەوە، دواتر یەك یان دووان لەو وێنانەم دەردەهێنان کە پێشتر گرتبوونم، ئینجا دوو وێنەی گەورەم دەکێشا و بەهیلاکەییەوە و بە خەمێکی سەیرەوە دەگەڕامەوە ماڵەوە.



## ٢٩

# نیگارکێشان و خۆشییە خێزانییەکان

هەر کاتێك دەگەیشتمە باڵەخانەکەی جیهانگیر، هەروەك ئەوەی دایکم پێشنیاری بۆ کردبووم، وەك ستۆدیۆیەك بەکارم دەهێنا، دەستم دەکرد بە فووکردن هەتا ئاگردانەکەم دادەگیرساند. (کاتێك تەمەنم یازدە ساڵان بوو، لەگەڵ خێزانەکەم لە هەمان باڵەخانە دەژیام، خولیایەکی زۆرم هەبوو ئاگر بکەمەوە لە هەر شوێنێك و هەر کاتێکدا بووایە، بەڵام ئەم جارە کە گەڕامەوە بۆ ئەم ماڵە، بۆم دەرکەوت خواست و چێژوەرگرتنی ئاگرکردنەوەم نەماوە و دەمێکە ئەو خولیایە جێی هێشتووم.) هەر کە ماڵەکە ئەوەندە گەرم دەبوو کە بتوانم کار بکەم، دەستم بە دەسکاریکردنی وێنە دووکەلاوییەکان دەکرد _ئەم کردارەش زیاتر لە هەر شتێك منی وەك کەسێك دەناساند، کە چەندین جارە وێنەی کێشاوە. ئەمەش بارودۆخێکی ناخۆش بوو بۆ من، هەڵهاتن بۆ ئەو شوێنە بە مەبەستی وێنەکێشان، دواتریش نەتوانیت ڕاستەوخۆ پیشانی هیچ کەسێکی تری بدەیت، زۆر جار لەوانە بوو بتوانم لەپاش ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ لە تەواوبوونی، ئینجا پیشانی خەڵکی تری بدەم. باڵەخانەکەم کردبوویە گەلەری _وێنەکان لەسەر هەموو دیوارەکان هەڵواسرابوون_ بەڵام هیچ کەس، نە دایکم نە باوکم، هەرگیز بۆ سەیرکردنیان نەدەهاتن. لەو شوێنە نەك تەنها پێویستم بەوە بوو کە نیگارەکانم ببینرێن، بەڵکو پێویستم بە ئامادەبوونی هەموو ئەو کەسانە بوو لە دەوروبەرم بن، هەتا نیگارەکانم هەڵبسەنگێنن. مانەوە و وێنەکێشانی ئەستەنبوڵ لە باڵەخانەکی خەمۆك کە پڕ بێت لە کەلوپەلی سارد، کۆن، بۆگەن و تۆزاوی، منیشی خەمۆك و پەست دەکرد.

زۆر بەوریاییەوە دەستکاری ئەو وێنانەم دەکرد کە لە تەمەنی شازدە بۆ حەڤدە ساڵی لە ماڵەوە کێشابوونم (ئێستا هیچکامیان نەماون) و خۆشحاڵی خێزانییان پێوە دیار بوو. ئەو نیگارانە زۆر واتادار بوون بۆ من _لەپاڵ هەریەکەیاندا، وێنەیەکی خێزانەکەم هەبوو کە لەلایەن وێنەگرێکی پرۆفیشناڵەوە گیراون. کاتێک تەمەنم حەوت ساڵان بوو، هات بۆ ماڵەمان و ئەو وێنانەی گرت _چونکە زۆر بەقورسی دەمتوانی بەردەوام بم لە سەرکێشانی وێنەی (خێزانی دڵخۆش). لەو کاتانەی وێنەی دیمەنەکانی ئەستەنبوڵ و کۆڵانە هەژارەکانی ئەستەنبوڵم نەدەکێشا، دەستم بە کێشانی وێنەی خێزانەکەم دەکرد. لەو کاتانەی کە هەموو خێزانەکەم لە دەوروبەرم بوون و هەموو ئەو شتانەیان دەکرد کە هەموو ڕۆژێک دووبارەیان دەکردنەوە. کاتێک هەموو شتێک ئارام بوو _کاتێک کەس لە کەس تووڕە نەبوو، شریت یاخود ڕادیۆ داگیرسابوو، کاتێک خزمەتکارەکە دەهات و دەچوو و نانی نیوەڕۆی ئامادە دەکرد، کاتێک هەموو پێکەوە لە گەشتێک یان لەدەرەوە دانیشتبووین _ کێشانی وێنەی خێزانەکەم دەست پێ دەکرد.



باوکم زۆربەی کاتەکانی لە ماڵەوە بە پاڵکەوتن لەسەر قەنەفەیەکی ژووری دانیشتنەکە، یان بە سەرنجدانی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب (ئەو ڕۆمانانە نەبوون کە ڕۆژانی لاوێتی ئارەزووی لە خوێندنەوەیان بوو، بەڵکو زۆرتر ئەوانە بوون کە

لەبارەی پردەوە نووسرابوون)، یاخود بەبێدەنگی سەیرکردنی بنمیچی ژوورەکە، بەسەر دەبرد. هەر کاتێك کەیفی ساز بووایە، شریتێکی ئۆکێستراى پارچە میوزیکێکی پێدەکرد، کە زۆر جار سیمفۆنیای یەکەمی بەرهەم بوو، بە جۆرێك دەستەکانی دەهێنا و دەبرد وەك ئەوەی مایسترۆ بێت، بەلاَم بەلای منەوە بەو شێوەیە زۆر بێزارکەر دەردەکەوت. دایکم لەسەر کورسییەکی تەنیشت قەنەفەکەی باوکم دادەنیشت، رۆژنامە و گۆڤاری دەخوێندەوە یاخود سەرقاڵی چنین بوو، کاتێك چاوی هەڵدەبڕی و سەرنجێکی باوکمی دەدا، سەیرکردنەکەی خۆشەویستی و سۆزداریی پێوە دیار بوو.

ئەو کاتانەی گفتوگۆیان نەدەکرد، زۆرتر گونجاو بوو بۆ کێشانی هەر وردەکارییەك لە نیگارەکەدا. کاتێك دیمەنەکە یەکێك لەو پیشاندانە دەگمەنانەی تێدا دەردەکەوت، بەچپە و بە دەنگێکی کەمێك گاڵتەجارییەوە بە خۆمم دەگوت: "بەڵێ، من دەتوانم ئەو وێنەیە بکێشم"، وەك ئەوەی لەگەڵ جنۆکەیەك قسە بکەم کە لە ناخمدا نیشتەجێ بووبێت، ئینجا بەخێرایی رامدەکردە ژوورەکەم و کەلوپەلی وێنەکێشانەکەم دەهێنا _وەکو بۆیەی رەنگە ئاوییەکان و قەڵەمبۆیە وشکەکان کە ١٢٠ دانە بوون و لە شێوەی گیتار بوون، باوکم لە بەریتانیا بۆی کڕیبووم و چەند لاپەڕەیەکی توێژینەوە رەنگ کاڵ کە پوورم لە هەموو یادی لەدایکبوونێکمدا بەدیاری بۆی دەهێنام_ ئینجا دەگەڕامەوە ژووری دانیشتنەکە و مێزەکەم بە جۆرێك رێك دەخست، کە بتوانم هەردووکیان لە نیگارەکەدا دەربخەم.

بە درێژایی کارەکەم، نە دایکم نە باوکم قسەیان نەدەکرد، چونکە هەردووکیان کاردانەوەیان پیشان دەدا بۆ ئارەزووە کتوپڕییەکەم، بە جۆرێك بوون، وەك بڵێی خودا لەبەر من بەو جۆرە دایناببێتن. (سەرباری بایەخپێنەدانم، بەلاَم هێشتا باوەڕم وا بوو کە خودا لە کاتە پێویستەکاندا دێت بەهانامەوە.) یاخود دایکم و باوکم لەبەر ئەوەی قسەیان نەدەکرد پێکەوە، دڵخۆش دیاربوون. خێزان، بە تێڕوانینی من، جگە لە خواستەکانیان بۆ خۆشەویستی و هەستکردن بە ئارامی، هەموو رۆژێك بەهێمنی و بەبێدەنگی دانیشتن دەتوانن هەموو سەر شێتییەکانیان بشارنەوە و وا پیشان بدەن کە دڵخۆشن. بەو جۆرە دڵخۆش دەبوون، چونکە نەیاندەتوانی بیر لە هیچ شتێکی باشتر بکەنەوە بۆ ئەوەی بیکەن بۆ دڵخۆشییان. لە کۆتاییدا، لەپاش پیشاندانی چەند

دیمەنێکی دڵخۆشکەر، بەڵام نەیاندەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە بەردەوام بن و لایەنە شەیتانییەکەیان بشارنەوە، لەو کاتەی دایکم بەردەوام خەریکی چنین بوو، باوکم چاوی لەسەر کتێبەکە لا دەبرد، رووی دەکردە پەنجەرەکە و سەیری بۆسفۆری دەکرد، هەرچەندە دوور بوو، بەڵام هیچ لە جوانییەکەی نەدەگۆڕا، لەناو خەیاڵەکانیدا نقوم دەبوو. بێدەنگییەکی جادوویی، باڵی بەسەر ژوورەکەدا دەکێشا. باوکم و دایکم بەبێدەنگی دادەنیشتن و یەك وشەیان نەدەگوت، وەك ئەوەی هەمووان بەشداریی یەك جۆری خەم بن. لە ساڵانی حەفتاکان، کاتێك تەلەفزیۆنمان کڕی، وەك هەر کەسێکی تری شارەکە، هەموومان مەڕئاسا بەدەوریدا دادەنیشتین، لەو کاتەوە ئیتر ئەو بێدەنگییە جادووییە دروست نەبوویەوە، منیش ئارەزووی وێنەکێشانی خێزانەکەم نەما. لەبەر ئەوەی بە تێڕوانینی من، خۆشبەختی کاتێك دروست دەبێت کە ئەو کەسانەی منیان خۆش دەوێت، هەستە شەیتانییەکانیان بشارنەوە و منیش بەئازادی نواندن بکەم.

هەرچەندە بە جۆرێك وەستابوون، وەك ئەوەی بۆ وێنەگرتن وەستابن. هەندێك جار گفتوگۆیان دەکرد، بەڵام کاتێك دەیانبینی من بەپەلە هەوڵ دەدەم تابلۆی خێزانە خۆشبەختەکە بکێشم، تەنانەت ماسوولکەکانیشیان نەدەجوڵاند. جاروبار یەکێکیان تێبینییەکی لەسەر لاپەڕەکان دەگوت، لەپاش بێدەنگییەکی دووردرێژ، یەکێکی تریان روونکردنەوەی دەدا یاخود بە درێژایی کاتەکە هیچ قسەیەك نەدەکرا. هەندێك جار لەگەڵ دایکم گفتوگۆمان دەکرد، باوکیشم کە لەسەر قەنەفەکە ڕاکشابوو و هیچ بایەخێکی بە گفتوگۆکەمان نەدەدا، لەناکاو دەنگی بەرز دەکردەوە و پیشانی دەدا کە بەتەواوەتی گوێی بۆ قسەکانمان گرتووە. هەندێك جار ئەگەر یەکێکمان لە پەنجەرەی باڵەخانەکەمانەوە لە بەشیکتاش سیرنبی سەرنجی دەرەوەی بدایە بۆ ئەوەی سەیری کەشتییە ترسێنەرەکەی سۆڤیەت بکات کە بەناو بۆسفۆردا تێدەپەڕی، یاخود ئەگەر بەهار بووایە، سەیری پۆلی باڵندە لەقلەقەکانیان دەکرد کە لەسەر ڕێگاکەیان بوون بەرەو باکووری ئەفەریقیا، بە ڕستەیەك بێدەنگییە دووردرێژەکە دەشکا، "ئەوە لەقلەقەکانن!"، بەڵام ئەو بێدەنگییەم زۆر بەدڵ بوو، کە باڵی کێشابوو بەسەر ژوورەکەدا، کاتێك هەموومان لەناو دونیا بچووکەکەی خۆمان نقوم بووبووین، هەستم بە

ئارامی و خۆشحاڵییە کاتییەکەمان دەکرد. لە کۆتاییدا، کاتێك تابلۆکەم تەواو دەکرد، ئەگەر بە چاوی شێوەکارێکەوە سەیرم بکردایە، هەندێك ناتەواویم لە وردەکاریی جەستەی باوکم و دایکم دەدۆزییەوە. سەیری ڕووخساری دایکم دەکرد، بە چاویلکەکەی چاویەوە کەمێك شادومانی و هیوای پێوە دیار بوو. سەرنجی شلیلەکەی دەستیم دەدا کە پێچرابوو بە دەزووی چنینەکەوە، لەوێشەوە شۆڕ بوویەوە بۆ باوەشی، لەوێشەوە بۆ ناو ئەو کیسەیەی کلافەی شلیلەکەی تێدا بوو کە لەلای قاچییەوە دانرابوو. لەتەنیشت کیسە ئاوییەکەی شلیلەکەی دایکمەوە، کە لەناو خەیاڵەکانیدا ون بووبوو، نەعلەکانی قاچی دانرابوون، هەتا زیاتر لە جەستەیان وردتر دەبوومەوە، تەزوویەك دەهات بە جەستەمدا. شتێك لە قاچ، دەست و سەریاندا هەبوو کە بێگیان و بێهەست بوو، وەك ئەو گوڵدانانەی کە دایکم گوڵەمینای تێدا ناشتبوون، یان وەك ئەو مێزە بچووکەی لەتەنیشتیەوە بوو، یاخود وەك ئەو قاپانەی ئیزنیك لەسەر دیوارەکە هەڵیواسیبوون. هەرچەندە سەرکەوتوو بووبین لە پیشاندانی خێزانێکی بەختەوەر، بەڵام کاتێك هەریەکەمان لە سووچێکەوە دانیشتبووین، وەك ئەو کەلوپەلانە دەردەکەوتین کە داپیرەم لە ژووری مۆزەخانەکە دایانابوون.

لەو بێدەنگییە چێژم دەبینی، کە زۆر دەگمەن و بەبەها بوو لەلام، هەروەك گەمەی (قەشەکە ڕایکرد) یاخود یاریی لۆتۆ، کە سەری ساڵی تازە دەمانکرد. کاتێك کاغەزەکەم بەخێرایی پڕ دەکردەوە، خۆم وەك ماتێسی دەهاتە بەرچاو کە فڵچەکەی بەپەلە دەهێنا و دەبرد، بە خاڵ شێوەی پەردە و فەرشەکانم پڕ دەکردەوە، هەر بەو شێوە ئەرەبێسکەی کە بۆنارد بۆ ڕازاندنەوە بەکاری دەهێنا. کاتێك ئاسمانی دەرەوە بەرەو تاریکی دەچوو و گڵۆپە سێ قاچییەکەی تەنیشت باوکم ڕووناکتر دەردەکەوت. کە ئێوارە دادەهات، ڕەنگی ئاسمان و بۆسفۆر دەگۆڕا بۆ ئەرخەوانییەکی جوان و تۆخ، ڕووناکیی گڵۆپەکە دەگۆڕا بۆ ڕەنگی پرتەقاڵی. لە پەنجەرەوەکەوە چیتر بۆسفۆر، بەلەمەکان، ئەو کەشتییانەی لە بەشیکتاشەوە تێدەپەڕین و بەرەو ئۆسکودەر دەچوون، یان ئەو دووکەڵەی لە دووکەڵکێشی کەشتییەکانەوە دەهاتە دەرەوە، هیچ کامیان دیار نەدەمان، بەڵام لەجیاتی ئەوان، کەلوپەلەکانیماڵەوە ڕەنگیان دەدایەوە.

کاتێك ئێواران لەسەر شەقام پیاسەم دەکرد، یاخود لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، هێشتا هەروەك منداڵی، حەزم دەکرد بەناو هالەی ڕەنگ پرتەقاڵی گڵۆپی سەر شەقامەکان، سەیری خانووەکانی تر بکەم. ناوەناوە ئافرەتێکم دەبینی، کە بەتەنیا لەسەر کورسییەك دانیشتبوو و سەیری بەختی خۆی دەکرد، ڕوانینەکانی هەر بەو جۆرەی دایکم بوو، کاتێك ئێواران لەسەر کورسییەك دادەنیشت جگەرەی دەکێشا، بەئارامی یاریی کاغەزی یەك کەسی دەکرد و چاوەڕێی هاتنەوەی باوکمی دەکرد. هەندێك جار سەیری حەوشەی سادەی خانووەکانی ترم دەکرد، کە خێزانەکان لەژێر ڕووناکیی پرتەقاڵیی گڵۆپەکان نانی ئێوارەیان دەخوارد و قسەیان دەکرد، کاتێك بەو جۆرە لەدەرەوە دەمبینین، بەساویلکەیی بڕیارم دەدا کە دەبێت چەندە خێزانێکی خۆشبەخت بن. لە پەنجەرەکەوە، خێزانەکان خۆشبەخت دەردەکەوتن، بەڵام لە ئەستەنبوڵی سەدەی نۆزدەیەم، میوانەکان تەنها لە ژووری میوان دادەنران، لەبەر ئەوە بێگانەکان زۆر بەدەگمەن دەیانتوانی هەموو دیمەنەکانی خێزانی ئێرە ببینن.

## ٣٠

# ئەو دووکەڵەی لە کەشتییەکانی بۆسفۆڕەوە بەرز دەبوویەوە

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، داهێنانی کەشتیی هەڵمی شۆڕشێکی نوێی لە گەشتکردنی دەریایی بەرپا کرد، ئەورووپای نزیکتر کردەوە و ڕێگای گەشتەکانی بۆ ئەستەنبوڵ کورتتر کردەوە. لە سەردەمێکدا، ئەوانەی دەربارەی ئەستەنبوڵ بیرۆکەکانیان دەنووسی، زۆربەی بیرۆکەکان دەستنوونی نووسەرە ناوخۆییەکان بوون، بەڵام گەیشتنی کەشتیی هەڵمی، ڕووخسارێکی تری بەخشییە شارەکە. لە سەدەکانی پێشوو کۆمپانیایەك هەبوو لە ئەستەنبوڵ، سەرەتا لەژێر ناوی شیرکەت هایریر بازرگانیی دەکرد، دواتر پێی دەگوترا شەهیر هاتلەری (هێڵەکانی شار)، لە هەموو گوندێکی بۆسفۆر مەیدانی تایبەت بە خۆی بۆ لەنگەرگرتنی کەشتییەکانی، کاتێك کەشتیيە هەڵمییەکانیان کەوتنە کار، شارەکە ڕووخسارێکی ئەورووپیی وەرگرت. (لەبیرمان نەچێت، کەشتییە هەڵمییەکان بوونە بەشێکی گرنگی ژیانی ڕۆژانەی شارەکە.) گۆڕانکارییەکی زۆر دروست بوو، مەیدانەکانی کەشتیی بۆسفۆر و



کەنداوی زێڕین قەرەباڵغتر بوون، گوندەکان گەشەیان کرد و بوونە بەشێکی شارەکە. (هەتا کەشتییەکان نەبوون، زۆر بەقورسی هەر کەسێك دەیتوانی بگاتە ئەو گوندانە.)

کاتێك کەشتییەکان سەرنشینەکانیان لەمسەر بۆ ئەوسەری بۆسفۆر دەگواستەوە، ئەوانیش هەروەك ئەستەنبوڵییەکان، ئاشنای هەندێك شوێنی وەکو کیزکولسی، ئەیاسۆفیا، ڕوملیحیسار و پردی گالەتە دەبوون. لەو کاتەی کەشتییەکان بوونە بەشێکی گرنگی ژیانی ڕۆژانە، زیاتر پیرۆزتر و گرنگتر سەیر دەکران. هەروەك ئەوانەی کە دەگەیشتنە بەندەری ڤینیسیا، شانازییان بە شێوە و مۆدێلی جیاوازیان دەکرد، بە هەمان شێوە ئەستەنبوڵییەکانیش ئەم هەستی شانازییەیان هەبوو کاتێك لەناو کەشتییەکانی هێڵەکانی شار بوون. چەندین کتێب لەبارەی ئەو کەشتییانەوە نووسراون و بە وێنە ڕوونکردنەوەیان بۆ بابەتەکە کردووە. جوتیەر گوتوویەتی کە لەسەر دیواری هەموو سەرتاشەکان، وێنەی یەکێك لەو کەشتییانە هەڵواسراوە. باوکم بەمنداڵی، هەریەکەیانی بە جۆرێك ناسیوەتەوە.



ئەگەر ناوی یەکێکیانی لەبیر نەبووبێت، ناوی هەموویانی وەك شیعر یەك لەدوای یەك گوتووە: پەنجا و سێ ئینشیرا، شەست و حەوت قەلەندەر، چل و حەوت تەرز نەڤین، چل و حەوت قەمەر...



کاتێك پرسیارم لە باوکم دەکرد چۆن جیاوازی بکەم لەنێوان ئەوانەیان کە زۆر لەیەك دەچن، کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەریەکیانی پێ دەگوتم _کاتێك لەگەڵ باوکم ئەم گفتوگۆیەمان دەکرد، لەسەر ڕێگاکەمان بووین بۆ بۆسفۆر، یان لە ژووری

دانیشتنەکەمان بووین لە بەشیکتاش _ یەکێکیان پشتی چەماوەیە، ئەو دانەیان بۆریی دووکەڵکێشەکەی زۆر گەورەیە، یەکێکیان لووتێکی چەماوەی هەیە، یان دواوەی خڕە یاخود لەناو شەپۆلەکاندا کەمێك بە لایەکدا لار دەبێتەوە، بەڵام من هەر نەمدەتوانی جیایان بکەمەوە جگە لە سێ دانەیان _دوانیان لە ئینگلاند دروست کرابوون، ئەوی تریان لە ئیتالیا لە ساڵی ١٩٥٢ دروست کرابوو، ساڵی لەدایکبوونم _ کۆتایی ناوەکانیان باخچە بوون، لەپاش ئەوەی شارەزای شکڵ و گەورەیی دووکەڵکێشەکانیان بووم، زانیم ناویان فەنەرباخچە، دوڵماباخچە و پادشاباخچە، کە ئەمەیان کەشتییە بەبەختەکەی من بوو، بوون.



گەورەترین دیاریی کەشتییە گەورەکان بۆ شوێنە بەرزەکانی شار، تەنها ئەو دووکەڵە بوو کە لە دووکەڵکێشەکانیانەوە بەرز دەبوویەوە. هەمیشە ئارەزووم دەکرد وێنەی دیمەنی هەوری ڕەشی دووکەڵاویی کەشتییەکان بکێشم، کە هەریەکەیان بەپێی شوێنی کەشتییەکە و شەپۆلەکانی بۆسفۆر و ڕەشەبا شکڵی دەگۆڕا. لەپاش ئەوەی وێنەکەم تەواو دەکرد، لە سووچی خوارەوەی لای ڕاستی کاغەزەکەوە وەکو واژوو، بە فڵچە کۆنەکەم وێنەی دووکەڵەکەم دەکێشا کە لە دووکەڵکێشێکەوە دەهاتە دەرەوە. کاتێك دووکەڵەکە ئەستوور دەبوو، دەبوویە هەورێکی ڕەش، بەتایبەت لەو کاتانە کە کەشتییەکان لەنزیك پردی گالەتا کۆ دەبوونەوە و دووکەڵەکەیان ئەوەندە زۆر بوو، وەك ئەوەی جیهان بە ڕووپۆشێکی تاریك داپۆشرابێت. کاتێك بە بەلەم گەشتم دەکرد یان لە

کەنارەکانی بۆسفۆر دەگەڕام، حەزم دەکرد بەژێر دووکەڵی ئەو کەشتییانەدا بڕۆم کە دەمێك بوو دوور کەوتبوونەوە. ئەگەر بایەك هەڵیبکردایە، ملیۆنەها گەردیلەی ورد و ڕەش وەك تۆڕی جاڵجاڵۆکە دەکەوتنە سەر ڕووخسارت.






زۆر جار لەپاش ئەوەی وێنەکەم بەرەو تەواوبوون دەچوو و بەشی سەرەوەی وێنەکەم بە دووکەڵ دادەپۆشی (زۆر جار دووکەڵێکی زۆرم دەکێشا و وێنەکەم تێك دەدا)، بیرم دەکردەوە کە لەپڕ گێژەڵۆکێك هەڵدەکات و دووکەڵەکە بڵاو دەکاتەوە، لەبەر ئەوە وێنەکەم دەخستە لاوە وەك ئەوەی بمەوێت جارێکی تر کاری لەسەر بکەم. بەڵام کاتێك دەمویست دەست لە فڵچەکەم هەڵبگرم و لە کۆتا بەشی وێنەکەمدا بووم، لەبیرم دەچوویەوە کە ئەو دووکەڵەی بە چاوی خۆم بینیبووم و شێوەی ڕاستەقینەی چۆن بوو.

کاتێك شنەبا بووایە، دووکەڵی کەشتییەکە بە شێوەیەکی ستوونی بە گۆشەی ٤٥ پلە بەرز دەبوویەوە و بە جۆرێکی هاوتەریبی لەپشتەوەی کەشتییەکە دەڕۆیشت، بەبێ ئەوەی شێوەکەی بگۆڕێت، وەك ئەوەی کەسێك هێڵێکی لە ئاسماندا کێشابێت، بۆ ئەوەی ئاڕاستەی ڕۆیشتنی کەشتییەکە دەربخات. ئەو چینە تەنکەی دووکەڵ کە لە دووکەڵکێشی کەشتییەکانی بەندەرەکەوە دەهات، ئەو دووکەڵەی بیر دەخستمەوە کە لە دووکەڵکێشی خانوچکەی کۆڵانە هەژارەکانەوە دەهاتە دەرەوە. ئەگەر ڕەشەبا بووایە، دووکەڵەکە وەك نووسینی عەرەبی بە ئاسماندا پەرشوبڵاو دەبوویەوە. کاتێك وێنەی بۆسفۆرم لەگەڵ کەشتییەکانی کۆمپانیای هێڵەکانی شار دەکێشا، دەمویست لە ڕێگەی دووکەڵەکەوە، ماتەمینیی دیمەنەکە بگوازمەوە. ئەو ڕۆژانەی ڕەشەبا نەبووایە، کاتێك دووکەڵەکە بە خەستی و لوولدراوی لە دووکەڵکێشەکانەوە دەهاتە دەرەوە و لە ئاسماندا ون دەبوو، ئەو خەمۆکییە نکوڵیی لێ ناکرێت کاتێك کەشتییەکە لە کەنارێکەوە دەچوو بۆ کەنارێکی تر و لەدوای خۆیەوە جێی دەهێشت. کاتێك دەمبینی دووکەڵە چڕ و ئاسۆییەکە لەگەڵ هەورەتریشقە تێکەڵ دەبوو، شادومان دەبووم و دیمەنەکە وەك نیگارەکانی شێوەکار تێرنەر دەردەکەوت. کاتێك وێنەی کەشتییەك یان زیاترم تەواو دەکرد و وێنەی دووکەڵەکەم دەکێشا، بەڵام هەمان ئەو دووکەڵە نەبوو کە لە خودی کەشتییەکانەوە دەهاتە دەرەوە، بەڵکو ئەو دووکەڵە بوو کە لە نیگارەکانی مۆنێت، سیسیلی و پیسارۆ هەبوو کە لە مزرمدا هێشتبوومەوە _وەك ئەو هەورە شینباوانەی کە مۆنێت کێشابووی، یان ئەو هەورەی شێوە کەوچك ئایسکرێمی کە شێوەکار دەفی وێنەی کێشابوو.



لە دێڕەکانی سەرەتای کتێبی (*پەروەردەی بەسۆز*)، فلاوبێر وەسفێکی جوانی ئەو دووکەڵەی کردووە کە شێوەکەی دەگۆڕێت، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە وا دەکات ئەم نووسەرەم خۆش بووێت (بەدڵنیاییەوە هۆکاری تر هەیە). بە بەکارهێنانی ئەم بابەتە وەك پردێك بۆ باسێکی تر، دەمەوێت بڕۆم بۆ باسی ئاوازێکی تر کە لە موزیکی کۆنی عوسمانی بە (ئارا تاقسیم) ناسراوە. وشەی تاقسیم بە مانای دابەشکردن، کۆکردنەوە یاخود بەندەری ئاو دێت. ئەو مەیدانە گەورەیەی کە لەوێدا نێرڤاڵ، فرۆشیار و گۆڕستانی بینیوە (هەروەها ناوەندی دابەشکردنی ئاو بووە)، کە ئێستا ئەستەنبوڵییەکان پێی دەڵێن تاقسیم، هێشتاش هەر بەو ناوەوە ناسراوە، ئەو شێوێنەی من هەموو ژیانم لە دەوروبەری بەسەر بردووە. بەڵام ئەو کاتەی فلاوبێرت و نێرڤاڵ پێیدا تێپەڕیون، بە تاقسیم نەناسراوە.

## ٣١

# فلاوبێر لە ئەستەنبوڵ:
# ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، نەخۆشیی فەرەنگی

لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٨٥٠، حەوت ساڵ لە اش گەشتەکەی نیرڤاڵ بۆ ئەستەنبوڵ، گۆستاڤ فلاوبێر لەگەڵ هاوڕێکەی ماکسیم دو کامپ گەیشتنە ئەستەنبوڵ. فلاوبێرت، نووسەر و وێنەگر بووە و لە بەیروت تووشی نەخۆشیی فەرەنگی بووە. ماوەی پێنج هەفتە لێرە ماوەتەوە، هەرچەندە لە نامەیەکدا بۆ لویس بۆیلیت گوتوویەتی: "هەموو کەسێك پێویستە لانی کەم، ماوەی شەش مانگ لە ئەستەنبوڵ بمێنێتەوە." پێویستە تێڕوانینەکەی زۆر بەهەند وەرنەگرین، چونکە فلاوبێر کەسێك بووە بیری ئەو شتانەی کردووە کە لەدوای خۆی جێی هێشتوون. لە کتێبەکەیدا، (قونستەنتینیە)، لەبارەی هەموو ئەو شتانەوە دواوە کە لە ماوەی گەشتەکەیدا زۆر تاسەیانی کردووە، ئەوانیش ماڵەکەی بووە لە ڕۆین، خوێندنەکەی و دایکی ئازیزی بووە، کە دوای جیابوونەوەی زۆر گریاوە و ئاواتی خواستووە بە زووترین کات بگەڕێتەوە نیشتمانەکەی خۆی.

فلاوبێر لە ڕێگەی قاهیرە، قودس و لوبنانەوە هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ. هەروەك نیرڤاڵ ماندوو بووە لە بینینی هەندێك شتی نامۆی ترسێنەر و قورسی ڕۆژهەڵات کە لەم شوێنانەدا ئاشنایان بووبوو. ئەو شتانەی خەیاڵی بۆ دەکردن، لە ئەستەنبوڵ بوونە ڕاستی، بەڵام بە شێوەیەکی ڕۆژهەڵاتی، لەبەر ئەوە کەمێك سەرسامی ئەستەنبوڵ بوو. (پێش ئەوەی بێتە ئەستەنبوڵ، پلانی وا بووە سێ مانگ بمێنێتەوە.) لە ڕاستیدا

ئەستەنبوڵ ئەو ڕۆژهەڵاتە نەبووە، کە ئەو چاوەڕێی کردووە. لە نامەیەکی تریدا بۆ لویس بۆیلێت، باسی لۆرد بایرۆنی کردووە کە گەشتی کردووە بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ. ئەو ڕۆژهەڵاتەی کە خەیاڵەکانی بایرۆنی گرتبوو "تورکیای شێوە ڕۆژهەلات، ڕۆژهەڵاتی شمشێرە چەماوەکان و ئەو پەنجەرانە بووە کە دەروازەی ئاسمینیان بۆ کرابوو و ڕوو لە دەریای شین بوون"، بەڵام فلاوبێر "ڕەنگی گەرمی دەشتەکی و بیابان، ڕەنگی سووری تۆخی ئەفەریقا، تیمساح، حوشتر و زەڕافەی لا پەسەند بووە."

لەناو ئەو شوێنانەدا کە کاریگەریی گەورەیان هەبووە لەسەر خەیاڵەکانی نووسەرە بیست و نۆ ساڵەکە، وڵاتی میسر بووە، هەتا پاشماوەی تەمەنی، ئەو کاریگەرییە هەر بەردەوام بووە. لە نامەیەکی تریدا بۆ بۆیلێت و دایکی، ڕوونی کردووەتەوە کە ئێستا هەموو بیروهۆشێکی لەسەر داهاتوویەتی لەگەڵ کتیبێك کە ئاواتی خواستووە بینووسێت. (لەناو یەکێك لە کتێبە ئەندێشەکانیدا، ڕۆمانێکی نووسیوە بە ناوی (هارل بەگ) کە کەسێکی شارستانی ڕۆژئاوا لەگەڵ کەسێکی ناشارستانی ڕۆژهەلات، هەموو شتێکیان لەیەك دەچێت تا لە کۆتاییدا شوێنەکانیان دەگۆڕنەوە.) لە نامەیەکی تریدا بۆ دایکی، هەموو ئەو لایەنانەی وەکو ڕەتکردنەوەی هەر شتێك جگە لە هونەر، ڕیسواکردن و ڕەخنەگرتنی ژیانی بۆرجوازی، هاوسەرگیری و دابینکردنی ژیان لە ڕێگەی بازرگانییەوە، پیشان داوە کە کاریگەرییان هەبووە لەسەر نووسینەکانی دواتری فلاوبێرت. سەدان ساڵ پێش لەدایکبوونی من، کاتێك نووسەر لەو کۆڵانانەدا گەڕاوە کە من هەموو ژیانم تێدا بەسەر بردووە، بیرۆکەی نووسینێکی بۆ هاتووە کە دواتر بوویە یەکێك لە بنچینە سەرەکییەکانی ئەدەبی نوێ: "من هیچ گرنگی نادەم بەم جیهانە، بە داهاتوو، بە قسەی خەڵك، جۆری دامەزراندن یاخود ناوبانگی ئەدەبی، کە لە ڕابردوودا چەندین شەو خەونم پێوە بینیون. من بەم جۆرەم، ئەمە کەسایەتیی منە." (نامەیەك لە فلاوبێرت بۆ دایکی لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٨٥٠، ئەستەنبوڵ.)

بۆچی هەموو گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان لێکچوون لەنێوان بیرۆکەکانیاندا هەبووە، لە کاتی گەشتەکەیان بۆ شارەکە چییان کردووە، یان چی شتێکیان بۆ دایکیان نووسیوە؟ چەندین جار منیش هەمان هەستی ئەوانم هەبووە و خۆم وەك ئەوان لێ کردووە (وەکو نێرڤاڵ، فلاوبێر و دی ئامیسیم) _هەروەك چەندین جار خۆم وەك ئۆتریلۆ لێ کردووە،

بۆ ئەوەی وێنەی ئەستەنبوڵ بکێشم_ بە هۆی ئەو کاریگەرییەی هەیانبووە لەسەرم، بە جۆرێك هەندێك جار ناسنامەی خۆمم لەبیر چووەتەوە. زیاتر لەبەر ئەوەش بووە کە نووسەرێکی کەمی ناوخۆی شارەکە هەن، کە بایەخ بە ئەستەنبوڵ بدەن.

هەر چۆنێك ناوی بنێین _هەست و بیروڕای هەڵە، خەیاڵ و بیرکردنەوەی کۆن_ لە مێشکی هەریەکەماندا دەقێکی تا ڕادەیەك نهێنی و نیوە نوسراو هەیە کە دەریدەخات لە ژیانماندا چیمان کردووە و چیمان دەوێت. هەریەکەمان لە ئەستەنبوڵ، بەشێکی گەورەی ئەم دەقەمان تەرخان کردووە بۆ سەرنج و تێڕوانینی ڕۆژئاوایەك کە کاریگەریی هەبووە لەسەرمان. بۆ کەسانی وەك من کە لەگەڵ ئەستەنبوڵییەك هەمان کلتوورمان هەیە، زۆر جار (گەشتیاری ڕۆژئاوا) ڕاستەقینە نین: لەوانەیە دروستکراوی خۆمان بن، لەوانەیە خەیاڵ یان ڕەنگدانەوەی خۆمان بن. بەڵام کاتێك نەتوانین بەتەنها پشت بە کلتووری خۆمان ببەستین بۆ نووسینی ئەو دەقە، دەبێت سوپاسگوزاری ئەو بیانییانە بین کە چاپێکی تەواوکراومان _دەقێکی نووسین بێت، وێنە بێت، یان فیلم_ پێشکەش دەکەن، لەبەر ئەوە هەر کاتێك هەست بە نەبوونی چاوی ڕۆژئاواییەك بکەم، خۆم دەبم بە ڕۆژئاوایی بەسەرخۆمەوە.



ئەستەنبوڵ هەرگیز نەبووەتە ژێردەستەی ئەو ڕۆژئاواییانە کە دەربارەیان نووسیوە، یاخود وێنەیان کێشاوە، یان فیلمیان لەبارەوە کردووە. لەبەر ئەوە کاتێك دەبینم ڕۆژئاواییەك باسی ڕابردوو و مێژوومان دەکات، زۆر تووڕە نابم. لە ڕاستیدا خەونەکانیان کە نامۆ و سەرنجڕاکێش بوون بەلامانەوە _هەروەك چۆن خەونەکانی ئێمەش بە هەمان شێوە بوون بەلایانەوە_ تەنها بۆ خۆشی و چێژلێبینین سەیرم نەکردوون، یاخود تەنها سەیری شارەکەم بکەم لە چاوی ئەوانەوە، بەڵکو ویستوومە سەیری هەموو ئەو جیهانە بکەم کە ئەوان بیرۆکەیان لێوە وەرگرتووە. بەتایبەت کاتێك

تەماشای نووسینەکانی گەشتیارەکانی سەدەی نۆزدەیەم دەکەم، هەست دەکەم کە ئەو شارەی (من) کە ئەوان باسیان کردووە، هەمان شارەکەی من نییە. کاتێك بەوردی سەیری بینا بەرزەکان و گۆشە ناسراوەکانی شار _لە گالەتاوە و جیهانگیر، ئەو شوێنەی ئێستا ئەم دێڕانە دەنووسم_ دەکەم، هەمان هەستم هەیە کاتێك شارەکە و وێنەکانی لە چاوی ئەو ڕۆژئاواییانەوە سەیر دەکەم کە لەپێش منەوە شارەکەیان بینیوە. لەم کاتەدا، تەنها پێویستە ڕووبەڕووی ئەم دوودڵییە ببمەوە کە دەربارەی شارەکە هەمە. زۆر جار وا هەست دەکەم وەك ئەوەی بووبێتمە یەکێك لەو گەشتیارە ڕۆژئاواییانە کە دەستم گرتبێت بەسەر چرپرپیی ژیان، سەرنجدان، هەڵسەنگاندن، بڕیارەکانی و خەونەکانیدا، بۆ ئەوەی دەستبەجێ ببمە بکەر و بەرکاری تێڕوانینی ئەو. کاتێك بەرەو پێشەوە یان بەرەو دواوە دەچم، هەندێك جار لەناوەوە و هەندێك جار لەدەرەوە سەیری شارەکە دەکەم، کاتێك بە شەقامەکاندا پیاسە دەکەم و لەناو ئەو جۆرە خەیاڵانەدا ون دەبم، وا هەست دەکەم کە بەتەواوەتی خەڵکی ئەم شارە نەبم، بەتەواوەتی کەسێکی بێگانە بم. خەڵکی ئەستەنبوڵ لە ماوەی ١٥٠ ساڵی ڕابردوو، هەمان هەستیان هەبووە.

با ئەم باسەتان لە ڕێگەی نەخۆشییەکەی چووکی فلاوبێرەوە بۆ ڕوون بکەمەوە، کە لە کاتی مانەوەی لە ئەستەنبوڵ، زۆر پەرێشانی کردووە. لە دووەم ڕۆژی گەشتەکەی لە نامەیەکیدا بۆ بۆیلیت، نووسەرە پەرێشانەکە لەبارەی ئەو حەوت زامەی لەسەر چووکی دروست بوون، دواوە و گوتوویەتی کە لەپاش ئەوەی تووشی نەخۆشیی فەرەنگی هاتبوو لە بەیروت، ئێستا بوون بە یەك دانە. "هەموو شەو و ڕۆژێك تەداویی زامی چووکە کەساسەکەم دەکەم و دەیپەستم!" فلاوبێرت وا بیری کردووەتەوە کە نەخۆشییەکەی لە مارۆنی گرتبێت، یان لە ئافرەتێکی تورکەوە بۆی گواسترابێتەوە. نووسەر دەپرسێت: "تورکبوون یان کریستیان؟"، بە هەمان تۆنی گاڵتەجارییەوە بەردەوام بووە: "کێشە! خواردنی بیروهۆشە! ئەمەش پرسیارێکی ڕۆژهەڵاتییە، گۆڤاری (پێداچوونەوەی دوو وشە) خەون بە وەڵامەکەیەوە دەبینێت!" هەر لەو ماوەیەدا بۆ دایکی نووسیوە کە هاوسەرگیری ناکات، بەڵام ئەم بڕیارەی بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە نەبووە.



هەرچەندە ململانێی بووە لەگەڵ نەخۆشیی فەرەنگی، بە جۆرێك بووبووە هۆكاری هەڵوەرینی قژی. كاتێك گەڕاوەتەوە، دایكی نەیناسیوەتەوە. فلاوبێر دەیتوانی سەردانی خانەی سۆزانییەكان بكات، بەڵام جارێكیان وەرگێڕە ڕێنیشاندەرەكەی، كە هەموو جار گەشتیارەكانی بۆ هەمان شوێن بردووە، فلاوبێری بردووە بۆ یەكێك لەو خانانە لە گالەتا كە ژنەكانی (ناشیرین) و (چڵكن) بوون، فلاوبێر هیوای خواستووە بتوانێت دەستبەجێ شوێنەكە جێ بهێڵێت. خاتوونی خانەكە بۆ ئەوەی فلاوبێر هێمن بكاتەوە، كچە شازدە تا حەفدەساڵەكەی پێشكەشی فلاوبێر كردووە، كە بەلایەوە زۆر شۆخ بووە. بەڵام سەرەتا كچەكە ڕەتی كردووەتەوە كە لەگەڵی بێت، لەپاش ئەوە زۆری لێ كراوە بۆ ئەوەی ڕازی بێت _ئەوەیان بۆ خوێنەر جێ دێڵم كە چۆن توانیویانە ڕازی بكەن_ هەردووكیان بەتەنها ماونەتەوە، لەو كاتەدا كچەكە بە زمانی ئیتاڵی داوای لە فلاوبێر كردووە چووكی پیشان بدات هەتا دڵنیا بێتەوە كە نەخۆش نییە. "هێشتاش بە شێكی كەم لە هەڵئاوساوی لە بەشی سەرەوەی مابوو، ترس ئەوەم هەبوو ببینێت، لەبەر ئەوە وەك كەسێكی خانەدان هەڵسوكەوتم كرد، لەسەر جێگاكە بازم دایە خوارەوە و بە تووڕەییەوە گوتم كە تۆ دەتەوێت من ڕیسوا بكەیت و ئەم ڕەفتارەت یاخیبوونە لە پیاوێكی خانەدان، ئینجا شوێنەكەم جێ هێشت."

لە سەرەتای گەشتەكەیدا، كاتێك پزیشكێكی لە قاهیرە بینیوە كە بە ئاماژە فەرمانی بەسەر نەخۆشەكانیدا كردووە پانتۆڵەكانیان داكەنن و نەخۆشییەكەی پیشان بدەن، فلاوبێر بەسەرنجەوە تێبینیی لەسەر نووسیون. لە یاداشتنامەكەیدا باسی كردووە _كاتێك باسی شێوازی وەستان و جلوبەرگی كورتەباڵایەكی كردووە كە لە تۆپكاپی پالاس بینیویەتی_ كە نەریتێكی تری نامۆ و ناشیرینی ڕۆژهەڵاتی بینیوە. فلاوبێرت لەپاڵ خواستی بۆ بینینی دیمەنی جوانەكان و پشتگوێخراوەكانی ڕۆژهەڵات،

تاقیکردنەوەی نەخۆشییەکەی و ڕێنماییە پزیشکییەکان، لایەنێکی تری هۆکاری گەشتەکەی بووە. ئێدوارد سەید لە ڕۆژهەڵاتناسی باسی دیمەنی نەخۆشخانەکەی قاهیرە دەکات، کە لەلایەن نێرڤاڵ و فلاوبێرەوە باسی کراوە، بەڵام لە باسکردنی خانەی سۆزانیی ئەستەنبوڵ کە دراماکە لەوێ کۆتایی پێ هاتووە، شکستی هێناوە، ڕەنگە هۆکاری باسنەکردنەکەی بە هۆی ئەوە بووبێت کە ویستبێتی قەدەغەی بکات لە ئەستەنبوڵییەکان بە پاساوی هەستی نەتەوایەتی، کارەکانی بەکار بهێنن. لەوانەیە سەید ئەو بەشەی لا بردبێت، چونکە ئەستەنبوڵ هەرگیز نەبووەتە ژێردەستەی بیرۆکەی ڕۆژئاواییەکان. (هەرچەندە دواتر تورکە نەتەوەپەرستەکان پێیان وا بوو کە نەخۆشییەکە لە ئەمەریکاوە بۆ هەموو جیهان بڵاو بووەتەوە، بەڵام گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانی سەدەی نۆزدەیەم بە نەخۆشیەکەیان دەگوت (فەرەنگی) کە ڕەگی وشەکە فەرەنسییە، دەیانزانی کە فەرەنسییەکان نەخۆشییەکەیان گواستەوەتەوە بۆ شارستانیەتە جیاوازەکانی جیهان. پەنجا ساڵ لەپاش گەشتەکەی فلاوبێر بۆ ئەستەنبوڵ، شەمسەدین سامی کە ئەلبانی بوو، کە یەکەم فەرهەنگی زمانی تورکی دانا، نووسیویەتی: "وشەی (*فەرەنگی*) لە ئەورووپاوە وەرمان گرتووە." بەڵام فلاوبێر لە فەرهەنگەکەی، (*بیرۆکە پەسەندکراوەکان*)، هەمان سەرنجی پێشووی هەبووە کاتێك کە لە خۆی دەپرسی: "چۆن نەخۆشییەکەی گرتووە؟"، بەبێ ئەوەی خۆی ببەستێتەوە بە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاواوە، بەم جۆرە کۆتایی پێ هێناوە: "هەموو کەس کەم یان زۆر نەخۆشییەکە دەگرێت."



فلاوبێرت بەبێ هیچ دوودڵییەک، سەرنجەکانی خۆی لەبارەی شتە نامۆ، ترسێنەر و خراپەکان نووسیوە، لە نامەکانیدا بەدوورودرێژی دەربارەی (مەزارگەی زیناکەران) (ئەوانەی بە شەودا خزمەتی سەربازەکانیان کردووە)، لانەی خاڵیی لەقلەقەکان، سەرما، ڕەشەبای سیبریا کە لە دەریای ڕەشەوە هەڵیکردووە، هەروەها دەربارەی جەنجاڵییەکانی شارەکە نووسیویەتی. هەر وەکو گەشتیارەکانی تر، سەرسامی گۆڕستانەکان بووە: یەکەم کەس بووە کە تێبینیی کردووە کە بەردی گۆڕەکان، هەر وەکو یادگاریی کەسە مردووەکان، بەهێواشی لەناو زەویدا نقوم دەبن، دواتر هیچ شوێنەوارێکیان نامێنێت."



## ٣٢

# شەڕی نێوان من و برا گەورەکەم

لەنێوان تەمەنی شەش بە نۆ ساڵی، بەردەوام لەگەڵ برا گەورەکەم شەڕمان دەکرد. هەتا کات زیاتر دەچوویە پێشەوە، لێدانەکانی براکەم زیاتر و تیژڕۆتر دەبوون. تەنها هەژدە مانگ جیاوازی نێوان تەمەنمان بوو، بەڵام ئەو تا ڕادەیەکی زۆر لە من بەتواناتر بوو. لەبەر ئەوەی بەلای خەڵکەوە زۆر ئاسایی بوو ئەگەر کەسێك لەگەڵ براکەی شەڕ بکات (ئێستاش هەر وایە)، کەس بە پێویستی نەدەزانی لە شەڕکردن بمانوەستێنن. لێدانەکانم وەك شکستی کەسایەتی سەیر دەکردن و لەسەر لاوازی خۆم و کەموکورتیی پلەکەم، گلەییم لەوانی تر دەکرد. لە ساڵانی سەرەتا، کاتێك براکەم لێی دەدام، پێم وا بوو کە شایەنی ئەو لێدانەم. ئەگەر یەکێك لە شەڕەکانمان بە شکاندنی وشوشەی پەنجەرە یان هەر شتێکی تر کۆتایی پێ بهاتایە، ئەگەر من شوێنێکم بروشایە یان خوێنی لێ بهاتایە، لە کۆتاییدا دایکم دەهاتە قسە و تووڕە دەبوو، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی کە لەیەکمانداوە و ئازاری یەکمان داوە، بەڵکو تووڕەبونەکەی لەسەر ئەوە بوو کە ماڵەکەمان شپرزە کردووە، زەزەرمان داوە و بە دەنگەدەنگ ماڵە دراوسێکانمان بێزار کردون.

لە ساڵانی دواتر کاتێك باسی ئەم شەڕانەم دەکردەوە، دایکم و براکەم هیچ شتێکیان بەبیر خۆیان نەدەهێنایەوە، دەیانگوت کە من تەنها لەبەر ئەوەی شتێك بدۆزمەوە دەربارەی بنووسم و ڕابردووم ڕەنگاوڕەنگ و میلۆدراما دەربخەم، ئەم قسانە دەکەم. هەرچەندە هیچ کامیان ڕاستیان نەدەگوت، بەڵام لە کۆتاییدا زۆرم لە خۆم

دەکرد کە ڕازی بم بە قسەکانی ئەوان، وەك هەمیشە كۆتاییم پێ دەهێنا، بەو باوەڕەی کە من لە دونیای خەیاڵدا دەژیم. ڕەنگە هەر کەس ئەم لاپەڕانە بخوێنێتەوە، وا هەست بکات کە من زۆر زیادەڕۆییم کردووە لە باسەکاندا، بەڵام ئەوەی گرنگە بۆ نیگارکێشێك، بوونی ڕاستەقینەی شتەکان نییە، بەڵکو شێوەکەیانە. ئەوەی گرنگە بۆ ڕۆماننووسێك، بەدڵنیاییەوە خودی ڕووداوەکان نییە، بەڵکو شێوازی ڕێکخستنیانە، هەروەها ئەوەی گرنگە بۆ یادنامەنووسێك، ڕاستیی تەواوی یادەوەرییەکان نین، بەڵکو گونجاندن و هاوسەنگیکردنیانە.

کاتێك خوێنەر تێبینی دەکات کە چۆن من لە باسکردنی ئەستەنبوڵ، باسی خۆمم کردووە، لە باسکردنی خۆم، باسی ئەستەنبوڵم کردووە، تێدەگات کە من لە باسکردنی ئەو شەڕە بێبەزەییانەی منداڵی، مەبەستم ئامادەکردنی دیمەنەکەیە بۆ نمایشێکی تر. سەرباری هەموو شتێك، ئەوە ئارەزووی هەموو منداڵێکە کە بە شێوازێکی توندوتیژ خۆی پیشان بدات. چەند گەمەیەکمان دەکرد کە خۆمان دامانهێنابوون، لەگەڵ هەندێك گەمەی تری باو کە یاسای تایبەت بە خۆیان هەبوو. لە ماڵە سێبەر و تاریکەکەماندا چەند یارییەکمان دەکرد، وەکو چاوشارکێن، دەستەسڕگرتن، مارەکان، خەتخەتێن، کاپتنی دەریا، نقومبوونی ئەدمیراڵ، ناوی شارەکان، نۆبەرد، ترسێنەر، یاریی دامە، شەترەنج و تۆپی سەرمێز (لەسەر مێزێك تایبەت بە منداڵان دروست کرابوو، یان لەسەر مێزی نانخواردنەکە دەمانکرد)، لەگەڵ چەند یارییەکی تر. کاتێك کەس لە ماڵ نەبووایە، ڕۆژنامەیەکمان وەك تۆپ خڕ دەکرد و بەدەوری هەموو ماڵەکەدا یاریی دووگۆڵیمان دەکرد و ئارەقەیەکی زۆرمان دەکرد، بەڵام زۆر جار بە شەڕ کۆتایی دەهات.



لە هەموو تەمەنەکان، گەمەی (هەڵمات)مان کردووە کە لە تاکتیك و شێوازەکەی، لاسایی یاریی تۆپپێیمان دەکردەوە. پوولەکانی یاریی تاوڵەمان دەهێنان و وەکو پارێزەر لەسەر زەوییەکە داماندەنان، ئینجا بەپێی یاساکانی یاریی دووگۆڵی دەمانجوولاندن، لەسەر هەمان یاسای یاریی دووگۆڵی، بەرگری و هێرشکردنمان هەبوو. هەتا زیرەکتر دەربکەوتینایە، جۆشوخرۆشی یارییەکە گەرمتر دەبوو. هەردوو تیپەکەمان _کە هەڵمات یان دانەی تاوڵە بوون_ لەسەر فەرشەکە ڕێك دەخست، وامان دەردەخست کە مەیدانی یاریکردنەکەمانە، ئینجا ڕەچاوی ئەو یاسا و ڕێسایانەمان دەکرد کە لەدوای سەدان شەڕکەردا ڕێك کەوتبووین لەسەریان، دواتر دەمانهاویشتن بەرەو ئەو تەختەیەی کە باوکم لای دارتاش بۆی دروست کردبووین. هەندێك جار هەڵماتەکان، ناوی یاریزانە ناودارەکانی ئەو سەردەمەمان لێ دەنان. هەروەك ئەو کەسانەی کە هیچ کێشەکیان نەبوو لە جیاکردنەوەی پشیلە خەتخەتەکانیان، بە یەك سەرنج دەمانتوانی هەڵماتەکان لەیەك جیا بکەینەوە. وەك خالید کیڤانچ، ناودارترین لێدواندەری یاریی تۆپپێی ئەو ڕۆژانە بوو، لێدوانمان بۆ جەماوەرە خەیاڵییەکەمان دەدا، یان کاتێك گۆڵمان تۆمار دەکرد، بە دەنگی بەرز هاوارمان دەکرد: "گۆۆۆۆڵ"، هەر وەکو وەك ئەو کەسانەی یاریی ڕاستەقینە دەکەن، دواتر لاسایی دەنگدانەوەی ناو جەماوەرمان دەکرد و لێدوانمان لەسەر یارییەکە، یاریزانەکان، ڕاگەیاندن و هەواداران دەدا (بەڵام هەرگیز لەسەر ناوبژیوان تێبینیمان نەبوو). لە کۆتاییدا، لەبیرمان دەکرد ئەوە تەنها یارییەکە، دەبوویە بەرەنگارییەکی سەخت لەنێوانمان، زۆربەی کات لە یەکەم شەڕکردن، من شکستم دەهێنا.

شەڕەکان سەرەتا بە هۆی بەزاندن، گاڵتەکردن، فریودانی یەك، دروست دەبوون، بەڵام ململانێی نێوانمان زیاتر هۆکاری شەڕەکان بوون. مەبەستمان ئەوە نەبوو کە پیشانی بدەین کێ ڕاستە، بەڵکو دەمانویست پیشانی بدەین کێ بەهێزتر، زیرەکتر و شارەزاترە. ململانێکانی نێوانمان، پەرۆشیی هەردووکمانی دەردەخست بۆ فێربوونی یاساکانی یاری _یان بەناڕاستەوخۆیی یاساکانی جیهان_ دەمانویست لە ڕێگەی ئەو یاسایانەوە، هەڵمەت، گورجوگۆڵی و توانای زیرەکیمان دەربخەین. ئەم ململانێیانە،

سێیەری کلتوورەکەمان بوون، بۆ نموونە" کاتێك سەردانی هەر نهۆمێکمان دەکرد بە لێکدانەوەی وشە تانوپۆکان و لێکدانەوە بیرکارییەکان هەڕەشەیان لێ دەکردین و ململانێیان دەخستە نێوانمان. هەمان کلتوور، جیاوازیی بیروباوەڕ و بۆچوونێکی کەمێك گاڵتەجارانەی بۆ دروست کردبووین، بە هۆی ئەو جیاوازییانەی لەنێوان هەر نهۆمێکدا هەبوو _هەر نهۆمێك، ماندەری تیپێکی جیاواز لەوی تر بوو_ ئەو جیاوازییانەی لە کتێبەکانی قوتابخانە هەبوون کە زۆر زیادەڕەوییان تێدا بوو دەربارەی سەرکەوتنەکانی عوسمانی لەگەڵ ئەو کتێبانەی بەدیاری بۆمان هاتبوون، وەك (*ئەنسکلۆپیدیای دۆزینەوە و داهێنانەکان*).

دایکم ڕۆڵی خۆی هەبوو لە دروستکردنی ململانێکانی نێوانمان. بۆ ئەوەی ئەرکی ڕۆژانەی ئاسانتر بکات، هەموو شتێکی کردبوو بە پێشبڕکێی نێوانمان. "هەر کەسێك یەکەم جار بیجامەکانی لەبەر بکات و بچێتە جێگای خەوەوە، ماچێکی دەکەم."، یان " هەر کەسێك وەرزی زستان بەسەر بەرێت بەبێ ئەوەی نەخۆش بکەوێت و سەرمای ببێن، دیارییەکی بۆ دەکڕم."، یاخود "هەر کەسێك زووتر شیوەکەی بخوات بەبێ ئەوەی کراسەکەی پیس بکات، ئەوە زیاتر خۆشەویست دەبێت لەلای من." هەموو ئەمانە، ئەو دەربڕینە دایکانەیە بوون بۆ ئەوەی کوڕەکانی بکاتە دوو کەسی هەرەوەز و چاکەکار و بێدەنگ.



لەپشت شەڕە ناخۆشەکانمان لەگەڵ براکەم، ئیرادەیەکمان تێدا بوو بۆ دەرخستنی پاڵەوانێتییەکەمان، کە هەموویان بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن و گەیشتن بە لوتکە ئەنجام دەدران، هەرچەندە ئەنجامەکەیان بەناخۆشی تەواو دەبوو. لەبەر ئەوە _هەر وەکو ناو پۆل کە دەستمان هەڵدەبڕی بۆ ئەوەی بیسەلمێنین وەك گەمژەکانی تر نین_ من و براکەم یەکمان دەبەزاند، بۆ ئەوەی بەربەرەکانی ئەو ترسە بکەین کە لە تاریکترین سووچی دڵمان خۆی حەشار دابوو: ئەویش خەم و ناخۆشیی چارەنووسی شەرمەزارکەری ئەستەنبوڵ بوو. کاتێك ئەستەنبوڵییەکان تەمەنیان گەورەتر دەبێت و هەست دەکەن چارەنووسیان بەستراوەتەوە بە چارەنووسی شارەکەوە، دەرگا بۆ ئەو خەمە دەکەنەوە کە بەڕووخۆشی و بەسۆزەوە خۆی پیشان دەدا. تا لە کۆتاییدا لە چارەنووسی خۆیان تووڕە دەبن، کە بەو جۆرەیە.

براکەم لە قوتابخانە هەمیشە لە من باشتر بوو. ناونیشانی هەموو کەسێکی دەزانی، دەیتوانی ڕووخسارەکان، ژمارەتەلەفۆنەکان و هاوکێشە بیرکارییەکان لە بیرەوەریدا بهێڵێتەوە. (هەر کات پێکەوە دەچووینە دەرەوە، من هەموو کاتەکەم بە سەیرکردنی پەنجەرەی دوکانەکان و ئاسمان و هەر شتێکی تر بەسەر دەبرد کە خەیاڵەکانمی فراوان دەکرد، بەڵام ئەو سەیری ژمارەی شەقام و باڵەخانەکانی دەکرد.) حەزی لە ئەبەرکردنی یاساکانی یاریی دووگۆڵی، ئەنجامی یارییەکان، پایتەختی وڵاتان و ئاماری یارییەکان بوو، هەروەك چل ساڵ دواتریش حەزی لە دۆزینەوەی کەموکووڕی کەسە بەربەرەکانیکەرە ئەکادیمییەکانی بوو و هەموو ئەو هەڵە بچووکانەی دەدۆزییەوە، کە لە پێڕستی سەرچاوەکاندا دەیانکردن. بەشێکی گرنگی بایەخدانی من بە وێنەکێشان، بە هۆی بەسەربردنی کات بوو لەگەڵ فڵچە و کاغەزەکانم، بەڵام بە شێکی تریشی پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە براکەم هیچ ئارەزوویەکی لەو بوارە نەبوو.

لەپاش بەسەربردنی چەند کاتژمێرێك بە وێنەکێشانەوە، ئەگەر دڵخۆشیم بەدەست نەهێنایە لەناو ئەو ماڵە تاریکە کە داپۆشرابوو بە پەردە قورسەکان و کەلوپەلە زیادەکان، وەکو هەر ئەستەنبوڵییەك بەدوای ڕێگایەکی تردا دەگەڕام بۆ دڵخۆشبوون، ئەویش بە چوونە ناو ڕکابەرییەوە بوو لەگەڵ براکەم. هەرچییەك حەزمان لێ بووایە لەو

ساتەدا _ یاریی هەڵماتێن، شەترەنج، یان کێبڕکێی ژیری _ هەوڵمدەدا براکەم ڕازی بکەم، بۆ ئەوەی جارێکی تر یاریم لەگەڵ بکاتەوە.

سەری لەسەر کتێبەکەی هەڵدەبڕی و دەیگوت: "وا بزانم دیسانەوە دەتخورێ، ها؟" مەبەستی ئەو گەمەیە بوو کە دۆڕابووم و بە لێدان کۆتایی هاتبوو. ئاماژەی بە دۆڕانەکەی پێشووم دەکرد و دەیگوت: "جەنگاوەری بەزێنراو، هەرگیز هیلاك نابێت لە شەڕکردن! " ئینجا دەیگوت: "کاتژمێرێکی تر دەخوێنم، دواتر یاری دەکەین."، سەری دەخستەوە سەر کتێبەکەی.

مێزی خوێندنەوەی براکەم ڕێکوپێك و کۆکراوە بوو، بەپێچەوانەوە، ئەوەی من وەك ئەوەی زەمینلەرزە لێی دابێت، ئەوەها شپرزە بوو.

ئەگەر شەڕەکانی پێشووتر یارمەتیی دابێن بۆ ئەوەی ڕابەرایەتیی جیهانی خۆمان بکەین، شەڕەکانی دواتر نەگریستر و خراپتر بوون. ڕۆژێك هەردووکمان دوو برا بووین پێکەوە، لەژێر تەمبێکردنە بەردەوام و چاوە نیگەرانەکانی دایکێك گەورە دەبووین کە تێدەکۆشا بۆ ئەوەی هەموو ئەو بۆشاییانە پڕ بکاتەوە کە لەلایەن باوکمەوە بە هۆی نەهاتنەوەی بۆ ماڵەوە جێ هێڵرابوون و بەهیوای ئەوەی بە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانە ڕێگە بگرێت لە دزەکردنی ماتەمینیی شارەکە بۆ ناو ماڵەکەمان. بەڵام لەپاش ئەوەی بڕیار درابوو هەر کەسە و مێز و شوێنی جیاکراوەی تایبەت بە خۆی هەبێت، ئەم جارە دەستمان کردبوو بە نواندنی دوو کەسی زکورتی. دیسانەوە ئەو یاسا و ڕێککەوتنانە کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەنێوان خۆمان دامانابوون بۆ پاراستنی ئاشتیی نێوانمان _بەشێکی دۆلابەکە بۆ براکەم بوو و هەموو کتێبەکانی خۆی تێدا دانابوو، دەبووایە لەناو ئۆتۆمبێل من لەتەنیشت باوکمەوە دابنیشم_ یان کۆمەڵێك تیبینیی تر وەکو: "دەستیان لێ مەدە، ئەوانە هی منن!"، یاخود "وریا بە، ئەگینا پەشیمان دەبیەوە!"، دەبوونە هۆکاری مشتومڕ، دەستبادان، مستەکۆڵە لێدان و توندوتیژی. بۆ پارێزگاریکردن لە خۆم، جلهەڵواسە دارینەکە، مقاشەکە گەرمەکە، دەسکی گسکەکە، یان هەر شتێکی ترم وەك شمشێر، بەکارم دەهێنا.

لەوەوپێش، هەموو ئەو گەمانەمان دەکرد کە لە ژیانی ڕۆژانەمان چاوم پێیان کەوتبوو (وەکو یاریی تۆپیپی)، بە هەڵمات لاساییمان دەکردنەوە. ئەگەر ئامانجی

گەمەکە بەدەستهێنانی سەرکەوتن بووایە، ئەوا کۆتاییەکەیان دەبوویە شەڕ. بەڵام ئەوە تەنها یارییەك بوو، کاتێك گەورەتر دەبووین، جیاوازتر دەبوو، شەڕەکانمان بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی یاری نەبوو، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی خودی ژیان بوو. بەخۆشحاڵییەوە، هەریەکەمان خاڵی لاوازی ئەوی تری دەزانی، بە هۆیەوە یەکمان دەچەوساندەوە. سەرەڕای هەموو شتێك، چەلەحانێکانمان تەنها بە توندوتیژی و لێدان کۆتایی پێ نەدەهات، بەڵکو دەستمان کردبوو بە هەڕەشەکردن و پلاندانانی بێبەزەییانە دژی یەکتر.

جارێکیان ئازاری براکەم دا، ئەویش هەڕەشەی لێ کردم و گوتی: "با ئەمشەو دایکم و باوکم بڕۆن بۆ سینەما، زۆر بەخراپی دەتکوژم!" لەسەر نانخواردنی ژەمی ئێوارە، هەڕەشەکانیم بۆ دایکم و باوکم دووبارە کردەوە و لێیان پاڕامەوە کە نەچن بۆ سینەما، بەڵام ئەوان ڕۆیشتن و بە متمانەیەکی کوێرانەوە جێیان هێشتم، هەر وەکو هێزی ئاشتیپارێز کە وا بیر دەکاتەوە توانیویەتی ناکۆکیی نێوان لایەنە شەڕکەرەکانی چارەسەر کردووە.

هەندێك جار کاتێك بەتەنها دەبووین لەماڵەوە _شەڕێکی ئەوەندە قورسمان دەکرد، کە ئارەقەمان لێ دەچۆڕا_ لەناکاو زەنگی دەرگاکە لێ دەدەرا، هەروەك ژن و مێردێك بە هاتنی دراوسێکەیان، کۆتایی بە شەڕەکەیان دەهێنن، کۆتاییمان بە توندوتیژی دەهێنا و بەڕێزەوە دراوسێکەمان یاخود میوانەکەمان ڕەوانەی ژوورەوە دەکرد _"فەرموو، وەرە ژوورەوە،" ئینجا دەمانگوت: "فەرموو دانیشە."_ بە خۆشحاڵییەوە چاومان لەیەك دادەگرت و بۆ میوانەکەمان ڕوون دەکردەوە کە دایکمان بەزوویی دەگەڕێتەوە ماڵ. بەڵام دواتر، کاتێك میوانەکە دەڕۆیشتەوە و بەتەنیا دەبووینەوە، هەرگیز نەدەگەڕاینەوە دۆخەکەی پێشوو وا خۆمان دەنواند کە هیچ شتێك ڕووی نەداوە و دەگەڕاینەوە بۆ دۆخی دڵخۆشی و بێکاری. هەندێك جار کە براکەم بەقورسی لێی دەدام، لەسەر فەرشەکە ڕادەکشام، وەك منداڵ دەگریام و وا خەیاڵم دەکرد کە پرسەی براکەمە. هەندێك جار براکەم لەپاش ماوەیەك لە خوێندن، هەستی بە بەزەیی دەکرد، دەهات بەرزی دەکردمەوە و پێی دەگوتم کە بیجامەکانم لەبەر بکەم و بڕۆمە ناو جێگەی خەوەکەمەوە، ئینجا دەگەڕایەوە سەر کارەکەی، منیش بە جلەکانمەوە دەچوومە ناو جێگا و خۆم نەدەگۆڕی بۆ ئەوەی لە تاریکیی بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە بتلێمەوە.

ئەو ماتەمینییەی کە دەمخورا بۆی _دواتر باسی دەکەم_ کە دۆخێك بوو کە بەزاندن، کەمبوونەوە و شەرمەزاریی بیر دەخستمەوە و ماوەیەك دەیوەستاندم لە هەموو ئەو یاسانەی پێویست بوو ئەبەریان بکەم، هەموو ئەو کێشە بیرکارییانەی کە دەبوو ئەنجامەکەیان بدۆزمەوە، هەموو بەندەکانی پەیمانی کارلۆویتز کە دەبووایە ئەوانیش ئەبەربکەم. بۆ ئەوەی لێدان بخۆم و ریسوا بکرێم، پێویست بوو هەست بە سەربەخۆیی بکەم. هەندێك جار خۆم دەمویست لێم بدرێت، وەك براکەم ئاماژەی پێ کرد کە دەمخورێت بۆی، زۆر جار هەستی پێ دەکرد کە من بە هەموو هێزێکی خۆمەوە، دەمویست شەری لەگەڵ بکەم و لێدانی توند بخۆم.

لەپاش هەموو لێدانێك، هەستێکی ناخۆشم بۆ دروست دەبوو. کاتێك لەناو جێگەی خەوەکەم بوومایە خۆمم سەرزەنشت دەکرد بە هۆی نەشارەزایی، تاوانباری و تەمبەڵیی خۆمەوە. دەنگێگ لە ناخمدا لێی دەپرسیم: "چی رووی داوە؟"، وەڵامم دەدایەوە و دەمگوت: "زۆر خراپم." دەستبەجێ ئەو وەڵامە، ئازادییەکی سەیری پێ دەبەخشیم، دونیایەکی گەشاوە و نوێی بە روومدا دەکردەوە. بیرم دەکردەوە، ئەگەر ئەوەندە خراپم، دەتوانم ئەرکەکانی قوتابخانە لەبیر بکەم و دەست بکەم بە وێنەکێشانی هەر شوێنێك کە ئارەزووم لێی بێت، یان دەتوانم هەر بەو جلانەوە بخەوم. لە هەمان کاتدا هەستم بە ئاسوودەییەکی سەیر دەکرد لە دۆران، زیان، شینبوونەوەی قۆڵ و لاق، لێوی قڵیشاو و لووتی خوێناوی: کوتراوەکانی جەستەم دەیانسەلماند کە من ناتوانم شەرێکی تەواوەتی و باش بکەم، لەبەر ئەوە شایەنی دۆران و لێدانم. ئەم بیرکردنەوەیەوە، دەبووە هۆی دروستبوونی خەیاڵەکانی رۆژانەم کە وەك شنەبای هاوین هەڵیاندەکردە ناو بیروهۆشم، ئینجا دەستم دەکرد بە خەیاڵکردن کە لەوانەیە رۆژێك بتوانم کارێکی گەورە ئەنجام بدەم. ئەم خەیاڵانە کاریگەریی خۆیان هەبوو لەسەرم، کە هەموو توندوتیژی و برینداریيەکیان بەدرۆ دەخستەوە و جیهانێکی نوێ بە روومدا دەگەشایەوە، پەیمانی ژیانێکی نوێی پێ دەبەخشیم. ئەو کاتانەی هەستم دەکرد خەمباریی شارەکە لەگەڵ من جێگیر بووە، کاتێك قەڵەمم دەخستە سەر کاغەز، لەو کاتانەدا حەزم دەکرد ئەو شتە بکەم کە ئارەزووم دەکرد، جیهانم لەبیر دەکرد و یاریم بە خەمەکەم دەکرد، تاریکییەکە بەرەو کزبوون دەچوو.

## ٣٣

# بێگانەیەك لە قوتابخانەیەكی بێگانە

چوار ساڵم لە قوتابخانەی ئامادەیی ڕۆبێرتی ئەكادیمی، بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی بەسەر برد. لەو ماوەیەدا بوو كە تەمەنی منداڵیم بەرەو كۆتایی دەچوو و زانیم ئەم جیهانە زۆر بێزاركەر و ناخۆشە. هەموو تەمەنی منداڵیم لەناو خێزانێكی داخراو و نزیك لەیەك لە یەك ماڵدا، لە یەك كۆڵاندا و لە یەك شەقامدا بەسەر برد كە بۆ من ناوەندی جیهان بوو. كە چوومە قوتابخانەی ناوەندی، بیرۆكەكەم ڕەت كرایەوە و بۆم دەركەوت لە ڕاستیدا من لە ناوەندی جیهان ناژیم، ئەو شوێنەی لێی دەژیم _ كە زۆر ئازاربەخش بوو بۆم_ چرای ڕێنیشاندەری جیهان نییە. لەو كاتەوەی هەستم بە بچووكی شوێنەكەم كرد و لە هەمان كاتدا گەورەی جیهان، هەستم بە تەنیایی و لاوازیی خۆم دەكرد زیاتر لە هەر كاتێكی تر _لە قوتابخانەكە حەزم دەكرد لەناو ڕێگا پێچاوپێچ و دیوارە سەقف نزمەكانی بینای كتێبخانە خۆم ون بكەم، كە لەلایەن ئەمەریكییەكی سێكیولاری گاورەوە دروست كرابوو.

براكەم بەیەكجاری ئێرەی جێ هێشت. كاتێك تەمەنم شازدە ساڵان بوو، ئەو ڕۆشت بۆ ئەمەریكا بۆ ئەوەی لە زانكۆی یال بخوێنێت. هەرچەندە بەبەردەوامی پێكەوە شەڕمان دەكرد، بەڵام دوو هاوڕێی گیانیبەگیانی یەك بووین، گفتوگۆمان دەكرد لەسەر هەموو ئەو شتانەی كە لەدەورمان بوون و بیرۆكەی خۆمان دەدەبڕی لەسەریان. پەیوەندیم لەگەڵ ئەو زیاتر بوو، تەنانەت نزیكتر لە دایك و باوكم. دوور لە شەڕكردن و سەرزەنشتكردن و لێدانی یەكتر، براكەم زۆر كاریگەریی هەبوو لەسەر فراوانكردنی خەیاڵەكانم و دووركەوتنەوە لە بێكاری و تەمبەڵییەكەم، بەدەگمەن هۆكارێك هەبوو بۆ

ئەوەی گلەیی لێ بکەم. بەتایبەت ئەو کاتانەی کە دڵتەنگ بووم، زۆر تاسەی ئەوم دەکرد.

وا دیاربوو کرۆکی شتێك لە ناخمدا شکابێت، بەڵام بەتەواوەتی تێنەدەگەشتم دەبێت کرۆکی چی شتێك بێت، دەبێت ئەوەش هۆکارێك بووبێت بۆ ئەوەی کە بەتەواوەتی نەتوانم هۆگری وانەکان و ئەرکی ماڵەوە یان هەر شتێکی تر بم. هەندێك جار کە دەمزانی چیتر وەك جاران بە هەوڵدانێکی کەم نەمدەتوانی ببمە سەرۆکی پۆلەکە، دڵم دەشکا، وەك ئەوەی هێزی شادومانیم لەدەست دابێت. بەمنداڵی کاتێك هەستم دەکرد دڵخۆشم، ژیان وەك قوماشی قەیفە نەرم و وەك چیرۆکێکی ئەفسانەیی بەکەیف دەبوو بۆم. بە تێپەڕبوونی کات، کاتێك تەمەنم گەیشتە سیازدە بۆ چواردە ساڵی، خەیاڵی دڵخۆشیم بەرەو کۆتایی دەچوو. لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر، تێدەکۆشام باوەڕ بەم شکستانە بکەم و خۆم ئامادە بکەم بۆیان _هەر وەکو سەرەتای هەموو ساڵێکی دەستپێکی خوێندن کە بڕیارم دەدا یەکەمی پۆلەکەم بم، تەنها بۆ بەدەستهێنانی نمرە. هەندێك جار جیهان زۆر دوورەپەرێز دەردەکەوت، کاتێك پێست و هزر و ئاوەزم ئاگاداری ئەوە دەبوون، ئەم جۆرە هەستەم زیاتر دەبوو.

لەناو هەموو ئەو پەرێشانییەدا، چەندین فانتازیای وروووژێنەری بێکۆتایی هەبوون کە لە جیهانەکەی ترم کە هەمیشە لەوێ خۆم داڵدە دەدا و پەنام بۆ دەبرد، بۆم مابوونەوە. سێکسکردن بۆ من بەو جۆرە نەبوو کە لەگەڵ کەسێکی تر ئەنجامی بدەیت، بەڵکو خەونێك بوو کە خۆم دروستم دەکرد. وەك ئەو ئامێرەی ناو مێشکم وا بوو، کاتێك پیتەکاتی دەخوێندەوە، خۆی دەکەوتە کار لەو تەمەنەی کە تازە فێری خوێندنەوە دەبووم، ئێستا ئامێرێکی تر هەبوو کە خەونی وروووژێنەری لە هەر کاتێکی خۆش، لە هەر وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگ یان لە هەر شتێکی دیکە دروست دەکرد. ئامێرەکەم هیچ بیردۆزێکی نەبوو _هەر کەسێکی پیشان دەدا کە دەمناسی یان هەر وێنەیەك کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بینیبووم. هەر کات ئامێرەکە دەکەوتە کار، دەچوومە ژوورەکەم و دەرگام لەسەر خۆم دادەخست.

کاتێك لەپاش هەموو شتێك هەستم بە گوناه دەکرد، هەموو ئەو گفتوگۆیانەم بەبیر خۆم دەهێنایە کە لە قوتابخانەی ناوەندی لەگەڵ دوو هاوپۆلم کردبووم. یەکێکیان زۆر

قەڵەو بوو، ئەوی تریان لە کاتی قسەکردندا زمانی دەگیرا. جارێکیان ئەو کوڕەی قسەی دەبزڕکاند، لێی پرسیم: "تا ئێستا کردووتە؟" بەڵێ، لە قوتابخانەی ناوەندی هەمان شتم کردبوو، بەڵام ئەوەندە جێگەی شەرمەزاری بوو بۆم، بەمینجەمینج وەڵامم دەدایەوە کە دیار نەبوو دەڵێم بەڵێ یاخود نەخێر. "تۆو نابێت، هەرگیز نەتکردووە!" کوڕەکە هاواری کرد و دەموچاوی سوور هەڵگەڕا کە کوڕێکی ژیر و لەسەرخۆی وەك من لەو ئاستە نزمەدا بێت. "دەستپەڕکردن خوویەکی ترسناکە، جارێك تاقی بکەیتەوە، هەرگیز وازی لێ ناهێنیت." لەم خاڵەدا، لەبیرمە هاوڕێ قەڵەوەکەم کە بە چاوێکی پڕ لە خەم و ئازارەوە سەیری دەکردم، هەرچەندە بەچپە هانی دەدام کە خۆم بەدوور بگرم لە دەستپەڕکردن (یاخود لە *سی و یەك*، کە بەو جۆرە ناسرابوو لە ناوماندا) _لەبەر ئەوەی هاوڕێکەم بۆی دەرکەوتبوو کە خووەکە وەك دەرمانی بێهۆشکەر وایە، بەڵام بە جۆرێکی ئەوەها وەڕەسیی خۆی دەردەبڕی بەرامبەر بەو خووە، وەك ئەوەی داوای بەزەیی لە خودا بکات.

ئەم جۆرە خەیاڵە کە دەبووە هۆی ئەوەی هەست بە گوناه و تەنیایی بکەم، هەتا ئەو کاتەش بۆ خوێندنی تەلارسازی چوومە زانکۆ، بەردەوام بوو. بەڵام خوویەکی دیکەش فێر بووم، کە وازهێنانی گران بوو بەلامەوە: هەر لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە کردبووم بە خوو، نەچمەوە بۆ قوتابخانە و وانەکانم لەدەست بدەم.

لە سەرەتادا هەستم بە شەرمەزاری و بێزاری دەکرد لەسەر هەبوونی خەیاڵێکی ماوەکورت کە تەنانەت هیچ کەسیش تێبینی نەدەکرد، یاخود لەدەستچوونی زانیارییەکی قوتابخانە. ڕەنگە هۆکاری نەڕۆیشتنەوەکەم، هیچ پەیوەندییەکی بە قوتابخانەوە نەبووبێت: مشتومڕی نێوان دایکم و باوکم، تەمبەڵی، نا بەرپرسیارێتی و نەخۆشی، هۆکار بووبوون لەو کاتانەی کە منداڵێکی سەرکەش بووم. ئەو هۆنراوەیەی دەبووایە ئامادەی بکەم، ئەو پەستانەی دەمخرایە سەر لەلایەن هاوپۆلەکانمەوە (لە قوتابخانەی دواناوەندی)، بێزاری، خەم و بێهیوابوون لە خۆم __ساڵانی دواتر هەموو ئەمانەش پاساوێك بوون. هەندێك جار نەدەچوومەوە بۆ قوتابخانە، لەبەر ئەوەی نازدارەکەی ماڵەوە بووم، لەبەر ئەوەی کاتێك براکەم دەچوو بۆ قوتابخانە، بەتەنیا

هەموو ئەو شتانەم دەکرد لە ژوورەکەم کە خۆم دەمویست، سەرەڕای ئەمانەش، دەمزانی کە من ناتوانم وەك براکەم ببمە قوتابییەکی باش. بەڵام لە هەمان کاتدا هۆکارێکی تر هەبوو هەروەك خەمەکەی ناخم، لە هەمان سەرچاوە سەری هەڵدەدا.

لەپاش ئەوەی ئەو سەرمایەیەی لە باپیرمەوە بۆمان جێ مابوو بەرەو لەناوچوون دەچوو، باوکم ناچار بوو لە جەنەڤا کار بکات. ئەو زستانە لەگەڵ دایکم ڕۆشتن بۆ ئەو شوێنە. من و براکەم لای داپیرەم ماینەوە و لەژێر چاودێریی بێبایەخی ئەودا، نەڕۆیشتنەوە بۆ قوتابخانە دەستی پێ کرد. ئەو کاتە تەمەنم هەشت ساڵان بوو، هەموو بەیانییەك ئیسماعیل ئەفەندی زەنگی لێدەدا بۆ ئەوەی بچینە خوارەوە و بمانبات بۆ قوتابخانە، براکەم جانتاکەی هەڵدەگرت و بەڕێ دەکەوت، لە کاتێکدا من هەر خەریکی مینەجەمینج بووم، بۆ ئەوەی بیانوویەك بدۆزمەوە بۆ نەڕۆیشتنەوەکەم: هێشتا جانتای کتێبەکانم کۆ نەکراوەتەوە، هەندێ شتی ترم بەبیر خۆم دەهێنایەوە (تۆ بڵێی داپیرەم وەك درۆزنێك بیری لێ کردبمەوە؟)، بەهەرحاڵ، تووشی سکئێشە دەبووم یان پێڵاوەکانم لەو کاتەدا تەڕ بوون، یاخود پێویست بوو کراسەکەم بگۆڕم. براکەم بەتەواوەتی دەیزانی من بەنیازی چیم، لەبەر ئەوە نەیدەویست لە قوتابخانە دوا بکەوێت، دەیگوت: "ئیسماعیل، ئێستا با بڕۆین، دواتر وەرە بەشوێن ئۆرهاندا."

قوتابخانەکەمان تەنها چوار خولەك لە ماڵەوە دوور بوو. هەندێك جار ئیسماعیل ئەفەندی براکەمی دەبرد و دەگەڕایەوە بەشوێن منیشدا، لە کاتێکدا نزیکی دەستپێکردنی وانەکان بوون. ئەم جارە قاچم زیاتر ڕادەکێشا، شتێکی ترم دەدۆزییەوە کە دیار نییە یاخود ئامادە نەبووم، وا خۆم پیشان دەدا کە سکم زۆر ئازاری هەیە و ئاگام لە زەنگەکەی ئیسماعیل نییە. بە هۆی ماندوبوونم بۆ ڕێکخستنی هەموو ئەو فرتوفێڵانە و بە هۆی ئەو شیرە وشکە بۆنناخۆشەی کە هەموو بەیانییەك ئامادەیان دەکرد بیخۆمەوە _ئێستاش بۆنە ناخۆشەکەی لە لووتمدا هەر ماوە_هەندێك جار بەڕاستی سکم ئازاری هەبوو. لەپاش ماوەیەك، داپیرە دڵنەرمەکەم دەهات و دەیگوت: "باشە ئیسماعیل، تازە زۆر درەنگە، ئێستا زەنگی چوونە ژوورەوە لێدراوە، باشترە ئەمڕۆ لە ماڵەوە بێت." دواتر برۆکانی گرژ دەکرد و دەیبردمەوە ژوورەوە: "بەڵام گوێ

بگره، سبەی بەدڵنیاییەوە دەچیتەوە بۆ قوتابخانە، تێگەیشتیت؟ ئەگەر نەچیت، تەلەفۆن بۆ پۆلیس دەکەم یان نامە دەنێرم بۆ دایك و باوکت."

لە ساڵانی دواتر، کاتێك لە قوتابخانەی دواناوەندی بووم، هەرگیز لێپرسینەوەم لەگەڵ نەدەکرا، نەڕۆیشتنەوەم بۆ قوتابخانە، زۆر ئاسانتر بوو. لەبەر ئەوەی هەستم بە تاوان دەکرد، پێویست بوو لە هەر هەنگاوێك دەمنا لەسەر شەقامەکە، هەڵسەنگاندن بۆ هەموو شتێك بکەم: سەیری شەبقە گەورەکەی ئەو ژنەم دەکرد کە هەموو ڕۆژێك لە سەریدا بوو، کاتێك بە شەقامەکەدا تێدەپەڕی، دەموچاوی سووتاوی ئەو سواڵکەرەی کە هەموو کات چاوم پێی دەکەوت، سەرتاشەکان و ئەو کەسانەی لە دوکانەکەیان ڕۆژنامە و گۆڤاریان دەخوێندەوە، وێنەی ئەو کچەی لەسەر پۆستەری ڕیکلامی میوە لەسەر دیواری باڵەخانەیەك هەڵواسرابوو، کاتژمێرەکەی مەیدانی تاقسیم کە وەك پارەهەڵگری شێوە بەرازی دەکەوتە بەرچاوم _سەیری هەموو ئەم شتانەم دەکرد. (تاسەی هەموو ئەو شتانەم دەکرد، کاتێك بە هۆی چاککردنەوەی شاقەمەکەوە بەوێدا تێنەدەپەڕیم.) دوکانە خاڵییەکانی هەمبەرگر، قوفڵسازەکانی کۆڵانەکانی دواوەی جیهانگیر، کۆنەفرۆشەکان، دوکانی میوەفرۆشان، تۆمارگە و دوکانی سیدی فرۆشتن، دوکانی کتێبفرۆشە کۆنەکان، دوکانی مۆر دروستکردن و چاپکردن لە یوکسەککالدریم _هەموو شتێك وەك خۆی ڕاستەقینە و جوان بوو، ڕێك وەك ڕۆژانەی بەمنداڵی لەگەڵ دایکم بەو کۆڵانانەدا دەگەڕاین. کۆڵانەکان پڕ بوون لەو فرۆشیارانەی کە سمیت، سەدەفی سوورەکراو، پلاو، بوندوق، کفتە و ماسیی برژاو، کولیچە، ماستاو و شەربەتیان دەفرۆشت. ئارەزووم لە هەرچییەك بووایە، دەمکڕی. لە سووچێکدا دەوەستام و بوتڵێکی خواردنەوە گازییەکانم دەگرت بە دەستمەوە و سەیری ئەو کوڕانەم دەکرد یاریی تۆپپێیان دەکرد (ئایا ئەوانیش وەك من ئەو ڕۆژە نەچووبوونەوە بۆ قوتابخانە، یان هەرگیز نەچوونەتە بۆ قوتابخانە؟) بەسەر بەرزاییەکدا دەڕۆیشتم، کە هەرگیز نەمدیبوو. هەندێك جار چاوم لەسەر کاتژمێرەکەی دەستم بوو و بیرم دەکردەوە کە دەبێت چی لەو کاتەدا ڕووب دات لە قوتابخانە، هەستکردن بە گوناه و تاوان، خەمەکەی زیاتر دەکردم.



لە ماوەی ساڵانی خوێندنی ئامادەیی، هەموو کۆڵانەکانی دواوەی بەبەك و ئۆرتاکۆی دەگەڕام لەگەڵ هەموو بەرزاییەکانی دەوروپشتی ڕوملیحیسار، مەیدانی لەنگەرگرتنی کەشتییەکانی نزیك ڕوملیحیسار، ئیستەنیە و ئەمیرجان، کە هێشتاش هەر وەك خۆیانن، قاوەخانەی ماسیگرەکان و کەنار ئاوەکەی دەوروبەریان، سواری بەلەمێك دەبووم و چێژێکی زۆرم دەبینی لە سەیرکردنی شارۆچکەکانی تری بۆسفۆر: سەیری ئەو ئافرەتە بەتەمەنانەم دەکرد کە لەبەردەم پەنجەرەکانیان سەرخەویان دەشکاند، پشیلە بەجۆشەکان و ئەو کۆڵانە هەژارانەی کە هێشتا خانووی کۆنی یۆنانی تێدا مابوو، کە چیتر لە بەیانیاندا دەرگاکانیان قوفڵ نەدەکرد.



لەپاش ئەوەی تاوانەکەم ئەنجام دەدا، زۆر جار بیرم لە چارەسەر دەکردەوە: دەبمە قوتابییەکی باش، ئەم جارە باشتر وێنە دەکێشم، بۆ خوێندنی بەشی هونەر دەڕۆم بۆ ئەمەریکا، واز لەگاڵتەکردن بە مامۆستا ئەمەریکییەکان دەهێنم (ئەو مامۆستایانەی سەرەڕای زیرەکییان، خۆیان وەك کاریکاتێر لێ کردبوو)، یان واز دەهێنم لە هەوڵەکانم بۆ بێزارکردنی مامۆستا بێزارکەر و لەشگرانە تورکەکان. لەپاش ئەم بیرکردنەوانە، لە ماوەیەکی کورتدا تاوانەکەم دەگۆڕا بۆ بیرۆکەیەکی نموونەیی و گەشاوە. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا، باوترین هەڵە لەنێوان هەرزەکارانی هاوتەمەنم، ناڕاستگۆیی، دووڕوویی و بێبەزەییبوون بوون. بە جۆرێك پرسیاری تەندروستیی کەسێکیان دەکرد، هەڕەشەیان لێ دەکرد، نەریتە خراپەکانیان بە قسەی ڕێزدار دەشاردەوە، هەموو ئەو شتانەی دەریاندەخست کە هەموو دەربڕینێکی ئەم هەرزەکارانە، دووڕوویی هەیە. بە تێڕوانینی ئەوان، (ئەزموونوەرگرتن لە ژیان) _ئەو شتەی کە دەیانگوت من پێی نەگەیشتووم_ واتە فێڵکردن و دووڕوویی‌کردن، دواتر خۆت بێتاوان دەربخەیت. با بۆتانی ڕوون بکەمەوە: منیش بە هەمان شێوە ئەم فێڵ و درۆیانەم دەکرد، دواتر هەستم بە تاوان و گوناە دەکرد، بەڵام بە وتنی ئیتر درۆ و دووڕوویی ناکەم، چارەسەرم بۆ تاوانەکەم دەدۆزییەوە _نەك لەبەر ئەوەی ویژدانم ڕێگەی پێ نەدابم یان بیرم کردبێتەوە درۆ و دووڕوویی هەمان شتن، بەڵکو بە هۆی ئەو پەرێشانییەوە بوو کە لەپاش تاوانەکە بۆم دروست دەبوو و تەواو هیلاکی دەکردم.



هەستکردن بە هەڵە و تاوان، ڕاستەوخۆ لەپاش دووربووییەکەم ڕووی نەدەدا، بەڵکو لە هەر کاتێکدا بووایە، ئازاری دەدام: کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانم قسە و گاڵتەم دەکرد، ئەو کاتەی لە نۆرەی سینەما وەستابووم لە بیۆگڵۆ، یان لە کاتی دەستگرتنی کچێکی جوان کە تازە ناسیبووم، سەرنجم دەخستە سەر هەموو شوێنێك و هەر کارێك کە دەمکرد _وەك جۆرێك لە کامێرای چاودێری_ (بۆ نموونە" لە فرۆشگایەکی بچووك پارەم دەدا بە ئافرەتێك، بیرم لە قسەیەك دەکردەوە لەگەڵ ئەو کچە جوانە بیکەم کە دەستم گرتبوو)، یان هەر قسەیەك لە دەمم دەردەچوو (لەوانەیە قسەیەك بووایە لە کتێبی (*گەشتێك بۆ ڕووسیا لەگەڵ خۆشەویستەکەم*) وەرمگرتبێت، "ئایا یەکەم جارە دێیت بۆ ئەم جۆرە ئاهەنگانە؟"). ڕاستەوخۆ دەبوومە دەرهێنەر و ئەستێرەی فیلمەکەم، بەردەوام دەبووم لە نواندن، لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی ئاسایی ڕەفتارم دەکرد، دواتر خەمێکی زۆر دایدەگرتم _هەستم بە شەرمەزاری و ترس دەکرد، کە وەك بێگانەیەك سەیر بکرێم، وەك ئەوە بوو کەسێك وەك پارچەیەك کاغەز ڕۆحم بنوشتێنێتەوە. هەتا خەمەکەم قووڵتر دەبوو، لە ناخەوە لاوازتر دەبووم.

کاتێك دەکەوتمە ئەم دۆخانەوە، تەنها چارەسەر هەڵهاتن بوو بۆ ژوورەکەم. دەرگام لەسەر خۆم دادەخست، لەسەر پشت ڕادەکشام و دووربووییەکەم دەهێنایە پێشچاوی خۆم. دواتر بە کۆکردنەوەی قەڵەم و کاغەز یان بە نووسین یاخود بە نیگارکێشان، خۆم لەو گرێکوێرەیە دەردەهێنا و هەر شتێکم دەکرد، هەتا بگەڕێمەوە دۆخی ئاسایی.

هەندێك جار هەبوو هیچ شتێکی هەڵەشم نەکردبوو، بەڵام وەك فێڵبازێك خۆمم دەبینی. کاتێك خۆم لە شووشەی پەنجەرەی دوکانێك دەبینی، یاخود لە دوکانێکی هەمبەرگر یان ساندویچ لە بیۆگڵۆ دادەنیشتم، لەپاش سەیرکردنی فیلمێك خۆم بە خواردنی گۆشتی سەوسەج خەریك دەکرد، لەپڕ لە ئاوێنەی دیوارەکەی بەرامبەر خۆم دەبینییەوە، ڕەنگدانەوەی وێنەکەم کەمتەرخەمیی پێوە دیار بوو. ئەو ساتە زۆر ئازاربەخش بوو بە جۆرێك حەزم دەکرد بمرم، بەڵام بەردەوام بووم لە خواردنی ساندویچەکەی دەستم، بەدڵتەنگییەوە سەرنجی ڕەنگدانەوەی وێنەکەی خۆم دەدا و وا بیرم دەکردەوە لە زەبەلاحی گۆیا دەچم _ئەو دێوەی کوڕەکەی خۆی خواردووە_

ڕەنگدانەوەکم گوناه و تاوانەکانی بەبیر دەهێنامەوە و دووپاتی دەکردەوە کە من چەند کەسێکی خراپ و قێزەونم. دەشێت بە هۆی هەمان هۆکار بێت لە هەموو لایەکی دیوارەکانی هیۆلی پێشوازیی یانەکانی کۆلانەکانی دواوەی بیۆگلۆ ئاوێنەی گەورەیان هەلواسیبێت. لەو کاتەدا قێزم لە هەموو شتەکانی دەوروبەرم دەکردەوە _گلۆپەکەی سەرسەرم، ئەو مێزەی لەسەری دانیشتبووم، دیوارە چلکنەکان و ڕەنگە ناشرینەکەی کافتریاکە_ دەمزانی هیچ سەرکەوتن و کامەرانییەك چاوەڕێم ناکات: لە بەڕێکردنی ژیانێکی درێژ و بێزارکەر و نادیار و بەسەربردنی کاتێك کە پێشتر لەبەرچاوم مردووە، تەنانەت لەو کاتانەی ئارامم گرتووە لەسەری، بێچارە بووبووم.

پێم وا بوو خەلکی دلخۆشی ئەمەریکا و ئەورووپا، وەك ئەو کەسانەی لە فیلمەکانی هۆلیوود بینیبوونم، ڕەنگە ژیانێکی پڕبەختیاری بێکێشە بەسەر بەرن، ئەوانی ترمان، بە خۆیشمەوە، هەموومان ناچار کراوین لە شوێنێکی وێران و ناخۆشی ئەم جیهانە ژیان بەرێ بکەین، هەموومان لەناو چووین، چونکە دەبێت وەك کەسێکی بێکەلك و پلەدووی ئەم جیهانە بوونمان هەبێت، هەرگیز ناتوانین شتێك بکەین، هەتا خەلکی دەرەوە بەبایەخەوە سەیری بکەن. ئەوە چارەنووسێك بوو، کە بەهێواشی و بەئازارەوە خۆم بۆ ئامادە دەکرد. لەبەر ئەوەی پێم وا بوو تەنها خەلکە دەولەمەندەکانی ئەستەنبولێ دەتوانن وەك خۆرئاواییەکان بژین، بە جۆرێك بەرگەی ڕۆکەشی و بێهەستییانم نەدەگرت، حەزم لە بینینی دۆخی ماتەمینیی کۆلانە هەژارەکان بوو. ئێوارانی هەینی و شەممان، بە پیاسەکردنی ئەو کۆلانانە و چوون بۆ سینەما بەسەر دەبرد.

بەلام لە کاتێکدا لە دونیاکەی خۆمدا دەژیام _کتێبم دەخوێندەوە، وێنەم دەکێشا و خۆم شارەزای کۆلانە هەژارەکان دەکرد_ هاوڕێیەتیی کۆمەلێك کەسی خراپم دەکرد. هاوڕێی چەند کوڕێك بووم کە باوکیان خاوەنی کارگە، یان لە کارگەی کانزا و هەر کارگەیەکی تر کاریان دەکرد. ئەم هاوڕێیانەم ئۆتۆمبێلەکانی باوکیان لێدەخوڕی کە مەرسیدس بەنزس بوون، هەر بەوانیش دەهاتن بۆ ڕۆبێرت ئەکادیمی. بەو ئۆتۆمبێلانە بەناو بەبەك و شیشلی دەگەڕان، هەموو جارێك کە کچێکی جوانیان دەدی، بەهێواشی لێیاندەخوڕی بۆ ئەوەی بانگی بکەن بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکە، ئەگەر سەر بکەوتایەتە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە، دەستەبەجێ بیریان لە سەرکێشییەکی هەوەسبازی دەکردەوە. ئەم

هاوڕێیانەم بە تەمەن لە من گەورەتر بوون، بەڵام بەتەواوەتی کەللەپوت بوون. کۆتایی هەفتەکانیان بە سووڕانەوە لە ماچکا، حەربیە، نیشانتاش و تاقسیم بەسەر دەبرد، بۆ ئەوەی کچێکی شۆخ ببینن و بانگی بکەن بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکەیان. هەموو زستانێک، دە ڕۆژیان لە گەشتی یاریی بەفر لە ئۆلوداگ بەسەر دەبرد، هاوینانیش هەوڵیان دەدا چاویان بەو کچانە بکەوێت کە هاوینانیان لە ساندیە و ئێرینکۆی بەسەر دەبرد. هەندێک جار منیش لەگەڵیان دەچووم بۆ ڕاوکردن (یان بانگکردنی کچان)، بەڵام تووشی شۆک دەبووم، کاتێک دەمبینی هەندێک لە کچان بە یەک سەرنج دەیانزانی ئێمە منداڵی بێزیانین و سەر دەکەوتنە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە. جارێکیان دوو کچ سەر کەوتنە ناو ئۆتۆمبێلی کاتبەسەربردنی چەند کەسێکی نامۆ کە بەڕێکەوت بەوێدا تێپەڕیبوون، دەستم کرد بە گفتوگۆیەکی هەڕەمەکی لەگەڵیان. دواتر چووین بۆ یانەیەک، لەوێ شەربەت و کۆلامان خواردەوە، دواتر هەر کەسە و بە ڕێگای خۆیدا ڕۆیشت. جگە لەو هاوڕێیانەم کە لە نیشانتاش دەژیان و بەردەوام یاریی پۆکەرم دەکرد لەگەڵیان، چەند هاوڕێیەکی تریشم هەبوون کە جاروبار لەگەڵیان یاریی شەترەنج و تۆپی سەرمێزم دەکرد، یان پێکەوە کۆ دەبووینەوە و گفتوگۆمان لەبارەی نیگارکێشان و هونەر دەکرد، بەڵام هەرگیز ئەمانەم نەدەناساند بە دەستە هاوڕێکەی ترم یاخود لە یەکدا کات چاوم پێیان نەدەکەوت.

لەگەڵ هەریەکە لەم دەستەی هاوڕێیانەم، کەسایەتیی جیاواز، شێوازی گاڵتەی جیاواز و قسەکردنی جیاوازم هەبوو. هەرگیز ناڵێم خۆم وەک حەربا دەردەخست، چونکە هیچ نەخشەیەکی گاڵتەئامێز یاخود زیرانە لەئارادا نەبوو، تاکو کەسایەتیی خۆم بگۆڕم. زۆر جار کاتێک لەگەڵ هاوڕێکانم دەبووم، ئەم کەسایەتییانە خۆیان سەربەخۆ دروست دەبوون. بەم جۆرە، بەئاسانی لەگەڵ دۆخەکە ڕاهاتبووم، لەگەڵ باشەکاندا باش بووم، لەگەڵ خراپەکاندا، خراپ بووم و لەگەڵ بێگانەکاندا، بێگانە بووم. بە تێپەڕبوونی کات، کاتێک تەمەنم گەیشتە بیست ساڵ، لەو تێڕوانینە گاڵتەجاڕانە وەستام. هەر کاتێک شتێک سەرنجڕاکێش بووایە بەلامەوە، شتێک لە ناخمدا هەبوو بەتەواوەتی باوەشی بۆ دەکردەوە.

سەرنج و بایەخەکانم لە خواستی گاڵتەکردن بە هەموو کەسێک و هەموو شتێک، نەیاندەوەستاندم. لە قوتابخانەی ڕۆبێرتی ئەکادیمی، هاوپۆلەکانم زۆر بەکەیف دەبوون

کاتێك نوکتە و گاڵتەم بۆ دەکردن، ئەمەش خۆشحاڵی دەکرم و دەیسەلماند کە دەتوانم ببمە چیرۆکخوانێکی باش. زۆربەی بابەتی گاڵتەکانم مامۆستا بێزارکەرە تورکەکان بوون، کە بۆ هەندێکیان قورس بوو لە قوتابخانەیەکی ئەمەریکی وانە بڵێنەوە و ترسی ئەوەیان هەبوو ڕەنگە سیخوڕێك لەناوماندا هەبێت و زانیاری دەربارەی ژیانیان بدەین بە ئەمەریکییەکان. ئەو مامۆستا تورکانەی کە بەردەوام بایەخیان بە وتاری هەستی نەتەوایەتی دەدا، لەچاو مامۆستا ئەمەریکییەکان زۆر خەمسارد، پەست، هیلاك و بەتەمەنتر بوون، هەستمان دەکرد هەروەك خودی خۆیان یان خودی ژیان، ڕقیان لە ئێمەیە. بەپێچەوانەی دڵسۆزی و دڵپاکیی مامۆستا ئەمەریکییەکان، ئامانجی یەکەمیان ئەوە بوو کە بابەتی وانەکان ئامادە بکەین، ئەگەر وامان نەکردایە، ئەوا سزایان دەدایین، ئەوانیش بە هۆی ئەو دەروونە بێزکراسییەوە کە هەیانبوو، ڕقیان لە هەموومان بوو.

مامۆستا ئەمەریکییەکان کە بەزۆری لاو بوون، ئەو پەرۆشییەی هەیانبوو لە کاتی وانەگوتنەوە، وای دەکرد زۆر خۆمان بێتاوان و چاوکراوەتر پیشان بدەین زیاتر لە خودی ڕاستەقینەی خۆمان. کاتێك ئەو پەرۆشی و گەرموگوڕییەمان تێدا دەبینین، یان کاتێك باسی لایەنە سەرنجڕاکێشەکانی ڕۆژئاوایان بۆ دەکردین، لەنێوان خۆشی و نائومێدی دەیانهێشتینەوە. هەندێکیان بەهیوای وانەگوتنەوە بە منداڵە تورکییە نەخوێندەوارەکانی جیهانی سێیەم، هاتبوون بۆ تورکیا. هەندێکی تریان ئەو چەپانە بوون کە لەپاش ساڵی ١٩٤٠ لەدایك ببوبوون، زیاتر بابەتەکانیان ڕوونکردنەوە مارکسییەکانی شەکسپیر بوون، تەنانەت لە کاتی وانە ئەدەبییەکان، هەوڵیان دەدا بۆمان ڕوون بکەنەوە کە سەرچاوەی هەموو خراپییەکانی کۆمەڵگایەك، بە هۆی ئەو خەڵکە باشانەوە دروست دەبێت کە بە ڕێگەی هەڵەدا دەڕۆن. یەکێك لە مامۆستا ئەمەریکییەکان کاتێك لەبارەی دەقێکی ئەدەبی دەدوا و باسی چارەنووسی کەسێکی سەرکەوتووی بۆ دەکردین کە خۆی نەبەستەوە بە کۆمەڵگاوە، زۆر جار دەیگوت: "ئێوە چۆکتان دانەداوە"، ئێمەش وەڵامان دەدایەوە: "بەڵێ مامۆستا، تۆش چۆکت دانەداوە"، بەڵام مامۆستا تورکەکە ئەوەندە زیرەك نەبوو کە تێبگات کە دەنگی هەمان ئەو وشەیە لە زمانی تورکیدا واتای جنێوێك هەیە، لەو کاتەدا هەموو پۆلەکە بەدزییەوە پێدەکەنی، بەڵام مەبەستی ئێمە ڕیسواکردنی مامۆستاکە نەبوو، بەڵکو بە هۆی

بێزاریمانەوە بوو لەدەست زانیارییەکانی مامۆستا ئەمەریکییەکە و وانەکەی. هەستی ترسنۆکانەی دژە ئەمەریکییەکان، لەگەڵ دۆخی هەستی نەتەوایەتی چەپەکانی ئەو کاتە دەگونجا، ئەمەش زیاتر قوتابییانی ئەنادۆڵی نیگەران دەکرد، چونکە تاقیکردنەوەی قورسیان پێ دەکرا بۆ ئەوەی مافی خوێندن لە قوتابخانەیەکی پلەبەرزدا بەدەست بهێنن، هەرچەندە زۆربەیان قوتابیی زیرەك بوون و بەقورسی هەوڵیان دەدا، لە کاتێکدا زۆربەیان لە خێزانە هەژارەکانی ناوچە دواکەوتووەکان بوون کە خەونیان بە کلتووری ئەمەریکا و زەوییەکی ئازادەوە دەبینی _زۆربەیان بەدوای هەلێکدا دەگەڕان، بۆ ئەوەی لە زانکۆکانی ئەمەریکا بخوێنن، یان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بمێننەوە_ بەڵام بە هۆی جەنگی ڤێتنام، تووڕەییان لە ئەمەریکا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەبوو. بۆرجوازەکانی ئەستەنبوڵ و هاوڕێ دەوڵەمەندەکانم لە وەرگرتنیان لەم قوتابخانەیە، کێشەیان بۆ دروست نەدەبوو. بە تێڕوانینی ئەوان، قوتابخانەی ڕۆبێرتی ئەکادیمی یەکەم هەنگاوە بەرەو ئەو داهاتوویەی کە چاوەڕێیان دەکات، یان ئەو داهاتوویەی کە دەیانکات بە خاوەن و بەڕێوەبەری گەورەترین کۆمپانیاکانی وڵات، یاخود نوێنەری تورکیا لە کۆمپانیا گەورە بیانییەکان.

دڵنیا نەبووم کە منیش وەك ئەوان هەمان خواستم هەیە، بەڵام هەر کەسێك پرسیاری لێ دەکردم، دەمگوت من لە ئەستەنبوڵ دەمێنمەوە و زانستی تەلارسازی دەخوێنم. ئەمە تەنها بیرۆکەی من نەبوو، بەڵکو خێزانەکەشم گەشتبوون بەو ئاکامە. لەبەر ئەوەی منیش وەك باپیرەم و باوکم و مامم زیرەك بووم، دەبووایە وەك ئەوان ئەندازیاریم لە یەکێك لە زانکۆ تەکنیکییەکانی ئەستەنبوڵ تەواو بکردایە، بەڵام بە هۆی ئەوەی زۆرتر مەیلم بەلای نیگارکێشان بوو، بڕیارم دابوو لە بەشی بیناسازی لە هەمان زانکۆ بخوێنم، چونکە پێم وا بوو ئەو بەشە زیاتر لە خولیاکەمەوە نزیکە. لەیادمە، یەکەم جار ئەوە تەنها بیرۆکەیەکی سادە بوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، ئەو کاتەی لە قوتابخانەی ڕۆبێرتی ئەکادیمی دەمخوێند، نەخشەکەم بەیەکجاری لە هزری خۆمدا جێگیر کرد. هەرگیز بۆ جارێکیش، بیرۆکەی جێهێشتنی ئەم شارەم نەبووە. ئەوەش تەنها بە هۆی خۆشەویستیم نەبوو بۆ ئەو شوێنەی لێی دەژیام، بەڵکو بە هۆی دوودڵیم بوو لە دەستهەڵگرتن لەو نەریت و ماڵەی کە بەو جۆرە لە تاقیکردنەوەی هەر شتێکی

نوێ، تەمبەڵیان کردووم. وەك دواتر بۆم دەرکەوت کە من ئەو جۆرە کەسایەتییەم هەیە ئەگەر هەمان جلوبەرگ و هەمان خواردن بخۆم، یان ئەگەر ماوەی چەندین ساڵ لە چێژبینین لە خەونە سەرکێشییەکانی ناو خەیاڵە نهێنییەکانم بەردەوام بم، هەرگیز بێزار نابم.



لەو سەردەمەی باوکم سەرۆکی ئەیگاز بوو، کۆمپانیایەکی تورکی بوو بۆ بەرهەمهێنانی گاز. هەندێك جار دەیگوت کە پێویستە بڕوات بۆ بیۆکچەکمەچە، بۆ پشکنینی هەندێك کۆگا یاخود بۆ بەنزینخانەکانی ئەمبارلی. لەبەر ئەوە تەنها لە ڕۆژانی یەکشەممان بە ئۆتۆمبێل دەگەڕاین، دەڕۆیشتین بۆ بۆسفۆر یان سەردانی داپیرەمان دەکرد _بە هەر هۆکارێك بووایە، دەیخستمە ئۆتۆمبێلەکەیەوە (فۆردی ئەڵمانی مۆدێل ١٩٦٦ بوو)، ڕادیۆکەی دادەگیرساند و لێیدەخوڕی. لەو گەشتانەی بەیانییانی یەکشەممان، باسی ژیانمان دەکرد یان هەر شتێکی تر بە خەیاڵماندا بهاتایە لەبارەی داهاتوو.

لە ماوەی ساڵانی شەستەکان و سەرەتاکانی حەفتاکان، کۆڵان و شەقامە سەرەکییەکانی ئەستەنبوڵ لە بەیانییانی یەکشەممان، چۆڵ بوون. کاتێك لەگەڵ باوکم بەو گەڕەکانەدا تێدەپەڕین کە هەرگیز پێشووتر نەمدیبوون، بەدەم گوێگرتن بۆ

(موزیکی هێمنی ڕۆژئاوا) (زه بیتلس، سیلڤای ڤارتان و تۆم جۆنس و چەندینی تر)، باوکم ڕێنمایی دەکردم کە باشترین شتێك کەسێك بتوانێت بیکات لە ژیانیدا، پشتبەستنە بە تواناکانی خۆی _پارە هەرگیز گرنگ نییە، بەڵام ئەگەر خۆشگوزەرانیی لەگەڵ بێت، ئەوا لە کۆتاییدا مانایەکی دیکەی دەبێت_ یاخود بۆی دەگێڕامەوە کە جارێکیان ڕۆیشتووە بۆ پاریس، لەوێ لە ژووری هۆتێلێك شیعری نووسیوە و هۆنراوەکانی ڤالێری وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی، بەڵام چەند ساڵ دواتر لە کاتی گەشتێکیدا بۆ ئەمەریکا، هەموو هۆنراوەکانی خۆی و وەرگێڕاوەکان کە لە جانتاکەیدا بوون، دزراون. کاتێك دەنگی موزیکەکە بەرز دەبوویەوە، ئاوازەکانی لەگەڵ دیمەنی شەقامەکانی شار و قسەکانی باوکم _دەیگێڕایەوە کە چەند جار لە پاریس لە ساڵی ١٩٥٠، چاوی کەوتووە بە جین پاول سارتەر، یان لەبارەی دروستکردنی باڵەخانەکانی پاموك و شکستەکانی خۆی لە کاری بازرگانیدا دەدوا_ دەگونجا. هەرگیز ئەو قسانەی باوکم لەیاد ناچن. ناوەناوە بۆ سەیرکردنی دیمەنێکی جوان یان ئافرەتێکی شۆخ کە بەسەر شۆستەکەدا تێدەپەڕی، ئۆتۆمبێلەکەی ڕادەگرت. لە کاتێکدا گوێم بۆ قسەکان و ئامۆژگارییەکانی بۆ بوون بە کەسێکی خانەدان ڕادێرابوو، سەرنجی دیمەنە قورقوشمییەکانی بەیانییانی زستانم دەدا کە لە شووشەی ئۆتۆمبێلەکەوە، کاتێك بەلایاندا تێدەپەڕین و دەمبینین. کاتێك تەماشای ئۆتۆمبێلەکانی سەر پردی گالەتا، کۆڵانە هەژارەکان کە هێشتا چەند خانوویەکی تەختەیان تێدا مابوو، گەڕەکە تەسکەکان، ئاپۆڕەی خەڵك لە کاتی سەیرکردنی یاریی تۆپێپێ، ئەو کەشتییانەی دووکەڵکێشێکی باریکیان هەبوو و ئەو کەشتییانەی تریان ڕادەکێشا کە بە خەڵووز کاریان دەکرد، گوێم بۆ دانەبەدانەی قسەکانی باوکم دەگرت کە پێی دەوتم چەندە گرنگە بۆ خەڵك، کە دوای هەستوسۆزی خۆیان بکەون، لە ڕاستیدا ژیان زۆر کورتە، زۆر گرنگە کەسێك بزانێت لە ژیاندا چیی دەوێت بیکات _لە ڕاستیدا ئەو کەسانەی ژیانیان بە وێنەکێشان و نووسین بەسەر

**دەبەن، چێژ لە ژیانێکی دەوڵەمەنتر و بەجۆشتر وەردەگرن_ کاتێك گوێم ڕاگرتبوو بۆ وشەکانی لەگەڵ، خۆیان لەگەڵ ئەو شتانەدا دەگونجاند کە دەمبینین.**





**موزیك، ئەو دیمەنانەی بەلای پەنجەرەکەدا تێدەپەڕین، کۆڵانە تەسك و چەوڕێژکراوەکان و دەنگی باوکم (دەیپرسی: "لێرەوە بسووڕێینەوە؟")، هەموویان تێکەڵ بەیەك دەبوون. هەستم دەکرد هەرچەندە هیچ وەڵامێکم بۆ ئەو جۆر پرسیارە بنچینەییانە نییە، بەڵام کامەرانیی ڕاستەقینە لەو شوێنەدا جێگیر بووە کە هەرگیز نایدۆزینەوە یان ڕەنگە هیوا نەخوازین بیدۆزینەوە. بەڵام _ئەگەر بەدوای وەڵامەکەدا**

بگەڕێین یاخود تەنها هەست بە خۆشی و هەستێکی قووڵ بکەین_ گەڕان بەدوای وەڵامەکەدا، هێندەی ئەو دیمەنانە گرنگ بوون کە لە شووشەی ئۆتۆمبێلەکەوە دەمانبینین، هەروەك دیمەنی خانوو و بەلەمەکان. بە تێپەڕبوونی کات، ژیان وەك مۆسیقا، هونەر و چیرۆك، بەرز و نزم دەکات، تا دەگاتە کۆتایی، بەڵام تەنانەت ئەو دیمەنانەی شارەکە کە ئێستا لەبەرچاومانن و چەند ساڵ دواتریش لەگەڵمان دەژین، هەر وەکو یادەوەرییەکان، تێکەڵی خەونەکانمان دەبن.



## ٣٤

# خەمباری، واتە ڕقلێبوونەوە لە کەسێك و لە شاری کەسێکی تر

کاتێك دەڵێین شاری کەسێکی تر، وەك ئەوەی باسی شارێکی تر بکەین. ئەو کۆڵانانەی کە وەك ماڵی خۆت بوون، لەناکاو ڕەنگیان دەگۆڕێت. کاتێك سەیری ئەو جەنجاڵییە شێواوە دەکەم کە بەبەردەممدا تێدەپەڕن، لەپڕ هەست دەکەم ئەم خەڵکانە بۆ ماوەی چەندین ساڵە لێرە ژیاون. پارکە قوڕاوییەکانی و زەوییە ناخۆشەکانی، ستوونەکانی کارەبایی، پەرژینی تەختە دروستکراوی دەوری مەیدانەکانی، شوێنە کۆنکریتکراوە زەبەلاحەکانی، ئەم شارە وەکو ڕۆحی من، بەخێرایی دەبێتە شوێنێکی بەتاڵ. خاشاکی قەراغ کۆڵانەکان، بۆگەنی زبڵدانەکان دەمکراوەکان، بەرزی و نزمی و درزی سەر شۆستەکان" هەموو شێواویی و ئاژاوەکان، هەموو ئەو پاڵنان و پەستانانە کە شارەکەیان بەو جۆرە لێ کردووە _لەو خەیاڵەدا جێماوم کە شارەکە سزام دەدات، ئەگەر شتێکی تر بۆ ئەو گەندەڵییە زیاد بکەم، یان ئەگەر بۆ هەمیشە لێرە بمێنمەوە. کاتێك خەم لە ناخی منەوە دزە دەکات بۆ شارەکە، لە شارەکەوە بۆ ناخی من، بیر دەکەومەوە کە شتێك نییە بتوانم بیکەم، وەکو شارەکە، منیش لەناو چەند شتێکی زیندوو و مردوو ماومەتەوە، تەرمێکم هێشتا هەناسە دەدەم، بەبێچارەیی لەو شەقام و شۆستانەدا پیاسە دەکەم کە نوشوستی و دۆڕانم بیر دەخەنەوە، تەنانەت کاتێك لەنێوان بینا ناشرین و کۆنکرێتکراوەکان (هەریەکەیان ناخم ئازار دەدات) سەیری بۆسفۆر دەکەم، کە لەدوورەوە وەك داپۆشەرێکی ئاوریشم دەبریسکێتەوە، هێشتاش ئومێد

خۆی دوور دەخستەوە لێم. هەمیشە بۆنی بکوژترین و تاریکترین ماتەمینیی ئەو کۆڵانەی لەدوورەوە دیارە، دەخزێتە ناو ناخمەوە، دەکەم. هەروەك ئەستەنبوڵییەکی شارەزا کە بە بۆنی هەستیاری قەوزە و دەریا لە ئێوارانی پاییزدا، دەتوانێن بڵێت کە زریان و باران لە باشوورەوە هەڵدەکات، خەڵکی ڕادەکەنە ماڵەکەنیان بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لەو زریانە، لەو زەمینلەرزە و لەو مردنە، منیش ڕادەکەمەوە بۆ نێوان چوار دیوارەکە.

حەزم لە نیوەڕوانی بەهار نییە، کاتێك لەناکاو وزەی خۆر بێبەزەییانە هەموو هەژاری و ناڕێکوپێکیی شارەکە دەردەخات. حەز ناکەم بڕۆم بە هەلەسکارغازی، بۆ ئەو کۆڵانانەی لە تاقسیمەوە بەرەو حەربیە، شیشیلی و مەجیدکۆی درێژ بوونەتەوە. دایکم بەمنداڵی لەو کۆڵانانەدا ژیاوە و باسی ئەو دارتووانەی دەکرد کە لەکەنار ئەو کۆڵانانە زنجیریان بەستبوو، بەڵام ئێستا جێگەیان بەو بینایانە پڕ کراونەتەوە کە لە ساڵانی شەستەکان و حەفتاکان لەسەر شێوازی نێودەوڵەتی دروست کراون، کە پەنجەرەکانیان گەورەن و دیوارەکانیان بە خشتی نەخش ناشرین داپۆشراون. کاتێك دەچمە شەقامە هەژارەکانی شیشیلی (پانگاتی) و نیشانتاشی (تۆپ ئاگاجی) و تاقسیم (تەلیمهانە)، ئارەزوو دەکەم یەکسەر هەڵبێم: چونکە ئەم شوێنانە دوورن لە هەموو ڕەنگێکی سەوز و دیمەنی زیوینیی بۆسفۆر، لەو شوێنانەی کە شەڕ و ناکۆکیی نێوان خێزانەکان بوونە هۆی دابەشکردنی ڕووبەرە بچووکەکان بۆ ڕووبەری بچوکتر، کە چەندین باڵەخانەی خەمبارکەر و بێزارکەریان تێدا بەرز بووەتەوە.

لەو ڕۆژانەی لەو کۆڵانە کشومات و دڵشکاوانە دەهاتم و دەچووم، هەستم دەکرد کە هەموو ئەو پوورانەی لە پەنجەرەکەیانەوە سەیری خوارەوەیان دەکرد، لەگەڵ هەموو مامە سمێڵ گەورەکان، ڕقیان لێمە _مافی خۆیان بوو بەو جۆرە بەڕقەوە سەیرم بکەن. ڕقم لەو کۆڵانەکانی دواوەی نێوان شیشیلی و نیشانتاش بوو بە کۆگای جلوبەرگەکانیانەوە، کۆڵانەکانی نێوان تەپباشی و گالەتا بە لەگەڵ گڵۆپ و چلچرا فرۆشەکانیانەوە و ڕووبەری دەورووبەری تاقسیم تەلیمهانە کە تا ئێستاش زۆربەی پارچەی یەدەگی ئۆتۆمبێلیان دەفرۆشت. (لەو ساڵانەدا، باوکم و مامم لەو سەرمایەیەی لە باوکیانەوە بۆیان جێ مابوو، بەکەیفەوە لە بازرگانیی هەڕەمەکی یەك لەدوای یەك

وەگەڕیان دەخست، لێرە یەکێك لەم جۆە دوکانانەیان کردەوە، بەلآم دواتر لەم کارەش تاقەتیان چوو و وازیان لە کەلوپەلی ئۆتۆمبێل هێنا و کرێکارەکانیان گواستەوە بۆ کارگەی دۆشاوی تەماتە. لەپاش ئەوە، برێکی زۆر بیبەریان بۆ زیاد کرد.) ڕقم لە شەقامەکانی دەوری سولەیمانیە بوو، کە ئەو دوکانانەی تێدا بوو کە مەنجەڵ و قاپیان دروست دەکرد، بە هۆی بەکارهێنانی چەکوش و ئامێرکانی ترەوە، نەڕەنەڕێکی بێزارکەر و بێکۆتاییان دروست دەکرد، ڕقم لەو تەکسی و بارهەڵگرانەی تر بوو کە خزمەتی ئەو کۆلآنانەیان دەکرد و ڕێگاوبانەکەیان بەتەواوەتی داخستبوو. کاتێك ئەو شوێنانەم دەبینی، تووڕەییەك لە ناخمدا دروست دەبوو بە جۆرێك هەروەك خودی خۆم، ڕقم لە شارەکە دەبوویەوە. لە هەمووی زیاتر ڕقم لەو وشە ڕەنگاوڕەنگ و پیت گەورانە بوون، کە لەسەر لافیتە و پۆستەرەکان لەلایەن چەند جوامێرێکی شارەکەوە نوسرابوون کە پڕوپاگەندە بۆ ناو، کاری بازرگانی و سەرکەوتنی خۆیان دەکرد. هەموو ئەو پرۆفیسۆر، پزیشك، برینپێچ، ڕاوێژکاری دارایی و پارێزەرانەی کە لەسەر بارەکان، دوکانی میوە و خواردەمەنی، کەبابخانەکان و فرۆشگای خواردنی دەریاییەکان، پڕوپاگەندە بۆ ناوەکانیان کراوە، هەموو بانکەکان، ئاژانسی بیمە، بەرهەمهێنەری تاید، ناوی ڕۆژنامەکان، سینەما و فرۆشگای کابۆ، ئەو پۆستەرانەی پڕوپاگەندە بۆ ناوی خواردنە گازی و ساردەمەنییەکان دەکەن، ئەو دوکانانەی بوتڵی ئاو، بلیتی یانسیبی یاریی تۆپێپێ و بلیارد دەفرۆشن، ئە کۆگایانەی بە پۆستەرێکی بەرز کە بە پیتی گەورە و شانازییەوە نووسراون، کە ئاگادارییان بۆ خۆیان کردووە وەك فرۆشیاری ڕێپێدراوی فرۆشتنی گاز _هەموو ئەم پڕوپاگەندە و ئاگادارییانە، شارێکی شڵەژاویان پیشان دەدان و پێیان دەگوتم پێویستە بگەڕێیمەوە بۆ سووچە تاریکەکە، بۆ ژوورە بچووکەکەم، پێش ئەوەی لەناو ئەم پۆستەر و ژاوەژاوەدا بخنکێم.

بانکبەیانیانکەبابخانەکۆتالگرەتنیلێرەبیخۆرەوەسابونیڕۆژانەکاتێکینمونەییزێڕ پارێزەرکرێدانقیست

لەبەر ئەوە، لە ئاکامدا و پێش ئەوەی هەتاوی نیوەڕۆ هەموو ناشرینییەکانی شارەکە بەڕووناکی پیشان بدات، لەناو هەموو ئەو جەنجاڵییە تۆقێنەرانە و بێسەروبەریانە

هەڵدێم. بەڵام لەپاش ئەوەی تەواو ماندوو دەبم، ئامێری خوێندنەوەکەی ناو مێشکم هەموو پۆستەرەکانی بیر دەکەوێتەوە و دووبارەیان دەکاتەوە، وەك شیعری لاواندنەوەی تورکی، هەموو وشەکان بەدوای یەکدا ڕیز دەکات.

بەهارداشکاندنژەمەخواردنەکانتەلەفۆنیگشتیئەستێرەبیگڵۆ

دادنوسمەکەرۆنیئەنقەرەبازاڕ پێشانگەسەرتاشتەندروستیڕادیۆیانترانسستەر

لە ڕاستیدا هەموو ئەو وشە ئینگلیزی و فەرەنسییانە لەسەر پۆستەرە تەختەکان، دوکان و گۆڤارەکان نووسراون، پیشانیان دەدا کە شارەکەمان بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، بەڵام هێشتاش گۆڕانکارییەکی ئاوەهایان دروست نەکردووە. هیچکام لەو شانازییانەی شارەکە لەلایەن مزگەوتەکان، منارە، بانگی نوێژکردن و مێژووی شارەکەوە ئاماژەیان پێ نەکراوە. هەموو شتێك بە نیوەناچڵی و بێبایەخی و خراپی ماوەتەوە.

گوێزانخۆشحاڵیبەرەوپێشچوونکاتیژەمینیوەڕۆفیلیپسپزیشکی

ڕیپێدراوکۆگایلولکردنیفەرشکەلوپچینیپارێزەرفاخیر

بۆ هەڵهاتن لەم دۆخە، سەردەمی زێڕین بەبیر خۆم دەهێنمەوە، ئەو کاتەی شارەکە پاکیزەتر و درەوشاوەتر بوو، کاتێك شارەکە سەراپای جوانی بوو. هەڵدێم و تەماشای ئەو نیگارانەی شارەکە دەکەم کە مێلین کێشاونی، هەموو ئەو نووسینانەی تر کە لەلایەن گەشتیارە ڕۆژئاواییەکانی وەکو نێرڤاڵ، جوتیەر و دی ئەمیسیس نووسرابوون. بەڵام کاتێك هرزم سوورە لەسەر بیرکرنەوەکانی خۆی، بیرم دەکەوێتەوە کە من تەنها شارەکەم لەبەر ئەو پاکیزەییەی خۆش ناوێت، بەڵکو بەتەواوەتی بە هۆی ئەو خواستە خەماوییەوەیە کە بۆ شارەکە هەمە، بە هۆی ئەو دەنگەی ناخم کە هەموو کەموکوڕییەکانم بیر دەخاتەوە و ئاگادارم دەکاتەوە لەو *هوزنەی* کە بەسەر دیواری شارەکەدا خۆی هەڵواسیوە، یان ئەو ئامێرەی هێشتا وشەکان دەخاتە مێشکمەوە.

شەقامپارەکەتداهاتووتدڵنیاییهەتاوژەمینانخواردنلێدانیزەنگ

سەیرکردنیئەستێرەپارچەییەدەگجلوبەرگگۆرەوی

هەست دەکەم کە بەتەوەواوەتی خەڵکی ئەم شارە نەبم، ئەم بیرکردنەوەیەش پەرێشانم دەکات. کاتێك لەماڵەکەی داپیرەم لە یەکێك لە پشووەکان لەگەڵ خێزانەکەم مەی و بیرەم دەخواردەوە، یان ئەو ڕۆژانەی زستان لەگەڵ هاوڕێ گاڵتەجارە دەوڵەمەندەکانی ڕۆبێرت ئەکادیمی بە ئۆتۆمبێلەکەی باوکیان بەدەوری شارەکەدا دەسووڕاینەوە، هەمان هەستی ئێستام هەبوو کاتێك لە نیوەڕوانی بەهار بە کۆڵانەکانی شاردا پیاسە دەکەم: بیرۆکەیەك لە ناخمدا دروست دەبێت، کە من کەسێکی بێنرخم و خەڵکی هیچ شوێنێك نیم، پێویست دەکات _وەك ئاژەڵێك_ خۆم لە کەسانی دەوروبەرم دووربخەمەوە و لە سووچێکدا خۆم بشارمەوە. ئەوەش ئارەزووی هەڵهاتنە لەو کۆمەڵگایەی کە باوەشی بۆ کردوومەتەوە، لەو یەزدانەی کە هەموو گوناهەکانمان دەبینێت، لێخۆشبوو و بەبەزەییە.

کاتێك چوومە قوتابخانەی ئامادەیی، خواستی تەنهایی هێشتا بەردەوام بوو و هێشتا ئەوەندە گەورە نەبووم وەك بەشێك لە چارەنووسی خۆم سەیری ئەو شتانە بکەم. خەونم بە هەبوونی هاوڕێیەکی باشەوە دەبینی کە هاوەڵیم بکات بۆ سینەما، کاتی ناخۆش، بێکاری و پشووەکانم لەگەڵ بەسەر بەرێت. ڕۆژێك خەونم دەبینی کەسێکی ڕۆشنبیر بناسم و لەگەڵی دەربارەی ئەو وێنانەی کە کێشابوونم و ئەو نووسینانەی خوێندبوونمەوە، گفتوگۆ بکەم، هەرگیز بۆ ساتێکیش بیرم نەکردایەتەوە کە من کەسێکی دۆڕاوم. خەونم دەبینی سێکس کۆتایی بە تەنهاییەکەم بهێنێت، خۆشەویستێکی جوانم هەبێت و لەگەڵ ئەو، خۆشییە قەدەغەکراوەکانم دابەش بکەم. هەرچەندە تەمەنێك لەلایەن ترس و شەرمەوە ئیفلیج کراوم و لە بەدەستهێنانی ئەم خەونانە دوور خرابوومەوە.

لەو ڕۆژانەدا خەم بە هۆی ئەو هەستەوە دروست دەبوو، کە وا بیر بکەیتەوە لە ماڵی کەسێکی تر، لە خێزانێکی تر و شاری کەسێکی تر بیت. لەو کۆمەڵگا گەورەیە _ئەو کۆمەڵگایەی نامۆکان بە برا بانگت دەکەن، ئەو کۆمەڵگایەی هەموومان دەڵێن ئێمە وەك ئەوەی هەموویان سەیری یەك یاریی تۆپپێ بکەن_ خۆم دوور دەخستەوە. ترس ئەو هۆکارە بوو کە بووبووە بەشێکی ژیان، لە کۆتاییدا هەوڵم دەدا وەك کەسانی تر بم و خۆم جیا نەکەمەوە. لە تەمەنی هەرزەکاری توانیم ببم بە کەسێکی کۆمەڵایەتی

و هاوڕێیەتیی هەموو کەسێکم دەکرد، هەردەم چیرۆك و نوکتەم دەگێڕایەوە و بە لاساییکردنەوەی مامۆستاکان، هەموو هاوپۆلەکانم دەهێنایە پێکەنین، کاتێك زۆر درێژەم دەدا بە گەمەکەم، وەك نوێنەرێکی سیاسیم لێ دەهات کە کاروبارە چەپەڵەکان دەگۆڕێت بۆ شێوازێکی ڕێکوپێك. لە پاشاندا، کاتێك لە ژوورەکەم خۆم بەند دەکرد، تەنها ڕێگایەك کە دەمزانی بۆ هەڵهاتن لە جیهانی درۆ و دووڕوویییەکەم، دەستپەڕکردن بوو.

بۆچی هاوڕێیەتیکردن بۆ من ئەوەندە قورس بوو، زیاتر لە هەر کەسێکی تر؟ بۆچی دەبووایە ددانم جیڕ بکەمەوە، بۆ ئەوەی خۆم لە هەندێك شت لا بدەم و دواتر ڕقم لە خۆم دەبوویەوە؟ یاخود بۆچی کاتێك هاوڕێیەتم دروست دەکرد، دەبووایە نواندن و دووڕوویی بکەم؟ هەندێك جار ئەوەندە بەپەرۆشییەوە ڕۆڵم دەگێڕا، لەبیرم دەچوو کە من تەنها نواندن دەکەم، وەك هەر کەسێکی تر، ماوەیەك خۆم دڵخۆش دەکرد، دواتر خەمێك لە شوێنێکی نادیارەوە هەڵیدەکردە سەر ناخم، دەستبەجێ دەمویست بگەڕێمەوە بۆ ماڵەکەم، بۆ ژوورەکەم، بۆ تاریکییەکەم و لە سووچێکدا خۆم لوول بکەم.

هەستم دەکرد ئەوەی منی خستووەتە ئەو دۆخە بێچارەییەوە، خودی ئەستەنبوڵە. نەك تەنها بۆسفۆر، شەوە خێزانییەکان، ڕووناکییەکان و جەنجاڵییەکان خەڵکیان بەیەکەوە دەبەست، بەڵکو شتێکی تر هەبوو کە ڕێگاکەیانی بەیەك دەگەیاند و کاروباری ژیانیانی بەیەکەوە دەبەست، کە من زۆر گونجاو نەبووم لەگەڵی. ئەم جیهانەی (ئێمە) _هەمووان یەك دەناسن، هەمووان یەك ناسنامە، ڕێزگرتنی کەسایەتی و یەك نەریتیان هەیە، هەمووان هەمان باوباپیران، مێژوو و ئەفسانەمان هەیە_ ئەو جیهانە نییە کە تێیدا بتوانم ببم بە (خۆم). هەر کاتێك نواندن دەکەم و نابم بە بینەر، هەست ناکەم لە نیشتیمان بم. تەنانەت لەپاش ئاهەنگی لەدایکبوونێك _تەنانەت ئەو کاتانەی بەئارامی لە هۆڵەکەدا دەسوڕامەوە، دەستم دەهێنا بە پشتی ئەوانی تردا و دەمپرسی: "ئاهەنگەکە چۆنە؟"_ سەیرێکی خۆم دەکرد، وەك ئەوەی خەو بێت، دواتر دەگەڕامەوە بۆ خۆ واندنە گەوجانەکە.



پاش ئەوەی دەگەڕامەوە ماڵەوە، لەپاش بەسەربردنی چەند خولەکێك لە وەبیرهێنانەوەی دووڕووی نواندنەکەم (هەموو جار دایکم دەیپرسی: "بۆچی ئێستا دەرگای ژوورەکەت قوفڵ دەکەیت؟")، دەگەیشتم بەو ئەنجامە کە ئەو ئارەزووی فرتوفێڵە نەك تەنها لە ناخی مندایە، بەڵکو لە ناخی ئەو کۆمەڵگایەدایە کە ئەو پەیوەندییانەی دروست کردووە. بەڵام ئەمە بیرۆکەی نووسەرێکی پەنجا ساڵەیە، کە هەوڵ دەدات فۆرمێك دروست بکات بۆ بیرۆکە شڵەژاوییەکانی هەرزەکارێکی چەند ساڵ لەوەوپێش و بیانگۆڕێت بۆ چیرۆکێکی ناوازە.

لەنێوان تەمەنی شازدە بۆ هەژدە ساڵی، تەنها ڕقم لە خۆم نەبوو، بەڵکو ڕقم لە خێزانەکەم، هاوڕێکانم و کلتوورەکەمان، هەموو ئەو لێدوانە سیاسییانەی پێیان دەگوترێن چی شتێك لە دەوروبەرمان ڕوو دەدات، سەردێڕی ڕۆژنامەکان، هەموو ئەو ڕێگایانە بوو کە دەیانویست جیاواز لە خودی خۆمان بین. پیتەکانی سەر پۆستەر و تەختەی ئاگاداریی سەر شەقامەکان لەناو مێشکمدا دەهاتن و دەچوون. دەمویست ببمە نیگارکێش، دەمویست وەك ئەو شێوەکارە فەرەنسییانە بم کە کتێبم لەبارەیان خوێنبوونەوە. بەڵام من ئەو توانایەم نەبوو کە ئەو جۆرە جیهانە لە ئەستەنبوڵ دروست بکەم، خودی ئەستەنبوڵ ئامادەیی پیشان نەدەدا بۆ پرۆژەکە. تەنانەت خراپترین نیگاری شێوەکارە تورکەکان _دیمەنی مزگەوتەکان، بۆسفۆر، خانووە تەختەکان و شەقامە بەفراوییەکان_ شادومانیان دەکردم، نەك وەك وێنەیەك، بەڵکو وەك

خۆشەویستییەك بۆ شارەكەم. ئەگەر نیگارێك لە ئەستەنبوڵ نەكات، ئەوە بەدڵنیاییەوە نیگارێكی باشە، بەڵام خراپ بێت، ئەوە بەتەواوەتی لە ئەستەنبوڵ دەكات، ئەوەش



دەریدەخات كە پێویستە بوەستم لە سەیركردنی شارەكە وەك هونەر، وەك دیمەنێكی جوان.

هەر لەو تەمەنەدا، مەیلێكی ڕۆژئاوایی لە ناخمدا هەبوو و ئارەزووم دەكرد شارەكەم بەتەواوەتی وەك ئەورووپای لێ بێت، هەروەها هەمان ئارەزووم بۆ خودی خۆیشم هەبوو. بەڵام بەشێكی تر لە ناخمدا هەبوو، دەیویست لەناو ئەو ئەستەنبوڵە گەورە بم بە هەمان نەژاد، نەریت و یادگارییەكانییەوە. كاتێك منداڵ بووم، دەمتوانی هەردوو خواستەكەم بەجیا دابنێم (منداڵ هیچ دوودڵییەكی لە خەونەكانیدا نییە، لە یەك كاتدا دەتوانێت ببێتە كەسێكی دەربەدەر یان زانایەكی گەورە)، بەڵام بە تێپەڕبوونی كات، ئەم توانایەم لەدەست دا. لە هەمان كاتدا، ئەو ماتەمینییەی شارەكە سەری بۆ نوشتاندبوویەوە _هەروەها بەشكۆدارییەوە سەیریان دەكرد_ هێواش هێواش خۆی دەخزاندە ناو ناخمەوە.

بەڵام ڕەنگە سەرچاوەی ئەم خەمە، نە هەژاری و نە ئەو بارگرانییەی *هوزن* بووبێت لەسەر شانم. ئەگەر لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تر ویستبێتم لە سووچێكدا وەك ئاژەڵێكی



مرداربوو بەتەنیا خۆم لوول بكەم، بۆ هێشتنەوەی ئەو خەمەی ناخم بووە، كەواتە چی شتێك بووبووە هۆكاری ئەو خەمە!

## ٣٥

# یەکەم ئاشقبوون

لەبەر ئەوەی کتێبەکە یاداشتنامەیە، ناچارم ناوی ئەو ئافرەتە بشارمەوە، یان ئەگەر ناوم هێنابێت، ئەوا وەکو شیعرەکانی دیڤان بەڵگەیەکم بەکار هێناوە و ئاماژەم داوە بە بەڵگەکە. ناوەکەی لە زمانی فارسیدا بە واتای گوڵی ڕەش دێت، بەڵام ئەوەندەی لێکۆڵینەوەم بۆ کردبێت، بۆم دەرکەوتووە هەر کەسێك لەکەنار دەریاکەوە بینیبێتی کاتێك بازی داوەتە ناو ئاوەکەوە، یان هەموو هاوپۆلەکانی قوتابخانەکەی، سەرسامی جوانییەکەی بوون _قژە درێژە گەشاوەکانی ڕەش نەبوون، بەڵکو قاوەیی بوون، چاوە قاوەییەکانی تەنها سێبەرێکی تاریك بوون. کاتێك پرسیارم لێ دەکرد دەربارەی واتای ناوەکەی، وەکو هەمیشە برۆکانی گرژ دەکرد، کاتێك بەڕاستی بایەخی بە شتێك بدایە، لێوەکانی کەمێك دەردەپەڕاند، وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت بەدڵنیاییەوە دەزانێت ناوەکەی چی مانایەکی هەیە و دەیگوت کە ناوەکەی جێگرەوەی ناوی داپیرە ئەلبانییەکەیەتی.

بەگوێرەی وتەکانی دایکم، دایکی ئەو کچە (ئەو ئافرەتەی کە دایکم (بەو ژنە) ناوی دەهێنا)، زۆر بەگەنجی هاوسەرگیریی کردووە، لەبەر ئەوەی لە بەیانییەکی زستان، ئەو کاتەی من تەمەنم سێ ساڵ و براکەم پێنج ساڵ بووە، دایکم هەردووکمانی بردووە بۆ پارکی ماچکا لە نیشانتاش، لەوێ چاوی کەوتووە بە دایکێکی ڕووخسار منداڵ، لەگەڵ کچە بچووکەکەی کە لەناو عەرەبانە منداڵانەکەیدا بەناو پارکەکەدا سووڕاندویەتیەوە بۆ ئەوەی خەوی لێبکەوێت. یان جارێکیان دایکم باسی داپیرە ئەلبانییەکەی ئەو کچەی بۆ

کردم کە ڕەنگە بە هۆی ئەوەی لە ساڵانی پەیمانبەستنی ئاشتی شتێکی هەڵەی کردبێت، یاخود بە دژایەتیکردنی ئەتاتورك ئابڕووی خۆی بردبێت، لە حەریمسەرا دوور خراوەتەوە. بەڵام من چیتر هیچ بایەخێکم بەو کۆشکی عوسمانییانە نەدەدا کە لەدەوروبەری ئێمەدا سووتێنران، یان بە چیرۆکی ئەو خێزانانەی کە ڕۆژێك تێیاندا ژیاون. جارێکیان باوکم بۆمی گێڕایەوە کە باوکی گوڵی ڕەشی بچکۆلە، بە هاوکاریی چەند ناسیاوێکی گیانیبەگیانی لە چوارچێوەی دەوڵەت، توانیویەتی ببێتە نوێنەری تورکیا لە کۆمپانیاکانی ئەمەریکای نوێ و هۆڵەندا، لە ماوەی یەك شەودا دەوڵەمەند بووە، بەڵام ئاوازی قسەکردنەکانی باوکم، هیچ نارەزاییەکەی دەرنەدەخست.

هەشت ساڵ لەپاش یەکەم چاوپێکەوتنەکەمان لە پارکەکە، خێزانەکەم لە بایرامۆگڵو خانوویەکیان کڕی، کە هاوینانی ئەم شوێنە هاوینەهەواری بەشی خۆرهەڵاتی شارەکە بوو و شوێنی گەشتیاریی دەوڵەمەندە نوێیەکان و مۆدێرنەکانی نێوان ساڵانی شەستەکان و حەفتاکان بوو، هەر لەم شارۆچکەیەدا چاوم کەوتەوە بە گوڵی ڕەش، کاتێك پاسکیلی لێدەخوڕی. لە ڕۆژە خۆشەکانی شارۆچکەکە، ئەوکات هێشتا بچووك بوو و قەرەباڵغ نەبوو، زۆربەی کاتەکانم بە مەلەکردن، گەڕان بە بەلەم بۆ ڕاوەماسی و یاریی دووگۆڵی بەسەر دەبرد و ئێوارانی پاییز، کاتێك تەمەنم بەرەو شازدە ساڵی دەچوو لە یانەکان بە سەماکردن لەگەڵ کچان بەسەر دەبرد. دواتر، لەپاش ئەوەی قوتابخانەی ئامادەییم تەواو کرد، دەستم بە خوێندنی زانستی تەلارسازی کرد و زۆربەی کاتەکانم لە ماڵەوە بە وێنەکێشان و خوێندنەوە بەسەر دەبرد. دەبوو چۆن ڕەفتارم بکردایە، کاتێك هاوڕێکانی قوتابخانەم بە هەر کەسێکیان دەگوت ڕۆشنبیر یان گومانلێکراو یاخود (ونبوو لەناو شتە ئاڵۆزەکان)، ئەگەر هەر کتێبێکی تری جگە لە کتێبی قوتابخانەی بخوێندایەتەوە؟ _واتە تۆ کەسێکی لە ڕووی دەروونییەوە کێشەت هەیە، یاخود تەواو پەرێشانی بە دەستهێنانی پارەیت. زۆر خەمم بوو کە وەك ڕۆشنبیر لەناو هاوڕێکانمدا ناو دەربکەم، هەموو هەوڵێکم دەدا بۆ ئەوەی قایلیان بکەم کە من هیچ لەخۆباییبوونێکم تێدا نییە و تەنها کتێبەکان_ زۆربەی کتێبەکانی ۆڵف، فرۆید، سارتەر، مان و فاولکنیر بوون_ "بۆ خۆشیی خۆم دەیانخوێنمەوە"، دواتر دەیانوت هەر بۆیە هەندێك دێرم دیاری کردووە.

ئەو هاوینەی کە بایەخم بە گوڵی ڕەش دەدا، لەناو هاوڕێکانم ناوبانگێکی خراپم هەبوو _سەرەڕای ئەو ڕاستییەی کە بە درێژایی ئەو وەرزە و وەرزەکانی پێشووتر زۆر بەدەگمەن سەرنجی یەکمان دەدا. کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانم لە نیوەی شەوان دەچوین بۆ دیسکۆ، یان وەکو گرووپێك هاوڕێی دڵخۆش بە ئۆتۆمبێلەکانمان، کە مەرسیدس یان مۆستانگ یاخود بی ئێم دەبلیو بوون، بەرەو شەقامی بەغداد (کە دواتر بە شەقامی پارکی ئاسیا ناسرابوو، تەنها نیوکاتژمێر لە ماڵی ئێمەوە دوور بوو)، پێشبڕکێمان دەکرد (هەندێك جاریش تووشی پێکدادان دەبووین)، یاخود بە بەلەمی یەکێکمان دەڕۆشتین بۆ لاپاڵێکی چۆڵ، چەندین بوتڵی بەتاڵی بیرە و ساردەمەنییەکانمان دەخستە سەر یەك، دواتر بە تفەنگی ڕاوکردنی باوکی یەکێکمان تەقەمان لێ دەکرد. بەو کارە، کچانمان دەترساند (کاتێك دەیانقیژاند، هوشمان لێ دەکردن بۆ ئەوەی بێدەنگ ببن). زۆر جار کاتێك یاریی مۆنۆپۆلی یان پۆکەرمان دەکرد من و گوڵی ڕەش، هیچ سەرنجی یەکمان نەدەدا.

کاتێك هاوین بەرەو کۆتایی دەچوو، کاتبەسەربردن لەگەڵ ئەو کۆمەڵە لاوە ژاوەژاوکەرە بەرەو نەمان دەچوو. لە هەموو مانگێکی ئەیلوول، باوباران و زریان زیانی بەکەنار دەریای ئەو شارۆچکەیە دەگەیاند، هەمیشە یەك تا دوو بەلەمی تێك دەشکاند و بەکارهێنانی یەخت و بەلەمە خێراکانی دەخستە مەترسییەوە. لە کاتێکدا شەستەباران دەباری، گوڵی ڕەش سەردانی دەکردم و دەهات بۆ ژوورەکەم کە وێنەم تێدا دەکێشا و ناوم نابوو ستۆدیۆ. بە هۆی ئەوەی خۆم بە کاغەز و فڵچەکانمەوە یان بە خوێندنەوەی کتێبەکانمەوە خەریك بکەم، زۆربەی هاوڕێکانم لەدەست دا. وەکو هەر کەسێکی تری ئەستەنبوڵ، هەژار، دەوڵەمەند، نێر و مێ، گوڵی ڕەش پێویستی بە کەسێك بوو لەگەڵی بدوێ و کاتەکانی لەگەڵ بەسەر بەرێت.

کۆتایی ئەو هاوینەمان بە وتووات لەبارەی ئەوانی تر بەسەر برد _کێ لەگەڵ کێدا پەیوەندیی سۆزداریی هەیە، کێ ئیرەیی بە کێ دەبات_ بەڵام زۆر بایەخم پێ نەدەدا، چونکە زۆرتر سەرقاڵی وێنەکێشان بووم. گوڵی ڕەش زۆر جار چای بۆ ئامادە دەکردم یان لە کردنەوەی قەباخی ڕەنگەکان یارمەتیی دەدام، دواتر دەگەڕایەوە بۆ جێگەکەی خۆی لە سووچێکدا، پێڵاوەکانی دادەکەند، لەسەر قەنەفەکە ڕادەکشا و دەستێکی وەك

سەرین دەخستە ژێر سەری. ڕۆژێکیان بەبێ ئەوەی ئاگاداری بکەمەوە، سکێچی پاڵکەوتنەکەیم کێشا. دواتر کاتێك زانیم شادومان بوو بەوەی ئەنجامم دا، جاری داهاتوو دەستم کردەوە بە وێنەکێشانی. کاتێك پێم گوت وێنەت دەکێشم، پرسیی: "چۆن بوەستم؟"، وەك ئەستێرەیەکی منداڵ وا بوو کە یەکەم جاری بێت لەبەردەم کامێرادا بوەستێت. شڵەژابوو و نەیدەزانی چۆن دەست و قاچی بوەستێنێت.

کاتێك وێنەیم دەکێشا، سەرنجی لووتە باریکەکەیم دەدا، بزەیەك لەسەر دەمی بچووکی بوو، ناوچەوانی پان و فراوان بوو، بالآی بەرز بوو و لاقەکانی درێژ بوون، بە هۆی کاریگەریی خۆرەوە ڕەنگیان گۆڕابوو بۆ قاوەیی، بەڵام کاتێك دەهات بۆ سەردانی من، تەنوورەیەکی درێژی شیکی لەبەدەر دەکرد کە لە داپیرەیەوە بۆی مابوویەوە، لەبەر ئەوە تەنها دەمتوانی قاچە بچووك و ڕێکەکانی ببینم. کاتێك سەرقاڵی وێنەکێشانی بووم و سەرنجی سنگی بچووکی و ڕەنگ سپیی گەردنی بەرزیم دەدا، شەرمێك لە ڕووخساریدا دەردەکەوت.

لە ماوەی سەردانەکانی سەرەتایدا، زۆر قسەمان دەکرد، بەڵام ئەو زۆربەی قسەکانی دەکرد. لە کاتی قسەکردنیدا، سەرنجی ئەو خەمەم دەدا کە لە چاوی و لێوەکانیدا هەبوو، لەبەر ئەوە زۆر جار دەیگوت: "بەو جۆرە خراپ سەیرم مەکە!" بە شێوەیەکی ساردوسڕ و ڕاستەوخۆ کە پێشبینیم نەدەکرد، باسی ناکۆکیی نێوان دایکی و باوکی و شەڕی بێکۆتای چوار برا بچووکەکەی دەکرد. یان بۆی باس دەکرم کە چۆن خێزانەکەی دەربارەی سزاکانی باوکیان ئاگادارن _وەکو نیشتەجێبوونی بەزۆر و دەستبەسەراگرتنی بەلەمی خێرا و هەندێك جار لێدان_ باسی دڵتەنگیی دایکی دەگێڕایەوە، بە هۆی پەیوەندیی سۆزداریی باوکی لەگەڵ ئافرەتی تر، دەیوت کە دایکی هەردووکمان بە هۆی ئەوەی هەمان خەمیان هەیە، متانەیان بەیەکە، چونکە دەیزانی باوکی منیش بەو جۆرەیە _کاتێك ئەم قسانەی بۆ دەکردم، ڕاستەوخۆ سەیری ناو چاومی دەکرد.

بەهێواشی و بە تێپەڕ بوونی کات، هەردووکمان نوقمی بێدەنگی بووین. هەموو جار کە دەهات بۆ سەردانم، لە هەمان شوێنەکەی جارانی دادەنیشت، یان سەیری نیگارەکانی دەکرد (زۆر سەرسام بوو بە نیگارەکانی بۆنارد)، یاخود هەندێك لەو

کتێبانەی دەخوێندەوە کە دانرابوون لەسەر هەمان قەنەفەی دانیشتن. دواتر وێنەیەکیم دەکێشا یان لەسەر هەمان ڕۆتینی ڕۆژانە بەردەوام دەبووین: لە دەرگای دەدا و دەهاتە ژوورەوە، بە گفتوگۆیەکی کەمتر لە جاران لەسەر قەنەفەکەی سووچەکە ڕادەکشا، سەیری ئەو کتێبەی دەکرد کە دەیخوێندەوە، یاخود هەندێك جار کاتێك وێنەیم دەکێشا، لە سووچێکی چاویەوە تەماشای دەکردم. هەموو بەیانییەك، لەپاش ماوەیەك لە کارکردن، چاوەڕێم دەکرد سەردانم بکات. لەبیرمە هەرگیز زۆر لە چاوەڕوانیدا نەیدەهێشتمەوە، بەڵام کاتێك دەهاتە ژوورەوە، هەمان زەردەخەنەی شەرمنانەی دەکرد هەر بەو جۆرەی کاتێك وێنەم دەکێشا.

یەکێك لە بابەتی گفتوگۆکانمان، باسکردنی داهاتوومان بوو. بە تێڕوانینی ئەو، من کەسێکی بەهرەمەندم و زۆر خۆم ماندوو دەکەم، لەبەر ئەوە دەیگوت: "تۆ دەبیتە شێوەکارێکی ناوداری جیهان _یاخود تۆ بڵێی گوتبێتی شێوەکارێکی بەناوبانگی تورکی؟_ دێیتە ناو قەرەباڵغییەکەی دەوروبەرم و دەڵێم ئەوە هاوڕێی منداڵیمە."

ئێوارەیەکیان بە پاساوی ئەوەی ئاسمان ساماڵە و پەلکەزێڕینە لە لایەکەی تری دوورگەکە دەرکەوتووە، ستۆدیۆ تاریکەکەمان جێ هێشت و بۆ یەکەم جار پێکەوە لە شارۆچکەکە بۆ ماوەیەکی زۆر پیاسەمان کرد. لەبیرمە لەو ماوەیەدا، هیچ قسەیەکمان پێکەوە نەکرد. هەردووکمان نیگەران بووین کە کەسێکی ئاشنا لەو هاوینەهەوارە نیمچەچۆڵە بمانبینێت و هەواڵ بدات بە دایکمان. ئەو شتەی وای کرد پیاسەکردنەکەمان (سەرکەوتوو) نەبێت، دیارنەمانی پەلکەزێڕینەکە نەبوو پێش ئەوەی بگەینە لای، بەڵکو ئەو هەستی پەشۆکانە بوو کە لەنێوانماندا هەبوو. لە کاتی گەڕانەکەماندا، تێبینیم کرد کە ملی گوڵی ڕەش چەندە بەرزە و چەندە بەجوانی دەڕوات بە ڕێگادا.

لە ئێوارەی شەممەی داهاتووتر، بڕیارمان دا دیسان پێکەوە بڕۆینە دەرەوە بەبێ ئەوەی بە هیچکام لەو هاوڕێیانە بڵێین، کە هێشتا لەو هاوینەهاوارە مابوونەوە. ئەم جارەیان ئۆتۆمبێلەکەی باوکم هێنابوو، ئەویش مکیاژی کردبوو، تەنوورەیەکی کورتی لەبەر کردبوو و بۆنێکی ئەوەندە خۆشی لە خۆی دابوو، هەتا ماوەیەك دوای ئەوەش، بۆنەکەی لە ئۆتۆمبێلەکەدا مابوویەوە. بەڵام پێش ئەوەی بڕۆین بۆ هەمان شوێنی پێشوو، هەستم بە هەمان تارمایی کرد کە وای کرد گەشتەکەی پێشوومان سەرکەوتوو

نەبێت. هەرچەندە شوێنێکی چۆڵ بوو، بەڵام یانەیەکی پڕ لە ژاوەژاوی لێ بوو. لە کاتێکدا لەوێش دەمانویست هەمان بێدەنگی ماوەدرێژی ستۆدیۆکەم دووبارە بکەینەوە _لەو کاتەدا بۆم دەرکەوت بێدەنگییەکانمان چەندە قووڵن_ لەگەڵ موزیکێکی هێواش سەمامان دەکرد. کاتێك بینیم ئەوانی تر هەمان شت دەکەن، منیش وەك ئەوەی هەستێکی لەخۆوە بێت، دەستم خستە دەوری ناوقەدی و نزیکم کردەوە لە خۆم، لەو کاتەدا کە نزیکتر بوو لێمەوە، قژەکانی بۆنی بادەمیان لێ دەهات. لە کاتی نانخواردن، ئەوەی سەرنجی ڕادەکێشام جووڵانی کەمی لێوەکانی بوو.

لە کاتی گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە، بێدەنگییەکەم شکاند و لێم پرسی: "حەز دەکەیت وێنەت بکێشم؟"، بەبێ ئەوەی هیچ پەرۆشییەکی پێوە دیار بێت، ڕازیبوونی خۆی دەربڕی. بەڵام کاتێك دەست لەناو دەست بە باخچە تاریکەکەماندا دەچووین، بینیم گڵۆپی ستۆدیۆکەم کراونەتەوە _تۆ بڵێی کەسێك لە ژوورەکەم بووبێت؟_ ئیتر بیروڕای خۆی گۆڕی و نەهات هەتا وێنەی بکێشم.

سێ ڕۆژ لەپاش ئەو ژووانەمان، هەموو دوانیوەڕۆیەك سەردانی دەکردم: لەسەر قەنەفەکە ڕادەکشا _سەیری نیگارەکانمی دەکرد، کتێبی دەخوێندەوە، یان لە پەنجەرەکەوە سەیری دەریاکەی دەکرد_ دواتر هەو بەو جۆرەی کە هاتبوو، بەبێدەنگی دەڕۆیشتەوە.

بە درێژایی مانگی تشرینی یەکەم، لە ئەستەنبوڵ هیچ لە خەیاڵم نەبوو پەیوەندی بە گوڵی ڕەشەوە بکەم. ئەو کتێبانەی زۆر بەپەرۆشییەوە دەمخوێندنەوە، ئەو وێنانەی بەخێرایی دەمکێشان، هاوڕێ چەپەکانم، مارکسیستەکان ئەوانەی لە ڕارەوەکانی زانکۆ شەڕیان بە یەك دەفرۆشت، نەتەوەپەرستەکان و پۆلیسەکان _هەموو ئەمانە هۆکار بوون بۆ ئەوەی شەرم بکەم لە هاوڕێکانی هاوینم، کە لە هاوینەهەوارە خۆشەکان دەمانەوە کە چوونەژوورە و هاتنەدەرەوەی زۆر قورس بوو بە هۆی پاسەوانەکانیانەوە.

بەڵام لە ئێوارەیەکی مانگی تشرینی دووەم، ئەو کاتەی گەرمکەرەوە سەرەکییەکان هەڵکرابوون، تەلەفۆنم بۆ ماڵی گوڵی ڕەش دەکرد. کاتێك دایکی تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، دامخستەوە بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکەم. ڕۆژی دواتر پرسیارم لە خۆم کرد، کە بۆچی دەبێت ئەم تەلەفۆنە بێمانایانە بکەم، هێشتا درکم

نەکردبوو کە کەوتوومەتە داوی خۆشەویستییەوە، هێشتا نەمزانیبوو دەبێت بچمە ژێر باری شتێکی ترەوە.

یەك هەفتە دواتر، لە ئێوارەیەکی تری سارد و تاریکدا، جارێکی تر تەلەفۆنم کردەوە بۆ ماڵی گوڵی ڕەش، خۆشبەختانە ئەم جارەیان خۆی وەڵامی دایەوە. هەموو ئەو وشانەی لە سووچی بەشێکی مێشکمدا دامنابووم، بەبێ ئەوەی بەشەکەی تر ئاگادار بێت، بە شێوەیەکی مەشقپێکراو، دەستم کرد بە گوتنیان: "ئەو وێنەیەت لەبیرە لە کۆتایی هاوین ئامادەم کردبوو؟ هیوادارم ئێستا بتوانم تەواوی بکەم، کەواتە تەنیا دوانیوەڕۆیەك دەتوانێت بێیت، هەتا تەواوی بکەم؟،

پرسیی: "ئایا هەمان جلوبەرگ بپۆشمەوە؟"

بیرم لەو پرسیارە نەکردبوویەوە، لەبەر ئەوەی گوتم، "بەڵێ، هەمان جل بپۆشەوە."

چوارشەممەی دواتر ڕۆیشتم بۆ بەر دەرگای قوتابخانەی دام دی سیۆن، کە دایکم ڕۆژێك لەوێ قوتابی بووبوو، دواتر گوڵی ڕەش لە قوتابخانەکە هاتە دەرەوە و پێکەوە ڕۆشتین، بەڵام ئەم جارەیان پێم باش بوو خۆمان دوور بگرین لە جەنجاڵیی دایکم، باوکم، چێشتلێنەر و ئەو پاسەوانانەی لەبەردەم دەرگاکە چاوەڕێیان دەکرد. وەکو هەندێك لە لاوەکان، پێم باش بوو لەپشت درەختی کەنار شەقامەکان دابنیشین و خۆمان بشارینەوە. ئەو کاتەی چاوەڕێم دەکرد، سەدان کچ لە دەرگای قوتابخانەکەوە دەهاتنە دەرەوە، هەموویان جلوبەرگی ڕەسمیی کاسۆلیکیی فەرەنسیی تایبەت بە قوتابخانەیان پۆشیبوو _تەنوورەیەکی شینی تۆخ، لەگەڵ کراسی سپی_ کاتێك لەناو قەرەباڵغییەکەدا دەرکەوت، بە جۆرێك دیار بوو کە تووڕە بێت لێم، قژەکانی لەدواوە بەستبوون و کتێبەکانی قوتابخانەی لە دەست بوون، چونکە لەناو جانتاکەی ئەو جلانەی تێدا بوو کە بڕیار بوو بۆ وێنەکە بیانپۆشێت.

کاتێك زانیی ناچینەوە بۆ ئەو ماڵەی کە دایکم چای پێشکەش دەکرد، بەڵکو بۆ ئەو باڵەخانەیەی جیهانگیر دەڕۆین کە دایکم ڕێگەی دابوو وەك ستۆدیۆیەك بەکاری بهێنم، کەمێك نیگەران بوو. بەڵام کاتێك لەوێ بینیی ئاگردانەکەم داگیرساند و قەنەفەکەم پاڵ پێوە دا هەروەك ئەوەی ماڵە هاوینییەکەمان، بۆی دەرکەوت کە من

بەڕاستی دەمەوێت وێنەی بکێشم، ئینجا هێمن بوویەوە و جلەکانی قوتابخانەی گۆڕی بۆ هەمان جلە درێژەکانی ئەو کاتەی هاوین، کە لەسەر قەنەفەکە ڕاکشابوو.

بەم جۆرە بوو، بەبێ ئەوەی وەك پەیوەندیی سۆزداری خۆی پیشان بدات، پەیوەندیی نێوان شێوەکارێکی نۆزدە ساڵان لەگەڵ مۆدێلە جوانەکەی، دەستی بە سەماکردن کرد لەگەڵ جۆرە موزیکێك کە خۆیشمان لە نۆتەکانی تێنەدەگشتین. لە سەرەتادا دوو هەفتە جارێك دەهات بۆ ستۆدیۆکەی جیهانگیر، دواتر بوو بە هەفتەی جارێك. سەرلەنوێ دەستم کردەوە بە نیگارکێشانی کچێکی گەنج، بەڵام بە هەمان شێوازی پێشوو (کچێکی گەنج لەسەر قەنەفەیەك ڕاکشابوو)، بەڵام ئەم جارەیان تەنانەت لە هاوینی پێشووتر کەمتر قسەمان دەکرد. ژیانی ڕاستەقینەم پڕ بوو لە جەنجاڵی، خوێندنی تەلارسازی، کتێبەکانم، خەونم بۆ بوون بە نیگارکێش، دەترسام شتێك بێتە ناو پاکیزەیی دونیاکەی ترم و وێرانی بکات، لەبەر ئەوە کێشەکانی ڕۆژانەم بۆ کچە مۆدێلە شۆخ و خەمبارەکەم باس نەدەکرد، نەك لەبەر ئەوەی وا بیرم کردبێتەوە کە لە قسەکانم تێناگات، بەڵکو دەمویست هەردوو جیهانەکەم جیا لە یەك بهێڵمەوە. بایەخدان و پەیوەندیم چیتر لەگەڵ هاوڕێکانی هاوینم و هاوپۆلەکانم، ئەوانەی دەیانویست ببنە خاوەنی کارگەکانی باوکیان، نەما. بینینی گوڵی ڕەش هەفتەی جارێك، شادومانی دەکردم.

لە ڕۆژانی باراندا، کاتێك لە هەمان باڵەخانەی جیهانگیر دەماینەوە، وەکو جاران کاتێك لە ماڵی پوورم میوان بووم، ئۆتۆمبێل و بارهەڵگرەکان ململانێیان دەکرد لەسەر ڕێگا چەوڕێژکراوەکانی کۆڵانە تەسکەکانەدا، بۆ ئەوەی سەر بکەونە سەرەوەی کۆڵانەکە، گوێمان لە هەموو ئەو دەنگانە دەبوو. لە ماوەی بێدەنگییە زۆرەکەمان _بەڵام هەرگیز بێزارکەر نەبوو_ جارجار چاومان دەبڕییە چاوی یەك. لە سەرەتادا لەبەر ئەوەی هێشتا منداڵ بوو، بە هۆی ئەم جۆرە شتانەوە زەردەخەنەی دەکرد، دواتر لە ترسی ئەوەی شێوازی وەستانەکەی تێك بدات، دەستبەجێ لێوەکانی دەگەڕاندەوە سەر شێوازی پێشوو و چاوە قاوەییە تاریکەکانی دەبڕییە چاوم، لەگەڵ هەمان بێدەنگیی دووروودرێژ. کاتێك سەرنجی ڕووخساریم دەدا، لە دەربڕینەکانیەوە دەمتوانی تێبگەم لەو کاریگەرییەی هەیبوو لەسەرم. کاتێك بەبەردەوامی و بەبێ وەستان سەیری چاوەکانی و

ئەو چەمانەوەم دەکرد کە لە گۆشەی لێویەوە دروست دەبوو _نەیدەتوانی زەردەخەنە بکات_ دەمزانی ئەویش ئەو جۆرە سەیرکردنە بەردەوامە، شادومانی دەکات. جارێکیان کاتێك بە کەمێك دڵخۆشی و بە کەمێك تووڕەییەوە پێکەنی، منیشی هێنایە پێکەنین ( فڵچەکەی دەستم بەبێئاگایانە لەسەر وێنە ڕۆنییەکە دەجوولا)، مۆدێلە جوانەکەم، شێوازی وەستانەکی تێك دا و دەیویست بپرسێت کە بۆچی بەو شێوەیە پێدەکەنم.

"دڵخۆشم، کاتێك دەبینم بەو جۆرە پێدەکەنیت."

لە ڕاستیدا ئەم ڕستەیە نەك تەنها ڕوونی کردەوە کە بۆچی پێدەکەنێت، بەڵکو دەریدەخست کە بۆچی هەموو هەفتەی جارێك دێت بۆ ئەم باڵەخانە تۆزاوییەی جیهانگیر. چەند هەفتەیەك دواتر، کاتێك هەمان زەردەخەنەم بینییەوە لەسەر لێوەکانی، فڵچەکەی دەستم دانا و ڕۆیشتم لەتەنیشتیەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشتم، هەر بەو جۆرەی کە چەندین هەفتە خەونم پێوە دەبینی، لە کۆتاییدا بوێریی ئەوەم هەبوو ماچێکی بکەم.

لەبەر ئەوەی ئاسمان ڕەش بوو، تاریکییەکەی ژوورەکە ئاسوودەیی پێ دەبەخشین، باوبۆرانە درێژخایەنەکە بەرەو پێشەوەی دەبردین، بەبێ ئەوەی کۆسپمان بۆ دروست بێت. لەسەر ئەو قەنەفەیەی کە پێکەوە ڕاکشابووین، ڕووناکیی پشکنەری ئەو کەشتییانەمان دەدی کە بە بۆسفۆردا تێدەپەڕین و بەناو ئاوە تاریکەکەدا بەرەو دیواری باڵەخانەکان دەڕۆیشتن.

بەبێ ئەوەی نەریتی جارانمان بگۆڕین، بەبەردەوامی یەکترمان دەدی. ئیتر زۆر دڵخۆش بووم لەگەڵ کچە مۆدێلەکەم، بەڵام بۆچی دەبێت لە بارودۆخێکی ئاوەهادا هەموو هەستەکانی ترم _خۆشییە بێماناکان، چاوچنۆکی، ترسەکانم، هەموو کاردانەوە سۆزدارییەکانم_ بشارمەوە، لە کاتێکدا لە داهاتوودا زۆر بەبەخشندەییەوە دەریاندەبڕم؟ لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا هەستم پێ نەدەکردن، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بووبێت پەیوەندییە نەریتییەکەی نێوانمان _ئەو شتەی کە پێکەوەی بەستبووین_ پێویستی بە بێدەنگی بووبێت. یاخود لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت، کە دەمزانی ئەگەر ڕۆژێك هاوسەرگیریی لەگەڵ بکەم _بە شەرمێکی منداڵانەوە بیرم لەم شتە دەکردەوە_ دەبێت ببمە خاوەنی کارگەیەك، نەوەك ببمە شێوەکارێك.

لەپاش نۆ چوارشەممە لە وێنەکێشان و خۆشەویستیی بێدەنگ، کەمێك نیگەرانی کەوتە نێوان شێوەکارە دڵخۆشەکە و کچە مۆدێلەکەی. دایکم زۆرتر چاودێریی دەکردم، کاتێك دەچوو بۆ باڵەخانەکەی جیهانگیر بۆ کۆکردنەوەی کەلوپەلە کۆنەکانی، دەیتوانی جیاوازی بکات لەنێوان نیگارەکانی بۆنارد و کچە مۆدێلەکەم. هەموو کاتێك وێنەیەکم تەواو دەکرد، کچە مۆدێلە قژ قاوەییەکەم دڵی دەشکاندم، بە گوتنی: "ئایا ئەو وێنەیە لە من دەکات؟" (گرنگ نەبوو کوڕە زیرەکەکەی وەڵامی بداتەوە)، لەپاش ماوەیەك، هەردووکمان دڵخۆش دەبووین کە دایکم توانیویەتی گوڵی ڕەش لە وێنەکەدا بناسێتەوە _ئەمەش وەڵامی پرسیارەکەی دەدایەوە_ لە هەمان کاتدا دەترساین کە تەلەفۆن بکات بۆ دایکی گوڵی ڕەش، چەنەبازی بکات و لەبارەی پەیوەندییەکەمان قسە بکات (لە کاتێکدا دایکی گوڵی ڕەش وای دەزانی کچەکەی هەموو چوارشەممەیەك وانەی دراما دەخوێنێت، لەبارەی باوکە تووڕەکەشی با هەر باسی نەکەین).

لەوەودا کۆتاییمان بە ژووانەکانی چوارشەممان هێنا، ئیتر لە ڕۆژەکانی تردا، چاومان بە یەك دەکەوت، بۆ نموونە" لەو نیوەڕوانانەی کاتێك پێشوەخت لە قوتابخانە دەهاتە دەرەوە، یاخود هەندێك بەیانییان کە من نەدەچوومەوە بۆ قوتابخانە. لەبەر ئەوەی چاودێرییەکانی دایکم بەردەوام بوون، کاتی تەواومان نەبوو بۆ وێنەکێشان و بێدەنگیی زۆر و لەبەر ئەوەی هاوکاریی هاوپۆلێکم کردبوو _تاوانێکی سیاسیی ئەنجام دابوو_ تا لەدەست پۆلیس ڕزگاری بکەم، لە باڵەخانەکەی ئێمە خۆی شاردبوویەوە، چیتر پێکەوە نەدەڕۆشتین بۆ باڵەخانەکەی جیهانگیر، لەبری ئەوە لە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵ پیاسەمان دەکرد، بەڵام دوور لە نیشانتاشی، تاقسیم ، بیۆگلۆ و هەڵدەهاتین لە هەموو ئەو ناسیاوانەی پێمان دەگوتن (هەموو کەسێك)، لەجیاتی ئەوە، پیاسەیەکی چوار خولەکیمان دەکرد لە قوتابخانەی دام دی سیۆن لە حەربیە، یاخود لە زانکۆکەی من لە تەشکیشلە، یاخود بە پاس دەڕۆشتین و کەمێك دوور دەکەوتینەوە.

پیاسەکەمان لە مەیدانی بەیازیتەوە دەستی پێ کرد، لەوێ کافێی چنارلتی هەبوو کە هەروەك شکڵی کۆنی خۆی مابوویەوە (تەنانەت لەپاش ئەنجامدانی مانۆڕی سیاسی لە دەوروبەری دەرگاکانی زانکۆی ئەستەنبوڵ، کە ببووە شوێنێکی باوی کۆبوونەوەی کوڕەکانی ئەو ناوچەیە و هەرگیز هیوایان لەدەست نەدەدا لە چاوەڕوانیدا دەمانەوە،

هیچ نەگۆڕابوو)، کتێبخانەی نەتەوەی بەیازیتم پیشان دەدا و شانازیم پێوە دەکرد کە دەمبینی لەبەرگێڕاوەی هەر کتێبێکی تێدایە کە ڕۆژێك لە تورکیا بڵاو کراوەتەوە، دەڕۆیشتین بۆ بینینی بازاڕی سەهەفلەر کە بازاڕی فرۆشتنی کتێبی دەستی دوو بوو، لەوێ لە ڕۆژە ساردەکاندا، فرۆشیارە دێرینەکان لە دوکانە بچووکەکانیان لەدەوری زۆپایەکی گاز یاخود کارەبایی لە چاوەڕوانیدا دانیشتبوون، خانووە لە تەختە دروستکراو و بێ بۆیەکانی ڤیزنسیلەر، شوێنەوارە وێرانبووەکانی بێزەنتە و هەموو ئەو کۆڵانانەم پیشان دەدا کە لە قەراغەکانیان درەختی هەنجیر ڕیزیان بەستبوو، یان دەڕۆشتین بۆ دوکانی ڤێفا بۆزا کە ئێوارانی زستان مامم هەموومانی دەبرد بۆ ئەم دوکانە بۆ خواردنەوە بەناوبانگەکەی ئەرزنی ترشاو، لەوێ پەرداخی بۆزای ئەتاتورکم پیشان دەدا، کە ئێستا لە چوارچێوە نراوە و لەسەر دیوار هەڵواسراوە. ئەو کچە دەوڵەمەندە (مۆرك ئەورووپییەی) نیشانتاشی کە شارەزای هەموو دوکانە مۆدێرنەکانی بەبەك و تاقسیم بوو، لە هەموو ئەو شتانەی پیشانم دا لە کۆڵانە هەژار و خەماوییەکانی ئەستەنبوڵ و ئەودیوی کەنداوی زێڕین، تەنها پەرداخی بۆزای بەلاوە سەرنجڕاکێش بوو، کە بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵ بوو نەشۆرابوون. هاوڕێکەم، هەروەك من دەستەکانی دەخستە باخەڵی چاکەتەکەیەوە، هەروەك من حەزی دەکرد بەخێرایی بگەڕێین، هەروەها زۆر بەسەرنجەوە دەیڕوانیە شتەکان، هەر بەو جۆرەی کە من پێشتر دوو یان سێ ساڵ پێشتر لەم شوێنانەدا دەگەڕام. هەستم دەکرد زیاتر نزیکە لێمەوە و زۆر دڵخۆش بووم بە هاوەڵیکردنی، ئەم هەستەش تووشی ئازاری دەکردم، چونکە دەمزانی ئەوەش نیشانەیەکی تری کەوتنە داوی خۆشەویستییە.

هەروەك من، کاتێك یەکەم جار چاوی بە کۆڵانەکانی دواوەی سولەیمانیە و زیرەك کەوت، سەرەتا هەستی بە نیگەرانی کرد، خانووە تەختەکان بە جۆرێك دەردەکەوتن، وەك ئەوەی بە بچووکترین لەرزە دابڕووخێن. چۆڵی و بێدەنگیی ئەو مۆزەخانەیەی نیگار و پەیکەری لا جوان بوو کە تەنها پێنج خولەك لە وێستکەی وەستانی پاسەکانەوە دوور بوو، ڕێك بەرامبەر قوتابخانەکەی خۆی. کانیاوە پشتگوێخراوەکان، پیاوە ڕیشسپی و کڵاوڵەسەرەکان کە لە قاوەخانەکانەوە سەیری دەرەوەیان دەکرد، ئەو پیرەژنانەی کە لە پەنجەرەکیانەوە سەیری هەر ڕێبوارێکیان دەکرد کە بەبەردەمیاندا تێدەپەڕی،

خەڵکی ئەو کۆڵانانە هەوڵیان دەدا بزانن کە ئێمە کێین، بە دەنگێکی ئەوەندە بەرز قسەیان دەکرد، کە گوێمان لێیان بوو: "براکەم، چۆن سەیری ئەو دوانە دەکەیت؟ لەوانەیە خوشك و برا بن، وا نییە؟ سەیر بکە بە ڕێگای هەڵەدا چوون!" _هەموو ئەم شتانە، هەمان خەم و شەرمەزارییان لە ناخی گوڵی ڕەشدا زیندوو دەکردەوە کە پێشتر بەسەر منیش هاتبوو. لە ماوەی گەشتەکەمان، لەلایەن چەند منداڵێکی بچووکەوە ڕێگەمان پێ گیرا کە دەیانویست هەندێك خشڵی بچووك و هەرزانیان لێ بکڕێن، یان بەکورتی نیازیان بوو لەگەڵمان بدوێن، "ڕێبوار، ڕێبوار، ناوتان چییە؟"، بەڵام گوڵی ڕەش بێزار نەبوو لێیان یان بپرسێت: "ئێوە چۆن دەزانن کە ئێمە بیانین؟" لە ماوەی گەشتەکەمان، خۆمان دوور دەگرت لە بازاڕی داخراو و بازاڕەکانی نور عوسمانیە. کاتێك ڕووبەڕووی هەستێکی شڵەژاوی و پەشۆکاوی بووینەوە _نەیدەویست بگەڕێینەوە بۆ وێنەکێشان لە ماڵەکەی جیهانگیر_ گەڕاینەوە بۆ بەشیکتاش، ئەو شوێنەی بە هۆی ئەو مۆزەخانەیەی نیگار و پەیکەر کە لەوێ هەبوو، هەردەم سەردانمان دەکرد. دواتر سواری بەلەمێکی بچووك دەبووین بەپێی پێویستی کات، بۆ ئەوەی سەیری بێستانە بێ گەڵاکان و دەریاکە بکەین کە ئاوەکەی لەبەردەم *یاڵەکان* بە هۆی هەوای باکوورەوە دەلەرزی و ڕەنگی دەگۆڕا، لەگەڵ سەیرکردنی ئەو باخچانەی کە پڕ بوون لە درەختی سنەوبەر، لە بۆسفۆر دوور دەکەوتینەوە. چەند ساڵ دواتر پرسیارم لە خۆم دەکرد، کە بۆچی لە ماوەی گەشتەکانی دەریادا، هەرگیز دەستی یەکمان نەگرت، ئەوەش دەبێت بە هۆی چەند هۆکارێکەوە بووبێت: (١) ئەو کاتە هەردووکمان دوو هەرزەکاری شەرمن بووین، بە شەقامەکانی ئەستەنبوڵدا دەگەڕاین نەك لەبەر ئەوەی ویستبێتمان هەست بە خۆشەویستییەکەمان بکەین، بەڵکو بۆ ئەوەی بیشارینەوە. (٢) ئەو ئەویندارانەی لەبەرچاوان دەستی یەك دەگرن، زۆر شادومانن و دەیانەوێت هەموو کەسێك کامەرانییەکەمان ببینێت، بەڵام ئێمە، سەرەڕای ئەوەی نەماندەویست قبوڵی بکەین بە هۆی ئەو پەیوەندییەوە دڵخۆشین، دەترساین خۆشەویستییەکەمان دەربخەین. (٣) ئەو ئاماژەیەی خۆشحاڵییەکەی هەردووکمانی ڕەوانەی ئەو شوێنە ناخۆش و خەمبارانە کردبوون. (٤) هەردووکمان لەناو ماتەمینیی ئەو گەڕەکە هەژارانەدا نقوم بووبووین، کە سەیرمان دەکردن.

کاتێك ماتەمینیی ئەو شوێنانە زۆر کاریگەرییان دەکردە سەرم، دەمویست دەستبەجێ بگەڕێمەوە بۆ جیهانگیر، بۆ ئەوەی وێنەیەك بکێشم کە زۆر نزیك بێت لەم دیمەنانەی ئەستەنبوڵەوە، هەرچەندە هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو کە وێنەکە چۆن دەردەچێت. دواتر بیرم دەکەوتەوە کە مۆدێلە جوانەکەم لە ڕوویەکی ترەوە خەمی ئەو شوێنانە دەبینێت، بەمەش هەوڵم دەدا چاوم پێی بکەوێت و کۆتایی بە وەهمەکەم بهێنم.

بەڵام کاتێك لە تاقسیم چاوم پێی کەوت، گوتی: "ئەمڕۆ زۆر هیلاکم، ئەگەر دیسانەوە بڕۆینەوە بۆ ئەو گەڕەکە هەژارانە، ئەوا خراپتر دەبمم. بە هەرحاڵ، ئێستا زۆر کاتمان نییە."

یەکێك لەو چاکەتە سەربازییانەم لەبەر کردبوو کە قوتابییە چەپڕەوەکان لەو ڕۆژانەدا لەبەریان دەکرد، ڕیشم نەتاشیبوو، بیرم دەکردەوە لەوانەیە بەم جۆرە ڕووخسارەوە نەهێڵن بچمە ناو هۆتێل هیلتۆن. ئایا پارەی تەواوم پێ بوو بۆ کڕینی چایەك؟ پاش ماوەیەك چووینە ناو هۆتێلەکەوە. لە هۆڵی هۆتێلەکە هاوڕێیەکی سەردەمی منداڵی باوکم دانیشتبوو، کە وەك ئەورووپییەك خۆی دەردەخست و هەموو نیوەڕۆیەك لە هۆڵی پێشوازیی ئەو هۆتێلە چای دەخواردەوە، لەپاش ماوەیەك منی ناسییەوە، تەوقەی لەگەڵ خۆشەویستەکەم کرد و بە گوێمدا چپاندی، کە خۆشەویستەکەم زۆر جوانە. بۆ ماوەیەك، هەردووکمان لەگەڵ ئەوم پیاوە سەرقاڵ بووین.

دواتر کاتێك پێکەوە دانیشتبووین، گوڵی ڕەش گوتی: "باوکم دەیەوێت لە قوتابخانەی ئێرە دەرمبهێنێت و بمنێرێت بۆ سویسرا!" لەو کاتەدا، دڵۆپێك فرمێسك لە چاوە گەورەکانییەوە کەوتە ناو کوپی چایەکەوە.

"بۆچی؟"

خێزانەکەی بە پەیوەندییەکەی ئێمەیان زانیبوو. ئایا هەرگیز پرسیارم لێ کرد لە ئێمە مەبەستی کێیە؟ ئا ئەو کوڕەی لەپێش منەوە گوڵی ڕەشی خۆش ویستبوو، بە هەمان شێوە باوکی تووڕە بوو لێی؟ بۆچی ئەوندە گرنگ بووم لەلای؟ لەیادم نییە ئەم پرسیارانەم لێ کردبێت. ترس و خۆشەویستی دڵیان کوێر کردبووم و زۆر نیگەران بووم

و دەترسام گوڵی ڕەش لەدەست بدەم _بەبێ ئەوەی بیرم لەو ئازارە کردبێتەوە، کە دوای لەدەستدانی ئەو چاوەڕێی دەکردم_ لە هەمان کاتدا تووڕە بووم کە ڕەتی دەکردەوە لەسەر قەنەفەکە ڕابکشێت، منیش سەیری بکەم و خۆشەویستیی بۆ دەرببڕم.

ئینجا پێم گوت: "ئەم چوارشەممەیە دەتوانین لە جیهانگیر قسە بکەین، نووریی هاوڕێم شوێنەکەی جێ هێشتووە و ئێستا چۆڵە."

بەڵام جاری داهاتوو کە یەکمان بینی، ڕۆیشتین بۆ مۆزەخانەیەکی نیگار و پەیکەر. سەردانکردنمان بۆ ئەم مۆزەخانەیە کردبوویە خوو، چونکە لە قوتابخانەوە بەئاسانی دەمانتوانی سەردانی بکەین و شوێنێکی چۆڵ بوو، دەمانتوانی بەئاسانی یەکتر ماچ بکەین، لەسەروو هەموو شتێکەوە، ڕزگاری دەکردین لە تاریکیی شارەکە. بەڵام دوای ماوەیەك، مۆزەخانە چۆڵەکە و نیگارە پشگوێخراو و خراپەکانی، تووشی خەمێکی زیاتر لە خەمی شارەکەی کردین. لەبەر ئەوەی پاسەوانەکان دەیانناسین و لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی تر دوامان دەکەوتن، یان لەبەر ئەوەی هەستی ورووژاندنی زیاتری لا دروست دەکردین، ئیتر لەناو مۆزەخانەکە یەکمان ماچ نەدەکرد.

بەڵام لە ڕۆژانی دواتر بۆ ئەوەی لە خۆشییەکەمان بەردەوام بین، لەسەر یەك ڕۆتین ماینەوە. کاتێك دەچووین بۆ مۆزەخانەکە، هەریەکەمان کارتی قوتابخانە و زانکۆمان پیشانی دوو پاسەوانە بەتەمەنەکە دەدا، ئەوانیش هەر وەکو پاسەوانی مۆزەخانەکانی تری ئەستەنبوڵ، بە گرژی و تووڕەییەوە سەیریان دەکردین، وەك ئەوەی بپرسن: "دەبێت کارتان چی بێت لە بینینی ئەو شوێنە؟" پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ بڕۆینە ژوورەوە بۆ ناو مۆزەخانە بچووکەکە بۆ بینینی نیگارەکانی بۆنارد و ماتیس، بە بزەیەکی درۆوە سڵاومان لە دوو پاسەوانەکە دەکرد، دواتر بەخێرایی تێپەڕ دەبووین بەلای نیگارەکانی ئەو شێوەکارە ئەکادیمییە تورکانە کە لەسەر نیگارەکانیان ناوی هەموو ئەو مامۆستا ئەورووپییانەیان نووسیبوو کە لاساییان کردبوونەوە، وەکو سیزان، لێجر و بیکاسۆ. ئەوەی ئێمە نائومێد دەکرد، ئەو شێوەکارانە نەبوون کە قوتابخانەی سەربازییان تەواو کردبوو و دواتر لە ئەورووپا خوێندبوویان و لەژێر کاریگەریی شێوەکارە ئەورووپییەکان بووبوون بە هونەرمەند، بەڵکو بە هۆی ساردیی خۆشەویستی

ئەم هونەرمەندانە بوو بۆ شارەكە لە نیگارەكانیاندا، كە زۆر بەكەمی هەست و ڕۆحی شارەكەیان پیشان دابوو.

بەڵام هۆكاری سەرەكیی هاتنی ئێمە بۆ ئەم باڵەخەنایە، كە یەكەم جار بۆ شازادە جێنشینەكانی كۆشكی دۆڵمەباخچە دروست كرابوو و تەنها چەند هەنگاوێك دوور بوو لەوماڵەی كە ئەتاتورك تێیدا كۆچی دوایی كرد، گەلەرییە چوڵ و نارێكەكان نەبوون، باڵكۆنییە جوان و نایابەكانی سەردەمی عوسمانی نەبوون كە لەپاش هەژارییە سەختەكەی ئەستەنبوڵ نۆژەن كرابوونەوە، یان دیمەنی جوانی بۆسفۆر نەبوو كە لە پەنجەرە گەورەكانی مۆزەخانەكەوە جوانتر دەردەكەوت و سەرنجڕاكێشتر بوو زیاتر لەو وێنانەی لەسەر دیوارەكان هەڵواسرابوون، ئەوەی ئێمەی دەبەستەوە بەم شوێنە، نیگارێك كە زۆر بەلامەنەوە خۆشەویست بوو. نیگاری (ئافرەتی ڕاكشاو)ی خەلیل پادشا بوو. لەدوای چاوپێكەوتنەكەمان لە دیوانەكەی هۆتێل هیلتۆن، هەموو جارێك دەهاتین بۆ ئەم مۆزەخانەیە و ڕاستەخۆ دەڕۆیشتین بۆ لای ئەم نیگارە: لە وێنەكەدا مۆدێلەكە ئافرەتێكی گەنج كە پێڵاوەكانی دانابوو، ئەمەش یەكەم جار كە نیگارەكەم دی، زۆر سەرسامی كردم، لەسەر قەنەفەیەك ڕاكشابوو و بەخەمبارییەوە سەیری وێنەكێشەكەی (هاوسەرەكەی؟) دەكرد و یەكێك لە دەستەكانی وەك سەرین خستبوویە ژێر سەری، هەروەك كچە مۆدێلەكەی من كە زۆر جار وای دەكرد. تەنها لێكچوونەكانی لەگەڵ نیگاری مۆدێلەكەی من سەرنجی ڕانەكێشام، لە سەرەتادا كە دەچووین بۆ ئەو بەشە بچووكەی گەلەرییەكە، ماچی یەكمان دەكرد و ئافرەتی ناو وێنەی سەر دیوارەكە سەیری دەكردین. كاتێك گوێبیستی تەپەتەپی پێی پاسەوانەكان دەبووین، كاتێك بەسەر تەختەی زەوییەكەدا تێدەپەڕین و بەرەو لای ئێمە دەهاتن، لە ماچكردنەكەمان دەوەستاین، ڕێك دادەنیشتین و گفتوگۆیەكی گەرممان لەبارەی نیگارەكەوە دەكردەوە، لەبەر ئەوە هەموو وردەكارییەكانمان لەسەر وێنەكە دەزانی، هەرچییەكمان لە ئەنسكلۆپیدیاكەی خەلیل پادشاوە وەرگرتایە، زیادمان دەكرد بۆ قسەكانمان.



گوتم: "ڕەنگە قاچەکانی کیژەکە لەدوای خۆرئاوابوونەوە سەرمایان بووبێت."

خۆشەویستەکەم گوتی: "من هەواڵی خراپترم لایە." هەر کاتێك سەیری وێنەکەم دەکرد، گوڵی ڕەش زیاتر لە کچە مۆدێلەکەی خەلیل پادشا دەچوو، ئینجا گوتی: "دایکم لەگەڵ ئەو ژنە دەلاڵە کە هاوسەگیری ڕێك دەخات، قسەی کردووە، ئەو ژنەش داوای کردووە چاوی پێم بکەوێت."

"ئەی تۆ ڕازی بوویت؟"

"زۆر پێکەنیناوییە، ئەو کوڕەی بۆی هەڵبژاردووم کەسێکە یاخود کوڕی کەسێکە کە لە ئەمەریکا دەژیت!" بە چپەیەکی گاڵتەئامێزەوە، ناوی خێزانەکەی ئەو کوڕەی پێ گوتم.

"باوکی تۆ دە هێندەی ئەوان دەوڵەمەندترە."

"ئەی تێناگەیت؟ ئەم کارەیان بۆ ئەوە کردووە، من و تۆ لەیەك دوور بخەنەوە."

"ئەی دەڕۆیت بۆ قاوەخانەکە بۆ بینینی ئەو خاتوونە؟"

"گرنگ نییە، نامەوێت لە ماڵەوە کێشە دروست بکەم."

"باشە، با بڕۆین بۆ جیهانگیر، دەمەوێت وێنەیەکی ترت بکێشم، نیگاری *ئافرەتێکی تری ڕاکشاو* دەمەوێت ماچت بکەم و ماچت بکەم."

خۆشەویستەکەم هێدی هێدی شارەزای خولیاکانی من دەبوو و ترس دەکەوتە دڵیەوە، لەبەر ئەوە ئەو پرسیارانەی دەکرد کە ئازاربەخش بوون بۆ هەردووکمان.

"باوکم ناڕازییە، چونکە تۆ دەتەوێت ببیت بە شێوەکار. تۆ دەبیتە شێوەکارێکی سەرخۆش و هەژار، منیش دەبمە مۆدێلە جلڕووتەکەت... باوکم لەوە دەترسێت."

لە کاتی قسەکردنەکەیدا، تێدەکۆشا بزەیەك بکات، بەڵام نەیدەتوانی. لەو کاتەدا گوێبستی تەپەی هەنگاوی پاسەوانەکە بووین بەهێواشی دەچوو، بەڵام بەتوندی قاچی دادەنا، دەستبەجێ بابەتەکەمان گۆڕی، بەبێ ئەوە ماچی یەکیشمان کردبێت، بۆ باسی وێنەی *ئافرەتە باڵکەوتووەکە*. بەڵام لە ڕاستیدا دەمویست بپرسم کە بۆچی باوکی دەیەوێت لە پیشەی داهاتووی ئەو کوڕە بزانێت، کە لەگەڵ کچەکەی دەچێتە دەرەوە و دەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکات؟ دەمویست بڵێم بە خۆشەویستەکەم کە بڵێت بە باوکی، من لە تەلارسازی دەخوێنم، بەڵام کاتێك بیرم لە وەڵامەکانی باوکی دەکردەوە، دەمزانی دەبێت لەو ساتەوە سەرزەنشتی خۆم بکەم و خۆم تاوانبار بکەم، بە هۆی بوونم بە نیگارکێشێکی بێچارە. لەوەودوا کە داوام لێ دەکرد لەگەڵم بێت بۆ جیهانگیر، ڕەتی دەکردەوە. ماوەی چەندین هەفتە بەم چەشنە بەردەوام بووین _مێشکم بەتەواوەتی ماندوو بووبوو و دەمویست هاوار بکەم بوون بە شێوەکار، چی هەڵەیەکی تێدایە؟ بەڵام ژوورە بەتاڵەکانی ئەم باڵەخانەیە ڕواڵەتییە_ کە وەك میراتی مابوویەوە، ئێستا بووەتەماڵی یەکەمی مۆزەخانەی تورکی پەیکەر و وێنە _هەروەك وێنە خراپەکانی سەر دیوارەکان، وەڵام بوون بۆ پرسیارەکەم. کتێبێکم دەربارەی خەلیل پادشا خوێندبوویەوە، دەمزانی کە خەلیل پادشا سەرباز بووە، نەیتوانیوە هیچ لە وێنەکانی بفرۆشێت، چونکە خۆی و هاوسەرەکەی _یان مۆدێلەکەی_ لە خانووی سەربازگەیەکدا ژیاون، ژەمی خواردنی هەرزانیان لە خواردنگەی سەربازگەکە خواردووە.

کاتێك یەکمان دەدی، هەموو هەوڵێکم دەدا بۆ ئەوەی خۆشحاڵی بکەم. نیگارەکانی شازادە عەبدولمەجیدم (گۆوس لە حەریم، بیتهۆڤن لە حەریم) پیشان دەدا، تەنها بۆ ئەوەی پێبکەنێت. هەرچەندە بەڵێنیشم دابوو ئەو پرسیارەی لێ نەکەم، بەڵام هەردەم دەمپرسی: "بڕۆین بۆ جیهانگیر؟" دەستی یەکمان دەگرت و بێدەنگ دەبووین. دواتر دەمگوت: "دەڵێی چی بتڕفێنم؟" کەشەکە لە کەشی یەکێك لەو فیلمانە دەچوو کە بینیبوونم.

لە ژووانەکانی دواییماندا، کە زۆر بەقورسی ڕێکمان دەخستن، چونکە نەماندەتوانی بە تەلەفۆن پێکەوە قسە بکەین، کاتێك لە مۆزەخانەکە لەبەردەم نیگاری *ئافرەتی ڕاکشاو* دادەنیشتین، مۆدێلە جوان و دڵتەنگەکەم بە چاوی بەفرمێسکەوە باسی باوکی دەکرد کە بە قامچی لە براکانی دەدات، یان کچەکەی تا ڕادەی مردن خۆش ویستووە، بەڵام گوڵی ڕەش زۆر لێی دەترسا لە هەمان کاتدا زۆری خۆش دەویست، بەڵام ئەو ڕۆژانە پیشانی دا کە منی زیاتر خۆش دەوێت. پاسەوانەکە بە ماوەی حەوت چرکە، ئینجا دەگەیشتە لامان، لەو ماوەیەدا پێش ئەوەی دەنگی تەپەی هەنگاوەکانی بێت، ئەوەندە بەگەرمی یەکترمان ماچ دەکرد، بە جۆرێك کە پێشتر نەمانکردبوو. کاتێك ماچی یەکمان دەکرد، دەموچاوی یەکمان دەگرت، وەك ئەوەی شووشەی پرۆسلین بێت و زوو بشکێت بە دەستمانەوە.

هاوسەرەکەی خەلیل پادشا بەخەمباری لەناو چوارچێوە گەورە و نایابەکەیەوە سەیری دەکردین. کاتێك پاسەوانەکە لە دەرگاکەوە خەریك بوو دەربکەوێت، خۆشەویستەکەم پرسیی: "دەتوانی بمرفێنی؟"

"بەڵێ دەتوانم!"

ساڵی پێشووتر، حسابێکی بانکیم بۆ هەڵگرتنی ئەو پارانەی کە داپیرەم بەردەوام پێی دەدام کردبوویەوە. لە دوکانێك لە شەقامێکی ڕوملیحیسار، بەشێکم هەبوو کە لەدوای یەکێك لە شەڕەکانی خێزانەکەم لەسەر سامان، ئەو بەشەم بەر کەوتبوو، هەندێك سەرمایەی ترم هەبوو هەرچەندە بەتەواوەتی شوێنەکەیانم نەدەزانی، بیرم دەکردەوە ئەگەر لە ماوەی دوو هەفتەدا وەرگێران بکەم بۆ ڕۆمانێکی گراهام گرین و هاوڕێکەشم نووری، کە ترسی دەستبەسەرگرتنی نەمابوو لەلایەن پۆلیسەوە، کاری چاپ و بڵاوکردنەوەی بۆ دەکات و بەو جۆرە دەمتوانی کرێی دوو مانگی باڵەخانەیەکی بچووکی وەك جیهانگیر بدەم و لەگەڵ خۆشەویستەکەم لەوێ بژین پێکەوە. یان بیرم دەکردەوە ڕەنگە دایکم (کە لەو ماوەیەدا زۆر پرسیاری لێ دەکردم، کە بۆچی لەم دواییانەدا پەرێشان دیارم)، بەزەیی پێماندا بێتەوە و باڵەخانەکەی جیهانگیرمان پێ بدات.

لەپاش هەفتەیەك لە بیروڕا گۆڕینەوە، کە کەمێك لە بیروڕای دوو منداڵ دەچوو، کاتێك نەخشە دادەنێین بۆ ئەوەی کە گەورە بوون ببنە پیاوی ئاگرکوژێنەوە، بڕیارمان دا

لە تاقسیم چاومان بە یەك بكەوێت. بەڵام بۆ یەكەم جار نەهات، هەرچەندە یەك كاتژمێر و نیو چاوەڕێم كرد. ئەو ئێوارەیە دەمزانی ئەگەر قسە لەگەڵ كەسێك نەكەم، ژیریم لەدەست دەدەم، لەبەر ئەوە پەیوەندیم كرد بە هاوڕێكانی قوتابخانەی ڕۆبێرت ئەكادیمی كە بۆ ماوەیەكی زۆر بوو نەمدیبوون. كاتێك منیان بەمەستی لە یەكێك لە مەیخانەكانی بیۆگڵو بنینی و زانییان كەوتوومەتە داوی خۆشەویستییەوە، لە كێشەدام و بەبێ یارمەتی، ئازار دەكێشم، دڵخۆش بوون و گاڵتەیان پێ دەكردم. بەبیریان هێنامەوە، تەنانەت ئەگەر بەبێ ڕازیبوونی باوكی هاوسەرگیری لەگەڵ كچێكی خوار تەمەنی یاسایی نەكەم، بەڵام مانەوە لەگەڵی لە یەك ماڵدا، ئەوا سزای ئەو كارە زیندانیكردنە، بەڵام كە بینییان من هەر سوورم لەسەر بڕیارەكەی خۆم، پرسییان كە چۆن بتوانم ببم بە شێوەكار و چۆن یارمەتیی خۆشەویستەكەم بدەم ئەگەر واز لە خوێندن و كارەكەم بێنم _ئەم قسانەیان بێزاركەر بوون_ لە كۆتاییدا، یەكێك لە هاوڕێكانم كلیلی نهۆمێكی پێ دام كە لەوێ هەر كات ئارەزووم لێی بوو، لەگەڵ خۆشەویستەكەم كات بەسەر بەرم.

لەپاش ئەوەی دوو جار لەبەردەم دەرگا جەنجاڵەكەی قوتابخانەی دام دی سیۆن چاوەڕێم كرد، لە كۆتاییدا توانیم خۆشەویستەكەم لەناو ئاپۆڕەی قوتابییەكاندا ببینم و لەگەڵی بڕۆم. بەڵێنم پێ دا ئەگەر لەگەڵم بێت بۆ ئەو نهۆمەی هاوڕێكەم كلیلەكەی پێ دابووم _پێشتر سەردانم كردبوو و ڕێكوپێكم كردبوو_ ئەوا ناهێڵم هیچ كەس بێزارمان بكات. دواتر كاتێك زانیم كە تەنها هاوڕێ متمانەپێكراوەكەی ڕۆبێرت ئەكادیمی ئەو ماڵە بچووكە بەكار ناهێنێت، بەڵكو باوكیشی هەندێك جار لەوێ دەمێنێتەوە، ترسام كچە مۆدێلەكەم لەو شوێنە نەمێنێتەوە هەتا وێنەی بكێشم. ئەو ماڵە تاكەكەسییە جگە لەوەی جێگایەكی خەوتنی گەورەی تێدا بوو، هەموو كەلوپەلەكانی تری پێك هاتبوون لە ڕۆژژمێرێك كە لەسەر دیوارەكە هەڵواسرابوو، لەگەڵ ڕەفەیەك كە لەسەری، لەنێوان دوو بوتڵی جۆنی وۆلكەر، هەموو پەنجا و دوو بەرگەكەی (*ئەنسكلۆپیدیای بریتانیكا*) دانرابوو، ئەم شتانە ئەوەندەی تر بێتاقەت و تووڕەیان دەكردین. كاتێك بینیم گوڵی ڕەش زیاتر لەوەی بیرم لێ كردبوویەوە، منی خۆش دەوێت و چەند سەرسام دەبێت كە پەیوەندییە سۆزدارییەكەمان بەو جۆرەیە، كاتێك دەمبینی چەندە بەخێرایی فرمێسك دەڕێژێت،

ئازاری گەدەم زیاتر دەبوو، بەڵام هەر کات دەمویست خۆم دوور بگرم لەم پەیوەندییە، زیاتر هەستم بە ئازار و بێدەسەڵاتی دەکرد. هەموو جارێك كە باسی نەخشەکەی باوکی بۆ دەکردم کە نیازی لە پشووی مانگی شوبات کچەکەی بنێرێت بۆ گەشتی زستانە بۆ سویسرا، دواتر لە یەکێك لە قوتابخانە خەیاڵییەکان ناوی بنووسێت کە پڕە لە عەرەبە دەوڵەمەندەکان و گەنجە ئەمەریکییەکان، ئەو ترسەی لە دەنگیدا هەبوو، وای لێ دەکردم متمانەی پێ بکەم. بەڵام کاتێك هەوڵم دەدا دڵخۆشی بکەم و بە لاساییکردنەوەی لاوێکی بەهێزی فیلمە تورکییەکان، سوێندم دەخوارد و دەمگوت دەترفێنم، لە ڕووخساری خۆشەویستەکەم شادومانیم دەبینی، بەمەش زیاتر باوەڕم بە خۆم دەبوو.

سەرەتای مانگی شوبات، پێش ئەوەی پشووی قوتابخانە دەست پێ بکات، کۆتا دیدارمان بوو. بۆ ئەوەی کێشە چاوەڕوانکراوەکان لەبیر خۆمان بەرینەوە، بۆ ئەوەی سوپاسی هاوڕێکەم بکەین بە هۆی پێدانی کلیلی ماڵەکەی، ئەم جارە دیدارەکەمان لەگەڵ ئەم هاوڕێ باشەم بەسەر برد. ئەو ئێوارەیە هەندێك لە هاوپۆلەکانی ترم، کە یەکەم جار بوو خۆشەویستەکەم ببینن، هاتن بۆ لامان. هەر هاوڕێیەك بەلایەکدا ڕایدەکێشام، ئەوکات بیرم دەکردەوە کە بۆچی هەرگیز نەمویستووە هاوڕێکانم کە هەر کەس لە بازنەی جیاوازدایە، پێکەوە کۆ بکەمەوە. دەترسام ناخۆشی دروست بێت لەنێوان گوڵی ڕەش و هاوڕێکانی کۆلێژم، چونکە هەر کات دەمویست سۆزداری بۆ خۆشەویستەکەم پیشان بدەم، گاڵتەیان پێ دەکردم، بەڵام بەو جۆرە بەردەوام نەبوو، گوڵی ڕەش دەستی کرد بە قسە و گاڵتەجاڕی لەگەڵیان. کاتێك پرسیاری لێ دەکرا دەربارەی دایکی و باوکی، شوێن و کاریان، یاخود دەربارەی سامان و دەسەڵاتیان، گوڵی ڕەش باسەکەی دەگۆڕی، وا خۆی دەردەخست کە ئارەزووی لەو جۆرە قسانە نییە. لەو ئێوارەیەی بەسەرمان برد لە خواردنگەیەکی بەبەك، تەنها ئەو ساتانە گوڵی ڕەش خۆشحاڵیی پێوە دیار بوو کاتێك بەدەم سەیرکردنی دیمەنی جوانی بۆسفۆر، لەبارەی یاریی تۆپێپێ و هەندێك بابەتی هونەری دیکە دەدواین، دواتر لە تەنکترین بەشی بۆسفۆر، لە ئاشیان، وەستابووین سەیری سووتاندنی کۆشکێکی تەختەمان دەکرد لەکەنار ئاوەکەی بەرامبەر دەسووتا.

ئەو کۆشکە کە دەسووتا، یەکێك بوو لە *یاڵە* جوانەکانی بۆسفۆر لە کاندیلی، بۆ ئەوەی ڕووداوەکە لەنزیکەوە ببینین، بە ئۆتۆمبیل ڕۆشتین و نزیك بووینەوە. خۆشەویستەکەم کاتێك بینیی هاوڕێکانم چەندە چێژ دەبینن لە سەیرکردنی ڕووداوەکە، هیلاك بوو، هات لەتەنیشتمەوە ڕاوەستا و دەستی گرتم. بۆ ئەوەی لە جەنجاڵیی ئۆتۆمبێلەکان و ئەو خەڵکە دوور بکەوینەوە کە بەدەم چای خواردنەوە سەیری سووتانی کۆتا کۆشکی عوسمانییەکانیان دەکرد، من و گوڵی ڕەش ڕۆیشتین بۆ لایەکەی تری ڕوملیحیسار و لەوێ پیاسەمان دەکرد. لەمیانەی ئەو پیاسەکردنەدا، بۆم دەگێڕایەوە کە لە قوتابخانەی ئامادەیی زۆر جار وانەکانم لەدەست داوە و بە بەلەم چووم بۆ لایەکەیتر و ئەو گەڕەکانە گەڕاوم.

لەو شەوە سارد و تاریکەدا، لەبەردەم گۆڕستانێکی بچووك ڕاوەستابووین و لە ئێسکەکانماندا هەستمان بە جووڵەی تەوژمەکانی بۆسفۆر دەکرد، لەو کاتەدا خۆشەویستەکەم چپاندی بە گوێمدا و گوتی: "زۆرم خۆش دەوێیت"، منیش لەئامێزم گرت و بەگڕوتینەوە ماچی یەکمان کرد. هەر کاتێك چاوم دەکردەوە، ڕووناکیی پرتەقاڵیی ئاگرەکەی ئەوبەرم دەبینی کە لەسەر پێستی ساف و جوانی گوڵی ڕەش دەبریسکایەوە.

لە گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە، لەناو ئۆتۆمبێلەکە توند دەستی یەکمان گرتبوو و هیچمان نەدەگوت. کاتێك نزیکی ماڵەکەیان بووینەوە، وەك منداڵێك بەخێرایی ڕایکرد بەرەو دەرگاکەیان. ئەوە کۆتا جار بوو کە گوڵی ڕەشم بینی، بۆ ژووانی دواترمان ئیتر نەهات.

سێ هەفتە دواتر، کاتێك پشووی قوتابخانە تەواو بوو، دەستم کردەوە بە چاودێریکردنی قوتابخانەکەی. لەدوورەوە یەکبەیەك سەیری هەموو کچەکانم دەکرد، هەتا لەناویاندا گوڵی ڕەش دەربکەوێت. بەڵام لەپاش دە ڕۆژ زانیم چیتر هەوڵدانەکەم سوودی نییە، بەڵام هەموو نیوەڕۆیەك قاچەکانم دەیانبردم بۆ بەردەم قوتابخانەکە و ئەوەندە چاوەڕێم دەکرد، هەتا کەس دیار نەدەما. ڕۆژێکیان برا گەورەکەی کە برا ئازیزەکەی گوڵی ڕەش بوو، لەناو ئاپۆڕەی قوتابییەکاندا دەرکەوت و پێی گوتم کە خوشکەکەی سڵاوی بۆم ناردووە و زەرفێکی نامەی پێ دام. لە شیرینیخانەیەك، بەدەم

جگەرەکێشانەوە نامەکەم دەخوێندەوە، کە نووسیبووی: "زۆر دڵخۆشم لە قوتابخانە نوێیەکەم، بەڵام زۆر تاسەی تۆ و ئەستەنبوڵم کردووە."

دواتر دوازدە نامەی دووروودرێژم بۆ نووسی، حەوت لە نامەکانم لەناو زەرف بۆ نارد، پێنج نامەی تریشم بۆ پۆست کرد، بەڵام هەرگیز هیچ وەڵامێکم پێ نەگەیشتەوە.

## ٣٦

# لەسەر ئەو کەشتییەی
# بە کەنداوی زێڕیندا دەڕۆیشت

لە شوباتی ١٩٧٢، کاتێك لە قۆناغی دووەمی خوێندنی تەلارسازی بووم، لەچاو جاران کەمتر دەچوومەوە بۆ خوێندنی وانەکانم. بە هۆی لەدەستدانی کچە مۆدێلە جوانەکەمەوە، دەبووایە تا چەندی تر بەردەوام بوومایە لەسەر ئەو دۆخە خەمباری و تەنیاییە؟ هەندێك جار بە درێژایی ڕۆژەکە لەماڵەوە، لە بەشیکتاش دەمامەوە و ڕۆژەکەم بە خوێندنەوەی کتێب بەسەر دەبرد. کتێبێکی ئەستوورم دەگرت بە دەستمەوە (وەکو کتێبەکانی (ترسێنەرەکە)، (شەڕ و ئاشتی)، (جۆگەکانی بەدن) لە ماوەی وانەکانم لە ماڵەوە دەمخوێندنەوە. لەپاش دیارنەمانی گوڵی ڕەش، چیتر خولیای وێنەکێشانم کەمتر بوویەوە. کاتێك فڵچەکەم دەهێنا بە کاغەزەکەدا و وێنەم دەکێشا، هەمان هەستی خۆشی و سەرکەوتنی منداڵیم نەبوو. نیگارکێشان بە کەیف و خۆشییەوە دەستی پێ کرد، بەڵام ئێستا ئەو خۆشییەم لەدەست دەدا و هیچ بیرۆکەیەکی ترم نەبوو جێگەی ئەو خۆشییە بگرێتەوە. هەوری



ناخۆشــی و بێــزاری بەتــەواوەتی بــاڵی کێشــابوو بەســەرمدا، بــەرێکردنی ژیــان بــەبێ وێنەکێشان، هەڵنەهاتن لەو جیهانە ڕاستەقینەیە _ئەوەی کە خەڵك پێی دەڵێن (ژیان)_ مانەوە بوو لە زینـدان. نیگـەرانی بـە جۆرێـك زاڵ بـوو بەسـەرمدا _هـەموو کاتەکـەم بـە جگەرەکێشـان بەسـەر دەبـرد_ بەقورسـی هەناسـەم بـۆ دەدرا. هەناسـەدان لـە ژیـانی ئاسایی، بە جۆرێك بوو وەك ئەوەی دەخنکام. خواستێك لە ناخمدا هەبوو، کـە خـۆم لـە ئازاردا بهێڵمەوە و لە وانەکانی قوتابخانە هەڵبێم.

ناوەناوە سەردانی ستۆدیۆکەم دەکرد و هەموو هەوڵێکم دەدا بۆ ئەوەی خۆشەویستە بۆنبادەمەکەم لەبیر بکەم _هەندێك جار بەپێچەوانەم دەکرد، هەوڵم دەدا بە کێشانی وێنەیەکی دیکەی، بیهێنمەوە بیری خۆم_ بەڵام شتێك لە ناخمدا ون بووبوو. هەڵەی من، بەردەوامبوونم بوو لەسەر ئەو ئەندێشەیەی کە وێنەکێشان هێشتا دەتوانێت ئەو خۆشییەم پێ ببەخشێت کە بەمناڵی هەستم پێ دەکرد، بەڵام لەبیرم کردبوو کە من چیتر منداڵەکەی جاران نیم. لە نیوەی وێنەکێشانەکەدا، بڕیارم دەدا کە جوان دەرناچێت، بەو جۆرە بەنیوەوناچڵ دەستم لێ هەڵدەگرت. ئەم دوودڵییە دەیگەیاندمە ئەو ئاکامەی کە کێشانی هەر وێنەیەکی نوێ، هەمان هەستی خۆشی منداڵیم بۆ دەگێڕێتەوە. تێنەدەگەیشتم کە من بەو جۆرە ئازار دەکێشم و ئازارەکەش هونەرەکەم بەرەوپێش دەبات.

ترسم هەبوو بێزارییەکەم زاڵ بێت بەسەر هەموو ئەو شتانەی تر کە بایەخم پێ دەدان: لەپاش ئەوەی چەند ساڵ بیستبووم تەلارسازی هونەرە، بۆم دەرکەوت خوێندنی تەلارسازی، چێژی وێنەکێشانم پێ نابەخشێت. هەرگیز وەك سەردەمی منداڵیم بایەخم پێ نەدەدا و چێژی نەبوو لەلام، هەتا ئەو کاتانە نەبووایە کە ئەو یارییانەم بەبیر خۆم دەهێنایەوە کە بە پارچەی شەکر و بلۆکی تەختە دەمکردن. هەروەك زۆربەی مامۆستا ساردەکانی زانکۆی تەکنەلۆژی، ئەوانەی گیانی ئەندازیارییان هەبوو، هیچ هەستێك و چێژێکم بۆ بیناسازی نەمابوو، وانەکانم تەنها بۆ بەسەربردنی کات و ڕووبەڕوو بونەوەی ئەو ژیانە ڕاستەقینەیە بوو کە دەبوو بەسەری بەرم. کاتێك ئەم بیرۆکانەم بۆ دەهاتن، هەموو شتێکی دەوروبەرم بێزارکەر بوون و چێژی جارانی نەبوو _وانەکانم، ئەو زەنگەی زۆر ئارەزووم دەکرد لێبدات، ئەو مامۆستایەی بەلووتبەرزییەوە

بەناو پۆلەکەدا دەسووڕایەوە، گاڵتە و جگەرەکێشانی قوتابییان لە وچانی نێوان دەرسەکان_ هەموویان بوونە شتێکی ترسێنەر. لەناو ئەم هەموو شتە بێبایەخ و هەڵانەدا گیرم خواردبوو، لەناو ئەم جیهانە ئازاربەخشە، هەستم بە خنکان و لەناوچوونی چارەنووسم دەکرد. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو خەوە ناخۆشانە، دەستم دەکرد بە نووسینی هەندێك شت، یاخود لە کاتی وانەکەدا وێنەم دەکێشا: سکێچی مامۆستاکە یان دواوەی قوتابییە گوێگر و وریاکانم دەکێشا، یان پارچە هۆنراوە یان پارچەیەك موزیکی کەسێکی دیکەم دەنووسی، یاخود دەربارەی ئەو شتانە دەمنووسی کە لە پۆلەکەدا دەگوزەران... بەڵام لەبری ئەوەی ئازارەکەم _نیگەرانی کە ژیان هیچ مانایەکی نییە_ کەمتر بێت، پەرێشانیم زۆر زیاتر دەبوو، وەك ئەوەی هاتنم بۆ بەشی بیناسازی لە تەشکیشلە تەنها بۆ بەسەربردنی ڕۆژەکە بووبێت. هەموو جارێك دوای کاتژمێرێك، بە جۆرێك زانکۆم جێ دەهێشت، وەك ئەوەی لەدەست هەموو ژیانم ڕامکردبێت (بەبێ ئەوەی سەرنج بدەم، بزانم قاچم لەسەر درزەکانی سەر شۆستەکە داناوە)، لەپاش ئەوەی دەهاتمە دەرەوە، هەڵدەهاتم بۆ کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵ.



دەڕۆیشتم بۆ کۆڵانە هەژارەکانی نێوان تاقسیم و تەپباشی، کاتێك بەمنداڵی لەگەڵ دایکم، بە پاس بەلای ئەو کۆڵانانەدا تێپەڕ دەبووین. بۆ منداڵێکی شەش ساڵە، وەکو شوێنێکی دوور دەردەکەوتن. یان لە گەڕەکەکانی پێرا دەگەڕام کە باڵەخانەکانی زۆر بەژیرانە لەلایەن وەستا ئەرمەنییەکانەوە دروست کرابوون، هەتا ئەو کاتەش هەروەك خۆیان مابوونەوە. هەندێك جار بەبێ ئەوەی سواری پاس ببم، یەکسەر لە زانکۆوە دەڕۆیشتم بۆ تاقسیم، یان هەر شوێنێك لە خەیاڵم بووایە، یاخود قاچەکانم بیانبرمایە: دەڕۆیشتم بۆ کۆڵانە تەسکەکانی قاسم پادشا، بۆ بالات کە دیمەنەکانی لە ڕاستی نەدەچوون وەك ئەوەی شوێنی دەرکردنی فیلم بێت، ناوچەی یۆنانی و جوولەکەکان کە کۆچبەرەکان و هەژارەکان بە جۆرێك شێوەیان گۆڕیبوون، لەدەرەوەی تێگەیشتن بوو، شەقامی مسوڵمانەکان و کۆڵانە زۆر هەژارەکانی ئۆسکودەر کە پڕ بوون لەو خانووە تەختانەی تا ساڵی ١٩٨٠ بوونیان نەما، کۆڵانە کۆن و سەیرەکانی کۆجام موستەفا بۆ ئەوەی بینای کۆنکریتکراوی ناشیرینیان لە جێگەکەیان بکرێتەوە، وێران کرابوون. حەوشە جوانەکەی مزگەوتی فاتیح کە هەمیشە دڵخۆشی دەکردم، زەوییەکانی دەورە بالیکلی، گەڕەکەکانی کرتلوش و فەریکۆی کە هەژار بووبوون و کۆنییەکەیان دەریدەخست کە خێزانەکانی چینی ناوەڕاست هەزاران ساڵ لێرە ژیاون و گۆڕانی زمان، نەژاد و ئایینیان، زۆرداریی ستەمکارانی دەردەخست بەرامبەر بەم شوێنانە، هەژارترین کۆڵانەکان کە لە نزمترین لێژاییدا بوون (وەکو کۆڵانە هەژارەکانی جیهانگیر، تەرلاباشی و نیشانتاش) _بەبێ مەبەست لە هەموو ئەم شوێنانەدا دەگەڕام. لە سەرەتادا، ئامانجی سەرەکیم هەڵهاتن بوو لەو جیهانەی کە هەموو کەس تێیدا کار، کورسی و ئۆفیسی خۆی هەبوو. بەڵام کاتێك دیوار بە دیوار و شەقام بە شەقامی شارەکە دەگەڕام، تووڕەیی خۆم لەواندا دەردەکرد و هێور دەبوومەوە، تەنانەت ئێستاش، ئەگەر بەڕێکەوت بە هەمان ئەو کۆڵانانەدا تێپەڕم، کاتێك کانیاوە وێرانبووەکانی ئەو ناوچانە یاخود دیوارە داڕووخاوەکانی کڵێسای بیزەنتین (پانتوکراتۆر، کوچوك ئایاسۆفیا) کە بە جۆرێك کۆن دەردەکەون، یاخود کاتێك سەیری کەڵەشاخی زێڕین دەکەم کە لەنێوان دیواری ئەو مزگەوتانە و باڵەخانەکان دەبریسکێتەوە، بیرم دەکەوێتەوە ئەو کاتە چەندە لە کێشەدا بووم و چەندە دیمەنەکان جیاوازتر دەردەکەوتن. دیمەنەکان بێزارکەر دەردەکەوتن،

لەبەر ئەوەی خۆم زۆر بێزار بووم. ڕۆحی خۆم تێکەڵی شەقامەکانی شار کردبوو، تەنانەت ئێستاش جێنشینی ئەوانە.



ئەگەر ماوەیەکی زۆر لە شارەکەدا بژیت، هەندێک کات هەیە هەروەک ئەوەی گۆرانییەك کە خۆشەویستە لەدەستچووەکەت بیر دەخاتەوە، بە هەمان شێوە هەندێک کۆڵان و دیمەنی شارەکە هەن هەمان هەستت لا دروست دەکەن. ڕەنگە لەبەر ئەوەی لەپاش لەدەستدانی کچە مۆدێلەکەم، بۆ یەکەم جار سەردانی هەندێك گەڕەك و کۆڵانی هەژاری شارەکەم کردبێت و ماتەمینیی ئەستەنبوڵم بینیبێت.

لەدەستدانی خۆشەویستەکەم، هێشتا لە دڵم دەرنەچووبوو، ڕەنگدانەوە دۆخی خۆمم لە هەموو شوێنێك دەدی _مانگی پڕم، وەك کاتژمێر دەکەوتە بەرچاو_ هەموو شتێك بووبووە سیمبول بۆ هەموو ئەو شتانەی کە دواتر بوونە خەون. لە مانگی ئاداری ١٩٧٢، سواری پاس بووم (هەروەك وەك ئەو کاتانەی لەگەڵ گوڵی ڕەش بووم)، ئەو شوێنەی ئارەزووم دەکرد بچم بۆ بینینی، پردی گالەتا بوو، ئاسمان تاریك و مۆرێکی خۆڵەمێشی بوو، بە جۆرێك بوو ئەگەری بەفربارین هەبوو، هیچ هاتوچۆکردنێك لەسەر پردەکە نەبوو. بە قاندرمە تەختەکانی پردەکە، لەو لایەی ڕووی لە کەنداوی زێڕین بوو، هاتمە خوارەوە بۆ سەر شۆستەی شوێنی لەنگەرگرتنی کەشتییەکان لەکەنار ئاوەکە.

لەوێ سواری کەشتییەك بووم کە بەڕێکەوت دەچوو. کاپتن، وەستا و پیاوی گوریس ڕاکێشانەکە، هەموویان وەك دەستەیەکی دەریاوانی وەستابوون و بەتەوقە

سلاویان لەو سەرنشینانە دەکرد کە جگەرەیان دەکێشا و قومیان لە چای دەدا یان لەنێوان خۆیاندا گفتوگۆیان دەکرد. کاتێک سەرکەوتمە سەر کەشتییەکە، منیش خۆم لەگەڵ دۆخەکەدا گونجاند و سلاوم لە هەموویان کرد، بەلام دەستبەجێ هەستم کرد هەموو سەرنشینە ماندووەکان بە چاکەتە ناشرینەکانیان، جانتا، کلاو و ملپێچەکانیانەوە ئاشنای لەمێژینەی یەکترن، منیش رێبوارێکی ترم کە هەموو رۆژێک بە کەنداوی زێڕیندا دێت و دەچێت. کاتێک کەشتییەکە بەهێواشی دەستی بە جووڵە کرد، لەپاڵ هەستکردن بەوەی هەموو ئەو کەسانە بناسم و هەستکردن بە دانیشتن لە دڵی شارەکەدا، هەستم بە شتێکی تر کرد. لەسەروو ئێمەوە، لەسەر پردەکە (لەوێوە دەمتوانی پۆستەری پروپاگەندەکان و پاسەکان ببینم) و شەقامە سەرەکییەکانی شارەکە، کات نیوەڕۆ بوو لە ئاداری ١٩٧٢، بەلام هەستم کرد ئێمە لێرە لە جیهانی خوارەوە لە کۆنترین، بێسنوورترین و قورسترین کاتداین. کاتێک بەسەر قاندرمەکاندا دەچوومە ناو کەشتییەکەوە، هەستم کرد کە سی ساڵ گەڕابێتمە دواوە بۆ ئەو رۆژانەی ئەستەنبوڵ دابڕابوو لە جیهان، بۆ ئەو کاتانەی زۆرتر هەژار و خەمبار بوو.



له پەنجەرە لەرزۆکەکانی بەشی دواوەی کەشتییەکە سەیری شوێنەکانی کەنداوی زێڕینم دەکرد، کە کەشتییەکە بەهێواشی بەلایاندا تێپەڕ دەبوو. سەیری ئەو بەرزاییانەم دەکرد کە داپۆشرابوون بە خانووی ئەستەنبوڵی دێرین، گۆڕستانە پڕ لە درەختە سەوزەکان، کۆڵانە تەسکەکان، گردە تاریکەکان، کەشتییە ژەنگگرتووەکان، درێژبوونەوەی بێکۆتای کارگە بچووکەکان، دوکان و دووکەڵکێشەکان، کڵێسا وێرانبووەکانی بێزەنتە، جوانترین و نایابترین مزگەتی عوسمانییەکان کە لە پیسترین و تەسکترین کۆڵانەکاندا بوون، کڵێسای پانتۆکراتۆر لە زیرەك، عەمبارە گەورەکانی تووتن لە جیبالی، تەنانەت سێبەری مزگەوتی فاتیح کە لەدوورەوە دیار بوو. سەیرکردنی دیمەنەکان لە نیوەی ڕۆژدا، بەناو هەورەکان و پەنجەرە لەرزۆکەکانی کەشتییەکە، وەکو ئەو دیمەنانەی ئەستەنبوڵ دەهاتنە بەرچاوم کە لە فیلمەکە کۆنەکاندا بینیبووم، ئەوەندە تاریك بوون وەك ئەوەی لە نیوەی شەودا سەیریان بکەیت.



پەروانەی کەشتییەکە دەنگێکی دروست دەکرد، وەك دەنگی مەکینەی درومانەکەی دایکم بوو، کاتێك نزیك دەبووینەوە لە شوێنی وەستان، لەناکاو دەنگەکە دەپچڕا، لەرزینی پەنجەرەکان نەدەما، ئاوەکەی کەنداوی زێڕین هێمن دەوەستا. دواتر پوورە بەتەمەنەکان کە پەنجا سەبەتەیان لەدەست بوو بە مریشك و کەڵەشێرەوە سواری کەشتییەکە دەبوون، لەوێوە کۆڵانە تەسکەکانی ناوچەی یۆنانییەکان دیار بوو، کارگە بچووکەکان، عەمبارەکان و بەرمیلەکان، تایەی ئۆتۆمبێلە کۆنەکان، گالیسکەکان

_هەموو ئەم دیمەنانە وەك وێنەیەكی كۆنی دڵڕفێنی سەر پۆستەرێكی سەد ساڵ كۆن دەردەكەوتن، هەموویان بەڕەشوسپی دەردەكەوتن. كاتێك كەشتییەكە لە كەنارەكەوە دەستی بە جووڵە كردەوە و پەنجەرەكان دەستیان كردەوە بە لەرزین، كاتێك بەرەو گۆڕستانەكانی كەنارەكانی بەرامبەر دەچووین، ئەو دووكەڵەی لە دووكەڵكێشی كەشتییەكەوە دەهاتە دەرەوە، دیمەنەكانی بە جۆرێك دادەپۆشی كە لە دیمەنی ڕاستەقینە نەدەچوون. لەو كاتەی خەریك بوو ئاسمان ببێت بە شەوەزەنگ، هەروەك لە فیلمەكان لە سووچێكەوە لەناكاو بڵێسەی ئاگر دەردەكەوێت، بەفرێكی سارد و ڕوون دەركەوت.



ئایا ئەمە نهێنیی ئەستەنبوڵە _كە لەژێر مێژووە گەورەكەی، هەژارییە زیندووەكەی، یادگارییە ڕووكەشەكانی، دیمەنە سروشتییە نایابەكانی، پاكیزەییەكەیەتی كە ڕۆحی شارەكەی لەژێر تۆڕێكی باریكدا شاردووەتەوە؟ بەڵام لێرەدا هەمووماں وەك بارنەیەكی خڕین، بۆ وتنی هەر شتێك دەربارەی كرۆكی شارەكە، دەبێت دەربارەی ژیان و بیركردنەوەی خۆمان قسە بكەین، شارەكە هیچ چەقێكی تری نییە جگە لە خودی خۆمان.

کەواتە دەبێت چی هەستێکم هەبووبێت، کاتێك لەگەڵ هاوەڵە ئەستەنبوڵییەکان لە ڕۆژی ئاداری ١٩٧٢، ئەو ڕۆژەی نەچوومەوە بۆ قوتابخانە، سواری کەشتییەکی کۆن بووم و لە کەنداوی زێڕینەوە بەرەو ئەیوب ڕۆیشتم؟ ڕەنگە بەو گەشتە، نیازم بووبێت خۆم قایل بکەم کە لەپاڵ خەمی شارەکەوە، دڵشکاوی و لەدەستدانی خۆشەویستیم بۆ نیگارکێشان _ئەو ئارەزووەی کە وا بیرم دەکردەوە لە هەموو ژیانم لەگەڵم دەبێت_ چیتر گرنگ نین بەلامەوە. بە سەیرکردنی وێرانکاری و خەمی ئەستەنبوڵ، ئازارەکەی خۆمم لەبیر دەچوویەوە. بەڵام بۆ گێڕانەوەی ئەم جۆرە شتانە، پێویستە زمانێکی میلۆدرامایی تورکی بەکار بهێنم، وەك پاڵەوانێك کە پێش دەستپێکی فیلمەکە لە چارەنووسی نووسراوە، هەر دەبێت تووشی دۆڕانی (ژیان و خۆشەویستی) ببێت _نەدەکرا لە ڕێگەی خەمی شارەکەوە، خەمی ناخی خۆمم دەربڕم. لە ڕاستیدا هیچکام لە خێزانەکەم و هاوڕێکانم، خواستی منیان بۆ بوون بە وێنەکێش بەهەند وەرنەگرتبوو. دەربارەی زۆربەی شاعیر و وێنەکێشەکانی شارەکە، کە زۆربەیان ئەوەندە بەتوندی لەژێر کاریگەریی ڕۆژئاوادا بوون، کە تەنانەت شارەکەی خۆیان نەبینیووە: ململانێیان کردووە لەنێوان سەردەمی مۆدێرن و جیهانی پاسی تڕێلەکان و پڕوپاگەندەکانی بانکی سەر پردی گالەتا. ئەوکات هێشتا بەتەواوەتی خۆم نەگونجاندبوو لەگەڵ خەمی شارەکە _لەبەر ئەوەی هێشتا گاڵتەجاڕی و سادەیی منداڵی لە ناخمدا مابوو، ئێستا هیچ خواستێکم نییە ڕووبەڕووی ئەم خەمە ببمەوە، هەر کات لە ناخمدا هەستی پێ دەکەم، دەستبەجێ بەرەو (جوانییەکانی) ئەستەنبوڵ هەڵدێم.





بۆچی دەبێت لە شارەکەمان چاوەڕوانی بکەین، هەتا ئازارە دەروونییەکانمان چارەسەر بکات؟ ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت نەمانتوانیبێت وەك خێزانێك شارەکەمان خۆش بوێت. بەڵام هێشتا گرنگە بزانین چی بەشێکی شارەکەمان خۆش دەوێت و وەڵامی پرسیارەکەمان بدەینەوە.



کاتێك کەشتییەکە لە هاسکۆی نزیك بوویەوە، لەناو بیرکردنەوە ئاڵۆزەکانم، بۆم دەرکەوت کە من زۆر بەقووڵی بەستراومەتەوە بە شارەکەمەوە، چونکە شارەکەم زیاتر لە وانەکانی قوتابخانەم، زیرەکی و تێگەیشتنێکی قووڵی پێ دەبەخشیم. بەناو پەنجەرە

لەرزۆکەکانی کەشتییەکە تەماشای چەندین دیمەنی دیکەم دەکرد، وەکو خانووە تەختە و کۆنەکان، فەنەر کە ناوچەی کۆنی یۆنانییەکان بوو کە بەنیوەچۆڵکراوی مابوویەوە بە هۆی ئەو ستەمەی لەلایەن دەسەڵاتەوە بەرامبەریان کرابوو، لەنێوان ئەو بینا کۆنانە و لەژێر هەورە تاریکەکەدا، دیمەنەکانی تۆپکاپی پالاس، مزگەوتی سولەیمانیە، بەرزاییەکان، مزگەوت و کڵێساکان لە هەر کاتێکی تر لێڵتر دیار بوون. لێرە، لەنێوان بەردە کۆنەکان و خانووە تەختەکاندا، مێژوو لەگەڵ وێرانکاری ڕاهاتبوو. وێرانکارییەکان خۆراکی ژیانن، ڕوویەکی تر دەبەخشن بە مێژوو. ئەگەر خۆشەویستی لەدەستچووم بۆ نیگارکێشان نەیتوانیبێت لەم جیهانە ڕزگارم بکات، وا دیار بوو کووچە و کۆڵانە هەژارەکانی شارەکە بوونەتە جیهانی دووەمم. کاتێك پێشتر لە بێزارییەکانی قوتابخانە و ماڵی داپیرەم، دواتر بێزارییەکانی زانکۆ هەڵدەهاتم، خۆمم لەناو ئەستەنبوڵ ون دەکرد. لە کۆتاییدا هێور دەبوومەوە و ئەو *هوزنە*م قبوڵ دەکرد کە جوانیی بەخشیبووە شارەکە، ئەو *هوزنەی* کە چارەنووسی شارەکەیە.





بەدەگمەن بە دەستی خاڵی دەگەڕامەوە بۆ جیهانی ڕاستەقینە. زۆر جار کارتێکی ئاسنینی بەسەرچووی تەلەفۆنم لەگەڵ خۆم دەهێنا، هەندێك شتی بێکەڵکم ترم لەگەڵ خۆم دەهێنا کە بەگاڵتەوە بە هاوڕێکانم دەوت دەتوانن وەك پاژنەهەڵکێش یان کردنەوەی سەری بوتڵ بەکاری بێنن، پارچەی خشتێکم دەهێنایەوە کە لە دیوارێکی هەزار ساڵە کەوتبووە خوارەوە، دەستەیەك پارەی کاغەزی ئیمپڕاتۆرم لەلای کۆنەفرۆشەکان دەکڕی، کارتی کۆمپانیایەکم دەهێنایەوە کە سی ساڵ لەوەوبەر بەسەر چووبوو، کێشانەی تەرازووی فرۆشیارەکانم دەهێنایەوە، یان کتێبێکی کۆن و هەرزانم دەکڕی. لە کۆتایی هەموو گەشتێکم، کاتێك قاچەکانم دەیانبردم بۆ بازاڕی سەهەفلەر کە کتێبی دەستی دووی تێدا دەفرۆشرا، لەوێ کتێب یان گۆڤارێکم دەربارەی ئەستەنبوڵ دەکڕی. لە لایەکی دیکەوە، دەمزانی ناتوانم ئەم کەلوپەلانە بۆ هەمیشە هەڵبگرم: ماوەیەك گەمەم پێ دەکردن و بەکارم دەهێنان، دواتر لەبیرم دەکردن. دەمزانی ناتوانم ببم بە یەکێك لەو کەسانە کە خولیایان کۆکردنەوە بووە و هەرگیز کارەکانیان دووبارە نابنەوە، هەروەك کۆچو، هەرچەندە هەموو جار بە خۆمم دەگوت، ئەم کارەم لە کۆتاییدا دەبێتە بەشێکی کارێکی گەورە _وێنەیەك یان زنجیرە وێنەیەك، یاخود ڕۆمانێك وەکو ئەو ڕۆمانانەی کە لەو ڕۆژانەدا خوێندبوونمەوە کە لەلایەن تۆلستۆی،

دۆستۆڤسکی و مان نووسرابوون. هەندێك کات هەیە _کاتێك هەموو یادەوەرییە نامۆکان دەبەسترێنەوە بە ماتەمینیی ڕووخانی ئیمپراتۆرییەکە و مێژووە جێماوەکەی_ خۆمم وەك تاکەکەسێك دێتە بەرچاو کە نهێنییەکانی شارەکەی دۆزیبێتەوە، ئەم هەستەش کاتێك دروست دەبوو کە لە پەنجەرەکانی کەشتییەکەی کەنداوی زێڕینەوە سەیری دەرەوەم دەکرد و بە جۆرێك باوەشم بۆ شارەکە دەکردەوە، وەك ئەوەی تەنها من خاوەنی بم.

ڕۆژێك ڕابەرایەتیی ئەو ژیانەم دەکرد، بەجۆشەوە بەدوای هەر شتێکدا دەچووم کە پەیوەندیی بە شارەکەوە هەبوو، هەر شتێك لە هزرمدا بووایە، هەر پارچە زانیارییەك، هەموو بەرهەمێك و باسکردنێکی ئەدەبی. پێش ئەوەی خۆشییەکەم بەرە کۆتایی بڕوات، با باسی ئەو کەشتییە و پەنجەرە لەرزۆکەکانی بکەم.

کەشتییەکە ناوی *کۆکاتاش* بوو، لەتەنیشت کەشتییە خوشکەکەیەوە، *ساریەر*، لە ساڵی ١٩٣٧ لە کەنداوی زێڕین، لە لەنگەرگەی هالسکۆی دروست کراوە. هەردووکیان دوو بزوێنەری زۆر گونجاویان بۆ دانراوە کە ئەوانیش لە ساڵی ١٩١٣ دروست کراوە و ڕزگاریان بووە لە یەختی *نیمتولا* کە پێشتر موڵکی حەدیڤ حیلمی پادشا بووە. ئایا دەتوانین لە پەنجەرە لەرزۆکەکانیەوە بڵێین، کە بزوێنەرەکە بۆ کەشتییەکە گونجاو نییە؟ ئەم جۆرە وردبوونەوانە وام لێ دەکات کە بڵێم من ئەستەنبوڵییەکی ڕاستەقینەم، یان زیاتر لە خەمەکەم قووڵتر ببمەوە. لەپاش ئەوەی گەیاندمیە ئەیوب، *کۆکاتاشی* بچووك بۆ ماوەی دوازدە ساڵی دیکە بەبەردەوامی دەگەڕا، واتە هەتا ساڵی ١٩٨٤ خزمەتی کرد.

ئەو شتانەی لە گەشتە بێئامانجەکەم دەمهێنانەوە _چەند کتێبێکی زۆر کۆن، کارتی تەلەفۆن، پۆستەی کۆن، یاخود هەر پارچە زانیارییەکی تری سەیر کە پەیوەندیی بە شارەکەوە هەبووایە_ دەیانسەلماند کە گەشتەکانم (ڕاستەقینە) بوون. وەکو قارەمانەکەی کۆلیریج کە لە خەو هەستا بۆ ئەوەی ببینێت گوڵی خەونەکانی هەڵگرتووە، دەمزانی هیچ کام لەم شتانەم لە جیهانی دووەمەوە نەهێناوە، ئەو جیهانەی کە دڵخۆشی دەکردم، بەڵکو هەموویانم وەك یادگاری لە جیهانی ڕاستەقینەوە هێناون.

ناوچەی ئەیوب، ئەو شوێنەی کە *کۆکاتاش* لەوێ جێی هێشتم، ئەو گوندە نایابە بوو کە دەکەوتە خاڵی کۆتایی کەنداوی زێڕین، دیمەنەکەی هەرگیز لە ڕاستەقینە نەدەچوو. وەك نیگارێکی خۆپەرست، ئایینی، جوان، سۆفیگەری ڕۆژهەڵاتی دەردەکەوت، هەر وەکو زەوییەکی دیزنەی مسوڵمانەکانی تورکیا بوو کە کەوتبێتە کەناری شارەکەوە. ئایا ئەمەش بە هۆی ئەوەیە کە کەوتووەتە پشت دیوارە دێرینەکانی شارەکە، یان کاریگەریی بێزەنتەی لەسەر نەبووە، یاخود لەبەر ئەوەی چەند زنجیرەیەکی شێواوە کە لە شوێنێکی جیاوازی شارەکەوەیە؟ یاخود ئایا ئەیوب بە هۆی کاریگەریی سادەیی ئایین و سۆفیگەرییەوە، هەموو بیناکانی بەو جۆرە بچووکن یان خۆی لە گەورەبوونی ئەستەنبوڵ دوور گرتووە و پارێزگاریی لە دەسەڵاتەکەی کردووە _دەسەڵاتەکەی لە پاشماوەی چڵکن، ژەنگاوی، شکاو و وێرانبووەوە دەست کەوتووە؟ ئایا بە هۆی توانای بەردەوامی بووە بۆ سوودوەرگرتن لە ڕۆژئاوا و ڕۆژئاواییبوونی شارەکە، لە کاتێکدا خۆی دوور گرتووە لە لاساییکردنەوەی بیۆکراسی، بینا و دامەزراوەکانی ئەوان؟ پایرلۆتی ئەم شوێنەی لا پەسەند بووە، تا لە کۆتاییدا لێرە ماڵێکی کڕیوە و ماوەتەوە_ لەبەر ئەوەی ئەیوب وێنەیەکی ڕاستەقینەی دەستکارینەکراوی ڕۆژهەڵاتە، هەر لەبەر هەمان هۆکار کەمێك بێزارکەر بوو بەلامانەوە. کاتێك گەیشتمە ئەیوب، ئەو خەمەی بە هۆی بینینی وێرانبوون و مێژووی ئەو ناوچانەی دەوروبەری کەنداوی زێڕینەوە دروست بووبوو، لەناو چینێك هەوای تەنکدا ون بوو. بەهێواشی گەیشتمە ئەو ئاکامەی کە من ئەستەنبوڵم بە هۆی وێرانبووەکانیەوە و ماتەمینییەکەی و ئەو شکۆدارییەوە خۆش دەوێت کە ڕۆژێك خاوەنی بووە و دواتر لەدەستی داوە. بۆ ئەوەی زیاتر دڵخۆش بم، ئەیوبم جێ هێشت و دەستم بە گەڕان بە گەڕەك و وێرانبووەکانی دیکەدا کرد.

# ٣٧

# گفتوگۆیەك لەگەڵ دایکم:

# ئارامگرتن، ئاگادارکردنەوە، هونەر

بۆ ماوەی چەندین ساڵی دوورودرێژ، دایکم ئێوارانی بەتەنیا لە ژووری دانیشتن، لە چاوەڕوانیی گەڕانەوەی باوکم بەسەر دەبرد. باوکم ئێوارانی لە شوێنی کارەکەی دەمایەوە، لەوێشەوە دەچوو بۆ شوێنێکی دیکە، هەموو جار ئەوەندە درەنگ دەگەڕایەوە، کە دایکم بێزار بووبوو لە چاوەڕوانی و چووبوویە ناو جێگەی خەوەکەیەوە. لەپاش ئەوەی من و دایکم لەبەردەم مێزی ژەمی نیوەڕۆ دادەنیشتین، باوکم تەلەفۆنی دەکرد و دەیگوت: "ئێوە نانی خۆتان بخۆن، من سەرقاڵم و درەنگ دەگەڕێمەوە." دواتر دایکم کارتی یارییەکەی دەهێنان و لەسەر مێزەکە، کە داپۆشەرێکی کرێمیی لەسەر بوو، بڵاوی دەکردنەوە و داهاتووی خۆی دەخوێندەوە، کاتێك هەر کارتێکی لە دەستەی پەنجا و دوو کارتەکەی تر هەڵدەگەڕاندەوە _هەندێك جار هەوڵی دەدا بەباشی ڕێکیان بخات، لە سوورەوە بەدوای ڕەشدا_ ئارەزوویەکی ئاوەهای نەبوو لە گەڕان بەناو کارتەکاندا بۆ دۆزینەوەی نیشانەکان، یان بە بینینی نیشانەکان کە چیرۆکی داهاتوویان پیشان دەدا، زۆر شادومانی پێوە دیار نەبوو. بۆ دایکم، ئەوە تەنها یاریی ئارامکردنەوە بوو. کە دەهاتم بۆ ژووری دانیشتنەکە، پرسیارم لێ دەکرد کە ئایا بەختی خۆی خوێندووەتەوە، هەموو جارێك هەمان وەڵامی دەدامەوە: "ئازیزم، من ئەم یارییە بۆ خوێندنەوەی بەخت ناکەم، بەڵکو تەنها بۆ کاتبەسەربردنە، ئەرێ کاتژمێر بوو بە چەند؟ یارییەکی تر دەکەم و دەڕۆم دەنووم."

کاتێك ئەم قسانەی دەکرد، سەرنجێکی تەلەڤزیۆنەکەی (ئەو کاتە شتێکی نوێ بوو لە تورکیا) دەدا، کە فیلمێکی ڕەشوسپی پەخش دەکرا یان بەرنامەیەکی گفتوگۆ بوو لەبارەی ڕەمەزانی پێشوو (لەو سەردەمەدا یەك کەناڵی تەلەڤزیۆنی هەبوو، ئەویش لەژێر ڕکێفی دەوڵەت، بەرنامەکانی پەخش دەکرد)، دواتر دەیگوت: "من سەیری ئەم بەرنامەیە ناکەم، ئەگەر حەز دەکەی بیکوژێنەوە."

هەندێك جار بە سەیرکردنی هەر شتێك کە پیشان بدرایە لە تەلەڤزیۆن، وەکو یاریی دووگۆڵی یان کۆلانە ڕەشوسپییەکانی سەردەمی منداڵیم، کەمێك کاتم بەسەر دەبرد. بەڵام زۆر بەدەگمەن بایەخم بە بەرنامەکان دەدا، زۆربەی کاتەکەم لە ژوورەکەم، لە جیهانە تایبەتییەکەی خۆم، یان ئەگەر لە ژووری دانیشتنەکە بوومایە، بە قسەکردن لەگەڵ دایکم بەسەرم دەبرد.

ناوەناوە گفتوگۆکەمان دەگۆڕا بۆ مشتومڕێکی خراپ، لەپاش ماوەیەك دەچوومە ژوورەکەم و دەرگام لەسەر خۆم دادەخست و بۆ ئەوەی بەخوێندنەوە یان بەدەست هەستکردن بە تاوانەوە تا بەیانی بتلێمەوە. هەندێك جار لەپاش دەمەقاڵێکانم لەگەڵ دایکم، لە شەوێکی ساردی ئەستەنبوڵ دەچوومە دەرەوە و بەدەوری تاقسیم، بیۆگڵۆ و کۆلانە هەژار و تاریك و دوکەڵاوییەکانی شار پیاسەم دەکرد. ئەوەندە دەگەڕام، هەتا هەستم بە لەرزینی هەموو ئێسکەکانم دەکرد، دواتر لەپاش ئەوەی دایکم و هەموو خەڵکی شارەکە دەخەوتن، دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە. کردبووم بە خوو، هەموو شەوێك کاتژمێر چواری شەو دەڕۆیشتمە ناو جێگەی خەوە و تا کاتی نیوەڕۆ دەخەوتم. بۆ ماوەی بیست ساڵی دواتر، هەر لەسەر هەمان ڕۆتین بەردەوام بووم.

بابەتی سەرەکیی مشتومڕەکانم لەتەك دایکم، لەسەر داهاتووی نادیارم بوو، لەبەر ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٢، لە نیوەی خوێندنی ساڵی دووەمی بیناسازی زۆر نەدەچوومەوە بۆ زانکۆ و جگە لە هەندێکی کەمی وانەکان نەبێت، ئەویش لە ترسی دەرکردنی یەکجاری، وانەکانم نەدەخوێند. زۆر بەدەگمەن لە زانکۆکەم لە تەشکیشلە، دەکەوتمە بەرچاوان.

هەندێك جار بەگەمژەییەوە دەمگوت: "ئەگەر نەیشتوانم ببم بە بیناساز، بەڵام خۆ دەبمە خاوەنی بڕوانامەی دیبلۆم." دایکم پێی وا بوو لانی کەم کاریگەریی باوکم و

هاوڕێکانم لەسەرم، دۆخی منیان خراپتر کردووە. کە دەمبینی مەیلی نیگارکێشانم کز بووە، هەستم دەکرد بۆشاییەك لە ناخمدا دروست بووە کە هەرگیز بە خوێندنی تەلارسازی پڕ نابێتەوە، لە هەمان کاتدا دەمزانی ناتوانم بۆ هەمیشە لەسەر خوێندنەوەی ڕۆمان و کتێبی تر، یاخود بەسەربردنی شەوەکانم بە گەڕان بە شەقامەکاندا، شەو تا بەیانی بەردەوام بم. هەندێك جار ترس دایدەگرتم، لەپڕ لەبەردەم مێزەکە هەڵدەسامەوە و هەوڵم دەدا دایکم لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستییەکان تێبگەیەنم، بەڵام لەبەر ئەوەی نەمدەزانی بە چی شتێك قایلی بکەم، هەندێك جار وا هەستم دەکرد کە بە چاوی بەستراوەوە دەمەقاڵێ لەگەڵ یەك دەکەین.

"کاتی گەنجی، منیش وەك تۆ بووم"، دواتر بۆم دەرکەوت دایکم بۆ ئەوەی بێزارم بکات، ئەم قسانەی دەکرد. "منیش ڕێك وەك تۆ لە ژیانی خۆم هەڵدەهاتم، لە کاتێکدا پوورەکانت لە زانکۆ بوون و لەگەڵ کەسە ڕۆشنبیرەکان دەژیان و لە ئاهەنگ و بۆنەکاندا کەیف و سەفایان بوو، منیش وەك تۆ لە ماڵەوە دەمامەوە و چەندین کاتژمێرم بەگەمژەیی بە سەیرکردنی ئەو وێنە و گۆڤارانە بەسەر دەبرد کە داپیرەت خۆشیی دەهات لەگەڵیان." جگەرەکەی هەڵدەگرت و سەیرێکی دەکردم، تا بزانێت وشەکان کاریگەرییان هەبووە لەسەرم یان نا. "من شەرمن بووم، دەترسام لە ڕووبەڕووبونەوەی ژیان."

کاتێك دایکم دەیگوت: "هەر وەکو تۆ"، تووڕەیی لە ناخمدا قوڵپی دەدا. هەوڵم دەدا بەو بیرۆکەیەی "کە ئەو لە بەرژەوەندیی من، ئەو قسانە دەکات"، خۆم هێور بکەمەوە. کە بەدووروردرێژی بۆی دەگێڕامەوە کە ئەویش هەمان ئەم شتانەی کردووە، دڵی دەشکاندم. کاتێك چاوم لەسەر تەلەفزیۆنەکەوە دەبردە سەر ڕووناکیپشکنەری ئەو کەشتیانەی بە بۆسفۆردا ئەمسەر و ئەوسەریان بوو، بۆم ڕوون دەبوو کە چەندە بێزارم لەم بیرۆکە نەریتییانە. دەمزانی ئەم بیرۆکە نەریتییەم لە دایکمەوە وەرنەگرتووە، چونکە هەرگیز بەکراوەیی دانی بەو شتەدا نەدەنا، بەڵکو لە بۆرجوازە تەمبەڵەکانی ئەستەنبوڵ و وتارنووسی ڕۆژنامەکانەوە وەرمگرتبوو کە خراپترین ساتی ڕەشبینییان کۆتایی پێ دەهێنا بە گوتنی: "هیچ شتێکی باش لە شوێنێکی وەکو ئێرە نایەتە بوون."

ئەم ڕەشبینییە لەو ماتەمینییەوە سەری هەڵداوە، کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژە ئارەزووی شارەکەی شکاندووە. کەواتە ئەگەر خەمی شارەکە بە هۆی هەژارییەوە بووە، ئەی بۆچی دەوڵەمەندەکانیش باوەشیان بۆ کردووەتەوە؟ ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت ئەو کەسانە بە بەخت دەوڵەمەند بووبن، یاخود لەوانەیە هیچ بلیمەتییەکیان نەبووە بۆ ڕکابەریکردنی ئەو شارستانییەی خۆرئاوا کە هیوادارن لاسایی بکەنەوە.

لە دۆخی دایکم هەرچۆنێك بێت، هەندێك بنچینەی وێرانکاری و ئاگادارکردنەوەی تایبەت بە چینی ناوەڕاستی ڕووکەش هەبوو کە دایکم لە هەموو ژیانیدا گەواهیدەدەریان بووە. لەپاش ئەوەی لەگەڵ باوکم هاوسەرگیرییان کردووە و دواتر من و براکەم لەدایك بووین، باوکم بێبەزەییانە دڵی دایکمی شکاندووە. نەهاتنەوەی باوکم بۆماڵەوە، هەژاربوونی خێزانەکە _کاتێك دایکم هاوسەرگیریی کردووە، هەرگیز لە خەیاڵیدا نەبووە ڕووبەڕووی ئەو جۆرە کێشانە بێتەوە_ هەمیشە هەستم دەکرد هەموو ئەو بەدبەختییانە زۆریان لە دایکم کردووە، هەتا بەسەر هەموو ئەو بەرگریکردنە دوورودرێژانەی ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵگا سەر بکەوێت. لە کاتی منداڵیم، کاتێك دایکم من و براکەمی دەبرد بۆ بازاڕکردن لە بیۆگڵو یان بۆ سینەما یاخود بۆ پارك، کاتێك پیاوێك سەیری دەکرد، لە دەربڕینەکەیدا ئەو ئاگادارکردنەوەی دەردەخست کە لەگەڵ هەر کەسێکی تری جگە لە خێزانەکە، تاقی کردبووەیەوە. کاتێك من و براکەم لەدەرەوە شەڕ و مشتومڕمان دەکرد، ئارەزوویەکم دەبینی لە دایکمدا بۆ پارێزگاریکردنمان.

هەستم دەکرد ئەم ئاگادارکردنەوە بەردەوامانەی دایکم، وەکو "ئاسایی بن، وەکو هەر کەسێکی تر بن"، دەربڕینی چەند ڕەوشتێکی نەریتی بوون _گرنگیی سادەبوون، قایلبوون بەوەی کە چەندە بچووکی و زیاتر بەردەوامبوون لەسەری، ڕاهێنان لەسەر بیرۆکەی دونیانەویستی سۆفیگەری کە کاریگەریی بەسەر هەموو کلتوورەکانەوە هەبووە_ بەڵام ئەم شتانە زۆر بەقورسی دایکمیان تێدەگەیاند کە بۆچی من قوتابخانەم جێ هێشتووە. بە تێڕوانینی دایکم، من زۆر هەڵەم لەو گرنگیدانە زیاد لە پێویستە، هونەر، وێنەکێشان و داهێنان _تەنها ئەورووپییەکان ئەو مافەیان هەیە بەگرنگییەوە کاریان لەسەر بکەن. بە جۆرێك باسی ئەو شتانەی دەکرد، وەك ئەوەی بڵێت ئەوە ئێمە نین لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەیەم دەژین، بەڵکو لە کلتوورێکدا دەژین کە

تووشی هەژاری بووە و دەسەلآت و سامان و ئارەزووی لەدەست داوە. ئەگەر بەم قسەیە بیرم پڕ کردبێت: "هیچ شتێکی باش لە شوێنێکی وەك ئێرە نایەتە بوون"، کەواتە نابێت بەو جۆرە بژیم کە دواتر پەشیمانیی بۆ دەربیرم.

هەندێك جار دایکم بۆ پارێزگاریکرن و بەرزڕاگرتنی ئەو شوێنەی هەیبووە لەناو کۆمەڵگادا، هەندێك کاری کردووە. بۆی دەگێڕامەوە کە منی ناو ناوە ئۆرهان، چونکە لەناو سوڵتانی عوسمانییەکان تەنها سوڵتان ئۆرهانی خۆش ویستووە. سوڵتان ئۆرهان هەرگیز لەگەڵ پرۆژەی گەورە و دەرخستتنی خۆی نەبووە، بەڵکو بە ژیانێکی ئاسایی ژیاوە، هەر لەبەر ئەوەیە کتێبە مێژووییەکان زۆر بەرێزەوە باسی ئەم دووەم سوڵتانەی عوسمانییان کردووە. هەموو ئەم شتانەی بەزەردەخەنەوە بۆ دەگێڕامەوە و ڕوون بوو کە دەیویست تێمبگەبەنێت کە بۆچی ئەم شتانەم بۆ باس دەکات.

لە یەکێك لەو ئێوارانەدا کە دایکم لە ژووری دانیشتەکە دانیشتبوو و چاوەڕێی باوکمی دەکرد بگەڕێتەوە، لە ژوورەکەم هاتمە دەرەوە بۆ ئەوەی دیسان مشتومڕی لەگەڵ بکەمەوە، چونکە دەمزانی ڕۆڵم دەبێت لە کەمکردنەوەی نیگەرانیی ژیانێکی سادە و خەمبار کە ئەستەنبوڵ پێشکەشی کردبوو لەگەڵ دڵدانەوەیەکی ئاسایی کە دایکم لێی چاوەڕێ دەکردم. هەندێك جار پرسیارم لە خۆم دەکرد، کە بۆچی دیسانەوە دەڕۆم و دەست دەکەمەوە بە دەمەقاڵێ لەگەڵی؟ لەپاش ئەوەی سەرکەوتوو نەدەبووم لە دۆزینەوە وەڵامێکی قایلکەر، نیگەرانییەك لە ناخمدا دروست دەبوو.

"جارانیش نەدەچوویەوە بۆ قوتابخانە"، دایکم بەدەم هەڵگێڕانەوەی کارتەکانی دەستیەوە، لەگەڵم دەدوا. "دەتگوت نەخۆشم، گەدەم ئازاری هەیە، لەرزوتامە. ئەو کاتەش لە جیهانگیر بووین، نەچوونەوە بۆ وانەکانت کردبوویە خوو. بەیانییەکیان کاتێك وتت نەخۆشم و ناتوانم بڕۆمەوە بۆ قوتابخانە، هاوارم کرد بەسەرتدا، لەبیرتە؟ ئینجا پێم گوتیت نەخۆش بیت یان نا، هەر ئێستا ئێرە جێ دەهێڵیت و دەڕۆیت بۆ قوتابخانە. نامەوێت لە ماڵەوە بیت!"

لەم خاڵی چیرۆکەدا، دایکم وەستا _لەوانەیە زانیبێتی تووڕە دەبم_ دواتر جگەرەیەکی دادەگیرساند، بەبێ ئەوەی سەیرم بکات، دەستی پێ دەکردەوە، بەڵام لە

دەنگیدا ئاوازێکی بەرز و نزمی هەبوو. "لەدوای ئەو بەیانییەوە، ئیتر هەرگیز گوێم لێ نەبوو بڵێت نەخۆشم و ناڕۆمەوە بۆ قوتابخانە."

بەهەڵەشەییەوە وەڵامی دایکم دەدایەوە: "لە ئێستاوە پێت دەڵێم، هەرگیز جارێکی تر قاچم ناخەمەوە کۆلێژی تەلارسازی."

"کەواتە دواتر چی دەکەیت؟ تۆش وەك من لە ماڵەوە دادەنیشی؟"

بەهێواشی ویستێك پاڵی پێوە دەنام کۆتایی بە مشتومڕەکەمان بهێنم، بەتوندی دەرگاکە لەدوای خۆمەوە دابخەم و بەنیوەمەستی و کێشانی جگەرەوە، بەتەنیا پیاسەیەکی دووردرێژ لە کۆڵانەکانی دواوەی بیۆگلو لەگەڵ ڕقلێبوونەوە لە هەموو کەسێك و هەموو شتێك بکەم. گەڕانەکەم زۆر جار چەند کاتژمێرێکی دەخایاند، ئەگەر زۆر بگەڕامایە، تەماشای پەنجەرەی دوکانەکان، چێشتخانە، قاوەخانە نیوەڕووناکەکان، پردەکان، بەردەم سینەماکان، پڕوپاگەندە و پۆستەرەکان، قوڕ و خاشاك و دڵۆپەی بارانەکان کە دەڕژانە ناو چڵپاویی سەر شۆستەکانەوە، گڵۆپی سەر شەقامەکان و ئۆتۆمبێلەکان و سەگە بێسەرپەرشتەکانی ئەو کۆڵانانەم دەکرد کە زبڵی خاشاکەکانیان هەڵگەڕاندبوویەوە. هەندێك جار دەموسیت دەستبەجێ بگەڕێمەوە ماڵەوە و دیمەنەکان بکەم بە وشە و زمانێك بدۆزمەوە کە گیانی تاریکی و هیلاکییان بەرجەستە بکات. ئەم ئارەزووەشم هەروەك پەرۆشیی جارانم بۆ وێنەکێشان دڵخۆشکەر بوو، بەڵام دڵنیا نەبووم بە چی جۆرێك خواستەکەم دەربڕم.



لەو کاتەدا دایکم دەیپرسی: "ئەرێ ئەوە دەنگی ئاسانسوارەکە بوو؟"

هەردووکمان دەوەستاین و گوێمان دەگرد، بەڵام کاتێك هیچ دەنگێکی ئاسانسوار نەبوو و باوکم دیار نەبوو. دایکم جارێکی تر کارتەکانی بەرز دەکردنەوە، بە گڕوتینێکی نوێوە هەڵیدەگێڕانەوە و بەسەرسامی تەماشای دەکردم _بە شێوازێکی ئەوەندە تایبەت دەجووڵایەوە، بەمندالّی ئەو شێوازەی زۆر خۆشەویست بوو بەلامەوە، بەڵام کاتێك خۆشەویستییەکەی دەشاردەوە، بێزاری دەکردم. نەمدەزانی چۆن لە ڕەفتارەکانی تێبگەم. هەستم دەکرد لەنێوان ئەوینێکی بێسنوور و ڕقلێبوونەوە ماومەتەوە. لەپێش چەند مانگێك، دایکم لەدوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لە مەجیك کۆی، شوێنی نهێنیی باوکمی دۆزییەوە کە لەوێ باوکم لەگەڵ دۆستەکەی ژووانیان دەبەست، زۆر ژیرانە کلیلەکەی لە پاسەوانەکە وەرگرتبوو و چووبووە ناو ئەو نهۆمەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەو دیمەنانە ببینێت کە دواتر زۆر بەساردی بۆی گێڕامەوە. جووتێك بیجامەی باوکم کە هەمیشە لە ماڵەوە لەبەری دەکردن، لەپشت جێگەی خەوەکەی تریەوە دانرابوون، هەروەها لەتەنیشت مێزەکەوە، هەر وەکو ئەوەی تەنیشت سیسەمەکەی ماڵەوەی، چەندین کتێب لەبارەی پردەوە لەسەر مێزەکە هەڵدرابوونەوە.



بۆ ماوەیەکی زۆر، دایکم ئەوەی بینیبووی لە هەمووانی شاردەوە. چەند مانگ دواتر، کاتێك وەك هەمیشە یاریی ئارامکردنەوەی دەکرد، جگەرەی دەکێشا و لە

سووچێکی چاویەوە سەیری تەلەڤزیۆنەکەی دەکرد، لە ژوورەکەم هاتمەوە دەرەوە بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەم، لەپڕ چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە. کاتێك بێزاری و تووڕەیی بە ڕووخسارمەوە بینی، بەکورتی چیرۆکەکەی تەواو کرد. هەتا ئێستاش کاتێك بیر دەکەمەوە کە باوکم ماڵێکی تری هەبووە، تووشی ترس و لەرز دەبم: وا بیرم دەکردەوە کە باوکم ئەو شتەی کردووە کە من هەرگیز نەمتوانی بیکەم _ئەو توانیویەتی جمکەکەی خۆی بدۆزێتەوە. ئەو بوونەوەرە لەگەڵی دەمایەوە، هاوشێوەکەی خۆی بوو نەك دۆستەکەی، کە هەموو ڕۆژێك دەچوو لە ماڵێکی تر لەگەڵی بێت. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، بیری دەخستمەوە کە شتێك لەناو ناخم و لەناو ژیانمدا ونە و پێویستە بیدۆزمەوە.

بەدەم یارییەکەوە پێی دەگوتم: "لە کۆتاییدا بۆ تەواوکردنی زانکۆ، دەبێت ڕێگایەك بدۆزیتەوە. بە وێنەکێشان ناتوانیت یارمەتیی خۆت بدەیت، پێویستە کارێکی تر بدۆزیتەوە. لەبیرت بێت، کە ئیتر وەك جاران دەوڵەمەند نین."

"ئەوە ڕاست نییە." ماوەیەکی زۆر بوو لەدەرەوە کارم نەکردبوو، تەنانەت ئەگەر هیچ شتێکیشم نەکردایە، دایکم و باوکم یارمەتییان دەدام.

"دەتوانیت پێم بڵێی بە وێنەکێشان دەتوانی چۆن یارمەتیی خۆت بدەیت؟"

لە شێوازی فڕێدانی جگەرەکەی بۆ ناو تەپڵەکەکە، لە تۆنە نیوە گاڵتەجاڕی و نیوە خۆبەزلزانییەکەی دەنگیەوە و لەو شێوازەی بەردەوام یاریی کارتەکانی دەکرد، تەنانەت لەو کاتانەی باسی بابەتێکی گرنگمان دەکرد، لە مەرامەکەی تێدەگەیشتم.

دەنگی کە کەمێك شادومانیی پێوە دیار بوو، گوتی: "دەزانیت ئێرە پاریس نییە، ئێرە ئەستەنبوڵە، تەنانەت ئەگەر ببیتە باشترین شێوەکاری جیهان، هیچ کەس تۆزقاڵێك بایەخت پێ نادات، هەموو ژیانت دەبێت بەتەنیا بەسەر بەریت. هیچ کەس تێناگات بۆچی لەبەر وێنەکێشان واز لە داهاتووی گەشاوە و نایابت دێنی! تەنانەت لە ئەورووپاش هەمووان دەزانن کە بۆچی ڤان گوخ و جوجون شکستیان هێنا."

بەدڵنیاییەوە دایکم هەموو چیرۆکەکانی باوکمی لەبارەی ئەدەبی بوونخوازی بیستبوو، کە لە ماوەی پەنجاکاندا باوکم زۆر پێوەیانەوە پەیوەست بوو. یان فەرهەنگێکی گەورەی ئەنسیکلۆپیدیای هەبوو _ئێستا لاپەڕەکانی زەرد بوون و

بەرگەکەی شڕ بووە_ کە بۆ دۆزینەوە و خوێندنەوەی ڕاستییەکان و نەریتەکان دایکم سەیری دەکرد.

"ئایا پەتیت لارۆس نەیگوتووە، هەموو هونەرمەندەکان شێتن؟"

"هیچ بیرۆکەیەکم نییە، کوڕم. ئەگەر کەسێك زۆر بەهرەمەند بێت و خۆی ماندوو بکات یان بەختی هەبێت، لەوانەیە بتوانێت ببێتە کەسێکی ناودار لە ئەورووپا. بەڵام لە تورکیا، تەنها شێت دەبن. تکایە بەهەڵە تێمەگە. ئێستا هەموو ئەو شتانەت پێ دەڵێم، بۆ ئەوەی دواتر پەنجەی پەشیمانی نەگەزی."

بەڵام من ئێستا هەست بە پەشیمانی دەکەم، لە هەمووی زیاتر کاتێك بیر لە قسە بەئازارەکانی دایکم دەکەمەوە، لە کاتێکدا کە یاریی بەختی بەبەردەوامی دەکرد، چارەنووسی خۆی دەخوێندەوە و ئەو قسانەی دەرکرد.

بۆ ئەوەی دایکم قسەیەك بکات و زیاتر بریندارم بکات، گوتم: "چی شتێکی تر هەیە زیاتر پەستم بکات؟"

"نامەوێت هیچ کەس وا بیر بکاتەوە تۆ کێشەی دەروونیت هەیە. هەر لەبەر ئەوەیە بە هاوڕێکانم نەگوتووە کە ناچیتەوە بۆ خوێندنی وانەکانت، چونکە ئەوان لەو جۆرە کەسانە نین کە تێبگەن بۆچی کەسێکی وەکو تۆ بڕیاری داوە زانکۆ جێ بهێڵێت و ببێت بە شێوەکار. وا بیر دەکەنەوە، مێشکت لەدەست داوە. دواتر لەپشتەوە قسەوقسەڵۆکت بۆ دروست دەکەن."

"هەرچییەك حەزیان لێیە، با بڵێن. واز لە هەرچییەك دێنم، بۆ ئەوەی وەك ئەوان گێل و گەوج نەبم." .

"تۆ شتێکی ئەوەها ناکەیت. لە کۆتاییدا هەمان شت دەکەیت، کە بەمنداڵی دەتکرد: جانتاکەت هەڵدەگری و دەچیت بۆ قوتابخانە."

"نامەوێت ببم بە تەلارساز، دڵنیام لەوە."

"کوڕەکەم، دوو ساڵ زیاتر بخوێنە و دیبلۆمی زانکۆ بەدەست بهێنە بۆ خۆت، ئەوکات دەتوانیت بڕیار بدەیت دەبیتە تەلارساز یاخود شێوەکار."

"نەخێر، نابێت."

" پێت بڵێم نورجیهان چی دەگوت، کە زانیی واز لە خوێندن دەهێنیت؟" دایکم دەیویست بە قسەی یەکێك لە هاوڕێ بێنرخەکانی ئازارم بدات.

"تووشی کێشە بوویت، بە هۆی شەڕەکانی من و باوکتەوە سەرت لێ شێواوە، لەبەر ئەوەی باوکت هەمیشە لەگەڵ ئافرەتی تر دەسووڕێتەوە _نورجیهان بەم جۆرە بیری دەکردەوە."

"گرنگ نییە لەلام، هاوڕێ بیرتەسکەکانی تۆ چۆن بیر لە من دەکەنەوە!" ئینجا هاوارم کرد بەسەریدا، تەنانەت لەبیریشم کردبوو کە بۆ بەرژەوەندیی من وا دەڵێت، خۆم ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی لە نواندنەوە هەڵسوکەوتەکانم بگۆڕم بۆ تووڕەییەکی ڕاستەقینە.

"کوڕم، تۆ زۆر شانازی بە خۆتەوە دەکەیت، ئەوەم زۆر بەدڵە. لەبەر ئەوەی گرنگتر لە ژیاندا ئەو هونەرە بێمانایە نییە، بەڵکو شانازیکردنە. زۆر کەس لە ئەورووپا بوونەتە هونەرمەند، لەبەر ئەوەی شانازییان بە خۆیانەوە کردووە. لە ئەورووپا وەك ئیشکەر یان گیرفانبڕ بیر لە هونەرمەند ناکەنەوە، بەڵکو بە چەشنێك ڕەفتاری لەگەڵ دەکەن، وەك ئەوەی کەسێکی تایبەت بێت. بەڕاستی لە شارێکی وەك ئێرە، وا دەزانی بوویتە هونەرمەند، دەتوانیت شانازییەکەت بهێڵیتەوە؟ ئەگەر بتەوێت لەلایەن خەڵکی ئێرەوە قبوڵ بکرێیت کە هیچ شتێك لە هونەر نازانن، یان هەتا هانیان بدەیت کارەکانت بکڕن، دەبێت مەرایی و ماستاو بکەیت بۆ دەوڵەت و دەوڵەمەندەکان، لە هەمووی خراپتر بۆ ڕۆژنامەنووسە نیوەخوێندەوارەکان. ئایا وا دەزانی، دەتوانیت لەگەڵ هەموو ئەو هەموو شتانە هەڵبکەیت؟"

تووڕەیی و شێتییەکەم، چالاکی و وزەیەکی وایان پێ دەدام کە پاڵی پێوە دەنام و ئارەزوویەکی ئاوەها سەیری پێ دەدام، بۆ ئەوەی دەستبەجێ ماڵەوە جێ بهێڵم و ڕوو بکەمە کۆڵانەکان. دواتر، لەپاش ئەوەی هەریەکەمان خراپترین قسەی خۆمان دەکرد، هێشتا دەمتوانی دەرگاکە بکەمەوە و لە ئێوارەیەکی تاریك و ترسناکدا، ڕابکەم بەرەو کۆڵانەکانی دواوەی شارەکە. قاچەکانم بۆ سەر شۆستە بەرز و نزمەکان، تێپەڕین بەژێر ڕووناکیی زەردباوی گڵۆپی سەر شەقامەکان یان هیچ ڕووناکییەك نەبوو، یاخود بۆ کۆڵانە چەوریێژکراو، تەسك و خەمگینەکانیان دەبرد. لەو کۆڵانە چڵکن و هەژارانەدا،

هەستم بە خۆشییەکی نائاسایی دەکرد. بەبێ وەستان دەگەڕام، ئاگری تووڕەیی، بیرۆکە و خەیاڵەکانم وەکو کەسایەتیی ناو شانۆکان بەلامدا تێدەپەڕین، خەونم بەو شتانەوە دەبینی کە ڕۆژێك بتوانم بیانکەم.

"سەیری فلاوبێر بکە، لەگەڵ دایکی لە هەمان خانوودا ژیاوە!" دایکم بە شێوازە نیوەمیهرەبانی و نیو گاڵتەجاڕییەکەی، لە کاتێکدا سەرنجی کارتەکانی دەدا، بەردەوام بوو لە ئاگادارکردنەوەکانی. "بەڵام من نامەوێت تۆ لەگەڵ من لە هەمان خانوودا بسووڕێیتەوە. ئەوە فەرەنسایە، کاتێك دەڵێت کەسێك هونەرمەندێکی گەورەیە، تەنانەت ئاویش لە ڕۆشتن دەکەوێت. لێرە شێوەکارێك کە وازی لە قوتابخانە هێناوە و ژیان لەلای دایکیەوە بەسەر دەبات، لە کۆتاییدا یان دەبێت بە کەسێکی مەست یان لە شێتخانە ژیان بەسەر دەبات." یان شتێکی دیکەشی بۆ قسەکانی زیاد دەکرد: "ئەگەر پیشەیەکت هەبێت، باوەڕم پێ بکە، زیاتر لە نیگارکێشان کامەرانت دەکات."

بۆچی دەشێت بەو جۆرە تووڕەیی و بێتاقەتییە، دەتوانم خۆشی لە پیاسەی شەوانە بدۆزمەوە بەناو کۆڵانە دوورەپەرێزەکان بەتەنها لەگەڵ خەونەکانم؟ بۆچی زیاتر لەبری دیمەنی پۆستەری پروپاگەندەی ڕۆژانەی ئەستەنبوڵ، کە گەشتیارەکان زۆر لایان سەرنجڕاکێش بوو، من زیاتر دیمەنی نیوەتاریکی کۆڵانەکانی دواوە، ئێواران و شەوانی ساردی زستان، ئەو خەڵکانەی وەك تارمایی بەژێر ڕووناکیی سەر شەقامەکاندا دەڕۆن، دیمەنی چەوڕێژی ڕێگاکان و تەنیاییەکەیانم زۆر لا پەسەند و جوانترە؟

"ئەگەر نەبیت بە تەلارساز یان ڕێگەیەکی دیکە بۆ بەڕێکردنی ژیانت نەدۆزیتەوە، ئەوا دەبیتە یەکێك لەو شێوەکارە دەمارگیر و هەژارانە کە هیچ هەڵبژاردەیەکیان نییە، جگە لە پشتبەستن بە بەزەیی کەسە دەوڵەمەندە و بەتواناکان. تێدەگەیت ئەوە واتای چییە؟ هیچ کەس لەم شارە ناتوانێت بە وێنەکێشان، ژیان و گوزەرانی دابین بکات. پەرێشان دەبیت. خەڵك بە چاوێکی کەمەوە سەیرت دەکەن. بەدەست نیگەرانی و بێزارییەوە دەناڵێنی تا ئەو ڕۆژەی دەمری. بەدڵنیاییەوە تۆ کەسێکی ژیر و خۆشەویستیت و پڕیت لە ژیان، دەتەوێت بەو جۆرە بژیت؟"

له بەشیکتاش، بە درێژایی دیوارەکانی دۆڵمەباخچە پالاس، بە درێژایی یاریگاکان و شوێنی وەستانی پاسەکان پیاسەم دەکرد. حەزم دەکرد هەموو شەوەکە بە پیاسەکردن بە درێژایی دیوارە ئەستوور، پڕ لە درز و بە قەوزە داپۆشراوی کۆشکەکان بەسەر بەرم. هەستم دەکرد تووڕەییەکەم زیاتر دەبوو، هەتا دەگەیشتمە دۆڵمەباخچە، یان دواتر دەچوومە کۆڵانێکەوە و بە ماوەی دوازدە چرکە دەگەیشتمە تاقسیم.



"کاتێك بچووك بوویت، تەنانەت ئەو کاتە شتەکان خراپتر بوون، وەکو هەمیشە پێدەکەنیت، دڵخۆش و گەشبین بووی. ئۆه، ئەوەندە منداڵێکی شیرین بووی، هەر کەس چاوی پێت دەکەوت، زەردەخەنەی بۆ دەکردیت. نەك تەنها لەبەر ئەوەی کە جوان بوویت، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەتدەزانی خەم چییە. هەرگیز بێزار نەدەبووی، تەنانەت لە خراپترین کاتدا، تۆ خۆت سەرقاڵ دەکرد و چەندین کاتژمێر گەمەت دەکرد. هەمیشە ڕووگەش بووی. چۆن دەبێت کەسێکی وەك تۆ، ببێتە شێوەکارێکی پڕ لە کێشە و هەمیشە کڕنووش بۆ دەوڵەمەندەکان بەرێت. تەنانەت ئەگەر دایکیشت نەبوومایە، بەرگەی ئەمەم نەدەگرت. هەر لەبەر ئەوەیە دەمەوێت بەبایەخەوە گوێم بۆ بگری و تووڕە نەبیت لە قسەکانم."



لەسەر ڕێگاکەم بۆ تاقسیم، دەوەستام بۆ ئەوەی سەیری ڕووناکییەکانی گالەتا بکەم کە دیمەنێکی نیوەتاریکی هەبوو، دواتر سەرێکم لە بیۆگڵو دەدا، بۆ ئەوەی چەند ساتێك چاو بخشێنم بە دوکانی کتێبفرۆشەکانی ئیستیقلالدا، لەپاش ئەوە بۆ ئەوەی بیرە یان ڤۆدکایەك بخۆمەوە، لە یەکێك لە یانەکانی لام دەدا. دەنگی تەلەڤزیۆن لەناو ژاوەژاوی جەنجاڵییەکەدا نەدەما، وەك هەر کەسێکی تر، سەیری ئەملاولای خۆم دەکرد، بۆ ئەوەی دڵنیای بکەمەوە ئەگەر ڕوو بدات شاعیرێك یان نووسەرێك یان هەر شێوەکارێکی ناودار لەتەنیشتمەوە دابنیشێت. دواتر، کاتێك هەستم دەکرد سەرنجی پیاوە سمێڵ زلەکانم ڕاکێشاوە _لەبەر ئەوەی زۆر سەیری دەورووپشتی خۆم دەکرد، بەتەنها بووم و ڕووخسارێکی منداڵانەم هەبوو_ جارێکی تر ڕۆیشتمە دەرەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ شەو تێکەڵ ببمەوە. لەپاش پیاسەیەکی کورت، سەرم دەکێشایە لە کۆڵانە هەژارەکانی بیۆگڵو، کاتێك دەگەیشتمە جیهانگیر، چوکورجوما و گالەتا دەوەستام و سەیری هالەی گڵۆپی سەر شەقامەکان، یان سەیری ڕووناکیی یەکێك لە تەلەڤزیۆنەکانی ئەو نزیکانەم دەکرد کە لەسەر شۆستەکە دەجووڵایەوە. کاتێك دەمڕوانیە دوکانی کۆنەفرۆشێك، یان ئەو بەفرگرەی کە فرۆشگایەکی خواردەمەنی لەبەردەم پەنجەرەکەیدا داینابوو، یاخود ئەو دەرمانخانەیە کە هێشتا هەمان بووکەڵەی جارانیان لەبەردەم پەنجەرەکەیان دانابوو، منداڵیم بیر دەکەوتەوە و دەمزانی کە چەندە دڵخۆش بووم ئەو کاتە. ئەو تووڕەییەی بە هۆی قسەکانی دایکمەوە دایگرتبووم، لەپاش پیاسەیەکی زۆر

به کۆڵانە هەژارەکانی بیۆگڵودا نەدەما _یاخود ئایا دەکرا بڕۆم بۆ ئۆسکودەر یان کۆڵانەکانی پشتەوەی فاتیح تاقی بکەمەوە؟_ بۆ هەر شوێنێك کە دەچووم، زیاتر سەرسام دەبووم و بە تینی گەرمای داهاتووی درەوشاوەم گەرم دەبوومەوە. کاتێك هیلاك دەبووم، کۆڵانە خەمگینەکان وەك فیلمە کۆنەکان لەبەرچاوم دەهاتن و دەچوون، لەو ساتەدا دەمویست لە سەرمادا بیبەستم یان خۆم بشارمەوە _هەر بەو شێوازەی کە بەمنداڵی فێر بووبووم کە تۆوێکی بەنرخ یان هەڵماتێك بۆ ماوەیەکی زۆر لە دەممدا بشارمەوە_ لە هەمان کاتدا دەمویست کۆڵانە چۆڵەکان جێ بهێڵم، بگەڕێمەوە ماڵەوە، لەبەردەم مێزەکەم دابنیشم، قەڵەم و کاغەز ئامادە بکەم و دەست بە نووسین یان وێنەکێشان بکەم.




"ئەو نیگارەی سەر دیوارەکە دەبینی، ئەوە نەریمان و عەلی وەکو دیاریی هاوسەرگیریی من و باوکت پێشکەشیان کردین. کاتێك ئەوانیش هاوسەرگیرییان کرد،

لەگەڵ باوکت ڕۆیشتین بۆ لای هەمان شێوەکار، بۆ ئەوەی ئێمەش نیگاریکیان بۆ بکرین، ئەگەر دەتبینی ئەو وێنەکێشە ناودارەی تورکیا چەندە دڵخۆش بوو کاتێك دەیبینی هەندێك خەڵك لەلای دەرگاکەوە دەگەڕێنەوە و لە کۆتاییدا وێنەیەکی لێ دەکرن، یاخود چەندە گاڵتەئامێز بوو کاتێك دەیویست خۆشحاڵییەکەی بشارێتەوە، یان چۆن بەکرنووشبردنەوە زەوییەکەی گسك دەدا، کاتێك ئێمە بە نیگارەکەی دەستمانەوە جێمان هێشت، یاخود چەندە بەمەراییەوە ماڵئاوایی لێ دەکردین، هەرگیز ئاواتت نەدەخواست لەم شارەدا شێوەکار بیت. کوڕەکەم، هەر لەبەر ئەوەیە بە هیچ کەسم نەگوتووە کە وازت لە خوێندن هێناوە هەتا ببیت بە شێوەکار. ئەو کەسانەی ئێستا بە بیرتەسك ناویان دەبەیت، ڕەنگە لە داهاتوودا نیگارەکانت بە ئەوان بفرۆشیت، کاتێك دەزانن تۆ داهاتووت _ هەموو ژیانت _ ڕەش کردووە بە دەستهەڵگرتن لە خوێندنەکەت، بەڵێ، دێن و یەك یان دووان لە وێنەکانت دەکرن، تەنها بۆ ئەوەی خێرێکت پێ بکەن، تەنها بۆ ئەوەی من و باوکت بچووك بکەنەوە، یاخود لەوانەیە بەزەییان پێتدا بێتەوە و برێك پارەت بدەنێ. بەڵام بەدڵنیاییەوە ڕێگە نادەن، هیچ کام لە کچەکانیان هاوسەرگیریت لەگەڵ بکەن. ئەو کچە خوێنشیرینەی کە وێنەت کێشابوو، دەزانی بۆچی باوکی ڕەوانەی سویسرای کرد؟ بۆ شارێکی هەژار هەر وەکو شاری خۆمان، بۆ ناو کۆمەڵێك خەڵکی لاواز و نیوەخوێندەوار، بۆ ئەوەی ببێتە خاوەنی ئەو ژیانەی کە شایەنیەتی. ئەگەر دەتەوێت هەمیشە سەرت بەرز ڕابگریت، دەبێت دەوڵەمەند بیت. لەبەر ئەوە کوڕم، هەرگیز واز لە خوێندنەکەت مەهێنە، دواتر زۆر بەخراپی ئازار دەکێشی، ئەگەر وا نەکەیت. سەیری ل کۆربیوسەر بکە، ویستی ببێتە شێوەکار، بەڵام بەشی بیناسازیی خوێند."

کۆڵانەکانی بیۆگلو، سووچە تاریکەکان، ئارەزووی هەڵهاتن، هەستکردنم بە گوناه _هەموو ئەمانە لەناو مێشکمدا وەکو ڕووناکی دادەگیرسان و دەکوژانەوە، بەپچڕپچڕی دیمەنەکان دەکەوتنە بەرچاوم. دەمزانی ئەو شەوە بگەڕێمەوە، لەگەڵ دایکم نابێتە دەمەقاڵێمان. لەپاش ئەوەی هەڵهدەهاتم بۆ کۆڵانە سەبووریبەخشەکانی شارەکە و تا

نیوەی شەو پیاسەم دەکرد، دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە، دەچوومە سەر مێزەکەم و لەسەر کاغەز لەبارەیانەوە دەمنووسی.

گوتم بە دایکم: "نامەوێت ببم بە شێوەکار، دەبم نووسەر!"

# ORHAN PAMUK
# ISTANBUL



"دوور لە هەڵسەنگاندنی دیمەنی سروشتی و نەخشەی تەلارە جوان و نایابەکانی شارەکە، ئەستەنبوڵ باسی خەمێکی نادیار دەکات و بەو جۆرەکاریك سەر پیاوێکی گەنجی خەیاڵفراوان، هەرچەندە خەمباری کردووە، بەڵام بەهرەکەی هێناوەتە بوون."
(نیویۆرك تایمز)

بە بیرهێنانەوەیەکی درەوشاوە، بە دەرخستنی هەموو زانیارییەکی ورد و وەسفکردنی فراوانی یەکێك لە گەورەترین شارەکانی جیهان لەلایەن یەکێك لە باشترین و دیارترین نووسەرەکانیەوە. ئۆرهان پاموك لە ئەستەنبوڵ لەدایك بووە، هێشتا هەر لەوێ ماوەتەوە و لە هەمان باڵەخانە کە یەکەم جار دایکی لەباوەشی گرتووە. بەو جۆرە وێنەی شارەکەی کێشاوە، هەر بەو جۆرەی وێنەی خۆی کێشاوە، کە هەردووکیان ڕەنگدانەوەی یادگاری و خەمی ـیاخود هوزنی ـ شارەکەن کە هەموو ئەستەنبوڵییەکان تێیدا بەشدارن: ئەو خەمەی بە هۆی ژیانکردن لەنێوان پاشماوە وێرانبووەکانی ئیمپڕاتۆرێکی ڕووخاوەوە دروست بووە.

بە تەکنیکێکی فیلمئاسا، پاموك لە باسکردنی ماتەمینیی خێزانەکەیەوە، ڕۆیشتووە بۆ باسی ئەو کۆشکە وێرانانەی کە بەسەر بۆسفۆریاندا ڕوانیوە. لە گرنگیدان بە بیروڕا و سەرنجەکانی خۆیەوە، ڕۆیشتووە بۆ لای سەرنج و بیروڕای ئەو نووسەرە ـبیانی یان تورکیـ کە کاریگەرییان هەبووە لەسەر بیرکردنەوەکانی لەسەر شارەکە. هەر وەکو دوبلینی جۆیس و ئایرسی بۆرگێس بیونۆس، (ئەستەنبوڵ)ی پاموك ئەزموونێکی سەرکەوتووی باسکردنی شوێنێکە کە بە جوانی و ویژادانەوە نووسراوە.



بەرگ : ئیبراهیم صالح

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ ( ٩٠٠٠ ) دینار